## مێناحیم بێگن

# شەوە سپییەکان

## بەسەرهاتی زیندانییەک لە ڕووسیا

**لە ئینگلیزییەوە: شەفیق حاجی خدر**

ناوی کتێب: شەوە سپییەکان
نووسەر: مێناحیم بێگن
و. لە ئینگلیزییەوە: شەفیقی حاجی خدر
بابەت: یادەوەری
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
بەرگ: حەمە سەعاتچی
ناوەوە: عەبدوڵڵا ڕەحمان
چاپخانە:
نرخ: پێنج هەزار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی «٢٠٥» ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە.

# WHITE NIGHTS

## The Story of a Prisoner in Russia

*by*

*MENACHEM BEGIN*
*Prime Minister of Israel*

*Translated from the Hebrew by Katie Kaplan*

HARPER & ROW, PUBLISHERS
New York, Hagerstown, San Francisco, London

# ناوەڕۆک

## پێڕست

# پێشباری وەرگێڕ

١

وەک چۆن بۆ نووسەر ڕاستە، کە هەر کتێبێک سەربردەیەکی بە دواوەیە، بۆ وەرگێڕیش هەمان ڕێسا هەر دروستە.

سەرەتای هەوڵی وەرگێڕانم لە هۆڵەندا بوو، ئەویش سەبارەت بە ئیسرائیل و سەرکردەکانی بوو. ئەوکات چەندین کتێبم، بەتایبەتیش یادەوەری سەرکردەکان بە هۆڵەندی خوێندەوە، بەڵام لەنێو ئەو کتێبانەدا بە ڕێکەوتیش بەسەر کتێبێکدا نەکەوتم، کە «مێناحیم بێگن» نووسیبێتی، یاخود لەبارەی ئەوەوە نووسرابێ.

کاتێ لە ٢٠١٢ش چوومەوە ئینگلستانێ، لە فێیسبووک شتێکم لەسەر وەرگێڕانەکانی تایبەت بە ئیسرائیل بڵاوکردەوە. لە کاردانەوەیدا نامەیەکم بۆ هات، مامۆستایەکی بنجووی زانکۆ ویستی بمدوێنێ و پەیوەندی لەگەڵ گرتم. لە میانەی قسەکانیدا، ئاماژەی بە بایەخی کتێبێک بۆ کردم، کە هی «مێناحێم بێگنە» بە ناوی «شەوە سپییەکان». کابرا ئەوەندە بە تامەزرۆوە باسیکرد، مەیلی پەیداکردنی لە کەڵلەی دام، لەوێ دەستم نەکەوت، زۆریشی نەبرد، گەڕاینەوە کوردستان.

دواتر لەگەڵ هەندێ کتێبی دیکە، بە سوپاسەوە لە ڕێی کاک «یونس حاجی»، کە دەربازبووی شاڵاوی بەدناوی ئەنفالە، دەمێکە لە ئەمریکا دەژی، کتێبەکانی بۆ ناردم، یەکێک لە کتێبەکان، ئەو کتێبە بوو، کە مامۆستا جووەکە بۆی باسکردبووم.

لەو کۆمەڵە کتێبە دوو دانەیان هی «مناحیم بێگن» بوون، بەڵام دیسان وەرگێڕانی «شەوە سپییەکان» دواکەوت، ئەمەشیان ڕێکەوت و بیرۆکەیەک دەوری تێدا بینی.

پار دووبارە «شەوە سپییەکان»یم خوێندەوە، دیسان کەڵکەڵەی وەرگێڕانم بۆ هاتەوە، ئەمجارەیان دوودڵیم لێنەکرد.

## ٢

مێناحیم بێگن لە ١٩١٣ لە برێست لیڤستوک، بیلاڕووسیای ئێستا لەدایکبووە. لە ١٩٣٥ لە زانکۆی «وارشۆ» خوێندنی قانوون تەواوکردووە. هەر لە سییەکانی سەدەی ڕابردووەوە لە بزووتنەوەی زایۆنزمیدا کارابووە. لە ١٩٣٨دا بووەتە سەرۆکی بزووتنەوەی ڕێکخراوی «بیتار» کە جووڵانەوەیەکی لاوانی زایۆنست بووە، ڕێکخراوەکە خۆی تەرخانکردبوو بۆ دروستکردنی دەوڵەتی جوو لە هەردوو دیوەکەی ڕووباری ئوردن. کاتێکیش ئاڵمان لە ١٩٣٩دا «وارشۆ» داگیردەکا، «مێناحیم»یش بۆ «ڤیلنا» ڕادەکا. دایک و باوک و برایەکەی لە ئۆردوگای زۆرەملێی نازییەکان سەردەنێنەوە. لە ١٩٤٠ دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتی «بێگن» دەگرن و بە تۆمەتی چالاکی سیاسیی جوولەکەیەتی ڕەوانەی ئۆردوگای کاری بێگاری (زیندانی) «سیبیریا»ی دەکەن، بەڵام لە ١٩٤١دا لێخۆشبوونێک بۆ هاووڵاتییە پۆلۆنییەکان دەردەچێ و بەر لێبووردنەکە دەکەوێ. لە دوای

ئازادبوونی، لە تاراوگە دەچێتە ڕیزی سوپای پۆلۆنی، ئینجا لە ١٩٤٢ خۆی دەگەیەنێتە فەلەستین. لە فەلەستین دەچێتە ڕیزی ڕێکخراوی میلیشیای «ئیرگون زڤای لیومی» و لە ١٩٤٣ تا ١٩٤٨ دەبێتە سەرکردەی ڕێکخراوەکە. دوای جاڕدانی سەربەخۆیی، ئیرگون خۆی دەکاتە حیزبێکی سیاسی و بە ناوی «هیروت - سەربەستی» و بەم جۆرە دەچێتە نێو پەرلەمان (کنێست)، تا ١٩٦٧ وەک حیزبێکی بەرهەڵستکار (ئۆپۆزسیۆن) دەمێنێتەوە. لە (١٩٦٧ - ١٩٧٠) دەچێتە نێو ڕیزی حکوومەتی یەکێتیی نیشتمانی و دەبێتە وەزیری بێ هەگبە. لە ١٩٧٣ش دەبێتە سەرۆکی حیزبی کوالیسیۆنی لیکود (یەکێتی). لە ١٩٧٧ تا ١٩٨٣ سەروەزیری ئیسرائیل بووە. لە ١٩٧٨ بەیەکەوە لەگەڵ «ئەنوەر سادات»ی سەرۆکی میسر خەڵاتی نۆبل بۆ ئاشتی وەردەگرێ. ئەو ئاشتییەی، کە ڕێککەوتننامەکەی لە نێوان میسر و ئیسرائیل لە ١٩٧٩دا واژۆکرا. لە ١٩٩٢ش لە تەلئەبیب کۆچی دواییکرد.

## ٣

ئەم کتێبەی نووسەر تەرخانە بۆ ئەو ماوەیەی، کە لە بندەستی حوکمی «ستالین» زیندانی بووە. هەڵبەتە من لێرە نامەوێ چەردەیەک لە ناوەڕۆکەکەی دووبارە بکەمەوە. ئەوەی من مەبەستمە هێڵی بەژێردا بێنم ئەوەیە:

شێوازی گێڕانەوەی ئەم بەرسەرهاتانە زۆر دڵگیر و سەرنجڕاکێشە، دەکرێ بۆ ئەوانەی لە قۆناغێکی ژیاندا هاوچارەنووس بن، ژان و ناسۆرەکانی خۆیان وەک ئەو، یان ئەوەی لە کونی زینداندا بینیویانە بخەنەسەر کاغەز. هەڵبەتە ئێمە لە ژمارەی زیندانییانی سیاسیشمان کەم نییە. دەکرا گێڕانەوەی وەها بۆشاییەکی گەورەی ئەدەبی بەرگریمانی پڕکردبایەوە.

ڕاستییەکەی بەنیازبووم، زیاتر لەسەر ئەم بەرایەدا بڕۆم و بەراوردێک لەنێوان حاڵەتی ماخۆی ئەم کتێبە و تێکۆشەرانی خۆشماندا بکەم. ویستم شیعرەکانی شەهید «مەلا عەلی» ئەوانەی لە زیندان و بەر لە سێدارەدانی نووسینی بە نموونە بهێنمەوە. هەروەها لایەنی پرسیار و وەڵامکاری دووتوێی لێکۆڵینەوەکان، ئەوانەی لێکدانەوەی فەلسەفی قانوون ی و کۆمەڵایەتییانە هەڵدەگرن. هەڵوەدابوونی لێکۆڵەر بەوەی لە کاتی پرسیار و وەڵامدا تەنیا و تەنیا هەڵوەدای وشەی "دانیپێدادەنێم" بێ تا هەرچی زووە کۆنووسی لێکۆڵینەوەکەی تەواوبکا، ئەوسا بەهەر شێوازێک بێ دانپێدانان لە بن زمانی "تاوانبار"ەکەی بەردەمی دەربهێنێ. بەڵام ئایا ئەوەی بۆ مەیسەر بوو؟ ئایا تۆمەتبار کەسێکی سادە و ئاسان بوو؟ ئایا حوکمدان بەبێ دادگەیی بە سێ، پێنج، هەشت ساڵ بەسەر بەندکراوەکان و ناردنیان بۆ ئۆردوگا زۆرەملێ بێگارەکانی «سێبریا»، ئەو ئۆردوگایانەی نۆ مانگ لە ساڵێکدا هەر سپیەڕۆژ بووە، بەفر و بەستەڵەک، شەوانی سپی سپی[1] بوون، بۆئەوەی نەگەڕێنەوە چۆن دەرچووە؟ ئایا ڕووە ڕاستییەکەی فەلسەفەی حوکمی یەکێتیی سۆڤیەتی ئەوکات (ستالینزم) چۆن بەسەر بازنەی ژیانی کۆلەمەرگی لە نێو زیندان و دەرەوەی زینداندا ڕەنگیداوەتەوە؟ ئاخۆ ئامرازەکانی زۆرلێکردن هەر ئەشکەنجەدان و ئازاردانی جەستەییە، یان شێوە ئازارێکی دیکەی هەیە؟ ئاخۆ ترس و دابڕان مەبەستی خۆیان دەپێکن و دەتوانن مرۆڤ تێکبشکێنن و بێ هیوای بکەن؟. دواتر ترسام کارەکەم سەرباركردنی وەرگێڕانەکە بێ و بچێتە خانەی درێژدادڕی، بۆیە ئەم کارە بۆ سەلیقە و لێکدانەوەی خوێنەر و بۆ لێکۆڵەرەوەکان لێگەڕام.

[1] لە سەرووی هێڵی پانی 66 ـەوە سێمانگی زستان خۆی هەڵنایەت و لە هاوینیشدا بۆ ماوەی سێ مانگ هەر ڕۆناکە

ڕاستیەکەی گەر هاتباو وەرگێڕ وەک نووسەر بۆی هەبا، کتێبەکە پێشکەشی کەسانێک بکا، ئەوکات دەمنووسی:

ئەم بەرهەمەم پێشکەشبێ بە گیانی پاکی دایکم، ئەو کەسەی لەگەڵ باوکم لەسەر ڕۆڵەکانی ئازار نەما نەیکێشێ، خەفەت نەما نەیخوا، لەبەر بێدەسەلاتیش هەر خۆخواردنەوەی پێمایەوە، تا خەم وەک مۆرانە هەناوی خوارد و هەتیوی کردین. ئاخر چی هەیە لە گەف و هەڕەشە، گرتن، دەرکردن، سووکایەتیپێکردن، زیندانیکردنی جگەرگۆشەیەک و لێدان لەوی دیکە و دەربەدەرکردنی سێهەمیان گەورەتربێ؟ لەکاتێکدا تۆش هیچت پێنەکرێ. لە هەمووشی پۆلکتر لە سەردەمی حوکمی بەعسی و خۆماڵیش بە هەمان ڕبە بێ!

دوای ئەو پێشکەشی «کنێر جەمیل»ی هاوسەری خۆشەویستم دەکرد، هێمای بەرخودان لە زیندان، هێمای ڕووبەڕووی حوکمی مەرگ و دواتر زیندانی هەتا هەتایە. هێمای سەردەمێک کە ئازایەتی و دڵسۆزی واتاداربوو.

بەڵێ گەر بۆم هەبووایە، ئەوا کتێبەکەم پێشکەشی "ڕەقیب"ی کاکم و هاوزیندانییەکانی دەکرد؛ هەریەک لە «مارف حاجی جێژنە، سوڵتان حاجی ئەحمەد شلانی جوانەمەرگ، دکتۆر مەلا ئەحمەد ڕوستایی، مستەفا عمر هەمزە، نادر ڕوستی، پیران ڕەسول، زرار ئیبراهیم حوسێن، ڕەمەزان نوری،، کەریم ڕەمەزان، دڵشاد یوسف ڕەمەزان، عەبدوللا عەبدولواحید، قادر مەلا ڕەسول، ئەحمد عەبدولا ئەحمەد، حاجی ئەحمەد تاهیر، عەبدولموتەلیب مەلا ئەحمەد، ئازاد غەفور میر، مەرعان جەمیل خدر، حەیدەر محەمەد حوسێن، جومعە نەبی ئەحمەد، عەبدوللا سەید قادر، سەید یوسف سەید کەمال، محەمەد ئەحمەد ڕەزگەیی، مستەفا ڕەسول باپیر، فارس خدر جۆلەمێرگی، عەبدولا

ئەحمەد ڕۆستەم، سەلمان عەباس، فەقێ عەولا، محەمەد حاجی سۆفی نەبی، سەید زاهیر ڕواندزی، عوسمان ئەحمەد مستەفا ...» ئەوانەی ١٣ و ١٤ی /١٢/ ١٩٨٩ لە حەوزی سۆران گیران و بە ڕووداوی گرتنی ٣٢ تێکۆشەرەکە ناسرا و ناوچەکەی هەژاند ...

بەڵێ پێشکەشی هەموو زیندانییە سیاسییەکانم دەکرد ئەوانەی بیروباوەڕ و ویژدان مایەی تاوانبارکردنیان بوو.

٥

لە کۆتاییشدا ناکرێ هەرهیچ نەبێ، بە سوپاس و پێزانینیش بێ، چاکەی هاوڕێکانم نەدەمەوە، ئەوانەی لەبەر من و لەبەر خاتری وشەی کوردی و لە خۆشەویستیی کتێب، خۆبەخشانە لەگەڵم ماندووبوون، هەڵەی تایپ و ڕێنووس و زمان و ڕێزمانیان بۆ ڕاستکردوومەتەوە. ناکرێ چاوتیژی و وردبینی هەر یەک لە «شێخ شەماڵ گەزنەیی»، «ئەژین محەمەد»، «ڕۆژان محەمەد»، «بارام سوبحی» و «لوقمان محمد شلانی» و «حەیدەری حاجی خدر»یش نادیدە بگیرێ.

ش.ح.خ

هەولێر، ١٧ - ٩ - ٢٠١٨

١

# گرتنەکە

"لەسەر داوانامەیەکی خۆت، بانگهێشت کراوی بۆ ئامادەبوون لە شارەوانی، سەر لە بەیانی لە نێوان سەعات ٩ تا ١١، سەر لە ژووری ژمارە٢٣ بدە."

لە ڕۆژی یەکەمی ڕەزبەر (ئەیلوول)ی ١٩٤٠دا ئەم داوەتنامە تایبەتییەی شارەوانی «ڤیلنا»م بە دەستگەیشت، ئەمەش هەر چەند مانگێکی کەم لە دوای بەرفرەوانکردنی دەسەڵاتی سەربازی و سیاسیی یەکێتیی سۆڤیەتەوە بوو بەسەر لیتوانیا و وڵاتە دراوسێکانی وەک لاتڤیا و ئیستۆنیا. ئەم سێ وڵاتەی «بەلتیک» لە پەیماننامەی نێوان ئاڵمان - ڕووسیا لە ١٩٣٩دا، کە لە نێوان ڕیبنترۆپ و مۆلۆتۆڤدا مۆرکرا، بە ناوچەی بن هەژموونی یەکێتیی سۆڤیەت دانران، بەڵام ڕووسیا دڵی بەوە داکەوت، لە دژی "قەولوبڕی[2] هەندێ لە حکوومەتەکانی تالینا، ڕیگا و کۆڤنۆ بە "خواستنەوەی" بنکە سەربازییەکان قایلبێ. ئەم حکوومەتانەش هەرجار پتر دژی کۆمۆنیستی دەوەستانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕووسیا لە ماوەی گواستنەوەدا باری چاودێریی خۆی زۆر بە وردی ڕاییکرد. وێڕای

2- قەولوبڕ: پەیماننبەستن، ڕێککەوتن.

ئەمەش، لیتوانیا دیارییەکی نیشتمانیی بەخشندەییانەی لە کرێملنەوە پێگەیشت.

بیست ساڵ دەبوو لیتوانییەکان چاویان لەسەر «ڤیلنا»، واتە لەسەر شارە دێرینەکەی «گێدیمین» هەڵنەگرتبوو، کە بە «ڤیلنوس» ناویاندەبرد. ڤیلنا – ڤیلنوس زێدی «گائۆن» بوو، جووەکان بە ئۆرشەلیمی لیتوانیایان دادەنا و لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییشەوە پۆلۆنیا داگیریکرد. ئەمە بووە هۆی ئەوەی، لیتوانیای بچکۆلە پەیوەندیی دیپلۆماتی و کەناڵەکانی دیکەی لەگەڵ دراوسێ زلەکەدا ببڕێ. «کۆڤنۆش» بە پایتەختی کاتی ڕاگەیەنرا، ئەو بڕوایەش لە ئارادابوو، جارێکی دیکە «ڤیلنا» بگەڕێتەوە و ببێتەوە پایتەختی خۆجێیی لیتوانییەکان، هەر ئەو بڕوایەش لە نێو گەنجان جۆشی سەند و لە کتێبەکانی قوتابخانەشدا بە ڕازاندنەوەی وێنەکانی لە وێستگەکانی قیتار و باڵەخانە گشتییەکاندا دەربڕا.

ئەرێ کێ لە وەرچەرخانی مێژوو دەگا؟ مەبەستی ئەو گەلە بچووکە لە لایەن هەر چاودێرێکەوە (سا ئەوەی لەگەڵی تەبا بێ یان دژ) بە خەیاڵپڵاوی لە قەڵەم دەدرا، کەچی هەر بەو شێوازە "خەیاڵپڵاوییە"ش خەونەکەیان وەدیهات. ئاخر پۆلۆنیا هەرزوو کەوتە بن زنجیری تانکەکانی ئاڵمان، ڕووسیای کۆمۆنیستیش پەیماننامەیەکی دۆستایەتی لەگەڵ ئاڵمانیای نازی مۆرکرد. بەگوێرەی ڕێککەوتنەکە، پۆلۆنیا بۆ چوارەم جار لە لایەن دراوسێ زلهێزەکانییەوە دابەشکرایەوە. «ڤیلنا»ش بەر ڕووسیا کەوت. لیتوانیاش وەک دەوڵەتێک کە لەگەڵ مۆسکۆ لەجەنگدابوو، ژیایەوە؛ ئەم جارەیان خەونەکەی بە لەخۆگرتنەوەی شارەکە لەسەر دەستی مۆسکۆ هاتەدی.

لەگەڵ ئەوەشدا سوودمەندانی دیارییەکە بەتەواوی لە ڕاستگۆیەتی دەهندەکانیان[3] دڵنیا نەبوون. لە زستانی ١٩٤٠دا و لە گەرمەی ئاهەنگێڕان بە خۆشیی گەڕانەوەی «ڤیلنوس» بۆ باوەشی وڵاتەکەیان، لیتوانییەکان بە تەوسەوە دەیانگوت: ڤیلنا هی ئێمەیە، بەڵام لیتوانیا سەربە ڕووسیایە. زستانی ئەو ساڵە، زستانێکی تووش بوو، زستانێکی پڕ لە چاوەڕوانی و مەراق، هێشتا لیتوانییەکان لەبن ئاوەزی دیپلۆماتییانەی پیرەمێردەکەیان، سەرۆک «سمانتا» و ڕامانی پۆلیسەکانی (کە جووەکان پێیان دەگوتن هەشتا مەتری)، بەژندرێژ لە بن بەرگی یەکپۆشی، کە هەنووکە لە «ڤیلنا» و هەروەها لە «کۆڤنۆش» بەڵگەی دڵە گەرمەکانیانن. هەر هەمان زستان - ئەمجارەیان لە غەیرە لیتوانییەکان - وشەی بەجۆش و پلەی هەرە باڵای ئاوەزمان لە پیرەمێردێکی دیکە بیست. ئەفسەرە سیاسییەکانی سوپای سوور، ئەوانەی لە بنکەکانی سۆڤیەتدا ڕاهاتبوون بە خۆشییەوە ئەو بانگهێشتنامەی لە ماڵە تایبەتییەکانەوە بۆیاندەهات، قبووڵبکەن، سیاسەتی ڕووسی بە تێروتەسەلی باسبکەن. لە یەکێ لەو بۆنانەدا، یەکێکیان نەخشەیەکی دووسێسووچی بۆ میوانە ئامادەبووەکان کێشا، لێدوانە ستراتیژییەکەی بەم جۆرە پێڕاگەیاندن.







3- دەهندە: بەخشندە.

"خـۆ دەبینـی،" ئەفسـەرە ڕووسـەکە گـوتی؛ "ئەورووپـای ئەمـڕۆ لەو سێگۆشـەیە دەچـێ. سـێ چەقە هێـزی هەیە، کە لە گۆشـەکانی سێگۆشەکەدا دیارن: بەرلین، لەندەن، مۆسکۆ. ئێستاش «چەمبرلین» و بـازنەی دەسـەڵاتی ئینگلسـتان چییـان دەوێ؟ ئەوان دەیـانەوێ بارودۆخەکە بە شێوەی سێگۆشـەی یەکەم لێبکەن: بەرلـین لە بەرانبەر پـێگەی مۆسـکۆ دابنـێن و لەنـدەنیش لە سـەری سـەرەوە بـێ. بەرلـین لەگەڵ مۆسکۆ بەریەکبکەون و لە کێشـەیەکی دووروودرێژی خوێناویـدا بمێننەوە تا هێزەکانی هەردوولایان، هی ڕووسـیا و ئاڵمـان هـیلاک ببن. ئەوسا، «چەمبەرلین» حیساب بۆ ئەوە دەکا، هیوای وایە لەندەنیش لە دوندەکە بێتەخوار و سیستەم بۆ ئەورووپا بگەڕێنێتەوە.

"بەڵام،" کـابرای ڕووس لەسـەر گوتـارەکەی خـۆی بەردەوام بـوو، "لە مۆسـکۆ تەلارێکـی دێـرین هەیە، «کـرێملن»ی نـاوە، لە یەکـێ لە ژوورەکانیدا کەسێکی وردبین، هۆشمەندترین کەسی دنیا و پیتۆڵترین ئادەمیزاد دانیشتووە، ئەویش «یوسف ڤیساریۆنۆڤیج ستالینە»، ئەو لە شـەو و ڕۆژێکـدا تـوانی هاوکێشـەکە بە ڕووی چەمبەرلینـدا هەڵبگێـڕێتەوە. هەروەک دەبیـنن، ڕەوشـی ئەمـڕۆی ئەورووپـا بە سێگۆشـەی دووەم لێکـدەدرێتەوە. «بەرلـین» لە بەرانـبەر «لەنـدەن» وەسـتاوەتەوە، لە کاتێکـدا «مۆسـکۆ» لـوتکەی سێگۆشـەکەی گرتـووە. شەڕیش کە بە هۆی پۆلۆنیاوە هەڵگیرساوە، لەوانەیە بۆ چەندین ساڵ درێـژە بکێشـێ. ئاڵمـان زۆر بەهێـزە، بەڵام لە هەمـان کاتیشـدا هێـزی بەیەکەوە گرێـدراوی ئینگلسـتان و فەرەنسـەش هەوەنـتە نیـیە نـابێ بە کەم بیگـرین. کە ڕۆژی خۆشـی هـات و هەردوو لا لە هێـزی خۆیـان داشۆران، ئەوسا ئێمە دێین و سیستەم لە ئەورووپا دادەمەزرێنینەوە ..."

خـۆی ئەمە هەر گەلاڵەکردنێـک بـوو. لە بەهـاری ١٩٤٠یشـدا ئیشـەکە وێـدەچوو ئیشـەکە ڕاسـت بـڕوا. بەڵام دیسـان پیـاوە ئازادەکـان –

بەتایبەتیش بیرئازادەکان - دەرکیان بەوە کرد، کە چەند گەمژەییە وا دابندرێ، دەسەڵاتدارە مەزنەکان، ئەوانەی بەو هەموو زانیارییە نهێنییە تەیارکراون، هەمیشە ئەوە بزانن کە چی دەکەن. لە هاوین و پایزی ١٩٣٩دا، ستالین کارتی فشاری لەسەر «چەمبەرلین» زیادکرد، هەروەک ئەفسەرە سۆڤیەتییەکە، کە لە ئاهەنگی پایتەختی لیتوانیا فێرکرابوو. لەماوەی تەنیا ساڵێکدا، خودی کارتەکانی "هۆشمەندترین پیاوی سەرزەوی" هەڵگێڕدرانەوە.

بەرەی ئەنگلۆ - فەرەنسی، کە لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە پێکهێنرابوو، لە ماوەی چەند هەفتەیەکی کەمی سەرەتای جەنگی دووەمی جیهانی تێکشکا. تانکەکانی ئاڵمان "ئۆپەراسیۆنی ورچە سوورەکە" (باربارۆسا)یان بە خێراییەکی وا کشانەوە، لە یەک کاتدا لەندەن و مۆسکۆی هەردوو سەرسامکردن، هەروەها سەرانی سوپای ڕووسی لووتوبزووت زانیان کاتێکی وایان بەدەستەوە نەماوە تا چاو لە داهێزرانی دوژمنەکانی خۆیان بکەن. ئەوان تا ڕاددەیەک دڵنیا بوون، ماوەیەکی کورتی خۆئامادەکردنیان بۆ جەنگێکی کاولکارانە دژی یەکێتیی سۆڤیەت لەپێشە! ئەمە و کەوتنی پاریس، کەوتنی حکوومەتەکانی «تالین»، «ڕیگا» و «کۆڤنۆ» بەدوای خۆیدا هێنا. ئەو هۆکارە پەیوەندییەی هەردوو لێکەوتەکان، لەسەر بەش و هێزە جیاوازەکانی ئەورووپا کاریگەری خۆی دانا. لە کاتێدا زرێپۆشەکانی ئاڵمان بەخێراییەوە بەنێو فەرەنسادا دەچوونە پێش، تانکەکانی ڕووسیاش وڵاتەکانی بەلتیکیان دەکێڵا. هەر لەو شوێنانەی کە ئەو حکوومەتانە "پێگەی سەربازییان" لێخواستبوونەوە، لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا حکوومەتی کۆمۆنیستی سەریهەڵدا و پەسنی "ڕزگاربوونیان" دەدا، پەسنێک وەنەبی لە سۆنگەی شۆڕشەوە هاتبێتەئارا، بەڵکو بە سەرەنێزەی سوپای سۆڤیەتیەوە بوو؛ ئەمەش سەرمەشقەنمونەیەک بوو، لە وڵاتەکانی دیکەشدا قەومابوو. ئیدی ئەوە نەما بڵێن، پێگەی سەربازی سوپای سۆڤیەتی لە وڵاتەکانی بەلتیکدا هەیە: وڵاتەکانی

بەلتیک خۆیان بوونە پێگەی یەکێتیی سۆڤیەت. کەواتە بەشی دووەمی تێبینییە بە تەوسەکەی، کە لە نێو لیتوانییەکاندا لە ماوەی لکاندنەوەی «ڤیلنا» ڕوویدا، ڕاست دەرچوو. هەر بەڕاستی «ڤیلنا» درایەوە بە لیتوانیا، بەڵام خۆ هەموو لیتوانیاش بووبوو بەماڵی ڕووسیا.

ڕاستەوخۆش دوای ڕوودانی ئەمە، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی وڵاتەکە بە شێوەی جیاجیا، ئەو جۆرە "بانگهێشتنامانەیان" پێگەیشت.

منیش ... شارەوانیی «ڤیلنا» بانگهێشتی بۆناردم.

پێشتر من هیچ داواکاریم نەدابووە شارەوانیی «ڤیلنا». خۆم لە گوندێکی بچکۆلانەدا دەژیام، هەرچەند کیلۆمەترێک لە شارەکەوە دووربوو، هیچ سەروکاریشم لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانییەکەدا نەبوو. ئەوێ دەمێ بارودۆخەکە هەر ئەوەبوو کە هەبوو، ئەوەندەش سەخت نەبوو، پەی بەوە ببرێ، کە شتەکە لە خۆڕایی نییە و نیازێک لە پشت پەردەی داوەتنامەکەوە هەیە.

لە سەرێکی دیکەشەوە، مرۆ هیچ گومانی نەبوو سەری لەو هەڵەوپەڵە سەیر و بچووکانە سووڕبمێنێ، هاوکات لەو شتە بەهەندهەڵگیراوەی دەزگەی هەواڵگریی سۆڤیەت کە پرسەکەیان وا لێکردبوو، یاخود بڵێین شتەکەیان وا دانابوو، کە ئەو بانگهێشتنە ساویلکەییە بنێرن. پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەت، دەزگەیەکی باڵادەستە، ئەزموونێکی باڵای هەیە، دەستی بە هەموو کونوقوژبنێکی دنیادا ڕادەگەیشت. نەوەک هەر دۆستەکانی یەکێتیی سۆڤیەت، بەڵکو دوژمنەکانیشی، بڕوایان وابوو، پۆلیسی نهێنیی ڕووسەکان لە هەموو هاوتاکانیان باڵادەستر و زیرەکترن. سەرنجێک هەبوو بەوەی، وەزارەتی ناوەخۆی مۆسکۆ، ئەمرۆ هەموو ئەفسانە و تەلیسمەکانی دەزگەی هەواڵگریی بەریتانی بە میرات بۆمابێتەوە. بەڵام خۆ ئەوە تەنها ئەفسانەیەک بوو. چارەنووسی من وابوو لە هەردوو دەزگە نهێنییەکە نزیکبکەومەوە، شایەتی ئەوەش

دەدەم کە لە نێو هەردووکیانـدا بـایی خۆیـان مێشـک گەمژەیـان کەم نەبوون. لە بەهێزیی ئەزمـوونی خـۆمەوە، ئامۆژگاریم ئەوەیە، بڕوا بە تەلیسمی زیرەکایەتیی دەزگەی هەواڵگریی هیچ کامێکیان نەکەن، نە هی ڕووسیا، نە هی بەریتانیا یان هەر دەزگەیەکی دیکە. ڕێسا ئاساییەکەی فێڵبازی و گەوجەتی، یان بەهرە و گەلحۆیی، وەکو یەک بە سەریاندا جێبەجێدەبێ. ئەوان ئەوە نین کە نەپەنی[4] بن.

N.K.V.D [5] ئاسـایش (لەمەولا ئەو دەزگەیە، کە لە پەراوێـز ڕوونکراوەتەوە زۆر ناوی دێ، بۆیە منیش لەمەوپاش هەر بە ئاسایش ئامـاژەی پێدەدەم) بڕیـاری دابـوو، بمگـرێ؛ بەڵام لەبەر هەر هۆکارێک بـێ، یـا ئەوانـی دیـکە هەوڵیانـدابوو خۆیـان لە کـارێکی وا ڕاشـەکاوانە دووربـخەنەوە، بەڵکـو بە هـۆی بانگهێشـتنامەکە بمـخەنە داوەکەوە. تـۆ بڵێـی ئەوەی ئەوان کردیـان کردەیەکـی شـازەراییانە بـووبێ؟ ئەوان فەرمانیـان بە شـارەوانی کردبـوو، کە بانگهێشـتنامەیەکم بـۆ بنێـرن، پەیوەنـدیی بە داوایەکـی مـنەوە هەبـێ، بێـئەوەی سـەرەتا خۆیـان لەو کێشمەکێشمەیە بدەن، ئاخۆ من داوایەکی وام بۆ شـارەوانی چ لە کۆن و چ لە ئێستامدا بەرزکردبێتەوە یان نا.

کەچی لەجیاتی ئەوەی من بکەومە داوەکەوە، ئاگادارکرامەوە. بڕیارمـدا بەپێل بانگهێشـتەکەوە نەچـم، بە هـیچ شـێوەیەک تخـوونی ژووری ٢٣ی شـارەوانییەکە نەکەوم، ئـاخر لە لێکـۆڵینەوەی ناڕاسـتەوخۆدا زانـیم، باڵەخانەی شارەوانی بۆتە نووسینگەی ئاسایش. لە خوێندنەوەی واتای بـن دێڕەکـانی بانگهێشـتنامەکە و فیـتەی حەرامـزادە گەیشـتم، دەکـرا

---

[4] نەپەنی: نەپەنە، نادیار

[5] – The People's Commissariat for Internal Affairs (Народный комиссариат внутренних дел, Narodnyi Komissariat Vnutrennikh Del) دەق ناوەکەی کۆمسیاری خەڵک بۆ کاروباری ناوەخۆ، ئاژانسێکی قانوونیی جێبەجێکاری یەکێتیی سۆڤیەت بوو، هەموو خواستەکانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە سەرتاسەری قەڵەمڕەوی یەکێتیی سۆڤییەتدا ڕایی دەکرد.

بڕیاری خۆشاردنەوە یان هەوڵی ڕاکردن بدەم، بەڵام دڵنیاش نەبووم لە تۆڕی ئەوان دەردەچم، لە سەرێکی دیکەوە، گومان لەوەدا نەبوو، بتوانم لە ماڵی دۆست و برادەران خۆم بشارمەوە، بەتایبەتیش لە شارێکی دیکە و بۆ ماوەیەکی باشیش دەمتوانی وابکەم. بەڵام بڕیارم دا نە توخنی باڵەخانەی شارەوانی بکەوم و نە ڕابکەم و نەخۆشم بشارمەوە. هۆکاری بەشی یەکەمی بڕیارەکەشم ئاسان بوو. خۆ ئەگەر حکوومەتی سۆڤیەت، وەک لە دڵی خۆمدا دەمگوت؛ بیەوێ بمگرێ، دەی با ئاژانەکانیان دەربکەون بێنە بەردەرکەی ماڵم و بمگرن. ئاخر خۆ ئەمە ئیش و کاریان بوو. باشە بۆچی خۆم بشارمەوە وەک ئەوەی زەوی قووتی دابم؟ هۆکاری بەشی دووەمی بڕیارەکەشم، ئاسان نەبوو، بەڵام نامەوێ لەسەری بڕۆم.

لە کۆتاییدا ئاسایش لەوەدا سەرکەوت کە بمگرێ، هەرچەندە گرتنەکەش بەگوێرەی نەخشە نەبوو.

وەهام دانا کە بەرپرسی بەشی تەکنیکیی[6] شارەوانییەکە چەندین ڕۆژ بەتاسەوە چاوەڕوانی من بێ، بەڵام دەرکەوت سەرانی ئەو لە باڵەخانەیەکی دیکە بوون، هیچ مەیلیشیان بۆ داواکراوەکە نیشاننەدا، یان هەر خۆشیان بە داوانامەکە تێکنەدا و نەشخرایە بەردەمیان. منیش لە لای خۆمەوە گریمانەی وام کرد، ئەو کەسانەی لەنێو ئەو دەزگە دەستڕۆیشتووەدا، ئەوانەی بە گرتنی منەوە پەیوەست بوون، بۆ یەکدی بە زەردەخەنەوە گوتیان: "خۆت تێک مەدە. ئەو هەر دەردەکەوێ!" لە کاتێک نەکرا وەک بانگهێشتکراوێک بچمە بەردەمیان، وەک ئەوەی داوایان کردبووم، ئەوان - یان نوێنەرەکانیان - لە شوێنی

[6]- بەڕای من لە دەستەواژەیەکی وەهادا، زۆر جار هەڵەیەکی زەق و باو هەیە، کە ڕاستەوخۆ ئەو دەستەواژەیە بکرێتە عەرەبی دەبێتە «فني» ئیدی لای ئێمەش بە هەڵە دەکرێتە هونەری، هەرچی لە کوردیدا هونەری ڕێک واتای لایەنە تەکنیکییەکە بە دەستەوە نادا. بۆیە هەر وشەی تەکنیکیم بەکار هێنا.

گرتنەکەمدا بەبێ ئەوەی بانگهێشتیشکرابن، پەیدابوون. بەڵام دیسان نەوەک بۆ ئەوەی بمگرن، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەی لەژێر چاودێری خۆیاندا بمهێڵنەوە.

ڕۆژێکی خۆش، تێبینیمان کرد، سێ کەس، یەکێکیان کچێک بوو، سەیری ماڵە بچکۆلەکەی ئێمەیان دەکرد. هەندێک جار هەر لەوێ دەوەستان و تەماشایاندەکرد. هەندێک جاریش لەو نێوەدا قەدەمیان لێدەدا و دەسووڕانەوە، ئەوان هەرگیز چاویان لەسەر شوێنەکە هەڵنەدەبڕی. نمایشێکی وەهایان نیشاندا، کە وەک ئەزموونداریک نەدەجووڵانەوە. بە پێچەوانەوە، هەر کاتێک لەوێ پەیدادەبوون، زووش ونـدەبوون، ئیدی ئەرکەکەیان زۆر دیار و پێشچاو بوو. ئێمەش بڕیاماندا ئەوان لەوێ دەربکەین، ئەوانیش وەها لەوێ نەوەستا بوون، کە ئێمە بە باشی تاقیبکەنەوە. منیش داوام لە ژنەکەم کرد، بە کورتە سەفەرێک بە قیتار لەگەڵم بێتە ناو شار. من وەهام بە ژنەکەم گوت: "ئەگەر ئەو لیکۆڵەرەوانە لە ڕێگەی چوونە ناو شار، یان لەنێو شارەکەدا منیان گرت، ئەوا کارێک دەکەم خواحافیزییت لێبکەم، بەڵام خۆ ئەگەر ئەرکەکەیان هەر وەستاندنی من بێ، هەر وەک ئەوە دەبێ، کە ئێمە بچین و خۆیان و کارەکەیان بناسین." ئێمە لە ماڵ هاتینە دەر. هەر وەک پێشتر پرۆسەکە ڕەنگرێژکرابێ. ئاسایشەکان بە دوامانەوە بوون. "چاودێرەکان" ئەوانەی لەوێ بوون، لە دوورەوە دیار بوون؛ لە پشتی ئەوانیشەوە برادەرەکانمان هاتن، کە تەنیا لە ئێمە دیاربوون. ئێمەش خۆمان فڕێدایە نێو فارگۆنی بەرایی قیتارەکە. بەم جۆرە من ژنەکەم لە کابینەیەک و سێبەرەکانیشمان لە کابینەی دواتر، برادەرەکانیش ئەوانەی سایەی سێبەرەکانی ئێمەیان دەکرد، لە کابینەی سێیەم سواربوون.

کاتێکیش قیتارەکەمان گەیشتە شاری «ڤیلنا»، هەمووان هەستمان بە دەستەی چاودێرییەکە کرد، کە لە دەروازەی وێستگەی قیتارەکە هەر

چاویـان بە ئاراسـتەی ئـێمە دەگێـڕا. کـارەکە ئەوەنـدە زەق بـوو، لەو بڕوایەدا بووین، هەربینا چ لێرە یان لەوێ بێن و بمـانگرن. کەچـی هەر بە دوامانەوە بوون، وێڕای ئەمەش، ئێمە لەسـەر ڕۆیشـتنەکەی خۆمـان تـا نـاو شـار بەردەوامبـووین، هەمیشـەش بە سـێ دەسـتە دەڕۆیشـتین. بەرەبەرەی ئەنگـۆرە[7] بە هەمـان شـێوەی دەرچوونمـان بەرەو مـاڵ بووینەوە.

بۆ مـاوەی دە ڕۆژی ڕەبەق ڕاوەدوونـانەکە بەم جۆرە درێـژەی کێشـا. لە ڕاسـتیدا پیاوێـک، کە بەردەوام ڕاونەرانـی ببینـێ، گـوێی لە تەپەی پێیەکانیـان بـێ، بە تەواویـش لە نیازیـان ئاگـادار بـێ، زۆر بە ئەسـتەم هەست بە شادمانی دەکا، لەگەڵ ئەوەشـدا لە بـارودۆخێکی دیاریکراودا مێشکی خۆشـی بـۆ مرازێکـی خـۆی یەکلاکردبێتەوە، بەوەی بیگەیەنێتە سـەر، ئەوا نـابێ بڕووخـێ. بەڵام تـۆ بڵێـی ڕاوەدوونەران دڵشـاد بـن؟ کارێک هەبێ لە ڕاوەدوونـانی مـرۆ قێزەونتـر بـێ؟ ڕۆژێکیـان سـەیری بیچمـی ڕاوەدوونەرەکـانم کـرد، هەر تیـرۆر لە ڕووخسـاریان دەبـاری. ئەو ڕۆژە کەتنـێکم پێکـردن. ئەمەشـم هەر بـۆ خۆشـی کـرد، چـونکە هەمیشـە پێشـتر دەمگـوت، دەبـێ جۆرێـک لە میزاجخۆشـی لە هەمـوو بارودۆخێکدا بهێڵیتەوە؛ کـاتێکیش شـتەکە بەسـەرچوو، بۆ ئاژانەکـان بە داخ بـووم، بە داخ بـووم بـۆ ئەوانەی بە جـواب بـوون، بە دەسـت و بە سـەر منیـان بەرەو شـوێنێک دەبـرد، وەک ڕاوکەر چـۆن نێچیـرەکەی بەرەو ئەو ئاقـارە دەبـا، کە ڕووبەڕووی ببێـتەوە، بەرلەوەی بیکـوژێ. مـــن هەمیشـــە لەوە پەشـــیمانم، کە شـــۆخییم لەگەڵ ئەوان کـــرد و پێمڕابـواردن؛ ئەوان بە جۆرێـک لە قـووڵایی کارەکەیـان ڕۆچووبـوون، ئەوەندەش ترسا بوون، زۆریش ناکەسبەچە بوون. هەوڵمدا جارێکیدی پێیانڕانەبوێرمەوە.

---

[7]– ئەنگۆرە: ئێوارەیەکی درەنگ، بۆ لێڵی کۆتایی ئێوارە.

بەم جۆرە تا دەهات ڕۆژە چارەنووسازەکە نزیکتر دەبووەوە. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ڕۆژەش، هیچ گۆڕانکارییەک لە ماڵە بچووکەکەماندا ڕووی نەدا. ئێمە لەسەر خووەکەی خۆمان بەردەوامبووین، بەیانیان زوو لە خەوهەڵبستین، بۆ دارکۆکردنەوە بچینە لێرەکە و بەو پایزە ڕووزەردە دار کۆبکەینەوە و کاروبارەکانی دیکەی ماڵەکەمان ڕابپەڕێنین. ئێمە لە نێو ماڵەکەماندا، دەمانخوێندەوە، مشتومڕمان لەگەڵ یەکدا دەکرد، بە خۆمان پێدەکەنین، یاری شەترەنجمان دەکرد و سەیری چاودێرەکانی خۆشمان دەکرد. "ئەرێ ئەوان هێشتا هەر لەوێ ماون؟" هەموو بەیانییەک لە یەکدیمان دەپرسی. هەموو بەیانییێکیش برادەرەکەم ڕاهاتبوو لێیدەپرسیم: "ئەرێ تۆ هەر لێرە ماوی؟" ئێمەش چاوەڕێمان دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، شتێک لە ئارادا هەبوو، بۆشمان پێناسە نەدەکرا.

ئەو پایزە ئێمە لە ژیانێکی مۆتەکەئاسادا دەژیاین. پاریس کەوت. فەرەنسا خۆی بەدەستەوە دا. سوپای بەریتانیاش دڵنەوایی خۆی لە کشانەوە سەرکەوتووەکەیدا دەبینییەوە. بە ملیۆنان جوو کەوتنە بن دەستی «هیتلەر» و «هیملەر». بەختی شوومیان خەتم کرا. خۆی هەر کەوتنی پاریس بوو، ناڕاستەوخۆ بڕیاری لەسەر چارەنووسی ئەوان دا. بە ملیۆن لە جووەکانی دیکە، کە زۆرینەیان خەونیان بە زایۆنەوە دەبینی، کەوتبوونە داوی ئەودیوی سنوورەکانی ڕژێمی ڕووسیا، کە وایان دەبینی ئامانجی زایۆنیزم "بە لاڕێدابردنی پرسی نەتەوەییە" لەنێو جووەکاندا. ڕژێمی سۆڤیەت هەمیشە پێویستی بەو بەلاڕێدابردنە هەبوو، بۆ ئەوەی بسەلمێنێ وەک دوژمنەکانی (ئەوانەی دەهۆڵی ڕق و قینەیان دژی گەلی جوو دەکوتا و گوڕدەمی[8] خەڵکیشیان بۆ جۆش دەدا) مەبەستیان بوو لایەنگری جووەکان نییە. ڕووسیا پێویستی بەوە هەبوو بیسەلمێنێ، کە شمشێری دادپەروەریی شۆڕشگێرانە هەر وەک

[8]- گوڕدەم: لافاوی خەڵک، ئاپۆرایی خەڵک.

چـۆن لە ســەری ڕووســی، ئـۆکراینی، پۆلـۆنی و ئۆزبەکییەکـان درا، ئاوەهـاش لەســەری جووەکـان بـدرێ. هەمـوو خەڵکـی لە بەرانـبەر ئاســـایش یەکســـانن ... هەڵـــبەتە جیـــاوازیش لە نێـــوان جـــووە چەوسێنراوەکان ئەوەیە کە ئەوان جوون، چەوساندنەوەی جوو لە نێو باقی "دوژمنەکانی شۆڕش" ڕەوشتێکی زۆر گرنگ سایکۆلۆژی بوو؛ بەڵام ڕاستییەکە لەو کاتەدا ئەوە بوو، کە جیاوازییەکە تەنیا و تەنیا سایکۆلۆجی بوو. جوویێکی لیتوانی چین مامناوەندی زیرەک، لە کاتی خۆی سەرنجی ئەوەی بۆ دەربڕیم: "هیتلەر یان ستالین! هیچ کامێکیان بۆ ئێمە باش نین، بەڵام جیاوازیشیان هەیە. ستالین پاڵتۆ خورییەکەم لەبەر دادەکەنێ، کەچی هیتلەر گیانم. هەر بۆیە من بەختم هەیە لێرە دەژیـــم، نەوەک لەوێ." لەگەڵ ئەوەشـــدا زۆری نەخایانـــد، هەر ئەو جوولەکەیە، دڵنەوایی خۆی بەو شێوە سەرەتا و کورتە دەدایەوە. ئیدی لەم دۆزەدا هەروەک زۆر لە دۆزەکانی دیکەدا، گیان لەبەر ئەو پاڵتۆ خورییەکەش داکەندرا.

کێفەڕات[9] بە دوای کێفەڕاتدا دەهات. لەنێو ئەو هەموو کێفەڕاتانەشدا، بە هەردوو بـاری تـایبەتی و گشـتییدا، کە بە بەرفرەوانـی بەرۆکـی مرۆڤایەتی گرتەوە، مردنـی «زییڤ ژابۆتنسکی[10]» بوو. من لەوە دڵنیـام، ئەگەر هەمـوو لاپەڕەکـانیش پڕبکەمەوە، هێشـتا نـاتوانم ئەوە ڕوون بکەمەوە، ئاخۆ مەرگی «ڕۆش بیتار[11]» چی بۆ من دەگەیاند. غەوارەیەک لێـێ تێناگـا. وشـەی "بیـانی" لەو بەردەقە تـایبەتەدا نەوەک هەر غەیـرە جـوو، بەڵکـو کەسـانێکیش لە نێـو خەڵکـی خۆشـمان

---

[9]– کێفەڕات: کارەسات

[10]– ڤلادیمیر ژابۆتنسکی (١٨٨٠–١٩٤٠) دەوڵەتمەدار، دواندەر، شاعیر، نووسەر، سەرباز – لە دوای هێرتزلدا مەزنترین سەرکردەی سیاسیی جوو بوو لە چەرخی نوێدا. (پەراوێزی نووسەر).

[11]– ئەوە نازناوێکی ڤلادیمیر ژابۆتنسکی بوو وەک سەرۆکی «بیتار»، ڕێکخراوی گەنجە نەتەوەخوازەکانی جوو، کە هەر بە خۆیشی دایمەزراندبوو. لە دەرسەکانی ژابۆتنسکی و بیتار، ڕێکخراوی «ئیرگون زڤای لیومی» لە دایکبوو. (پەراوێزی نووسەر)

دەگـرێتەوە. هەر بـۆیە، هەمـوو ئەوەی دەمەوێ بیڵـێم: وام هەسـتکرد هەڵگری هیوا لەدەسـتچوو، هەرگیـز نـاگەڕێتەوە؛ لەوانەشـە هەر لەگەڵ ئەودا هەرگیز هیواش نەگەڕێتەوە.

تۆ بۆ هەر لایەک سەیرت دەکرد هەر ژان و ناسـۆر بـوو. دەریـایەک لە ژان، قـووڵ و بەریـن هەروەک زەریـالووش وابـوو. ئـاخر ئەو ژان و ناسۆرە جۆرێکی ئاسایی نەبوو لە ئازار، تومەز سنووری نەبوو، خۆی ژانی ژیان نەبوو؛ ژانی تاکەکان نەبوو کە لە چەوساندنەوە و نەدارییدا هاتبێ. ژانەکە هی ترسێکی کوشندە بوو، ژان و ناسۆری خەڵکێک بـوو، کەوتبـــــوونە داوی کەســــــانێک کە بەدوای قڕکردنیـــــان دەگەڕان، ژانوناسـۆری ملیۆنـان خەڵکـی ئاسـایی بـوو، کە هەمـوو مەبەسـتێکی ژیانیان ئەوە بوو، لێبگەڕێن بەس بژین و منداڵەکانیشیان بتوانن بژین.

بەرەو ڕووی ئەو زێیە پڕ لەژان و ناسۆرەدا، گوێگرتن لە هەراوزەنـاکە دەزرنگایەوە، بیستنی گریانی ئەشکەنجەدراوان، نـووزەی زینـدانیکراوان - کە هەمـوو ئەوانەش ( یـان بەشـێک لەوان) کەسـانی ئاسـایی بـوون، "کەسـانێکی نـانخۆر"؛ ئەوان بیچمـی گشـتی ناسـراو نەبـوون، سـەرکردە نەبوون، ئایدیالیستە جاڕدەرەکان نەبوون - لەو دۆخەشدا کەس بیـری بـۆ ئەوە نەدەچـوو، لەوێ گۆبەنـدێک نەبـێ، شـتێک بـێ زیـاتر پـاڵنەری مرۆڤ بێ بۆ یاخیبوون، کە گەورەتر بێ لە خودی ژانوناسۆر.

کەسیش حاشایی لەوە نەدەکرد، ژان و ناسۆرێکی وەها ئامانجی ژیانی بە دواوە نییە، بەڵکو هەر ئاماژەیەکی ژیانیشی تێدا نییە. بە شـێوەیەکی ئاسـایی مـرۆ لە خـۆی دەپرسـێ: باشـە بـۆچی ئـازار دەچێـژم؟ ئـاخۆ شـتێکی ئاسـاییە کە خۆی لە ژان و ناسـۆر دووربخـاتەوە، لەنـاوی ببـا، بەلاوەی بنـــێ. بەڵام لەو ڕۆژە کێفەڕاتـــانەدا، لەبـــن بـــاری ئەو دۆخە داڕمـاوە گشـتییەی بـێ کۆتاییدا، پیـاو لە خـۆی دەپرسـێ: ئەرێ بـۆچی ئەوان دەنـاڵێنن؟ هەر بەڕاسـتیش، دنەدەری سروشـتی، سـەرەتایی بـۆ یارمەتییـدانە، بـۆ فریادڕەسـییە، بـۆ دڵنەواییـە. بەڵام خـۆ ئەگەر چیـدی

دڵنەوایی نەکرێ؛ خۆ ئەگەر تۆ چیدی توانای ڕزگاربوونت نەبێ؛ هیچ شتێک بەدەر لە دیمەنی سامناکی ژان و ناسۆری ناقۆڵا نامێنێتەوە؛ ئەوا تارمایی ترس باڵی بەسەر هەموو کونج و کەلەبەرێکی ژیاندا دەگرێ.

هەر لەبەر ئەوەشە، لە ڕاستی زیاتر من هیچ شتی دیکەم نەگوتووە، کاتێک دەڵێم ئەو کاتەی ڕۆژی چارەنووس دێ و هەواڵگرە ڕووسییەکان دێن و من بەرەو سەفەرێکی دوورودرێژ دەبەن، هەستم بە پەشێوی نەکرد. بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەستوسۆزی بنەماییانەم یەکێک بوون لە ئاسوودەبوونێکی زۆر تۆخ.

ئیدی ئەوان لە ڕۆژێکی ساماڵی پاییزیدا هاتن. ئەوان سێ کەس بوون: پیاوێک کە فەرمانی گرتنی منی پێبوو لەگەڵ دوو یاریدەدەر. پیاوە بەرپرسەکە بە تووڕەییەوە لێیپرسیم:

"ئەرێ بۆچی بەپیر بانگهێشتنەکەی شارەوانییەوە نەهاتی؟ باشە ئەدی ئێمە تۆمان بانگهێشت نەکردبوو؟"

بەڕاستیش ئەمە پرسیارێکی گەمژانە بوو؛ وەڵامەکەشی هەر دەبووایە "سادەوساکار" بێ.

"من هیچ داواکارییەکم بۆ شارەوانی بەرز نەکردبووەوە، من هیچ کاروبارێکم لەوێ نییە. خۆ ئەگەر شارەوانی هەر کارێکی بە من هەبێ، دەبوو کارمەندە خەمخۆرەکە ئەوەندە دلۆڤان بووایە، خۆی سەردانی بکردبامایە."

"خۆ هەر دەبووایە خۆت چووبایتە شارەوانی، چونکە هەر هیچ نەبێ بانگهێشت کرابووی." ئەمەش قسەی دووەمین لێکۆڵەرەوەکە بوو، کە زیاتر بەلای ئاشتەواییدا دەیشکاندەوە.

"نەخێر من ناچم."

"بەڵێ دەبێ بچی." پیاوە بەرپرسەکە بە زبرییەوە وای پێگوتم.

منیش حەوسەڵەی گەمەی خۆشاردنەوەم نەمابوو. حەوسەڵەی مشتومڕم نەمابوو، بە دەنگێکی تووڕەوە پێم گوتن: "باشە ئێوە کێن؟ بۆچی دەوروخولی ماڵەکەمتان داوە؟ باشە کێ مۆڵەتی بەئێوە داوە وەها بکەن؟ خۆ ئەگەر واز لە هەراسانکردنم نەهێنن، سکاڵا لای پۆلیس تۆمار دەکەم."

بەم قسەیەم دەموو چاوی بەپرسەکە کرایەوە.

"پۆلیس؟ دەی تکایە، با هەر ئێستا بچینە پۆلیس!"

"من نامەوێ بچم. من ئەو کاتە دەچم، کە پێویست بێ."

"خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی ئازادانە نەچی، بە تۆپزی لەگەڵ خۆمان دەتبەین." ئەو بەم جۆرە بەسەرمدا تەقییەوە.

"ئۆو! .. کەواتە دەی پێم بڵێ، ئێوە کێن؟ ئایا تۆ نوێنەری دەسەڵاتی؟ باشە کاغەز و ناسنامەی تۆ چییە؟ خۆ ئەگەر ناسنامەیەکی فەرمیم پێنیشان نەدەی، لەگەڵت نایەم."

لێکۆڵەرەوەکان ڕوویان لە یەک کرد. دوای ئەوەی لە ڕاوێژە بێدەنگەکەیان بوونەوە، پیاوەکەی یەکەم جۆرە کارتێکی دەرهێنا و نیشانیدام، کاتێکیش کاغەزەکەی نیشاندام، سەرنجێکی تیژیشی تێبڕیم.

منیش سەیری کارتەکەم کرد. بە ڕاستی کارتێکی فەرمییانە بوو، لە لایەن دەزگەی هەواڵگریی دەوڵەتی لیتوانییەوە دەرچوو بوو. ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ڕوون بوو، ئەمجارەیان زەقوزۆپتر بووەوە.

ئینجا بە دەنگێکی قایلبوونەوە گوتم: "باشە. ئێوە هاتوون بمگرن. باشە ئەدی بۆچی هەوڵتان دەدا خۆتانم لێ بشارنەوە؟ بۆچی ڕاستەوڕاست پێتان نەگوتم؟ ئایا ئێوە فەرمانی گرتنتان پێیە؟"

ئاخۆ فەرمانی گرتنتان پێیە؟ ئەم وشانە سەدایان لە ڕابردوویێکی دوورەوە دەهات. لە چاوتروکانێک دیسان بینیمەوە، لە چاوی مێشکم، ئەو شەوە سامناکەی بیست ساڵ لەمەوبەرم، لە «بریست – لیتڤۆسک» بە بیر هاتەوە. ئەو کات لەشکری ترۆتسکی و توخاتسیڤسکی کشابوونەوە و پۆلیسی پۆلۆنی هاتبووە نێو شارەکە. ئەو شەوە – من هێشتا کوڕوکاڵ بووم – لێکۆڵەرەوە پۆلۆنییەکان هاتبوون بە تۆمەتی پشتگیریکردنی بەلشەڤیکەکان، باوکم بگرن. باوکم جەنگاوەرێکی دێرینی زایۆنیست بوو، سکرتێری جڤاتی جووەکان، هەمیشە هەر سەرقاڵ بوو – زۆر جارانیش سەرکێشی مەترسیداری دەکرد – تێدەکۆشا ئەو جووانە ڕزگار بکا، کە بە کاری قورس و مەرگ سزا درابوون، ئەوەش وەنەبێ لەبەر ئەوە بوویێ، کە ئەوان بەلشەفیک بووبن، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو، دەسەڵاتدارە دژەسامییەکان بەوە تاوانباریان دەکردن، گوایە ئاوی گەرمیان بە سەر لەشکری پۆلۆنیدا کردووە یاخود زانیارییان داوەتە لەشکری سوور. لە چاوی دژەسامییەکاندا، هەمو جوویێک "بەلشەفیکێک" بوو بۆ خۆی. هەر بۆیە مایەی سەرسامی نەبوو، لە میانی ڕەشبگیرییەکی فەرمییدا باوکم ڕاپێچبکەن. بەڵام ئەو لە بەردەم گرتنەکەیدا وەستایەوە، لە کۆتاییدا توانی ژیانی خۆی ڕزگار بکا، ئەوەش کاتێ ئەم پرسیارەی لێکردن: ئەرێ فەرمانی گرتنی منتان پێیە؟

چەرخەکە تەواو وەرسووڕا. لێرەدا من دوای بیست ساڵ، هەمان پرسیارم لە لێکۆڵەرەوە بەلشەفیکەکان کرد: ئەرێ ئێوە فەرمانی گرتنی منتان پێیە؟ من بەتەواوی دەمزانی ئەو پرسیارەم لە گرتنەکە نامپارێزێ، بەڵام هەر هەمان کاریشم کرد. لەوانەیە بەو ڕەفتارەم

داخوازییە قانوون ـییەکەم بەجێ گەیاندبێ؛ بەڵکو هەوڵێکی گەڕانەوە بێ بۆ دواوە.

"ئێمە هیچ فەرمانێکی گرتنمان پێ نییە،" بەرپرسی لێکۆڵەرەوەکان وەها وەڵامی دامەوە و لەسەر قسەکەی خۆیشی ڕۆیشت: "بەڵام ئەوەی تۆ دەیڵێی ڕاستە. ئێمە هاتووین تۆ بگرین. خۆ ئەگەر بە خۆشی خۆت لەگەڵمان نەیەی، مافی ئەوەمان هەیە تۆپز بەکاربێنین."

منیش گوتم: "زۆر باشە. ئێستا زانیم ئێوەیان بۆ گرتنی من ناردووە. ڕێگەم بدەن خۆم ئامادە بکەم."

لە ماوەی خۆگۆڕینەکەمدا، ژنەکەم و دکتۆر «ئیسرائیل سخێیب» و ژنەکەی وەستابوون. ئاخر ئێمە لەژێر یەک هەنواندا لەگەڵ برادەرەکەم و زاوای کۆچکردووم «د. ئارنۆلد» و «ژول کرێلمانی» هاوڕێی منداڵیمدا دەژیاین. ئەوکات «باتایا سخێب» گریا، منیش داوام لێکرد نەگریێ. ژنەکەم نەگریا. ئەویش وەک من خۆی بۆ ئەم حاڵەتە ئامادەکردبوو. «سخێب» و من چەند کورتە سەرنجێکمان لەسەر گەمە خۆشەکەمان، لەسەر شەترەنج لەگەڵ یەکدی ئاڵوگۆڕ دەکرد، کەچی ئەو "میوانانە" هاتن و گەمەکەیان پێ بڕین و لێیان تێکداین.

دوای ئەوەی ئەوان دانیان پێدانا بۆچی لەوێن، ئیدی ڕەفتارمان لەگەڵ لێکۆڵەرەوەکان گۆڕا. ژنەکەم و من فەرموومان لێکردن بەڵکو چایەکمان لەگەڵدا بخۆنەوە. ئەوانیش سوپاسیان کردین و بەڕێزەوە ڕەتیانکردەوە، بەوە خۆیان لە بانگهێشتکردنەکەمان دزیەوە، نەبادا لە کارەکەیان دوا بکەون. منیش خێرا خۆم ئامادەکرد. داوام کرد بەڵکو هەندێ نان لەگەڵ خۆم بەرم. پێڵاوەکانیشم بۆیە کردن. من هیچ شتێکی دیکەم لەگەڵ خۆم نەبرد، چونکە ئاژانەکان ڕێگەیان نەدا هیچ "پریاسکە"یەکم پێ بێ، بۆیان ڕوونکردمەوە، بە جۆرە ڕێز و خەندەیەکی سەرسامکەرانە بۆیان ڕوونکردمەوە، هەرچەندە من

گیراوم، بەڵام ئەوان ئەرخـایەنن، دوای چـوونم بـۆ ئەوێ، هەر هەمـان ڕۆژ ئـازادم دەکەن و دەگەڕێـمەوە سـەر مـاڵ و حـاڵی خـۆم. ئەوان دەسـتیان نەگرتم دوو کتێب بـۆ خوێنـدنەوە لەگەڵ خـۆم بەرم. ئەوەش پێـدانی زێـدەمافێک بـوو، لە هەمـان کاتیشـدا ئامـاژەیەک بـوو بەوەی متمانەم پێدەکەن، بۆ لێکۆڵەرەوەکانیش ئەو دەرفەتە نەبوو ناوەڕۆکی کتێبەکان بزانن، کتێبەکانیش دژەشـۆڕش بـوون. یەکێ لە کتێبەکان بە ئینگلیـزی بـوو، ئەو زمـانەی تـازە فێـری ببـووم. ئەویـش کتێـبەکەی «مـــاوریس» بـــوو کە «دزرائیلـــی[12]» نووســـیبووی، ئەو پیـــاوەی ئیمپراتـۆریەتی بەریتـانی بەرفرەوانکـرد. کتێـبەکەی دیـکەش بە قەولـی جـووە کۆمۆنسـتێکی بە جـۆش بە "زمـانە فاشیسـتەکە" نووسـرابوو، ئەویش تەوجیل[13] بوو.

ئینجـا خواحـافیزیم لە «د. سـخێب» و «باتیـا» کـرد. ڕێگەیـان بە ژنەکەشـم دا تـا لای ترومبێلەکەیـان یـاوەرییم بکـا، هەنـدێک لە دووری خانووەکەمـان ڕایـانگرتبوو. منـیش یەکەمـین هەنگـاوی چارەنووسـم بەرەو نادیـارێتی هەڵهێنـا؛ وەک بەنـدکراوێک دەروازەی مـاڵەکەم بـڕی. ئینجـــا بەرەو مەیـــدانەکە بەڕێ کەوتـــین. ماخۆکـــانی خـــانووەکە، کاربەدەستی پۆلۆنی و کاسۆلیکی دڵسۆز بوون، کاتێک گەیشتمە لایان و خواحـافیزیم لێکـردن، هیـوام خواسـت هەمـوو شـتێک بـاش بێـتەوە، دەسـتیان بەخـۆدا شـۆڕکردنەوە و چاویـان بەردایەوە. ڕەنـگە ئەوان ترســـابن. بە دڵنیـــاییەوە ســـەریان ســـوڕمابوو، کە حکـــوومەتێکی کۆمۆنیســـتی، جـــووێکی کرێگـــرتەی خانووەکەیـــان بگـــرێ. دیـــمەنەکە

---

[12] دزرائیلی: بنیامێن دزرائیلی (Benjammin Disraeli ١٨٠٤ -١٨٨١ دەوڵەتمەدار و ڕۆماننووسی بەریتانی کە دوو جاران بۆتە سەروەزیر، بە ڕەچەڵەک جوویەکی سەر بنەماڵەی سێفێرادیکی ئیتالی بووە. ڕۆڵێکی گرنگی لەنێو پارتی کۆنسەرڤاتیڤی بەریتانییدا گێڕاوە.

[13]– تەوجیل: تەورات و ئینجیل، بایبل.

ئەوەندە لە ڕامانی ئەوانەوە دوور بوو، لە چاوی ئەوانەوە شتەکە زۆر نامۆ بوو.

لە ڕێگە بۆ لای ترۆمبێلەکەیان، برادەرەکەی خۆم «دایڤید یوتان»م بینی، ئەو کەسەی چەند هەفتەیەک پێشتر پێشبینی گرتنی کردبووم. کە بینیم سەیری یەکدیمان کرد، ئەوەش خواحافیزیکردنمان بوو. ژنەکەم و من چەند قسەیەکمان لەگەڵ یەک کرد. دەرفەتی قسەی زیاترمان نەبوو. ئاخر سوودی چی دەبوو ئەگەر قسەی زیاتریشمان کردبا؟ پێمڕاگەیاند، کە پێموایە دەگەڕێمەوە، بەڵام لە هەر بارێکدا نابێ کارێکی وەها بکا، خەڵک پەرۆشی من بێ. ئەویش بە کورتە ڕستەیەک وەڵامی دامەوە: "خەم مەخۆ، هەموو شتێک چاک دەبێ."

"لەبیرت نەچێ بە «سخێب» بڵێی لە دوا گەمەی شەترەنجدا پێی دۆڕاوم. ئەو لە پێشەوە بوو، هەرچۆنێک بێ، دۆخەکە وابوو کاتێ ئەوان هاتن و گەمەکەیان پێبڕین."

"لە بیرم ناچێ." ژنەکەم وەها وەڵامی دامەوە.

ژنەکەم لەوێ ڕاوەستا، تا ئەو کاتەی ترۆمبێلە کەشخەکەی ئاسایش دوور کەوتەوە و لەبەر چاوان ون بوو، هەر دەستی بۆ ڕاوەشاندم.

## ٢

# لێکۆڵینەوەکە دەستیپێکرد

دوای کەمێک گەیشتینە تەلارێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی لە نێو جەرگەی «ڤیلنا»، کە بارەگای سەرەکی هێزی ئاسایش بوو. پێشتر بە شێوەیەکی فەرمی لە دالانە درێژەکانی باڵەخانەکەدا سەدای پارێزەران، داواکراوان و دادوەران، بەندکراوان و پۆلیس دەبیسترا. تەلارەکە پێشتر باڵەخانەی دادگەی پۆلۆنیا بوو. لە پایزی ١٩٤٠دا داواکراوان و پارێزەرەکانیان لە نێو دالانە تاریکەکاندا نەمان. بەڵام دیسان لەوێ بەندکراو و پاسەوانەکانیان و دادوەرەکانیان سەریان هەڵدایەوە. زۆر بە کەمی خودی باڵەخانەی دامەزراوەکە گۆڕابوو، کەچی باری ڕۆڵگێڕەکانی تراژیدیای مرۆڤایەتی تەواو گۆڕا بوو. گۆڕانەکەش لە هەموو شتێک هێمادارتر بوو، هێمای قۆناغی گواستنەوەی شۆڕشگێڕانە بوو، کە ئەو کات بەسەرماندا هات.

لە سەردەمی خوێندکاریمدا، وا ڕاهاتبووم گوێم لە خوێندکارە کۆمۆنیستەکان بێ، کە بە چەندین شێوە گۆرانییان دەگوت، هەر گۆرانییێکیش بە وشەکانی: "ئێمە دەبینە دادوەر" کۆتایی دەهات. ئەم گۆرانییەیان کە لە ڕووسییەوە وەرگێڕدرابوو، سەدایەکی قووڵ و باوەڕدارانە و هەڕەشەشی بەرجەستە دەکرد. بڕواناکەم ئەو ئایدیالیستە قەللۆشانە[14] هەرگیز بە ڕاستی مەبەستیان بووبێ، ببنە

[14] – قەللۆش: نابووت، مفلس

دادوەری دادوەرەکانیان، بەڵام ئەوان بڕوایان بە دڵنەوایی تۆڵەکردنەوە هەبوو: ڕۆژێک دادێ دادوەرەکانیان دادگەیی دەکرێن، ئەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەوانیان زیندان کردبوو، دەبێ زیندانی بکرێنەوە، دەبێ چەرخ بسووڕێ و چەوسێنەرەکانیان بچەوسێنرێنەوە. ئەمەش نەخشەی شۆڕشەکەیان بوو، هەرچەندە ئەگەر ئامانجەکەش وەها نەبووبێ. ئەمڕۆش، ڕۆژەکەی هاتووە. لەو شوێنەی، کە دادوەرە پۆلۆنییەکان هەوڵیاندەدا دادوەری بەسەر کۆمۆنیستەکانەوە بکەن، ئیدی کۆمۆنیستەکان هەوڵ دەدەن دادوەری بەسەر خودی دادوەرەکانەوە بکەن. بەڵام بۆ بەشێکی زۆر لە نەوە ناشادەکان، جەنگاوەرە بەجۆشەکانی کۆمۆنیزم، هیچ دڵنەواییێک لە تۆڵەکردنەوەکەیاندا نەبوو. هەر بەڕاستیش چەوسێنەرەکانیان چەوسێنرانەوە، دادوەرەکانیان دادگەییکران، بەڵام خۆیان، بڕواداران بە "جیهانی نوێ" نەوەک هەر نەبوونە دادوەر، بەڵکو دادگەییکران. ئیدی تراژیدیای ئەوان، تراژیدیا تایبەتییەکەی ئەوان، کە لە مێژووی خەباتی مرۆڤایەتیدا وێنەی نەبوو، من لێرەدا دەیگێڕمەوە. من ئەوانم لە جۆشوخرۆش و لە کەساسی خۆیاندا بینی؛ من ئەوانم لە ترۆپکی دڵشادیی خۆیاندا و لە بندینی[15] بێمرادیشدا بینی. ئاخر هەرگیز من سووتانەوە و کڕووزانەوەی ئەو کەسە بە جۆشانە، ئەو بێمرادە نەگبەتانەم نەبینیوە، هەرگیز دارمان و کەوتنێکی لە هی ئەوانم بە زەبرتر نەبینیووە.

من بە یەکێک لە دادوەرە نوێیەکان ئاشنا بووم، ئەوەش ئەو کاتە بوو، کە پێم نایە دەروازەی بارەگای سەرەکی ئاسایش. لە ژوورێکی سادەدا دانرام، لە بەردەم مێزێکی ئاسایی، لەوێ سەرم بەسەر کتێبەکەدا گرتبوو، ئەوەی لەبارەی سەردەمی گەنجێتی دزرائیلیدا بوو، دەخوێندەوە. لەپڕێکدا گوێم لە تەپەی پێ بوو لە ڕاڕەوەکەدا دەنگی

---

15- بندین: بنی بنەوە.

دایەوە، ئینجـا دەرکەکە بە کپـی کـرایەوە، لە نێـو دەرگەکەدا سـێ لێکۆڵەرەوەم بینـی، دوو لەوانە بـوون منیـان گرتبـوو، سێهەمەکەشـیان نوێ بوو. ئیدی پێشبینیکردنەکە زەحمەت نەبوو، بۆ ئەوەی بگوترێ کە لێکۆڵینەوەکە دەستپێکرد.

پیاوی سێهەمییان، سڵاوی لێکردم و بە ڕووسی پێیگوتم بەخێر بێیت! ئینجا لە لایەکی مێزەکە دانیشت و پرسـیاری نـاوەکەمی لێکـردم، خـۆ باشـیش دەیزانـی نـاوم چییە. منیش وەڵامـدایەوە. پرسـیاری دووەمـی دەربارەی ئەو کتێبە بوو، کە کەوتبووە نێوانی مـن و ئەو. قەنـاعەتی بە ناونیشانی کتێبەکە نەبوو، بەڵام دەیویست بزانێ ئـاخۆ دانەرەکەی کێیە و کتێبەکەش دەرباری چی نووسراوە.

بەم جۆرە وەنەبێ لێکۆڵینەوەکە دەستی پێکردبێ، بەڵکو دەتگوت کورتە دەمەتەقێیەکی دۆستانەیە. ئێمە سەیری یەکدیمان کرد. ئەویش دانیشت و سەیریکردم، چاوە بچووکەکانی لە یەکدەدان، بە تـامەزرۆوە بە دوای شـتدا دەگەڕا، نیشـانەی کەسـایەتی پیشـەکەی نمایشـدەکرد. منـیش یەکەمین بەندکراو نەبووم، کە تووشی یەکێکی وا بێت بەو شێوە لەپڕ و بە نەرمونیـانییە، لەسـەر شـێوەی لێکـۆڵینەوەی دادوەرانەی دیستۆفیسـکیدا بگـاتە مەرام. بـۆ مـن، ئەو یەکەمـین لێکـۆڵەرەوەی ئاسایشی کۆمۆنیزمی سۆڤیەت بوو، کە لە ژیانمدا تووشی هاتبم. ئـاخر جیهانێکی نوێ بە ڕووی مندا کرایەوە، کە پڕ لە ترسـوبیمی سـەرچاوە نادیار بوو. من دەمزانـی هەر کەسێک بێت و لەو جیهانە "بکۆڵێتەوە"، ئەو جیهـانەی لەگەڵ کـرانەوەی دەرگەکـانی هەر زوو داخـرایەوە، ئیـدی کەسەکە دەبێ بـاجێکی زۆر بـدا تـا لێکۆڵینەوەی خـۆی دەکـا، بەڵام مـن بەوە قـایلبووم، کە ئەو دەرفەتەم بۆهـات - سوپاسـگوزارم، بـۆ وەرچەرخـانی چەرخ - بـۆ ئەوەی لە نـزیکەوە لە نێـو بارەگاکەیانـدا، بە شێواز، بە کاری نهێنی و بە هەژموون و قەڵەمڕەوی ئـاسایش بەڵەدبـم، بـۆیە مـن ڕاسـتگۆم، کە دەڵـێم کاتێـک لە بەرانـبەر لێکـۆڵەرەوەکەم

دانیشتم، هەستمکرد لە ناخەوە، بە پێزانینەوە خوێندکارێکی چاودێریم و گرتنەکەش تەنیا فەرمانناممەیەکی دەرەکییە. ئای لە هێزی پرسنیی[16]! بەڵام خۆ ئەگەر هەموو ڕاستیەکە بگێڕمەوە، دەبێ پێ لەوە بنێم، کە نەمتوانی پارێزگاری لە پێگەکەم بکەم وەک خوێندکارێکی هەمیشەیی، چونکە من لە نێو جیهانی ئاساییشدا بووم، لە میانەی گرتنەکەمدا تەنیا پێگەی زیندانییەکەم باقی مابووەوە، خۆ ئەگەر هیچ شتێک لە بەندکراو بەجێ مابێ.

هەرچۆنێک بێ، لە خاڵی بە هێزی ئەزموونەوە دەتوانم بڵێم، مرۆ دەبێ لە بن هەموو هەلومەرجێکدا جڵەو بۆ تێنوێتی زانیارییەکانی شلبکا، ئەم خەسڵەتەش لە هەموو کەسێکدا هەیە. خۆ ئەگەر ئەوپەڕی سووکایەتیشت پێبکەن، بتخەنە قووڵایی زیندانەوە، ڕاتبکێشنە بەر سێبەری مەرگیش، چاوەکانت باش بکەوە و فێر ببە! تا ئەو کاتەی تۆ شت فێر دەبی و لێیتێدەگەی، بۆ ئەوەی لێکۆڵەرەوەکانت نەتوانن ئەو پەیوەندییە لە نێوان خۆیان و تۆدا بەو شێوەیەی مرخیان لێخۆش کردووە، دروستبکەن؛ ئەوان خەڵکێکی دەستڕۆیشتوون، تۆش بابایەکی، کە بە سووکی لێت دەڕوانن و کەوتوویتە بنی بنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا وەک کەسێکی هاوشان و یەکسان قسەیان لەگەڵدا بکە؛ ئەوان لێپێچینەوەت لەگەڵدا دەکەن، تۆش دەبێ لێیان بکۆڵیتەوە.[17] تۆ نابێ بە تەنیا هەر "دۆزێک" بیت. زانیاری پەیداکردن سەبارەت بە ئەوەی دەوروخولی داوی هەر بە تەنیا باری سکاڵا و کوێرەوەری و سوکایەتی پێکردن نییە، بەڵکو کەرەستەی لێکۆڵینەوە و زانینیشە، تۆ دەبێ خاڵی بە هێزی خۆت لە هیچوپووچیی لێپێچینەوەکەدا بەدەستبهێنی و وەک پیاو بمێنیتەوە.

---

16– پرسنی: زۆر پرسیارکردن، فزوولی.

17– خوێنەری خۆشەویست، مەبەست لەم ڕستەیە ئەوان لێکۆڵینەوەی سزایی(تحقیق)ت لەگەڵ دەکەن، تۆ لێکۆڵینەوە دەکەی، واتە دیراسەیان دەکەی. هەردوو وشەکە هەر یەکن، هیوادارم لە وەرگێڕانیدا کورتم پێنەهێنابێ.

هەر بۆیە لە میانەی ئەو لێپێچینەوەیەی لەگەڵمدا کرا، تێکۆشام لە سروشتی ئەو کەسە بگەم، کە سین و جیمم لەگەڵدا دەکا:

ئایا ئەمە چیکییە [18]؟ ئایا ئەم لێپێچینەوەیە شێوازێکی چیکییە؟ ئایا ئەوە سەر بەو قوتابخانەیە کە شێوازی تەلیسماوی بۆ تێکشکاندنی خەڵک بەرهەمهێناوە؟ تۆ بڵێی چۆن لێپێچینەوەم لەگەڵدا بکا؟ تۆ بڵێی چی لە من بوێ؟

من هیچ شتێکی تایبەتی و هیچ شێوازێکی بەرچاوم لە بیچم و ڕەفتاری ئەو کەسەی پرسیارەکانی لێکردم، هەڵنەکراند. ئەو جلێکی مەدەنی لەبەردا بوو، بۆینباخێکی بۆرژوازییانەی لەسەر قاتە بۆرەکەی بەستبوو. لە ڕووخساریدا ئەو سەرنجەم بۆ پەیدا بوو، ئەویش جوو بێ، بەڵام دڵنیا نەبووم. هەڵبەتە بەتەمای ئەوە نەبووم، هیچ زێدەمافێکی لێوەربگرم، ئەگەر هاتبا و دایکی بەرانبەرەکەم لە شەوانی هەینییدا مۆمی داگیرساندبێ، چیدەبوو؟ بەڵام زۆریشم پێخۆش بوو بزانم، ئاخۆ سەرنجەکەم لەسەر کابرا ڕاستە، کە بنجوو بێ. ئەو سەرنجەشم بە پرسنییەوە بە ڕوونی پێوە دیار بوو، بۆیە ئەوەی کابرای لێکۆڵەرەوە پەی پێبرد. لە هێکەوە گفتوگۆکەمانی پچڕاند بە تەوسەوە لێیپرسییم: "ئەرێ بۆ بەم جۆرە سەیرم دەکەی؟"

منیش بە دەنگێکی لێبووردەییانە ناچار بووم حاشایی لێبکەم، بەوەی هەوڵم نەداوە بە هچ شێوە و مەرامێکی تایبەت لێیبڕوانم.

دیسان لەپڕ لێی پرسیم: "ئایا دەزانی بۆچی بانگی ئێرە کراوی؟"

بە حەپەسانەوە دووبارەم کردەوە: "باشە بۆچی بانگکراوم؟"

---

[18]– چیکی: پۆلیس و هەیتەی سەردەمی قەڕاڵ.

"بەڵێ. منیش دەمەوێ بزانم، ئاخۆ تۆ دەزانی کەوا بۆچی بانگی ئێرە کراوی؟"

"من هۆکارەکەی نازانم، بەڵام ئەوەندە دەزانم، من بانگهێشتی ئێرە نەکراوم بەڵکو گیراوم."

ئەمجارەیان من ددانم لەسەر گۆکردنی وشەی گرتن گیرکرد، هەروەک چۆن پێشتر وشەی بانگهێشتکردنم بە جوانی دەربڕی.

لێکۆڵەرەوەکە بە سەرزەنشتەوە لێی پرسیم: "کێ پێیگوتی تۆ گیراوی؟" ئینجا درێژەی بە قسەکانیدا: "کەس تۆی نەگرتووە. هەر تەنیا ویستم قسەت لەگەڵدا بکەم. چەند پرسیارێکت لێبکەم، خۆ ئەگەر وەک هەر کەسێکی ڕاستگۆ لە دڵەوە بەرسڤیان بدەیتەوە، ئەوا یەکسەر دەڕۆیتەوە ماڵێ. ئەرێ هەر بەو بۆنەیەوە، تۆ ژنت هێناوە؟"

"بەڵێ."

"تەمەنی چەندە؟"

"بیست."

"کەواتە گەنجە. بێ سێ و دوو ئێستا چاوەڕێت دەکا. بەڵام خەم مەخۆ، هەر تەنیا وەڵامی چەند پرسیارێکم بدەوە، ئینجا دەگەڕێیتەوە بۆ لای ئەو. خۆت وەها دابنێ پیاوێکی سەربەستی، نەوەک بەندکراو. من دووبارە پێت دەڵێمەوە" تۆ نەگیراوی. تۆ بۆیە بانگهێشت کراوی تا یەک دوو قسە لەگەڵ من بکەی، هەمووشی دەکەوێتە سەر خۆت، ئاخۆ کەی بگەڕێیتەوە ماڵ."

من گوێم لە قسە گەرمەکانی یارۆی لێکۆڵەرەوە گرت و خۆشیم پێهات. نوێنەرانی ئاسایش وەک بۆ هەموان ڕوون بوو، هەوڵیان دەدا شتم

لێدەربێنن، بەڵام لە چاکەی "کەڕەپ[19] بوونم، ئەو دەرفەتە لە دەست کابرا دەرچوو، کە پێیەوە شادمان بێ.

بە پێکەنینێکی سروشتی خۆمەوە، گوتم: "باشە بۆچی دەتەوێ لە خشتەم ببەی؟ من دەزانم کە گیراوم، بە تەواویش ئامادەم وەک بەندکراوێک وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە."

ئەو هێشتا ئامادە نەبوو پێیلێبنێ، بە دەنگێکی هەندێ تووڕە پرسی: "کێ بە تۆی گوتووە گیراوی؟ باشە ئەو بیرۆکەیەت لە کوێ هێنا؟"

"ئەوانەی منیان بۆ ئێرە هێنا، گوتیان تۆ دەستبەسەرکراوی."

ئیدی کابرا وەک ئەوەی شتێک پێوەی دابێ، لەسەر کورسییەکەی خۆی هەڵستا.

"چی؟ ئەوان پێیان گوتی کە دەستبەسەرکراوی؟"

چاوەڕێی زانیاریی زیاتری لە من نەکرد، هەڵسا و بەرەو دالانەکە ڕۆیشت، بێ ئەوەی خۆشی تێکبدا و دەرکەش پێوە بداتەوە. لەو شوێنەی لێی دانیشتبووم، ژووری ئەو ئەفسەرە لێکۆڵەرەوەم دەبینی، کە دەیەویست بانگهێشتی شارەوانیم بکا و گوێم لە دەنگی یارۆی لێکۆڵەرەوەی ئاسایش بوو، لە دالانە چۆڵەکەدا سەدای دایەوە. لە دەهریبوونێکی تەواوەوە، چەندین جوێنی پیس پیسی ڕووسیم بەرگوێ کەوت، کە ڕۆژانی دوای ئەوە پێی ئاشنا بووم، کەوا مافی هەر هاووڵاتییێکی تەواوعەیاری بن قەڵەمڕەوێتی ئاسایشە، هەرچەندە جنێوودانیش بە قانوونی سۆڤیەتیش قەدەغە بوو.

دیارە لە بن هەلومەرجی ڕژێمێکی هەرە دەستڕۆیشتوودا، هەندێک ڕێسا هەن، کە لە بەرانبەر قانوونەکانی ژیاندا کراوەن؛ ئاخر چۆن

---

19– کەڕەپ: نەسەلمێن، عیناد.

ڕووسەکان، کە خۆیان بە بەرپرسی قانوون پارێزی دەزانن، ئەو هەستانە دەرببڕن بە باش و خراپییەوە بە بێ نەفرینێکی "داکانە[20] بن"؟ ئەو لێکۆڵەرەوە بەدبەختەش، کە من لە دالانەکەوە گوێم لە قسە توندەکانی بوو، وەلامدەرەوەی شتگەلێک بوو، - هەر سەداکەشی گەیشتە گوێچکەم -، ئینجا یارۆی لێکۆڵەرەوە گەڕایەوە ژوورەکە، کەفوکوڵی تووڕەبوونەکەشی هەر بەسەر لێوەوە دیار بوو.

ئینجا بۆم ڕوون بووەوە، بۆچی دەزگەی ئاسایش پێویستی بەو هەموو سیناریۆ کۆمێدیانەی بانگهێشتکردنەکە بوو، کە بچم بۆ شارەوانی؛ بۆم ڕوون بووەوە، بۆچی بەر لە گرتنم ئاژانەکانیان گەمەی چاوشارکێیان لەگەڵدا دەکردم. ئاخر بڕیاریان دابوو بمگرن و بە شێوەیەکی نائاساییش لەناوەبەرن. خۆ دەشیان توانی ئەم کارەش بە ئاسانی بکەن، بەلام دەیانەویست هۆکارە ڕاستەقینەکەم لێبشارنەوە. بە پێی ڕۆژگاریش، کاتێک چاوم بە بەندکراوەکانی دیکە کەوت، لەوە تێگەیشتم، هەر بە تەنیا نەبووم، کە دەزگەی ئاسایش هەوڵیدابوو بە شێوازی مەدەنیانە بانگهێشتیانبکا، ئەمەش بۆ ئەوەی دنەی هیچ گومانێک نەدەن، شێوازێک بوو بۆ ئەوەی جێگەی گرتنی ڕاستەوخۆ بگرێتەوە. لە زۆر باردا کەسە بانگهێشتکراوەکان، ئاساییانە بەپیر بانگەوازەکەوە چووبوون، سەریان لە نووسینگەی داواکراو دابوو؛ خۆ ئەگەر دڵیان پڕبووبا، ئەوا خۆیان لە خشتە دەبرد - وەک هۆشدارییەکەی «دانتێ» سەبارەت بەوانەی، کە دەستبەرداری هیوا دەبن؛ لەسەر دەروازەی هیچ نووسینگەیەکی لاوەکی پۆلیسی نهێنی سۆڤیەتی نەنووسراوە - خۆ ئەگەر پرسەکەش ڕوون بووبایەوە، ئەوا ڕێگەی بانگهێشتکراوەکانیان دەدا بگەڕێنەوە ماڵەوە. ئەم وەهمەش - سەرەتا بەلام نەوەک کۆتایی نێوچاوانی بەندکراوەکە بێ - لە لایەن ئەندازیارێکی «چیکییەوە» سەری هەڵدا. خۆ ئەگەر پیاوێک گیراو و

---

[20] - داکانە مەبەست ئەو شتەیە کە سەرچاوەی شتەکانی دیکە بێ. وەرگێڕ.

زانرا کەوا گیراوە - بەتایبەتیش لە لای دەزگەی ئاسایشەوە - ئەوا بە جدییەوە گومانی لە بەڵێنەکە پەیدادەبێ: خۆ ئەگەر ڕاستییم پێ بڵێی، ئەوا دەستبەجێ دەگەڕێیتەوە ماڵێ. بەڵام ئەگەر پیاوێک بۆ گفتوگۆیەک بانگهێشتکرابێ، ئەوا بە تاسەوە داوا لە پیاوەکە دەکرێ وەڵامی هەندێ پرسیار بداتەوە. باشە لەو کاتەدا بۆچی ئەو هیوای پەیدانابێ، یان بۆچی خۆی لەخشتە نابا بەوەی، کە بە سەلامەتی لێی دەردەچێ؟ دەرچوون لە داوی وێستگەیەکی پۆلیس کارێکی گەورەیە. بەڵام چی دەڵێی ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ گریمانەکانی دەزگەی ئاسایش؟ ئەوانەش کە بانگهێشتنامەیان بە زانیاری دەزگەی ئاسایشەوە کردووە، ئەو فەرمانانە دەدەن، کە هەر بەو شێوە ڕەفتار لەگەڵ قوربانییەکەدا بکەن. کەواتە فەرمانی گرتن، هەر لە نێو فایلەکەدا دەمێنێتەوە. حاشاش لە خودی کردەی گرتنەکە دەکرێ. یەکەمین لێپێچینەوەش بە زۆری هەر بە "گفتوگۆیەک" دەستپێدەکا. ئینجا ئەگەر تۆ ڕاستییەکە هەڵبڕێژی، کە ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنی، ئەگەر تۆ نەوەک ئەو شتەی دەیزانی هەڵیڕێژی، بەڵکو ئەو شتەی دەزگەی ئاسایش لە تۆی دەوێ، پێیان بڵێی، ئەوا دەگەڕێیتەوە ماڵێ و دەچیتەوە نێو ماڵ و مندالی خۆت.

ئەمە شێوازەکەیە. کەسیش ناتوانێ لەم سیستمەدا ڕێژەی سەرکەوتنی دەزگەی ئاسایش مەزندەی بکا. هەرچەندە تواناکانی دەزگەی ئاسایش لەبەرچاوبگیرێ، هەرچەندە گیانی ئەندازیاری سۆڤیەتی بە خۆی و هەموو ئامرازەکانی بەم جۆرە بێ، دەکرێ ئەوەش ببێتە مایەی سەرسامی، کە ئەو زلهێزە پەنا بۆ شێوازێکی قەناعەتپێهێنانی سادە و ئاسان و بەرایی ببا. ئایا ئەگەر کەسێک داوای لێکرا، دان بە تاوانە هەرە قێزەونەکانی بنێ - ئەوا لە چاوی ئەو دەسەڵاتەی کە گرتوویەتی یان تەنانەت ئەوەی بانگهێشتی کردووە - زۆر جار وا پێدەچێ کەسەکە دان بە شتەکاندا بنێ، چونکە لێکۆڵەرەوەکە یان ئەو کەسەی، کە پەیوەندیدارە بە بڕیار، بەڵێنی ئەوەی پێدەدا ئازادی بکا؛ یاخود وای لێبکا دواتر ئازادببێ؟ ئایا دەزگەی ئاسایش بە خێرایی گرتووەکە یان

بانگهێشـــتکراوەکەی ئازاددەکـا؟ کاتێـک هەر کەسـێکی تـایبەت بـۆ گفتوگـۆیەک بانگهێشـتدەکرێ، تـۆ بڵێـی هەزارانـی دیـکە پـێش ئەو بانگهێشت نەکرابن؟ ئایا چارەنووسیان چی بووە؟ هەر کەسێک ئەو شـتانە لێکبـداتەوە و ڕاسـتییەکان بزانـێ، لەو بانگهێشـتنە سـادەیە بکـۆڵێتەوە بە شـتێکی هەرزەی دەزانـێ. بەڵام لەو کارەشـدا ڕێـگە و شێواز هەیە، چونکە ئەو کەسەی خەمی هیوای خۆیەتی، بەلای ئەوەدا ناچێ، کە لە ئەزموونی ئەوانی دیکە فێرببێ. ئەو هەمیشە خۆی بە ڕیزپەڕێک[21] دەزانێ: لە دڵی خۆیدا دەڵێ: بەڵکو دەرفەتێکم هەبێ؟ هەمووشی هەر وەک یەکە.

تەنیـا ئەو کەسـەی ئەم سیسـتمەی تـاقی کـردبێتەوە، لەو دەربـڕینە دژبەیەک (پـارادۆکس)ـەی بەرەوپێشـوەچوونێکی گەڕاوە تێـدەگات. جـارێ بەر لە "نەشـونماکردنی" سۆشـیالیزم و کۆمـۆنیزم، ڕێسـای سـەقامگیر دانـراون بـۆ ئەوەی ڕەفتـاری کـۆمەڵگە یـان دەوڵەت لە بەرانبەر تاکی تۆمەتبار یاخود ئەو کەسەی گومانی ئەوەی لێدەکرێ، کە بەرانبەر ئەوان بوەستێتەوە، دیار کراوە. نوێنەری دەسەڵات دەکرێ بڵێ؛ لێرەوە بە ناوی قانوون من تۆ دەگرم، ئینجا فەرمانەکە بە واژۆی دادوەرێـکەوە لەسـەر مێـز دادەنـێ. ئیـدی ڕەوشـی گیـراوەکە یـان گومانلێکراوەکە بۆ ماڵباتەکە ڕوون دەبێتەوە، دەکرێ پارێزەرێک بۆ بەرگریکـردن بگـرن و پێـواژۆ قـانوونییەکەش دەسـتپێدەکا، کـارەکەش بەوە کۆتـایی دێ، کە تـۆمەتەکە بسـەلمێندرێ یـاخود تاوانبـارکردنەکە نەسەلمێندرێ و گیراوەکە بەربدرێ. بەم جۆرە پێواژۆیەکە زۆر ئاسـان دێتە بەرچـاو. ئەوەنـدە ئاسـان بەوەی ئەوانەی لێیڕاهـاتوون بەم جۆرە وێنایدەکەن. بەڵام خۆ ئەم حاڵەتەش نەکەوتۆتە بەر متمانەی لێبوردنی مرۆییانە. بۆ چەندین نەوە، بۆ سەدان ساڵ دەچێ، مرۆڤایەتی بۆیە لە بن باری ژان و ناسۆردا دەناڵێنێ، چونکە پێواژۆیەکی لەم جۆرە لە

[21]– ڕیزپەڕ: هەڵاوێر، ئایەر، شاز، دەرچوو لە ڕێسای گشتی.

ئارادا نییە، بەڵکو بەردەوام شۆڕش بۆ ئازادی لە گۆڕێدا هەیە، نرخی ئەو ژانوناسۆرەش هەر فرمێسک و خوێنە، ئەوەش دەروازە و سەقامگیری ئەوانە وەک پشتیوان و پارێزەری تاک بۆ تاوانبارکراو یان تاوانباری ڕاستەقینەکە دەبێتە خۆراکی دەستهاڕی دەسەڵات.

بەڵێ لێرەوە "نەشونماکردنی" شۆڕش لە ڕۆژگاری ئێمەدا هات، کە بشگەڕێینەوە ڕۆژانی پاشتر، هی سەردەمی بەر لە ڕۆژانی شۆڕش، ئەو ڕۆژانەی کە دەسەڵاتی باڵادەست بەوە وێنادەکرا، کەوا خەڵک بە دزی دەگرێ، هاووڵاتی دەڕفێنێ و دەیانخاتە کونجی زیندانەوە. چۆن خوێندکارە کۆمۆنیستە هاوچەرخەکانم گاڵتەیان بە زێدەمافەکان[22] دەهات، ئەوانەی لە چەندین نەوەدا بە سەربەستی تاکەوە گرێدراو بوون! ئەوەی لۆژیکی ئەو دیالیکتیکە تێدەکۆشا بیسەلمێنێ، ئەوەبوو ئەو پارێزەرانە پارێزەری قەڵپن، ئەوانە پێکهاتەیەکی نادروستی ڕژێمی سەرخانی چەوساندنەوەن لە جێی پارێزەرە ڕاستەقینەکە دایانناون، بۆ ئەوەی ڕووی چەوساندنەوەی خۆیان بەو شتانە لەبەر چاوی تاکدا جوان بکەن بەوەی وەهمی ئازادی تاکییان لەپێش چاودا خۆش و شیرین بکەن. کاتێکیش من ئەوانم بینی، یاخود لەو خوێندکارانەم بەرزتر و گرنگتر بینی، ئەویش ئەوکاتە بوو، کە چوومە نێو دنیای دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتییەوە، چیدی گوێم لەو جۆرە قسانەی تایبەت بە زێدەمافەکانی تاک نەبووەوە. کاتێکیش ئەو باسەمان لەگەڵ هێنانە گۆڕێ، لە ماوەی شەوی گیرانەکە تا ڕۆژەکانی پاشتر بەر لە "گەشەسەندنی گەڕاوە"؛ ئەوان سوکوئاسان دەستیان بە دینگەکانی جیهانی "کۆن"ـەوە گرت، بەوەی بە لای ئەوانەوە لە جیهانی "نوێ"دان - کەچی لە ڕاستیدا کۆن بوو - بەقەد پاشماوەی دێرینی ئەفسانەی گریکی کۆن.

---

[22]- زێدەماف: ئیمتیازات

بەڵام سیستمی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دژیەکیەکی دیکەی ئافراندبوو. دەسەڵات بەسەر خەڵکدا بابەتێکی بێ سنوور بوو لە دەستی دەسەڵاتدا. بۆ ئاسایش هەبوو خەڵکی لە هەر کاتێکدا بێ، بگرێ؛ هەروەها بۆ دەسەڵات هەبوو حوکمیشیان بەسەردا بدا، ئەوسا حوکمدانەکە بە دانپێدانان بێ یان بە بێ دانپێدانان بێ، بە بوونی شاهید و گەواهییەوە بێ یان بەبێ ئەوە بێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی شۆڕەوی ڕێگەی گرتنی لێنەبژارد، بەڵکو ڕێگەی بانگهێشتکردنی هەڵبژارد؛ ئەو بە کراوەیی دەست بەکارنەبوو، بەڵکو بە نهێنی ڕەفتاری نواند. خۆ ئەگەر لە جیهانی ئێمەدا مایەی قایلبوون بێ، کە دەسەڵاتی دەوڵەتێک لە بەرانبەر دەوڵەتێکی دیکەدا پەنا بۆ هێزی نهێنی و شاراوە ببا، ئەوا تەنانەت لەو جیهانەی خۆشماندا شتێکی نامۆیە، هەمان ڕێساش لەسەر تاکەکانی بن دەسەڵاتی قانوونی خۆی بەکاربێنێ. مێژوو پێمان دەڵێ بزووتنەوەی ژێرزەمینی، کە لە لایەن هاووەڵاتییانەوە دامەزرێنراوە هەمان ڕێسای نهێنییان دژی دەسەڵاتی خۆیان بە کارهێناوە؛ بەڵام لە یەکێتیی سۆڤیەتدا و لە ژێر زەمیندا لە ڕێی دەسەڵاتەوە ڕێسای کارا و بەهێز لە دژی هاووڵاتییەکانی خۆی بەکارهێنراوە.

کاتێکیش دەست بە لێکۆڵینەوەکەم کرایەوە، هەڵبەتە نەمدەتوانی بیر لەو هەموو شتانە نەکەمەوە. تەنیا حەپەسانێکی بەرایی و منداڵانەی سیستمەکە و لە هەمان کاتیشدا بە دۆزینەوەی شتەکان، خۆشحاڵییێکی تێکەڵە پەڕیە نێو دڵم.

لێکۆڵەرەوەکە بەڵێنەکەی خۆی دووپات کردەوە، هەرچەندە بە شێوەیەکی لێبڕاوانەی قەناعەتپێکەرانەش نەبوو، بەوەی ئەگەر من ڕاستییەکەی پێبڵێم، ئەوا ڕێگەم دەدا بچمەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆم. بەڵام تۆ بڵێی "ڕاستی"، ئەوەی دەیەویست لە منەوە گوێی لێبێ، کە ئەو

وا بە ڕێزەوە عەودالّی بوو، بە بزەوە ڕۆڵی داخوازییەکەی دەگێڕا چی بووبێ؟

"ئایا تۆ لە کایەی سیاسییدا کارای؟" وای لێپرسیم.

"بەڵێ."

"کامە؟"

"زایۆنیستی."

لە کامە ڕێکخراوی زایۆنیستیدا کارا بووی؟"

"لە «بیتار»."

"ئایا تۆ ئەندامێکی ئاسایی، یان لەوێدا نووسینگەت هەیە؟"

" نووسینگەم هەیە."

"کامە؟"

"من سەرۆکی ڕێکخراوەکەمان بووم لە پۆڵەندا."

"ئایا ئەندامی زۆرتان لە پۆڵەندا هەبوو؟"

"بەڵێ، بە دەیان هەزار."

"زۆر باشە ... هەنووکە هەموو شتێکم پێ بڵێ – هەموو شتێک – ئەوەی بە بیرتە! – شت دەربارەی چالاکییەکان لە «ڤیلنا» دژی دەسەڵاتی سۆڤیەتی."

"ئاخر هیچ جۆرە چالاکییەکی وەها لە گۆڕێدا نەبوو."

"تۆ درۆدەکەی!"

تا ئێستا ئەو ڕووی قسەی بۆ من بە شێوەی کۆ (ئێوە) بوو، ئەمەش بارێکی پەسەندکراوی پۆلیسی سۆڤیەتی بوو، بەڵام ئەمجارەیان هێرشەکەی تاکگۆییانە بوو (تۆ)[23]ی بەکار هێنا. لەوانەیە لەو ساتەدا و لێکدانەوەی ئەو شتانە، شتێکی قۆڕ بێ، بەڵام زێدەمافم ڕێگەی نەدام دڵنەوایی خۆم بدەمەوە، چونکە لە پڕێکەوە هەڵسوکەوتی کابرای لێکۆڵەرەوەکە گۆڕا.

منیش پێم گوتەوە: "من خوێندوومەتەوە، کە دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتی بە سۆز و ڕێزەوە ڕەفتار لەگەڵ هاوڵاتییەکانیان دەنوێنن، بۆیە داوات لێدەکەم "تۆ" بەرانبەر من بەکار مەهێنە، هەروەها شتێکی دیکەشت پێ بڵێم: من درۆناکەم."

"من نەمویست بێڕێزیت بەرانبەر بکەم،" لێکۆڵەرەوەکە وای پێگوتمەوە؛ "من دەبینم تۆ گراماتۆن Gramatone[24] (خوێندەوار)ی، بەڵام نابێ شانازی بە خۆتەوە بکەی. شتی سەرەکی ئەوەیە، تۆ دەبێ ڕاستییەکە بڵێی، پێدەچێ تۆ نەتەوێ ڕاستییەکە بڵێی. باشتر وایە بیری لێبکەیتەوە، چونکە بە خۆت ئازاری خۆت دەدەی."

بۆ ماوەیەک هەر ئەو دەمەتەقێیە بوو، بەشێوە و دەستەواژەی جیاجیاوە دووبارە دەکرایەوە. لە ڕاستیشدا ئەوەی من پێشتر بۆم باسکرد - یان بە قەولی خۆی، بەوەی من وەک "دانپێدانانێک" بۆم هەڵڕشت - بە گوێرەی قانوون و ڕێسای دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بایی ئەوەندەم کەرەستە دایە دەست، کە پێیەوە

---

[23]- لە دەقەکەدا وشەی ti ی ڕووسی بەکارهێنراوە کە واتای تۆ دەدا.

[24]- گراماتۆن: دەقاودەق واتای ئەوە دەگەیەنێ: ئەوەی دەزانێ بخوێنێ و بنووسێ، بەڵام ڕووسەکان لە ڕستەدا بەکاریدەهێنن، بە واتای پێهەڵدان بەکاری دەهێنن، واتا خوێندەواری، ئەوەی پلەیەکی لە خوێندن بڕیبێ. نووسەر

لەناوم ببا. ڕاستییەکەش، شتێکی وا لەو قسانەی مندا نەبوو، بۆ ئەو نویێ بێ. ئاخر خۆ کاری ئێمە لە پۆلۆنیادا ئاشکرا و ڕاشەکاو بوو، زانیاریشیان دەربارەی چالاکییەکان پێشتر لە ڕێی سووسەکارە جووەکانەوە پێگەیشتبوو، کەواتە هیچ شتێک نەمابۆوە بۆ دزەپێکردن. ئەوەش ڕاستی بوو، من هەموو ئەو شەوانەی بە بێداری خۆمانم لە «ڤیلنا»، «کۆنۆڤۆ» و شارە لیتوانییەکانی دیکەدا پێنەگووت، کە بۆ یادی زیڤ ژابۆتنسکی لەسەر پێ بووین.

ئەو پرسەم پێنەگوتن کە دوای سی ڕۆژ لە مەرگی «ڕۆش بێتار»دا لە گۆڕستانی ڤیلنادا دامانـا، لەوێ بە دەیان ئەندامی بێتار ئامادە بوون، لە نێویشیاندا «جوزیف گلازمان»، کە دواتر سەرکردایەتیی جەنگاوەرانی گیتۆی ڤیلنای بەدەستەوە گرت، «ئیسرائیل ئیپستاین» وەک یەکێک لە ئەفسەرانی «ئیرگون زڤای لیومی» لە ڕۆما گیانی لەدەست دا؛ «ئابراهام ئامپەر» بووە یەکێک لە عەریفەکانی «ئابراهام ستێرن»، هەروەک سەرکردەکەی بە دەستی ئاژانە بەریتانییەکان کوژرا؛ «ناتان فریدمان» و «د. سخێب» لە یەک کاتدا جەنگاوەرانی ئازادی بۆ ئیسرائیل بوون کە بە «گرووپی ستێرن» ناسراوبوون؛ «دایڤید یوتان» کە بە پەرجوویێک لە دەست ڕەشبگیری ڕووسەکان دەرچوو، بەڵام لەوەدا سەرنەکەوت، کە لە چنگ بەریتانیەکان و ئۆردوگای زۆرەملێی ئەریتێریا ڕزگاربێ؛ «یەراخمیل ڤیرنیک» کە ئێستا بۆتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی «یزما» لە ئیسرائیل؛ «شلۆمۆ سکلولسکی» شاعیر و چەندانی دیکەش لە یادکردنەوەکە ئامادەبوون. ئاڵاکەمان بە دزییەوە بۆ ڕێوڕەسمەکە لەگەڵ خۆ بردبوو. ئێمە لە دەوری گۆڕی گەنجێکی ئەندامی «بێتار» خڕببووینەوە، ئەو گەنجەی لە سەرما و لە ڕێی «ڤیلنا» کە دەیەویست بەرەو فەلەستین بڕوا، لە سەرما ڕەقببووەوە. ئێمە نوێژمان لەسەر کرد و سروودی «ڕۆش بێتار»، «میۆڤ ڕیکاڤان ئافارما»، سروودەکەی شۆڕشمان دەگووتەوە، لەو بڕوایەدا بووین، دەبێ ئیسرائیل لە نێو وێران و سوتماکدا، دیسان

هەڵبستێتەوە. بە شەکانەوەی ئاڵای شین و سپییەوە بەسەر گۆڕستانەکەدا، سوێندمانخوارد بڕوامان بە ڕاسپاردەی مامۆستاکەمان، بە هێزی ژیاندنەوەی نەتەوەکەمان هەبێ، ئەوسا لەبن هەر هەلومەرجێک و بە هەر نرخێکیش بێ. "ئێمە ئێستا دەبێ ئەو زێدەمافەی تێکۆشانمان لە پێناو زایۆندا هەبێ" من ئەمەم بە گرووپی «شینگێر» گوت. "بەڵام ئەگەر لە ڕێی کارەکەشماندا ڕێمان لێگیرا، ئەوەش هەرباشە کە لە پێناو زایۆندا ژانبگرین. دەی هەر چیەک بێتە پێش با بێتە پێش؛ دەبا دەرەقەتی بەدیهێنانی ئەرکەکانمان بین."

هەڵبەتە ئەو جۆرە چالاکییانە بە تاوانی سیاسی دادەندران؛ ئەوەش دەبێ بگوترێ، ئەم کارانە لە چاوی کاربەدەستانی سۆڤیەتی تاوانی ڕاستەقینە بوون. تۆ بڵێی ئێمە ئەو کارانەمان بە تاوان زانیبێ؟ باشە دەبێ بە چ پێوەرێک ئەو گردبوونەوە ماتەمبارییەمان زیانی بە حکوومەتی مۆسکۆ گەیاندبێ؟ مایەی حاشایی لێکردن نەبوو، لە ژێر هەژمەوونی ڕژێمەکەدا، هەوڵدەدرا هەر لە ڕێلادانێک بە توندی سەرکوتبکرێ، ئەم جۆرە پرسیارانە ساویلکە بوون. بەڵام خۆ شتەکە ڕاستەقینە بوو، لێکۆڵەرەوەکەش پرسیاری ئەوەی لێکردم، ئاخۆ چ چالاکییێکمان لە «ڤیلنا» دژی حکوومەتەکەی کردووە. منیش نکۆڵیملێکرد، کە چالاکییێکی لەو جۆرە کرابێ، قەناعەتیشم وابوو ڕاستی دەڵێم. بەڵام کاتێ لێکۆڵینەوەکە درێژەیکێشا و بەردەوام بوو، تێگەیشتم، مەبەستی ئەو شتە بێ بەهایانە نەبوو؛ ئەو مەبەستی کاروچالاکی شۆڤاری و خۆ ئامادەکردن بوو بۆ کردەی تێکدەرانە. لە بەرانبەر ئەو ڕاستییەشدا، ئەو پڕ بە دەم بەڵێنی پێدام من بە بێ وەی بگەڕێنتەوە ماڵێ، بەڵام لەناو دڵی خۆیدا بۆ ناو گۆڕ.

ئەوەی لە ئەنجامی ئەزموونی بەندکراوەکانی دیکەدا فێربووم، هەر بەشێکی "شێوازە زانستییەکە" بوو. پیاوێک کە لە لایەن دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنستی سۆڤیەتی وەک دژبەرێکی سیاسی بگیرێت، ئەوا

به کردنی کاریکی دیاریکراو تۆمەتبار ناکرێ، بەوەی شتێکی دیاریکراوی کردبێ یان نەکردبێ، بەڵکو هەر لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەدا ڕووبەڕووی تۆمەتبارکردنی کوشندە دەکرێتەوە، هەروەک سیخوڕێتی و کاروباری تێکدەرانە، ئەمانەش تاوانبارکردنێکی ڕۆتینیانەی ڕۆژەڤ بوون. لەو کاتەدا بەندکراوەکەش تەواو دەحەپەسێ و حاشاییش لە هەر هەموویان دەکا. لێکۆڵەرەوەکەش هەر سوور دەبێ، کە بە تەواوی دانپێدانانی لە بن زمان دەربهێنێ. بەندکراوەکە هەوڵ دەدا قەناعەت بە لێکۆڵەرەوەکە بێنێ، کە ڕاستی دەڵێ، لەپێناو ئەوەش، بۆ ئەوەی لە تەون و داوی ڕاچێنەرەوای تۆمەتبارکردنەکە دەربچێ، ڕەنگە دان بە هەرە سووکەکەیاندا بنێ، ئەگەرچی نەشی کردبێ.

ئەرێ تۆ بڵێی لێکۆڵەرەوەکە بڕوای بەو تاوانبارکردنەی من هێنا بێ، یاخود ئەویش هەر لە سەر شێوازی پێواژۆی لێکۆڵینەوەکە ڕۆیشتووە، لە تۆمەتبارکردنە هەرە سامناکەکان دەستپێکردووە بۆ هەرە سووکەکان، لەوەی قورسایی هەرە سووکەکەشیان بە قەد ژیانی من قورس بوو؟ شتێکی زەحمەتیشە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە. چەند سەعاتێک بوو لێکۆڵینەوەکە دەستی پێکردبوو، دوای ئەوەی جارێکی دیکەش لێکۆڵەرەوەکە لەوە دڵنیایکردمەوە، کە بە لادان لە ڕاستی گوتن، هەر خۆم ئازاردەدەم، لە پڕێکەوە قسەکانی گۆڕی و گوتی:

"من دەمەوێ تۆ لێرە بەتەنیا جێبێڵم. لێرە قەڵەمێکت لەبەر دەستە، کاغەز و مەرەکەبیشی لێیە. دەی بنووسە، هەموو شتێک سەبارەت بە ژیانت و بە چالاکییەکانت بنووسە. بەڵام باشترە ڕاستییەکە بنووسی. لە هەموو بارێکدا ئێمە دەزانین ... تۆ هێشتا ئەو دەرفەتەت لە پێش ماوە بچیەوە نێو ماڵ و حاڵی خۆت. دەی هۆشیارانە بیر بکەرەوە و ڕاستیەکە بخەرە سەر کاغەز."

منیش هێشتا فێرنەببووم بە باشی بە زمانی ڕووسی بنووسم. ئەوکات لە زمانەکە دەگەیشتم، لە ڕێی بیستنەوە فێرە قسەپێکردنیش ببووم، دەمتوانی بە بەکارهێنانی چەند وشەیەکی پۆلۆنی، بە ڕووسی وەڵامی پرسیارەکان بدەمەوە. بۆیە لە لێکۆڵەرەوەکەم پرسی، ئاخۆ باشتر وانییە سەربردەی ژیانی خۆم بە زمانی پۆلۆنی یان بە یدیشی[25] بنووسمەوە.

"هەمووی بۆ من وەک یەکە،" ئەو وەهای وەڵام دامەوە. "ئێمە لێرە لە زۆر زمانەوە وەرگێڕمان هەیە، بەڵام بە ڕوانینی من باشترە بە زمانی یدیشی بینووسی، چونکە منیش جووم."

منیش قسەکەم قۆستەوە: "بەڕاست؟"

ئەویش وەڵامی دامەوە: "بەڵێ. من جووم، هەر وەک جووێکیش دەکرێ متمانەم پێبکەی. تۆ بە تەنیا هەر ڕاستییەکە بنووسە!

---

25- یدیشی: زمانی جووەکانی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی بوو بەر لە هۆلۆکۆست. لە بنەچەکیشەوە زاراوەیەکی ئاڵمانی پڕ لە وشەی عیبری و چەندین زمانی هاوچەرخ بوو، هێشتاش نزیکەی ٢٠٠٠٠٠ کەس قسەی پێدەکەن، بە شێوەیەکی سەرەکیش لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، ئیسرائیل و ڕووسیا پێی دەدوێن.

٣

# دیوارەکە

کاتێک دانیشتم سەربردەی ژیانم بنووسمەوە، ژیاننامەم بیرکەوتەوە، ئەو ژیاننامەیەی کە پێش ئەوەی بچیتە قوتابخانە, بۆ ئەوەی وەربگیرێی یان بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوە بینووسی. ئاخر کێ بیری بۆ ئەوە دەچوو، کە ڕۆژێک بێ، من بنووسم: "من لە ١٩١٣ لە دایکبووم ... چوومە قوتابخانە ... لە خوێندنەکەم بوومەوە ..." ئەمەش بۆ قوتابخانەی بالآی ژانوناسۆر، بۆ زانکۆی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەت!.

هەمیشە بۆ ڕۆژانی قوتابخانە بە تاسەوە بووم، بەڵام هەرگیز هەستم بە پەستی و گرژی سالآنی ڕابردووم نەکرد، کاتێ دانیشتبووم، دەبوایە مێژووی ژیانم بۆ ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بنووسمەوە.

لەو ساتانەشدا، پەڕجوو دەخولقێ و ڕاستی لە بوونی خۆی دەوەستێ؛ بەرهەمی چاکە و خراپی ئەندێشە جێگەی دەگرێتەوە. بەڵام خۆ ئەو ساتانە، هەر بە ڕاستی ساتی لاوازی و زەبوونین. پیاو کاتێ ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەیەکی بالآدەستی ژانوناسۆر دەبێتەوە، هی ئەو شتانەی بڕوای پێی هەیە و بۆی تێدەکۆشێ، ئەوا پێویست نییە خۆی بە داوی سەردەمی کوڕوکاڵێتیدا شۆڕبکاتەوە و لەوێوە لەنگەر بگرێ. ئەو پێویستە ئەوە بزانێ، کە چیدی دەستی خۆشەویستی دایکایەتی بەسەری دانایەت و دڵنەوایی ناداتەوە، ئەو خۆشی و چێژی

کوڕوکاڵێتیش چیدی بەشێک نییە لە ژیانی ئەو. سەعاتە بێدارەکانی ئێمە ڕاستی و داکەوتن نەوەک سەعاتی خەونەکان. ئاخر لەوێدا نە ماڵ هەیە، نە دایک، نە خوشک نە دۆست. لەوێ تەنیا دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤێتی هەیە. لەوێ لێکۆڵەرەوەیەک هەیە، هەر داوای ڕاستیت لێدەکا. ئەو خوازیارە ئەو شتەی دەیەوێ بە دەستی بێنێ، بیگۆڕێتەوە بە بەڵێنی گەڕانەوەی سەلامەتبوونم بۆ نێو ماڵ و حاڵم؛ بەڵام پێشی خۆشە شتەکە بخوێنێتەوە، ڕەش و سپی بۆی نووسرابێ، وەک هێلکەی پاککراو لە سەرچاوەیەکی متمانەپێکراوی هاوبەش، خرابێتە بەردەمی ...

بەڵێ من دەبوایە کورتە چیرۆکێکی ژیانم بنووسم و خۆشم بۆ کاروانێکی دوورودرێژ ئامادە بکەم. لەبەردەممدا کاغەز و قەڵەم و مەرەکەب هەبوو، پاسەوانانی شۆڕش بە دلۆڤانییەوە بۆیان هێنابووم. لە پشت منیشەوە سەربازێک بە خۆی و تفەنگەکەیەوە وەستابوو. ئینجا دەی بنووسە و هەر بنووسە!

سەربازەکەی سوپای سۆڤیەت دوای ئەو کورتە ماوەیە لە سەرشانۆکە ئامادەبوو، کەرەستەی نووسینیان خستە بەردەستم. ئەو لە لایەن عەریفێکەوە هێنرایە ئەوێ، لەو کاتەوە هەرگیز بە تەنیا نەمامەوە، نە لەو ژوورەی کە لێی بەندکرابووم، نە لە شوێنی دیکەش کە بۆی نێردرام. پاسەوانەکەم لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستا و دەستیشی لەسەر قۆنداغی تفەنگەکەی بوو، چاوەکانیشی لەسەر هەموو جووڵەیەکی من بوو. ئەو هیچی نەگوت و منیش سەرم بەسەر کاغەزدا گرتبوو، دەمنووسی.

لە نووسینی پەخشانەکەم بوومەوە، تیایدا ئەوەم سەلماندبوو، کە لە کاتی خۆناسینم وەک کوڕوکاڵێک، بە ڕۆژانی دواتریش، ئەوکاتەی سەرۆکی جووڵانەوەی «بێتار» بووم لە پۆلۆنیا، کارمکردووە تا خەڵکی ئیسرائیل بگەڕێتەوە سەر نیشتمانی خۆی. پاشان کە

لێبوومەوە، دیسان دەستم دایەوە کتێبەکەی «ماوریس» و کەوتمەوە سەر خوێندنەوەی سەردەمی "بەر لە مێژوو"، ئەو چاخەی هەر بە ڕاستی خەونبینانی زایۆن هەبوون، هەرچەندە هەرگیز بە مێشکی ئەواندا نەهاتبوو، ڕۆژێک دابێ، خەونەکەیان بە تاوان لە قەڵەم بدرێ. پاسەوانەکە لێگەڕا بە کەیفی خۆم بخوێنمەوە. من سەرم بەسەر کتێبەکەدا داگرتبوو، چووبوومە نێوی و ئاگام لە کات نەما.

لە هیکەوە دەرکەکە کرایەوە و یارۆی لێکۆڵەرەوە بە هەنگاوی خێراوە وەژوور کەوت. بۆ مایەی سەرسامیم، سەرەتا چووە لای پاسەوانەکە و جۆرە بەڵگەنامەیەکی نیشاندا. پاسەوانەکەی بە خەمخۆرییەوە لێیڕوانی و شتێکی وەهاشی دەربڕی، کە تەواوە و ئینجا لە ژوورەکە چووە دەر. کاتێکیش ئەفسەری دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لە بەردەمم لەسەر مێزەکە دانیشت، بە میهرەبانییەوە لێیپرسیم: "باشە، ئەرێ لە نووسینەکەت بوویەوە؟ بە پەرۆشم ئەوەی نووسیوتە بیخوێنمەوە."

منیش ژیاننامەکەم دایە دەست. ئەویش لاپەڕە دەستنووسەکەی لێوەرگرتم، سەیری پیتە چوارگۆشەکانی کرد و لە لایەک داینا. ئەو شتەکەی نەخوێندەوە. تەنانەت هەر خۆشی تێکنەدا تا بیخوێنێتەوە. پێم سەیر بوو هەر بتوانێ بە زمانی زگماکی بخوینێتەوە. بەڵام لە جیاتی ئەوەی بایەخ بە نووسینی پیتە کۆنەکانی زمانی پێنووسراو بدا و ئەو پەخشانە بخوێنێتەوە، کە خۆی داوای کردبوو، هاتەوە سەر یاسینێ گۆلکێ[26] و پرسیارە کۆنەکەی کردەوە.

"ئەرێ ئامادەی ڕاستییەکە بڵێی؟"

منیش دووپاتم کردەوە، ئەو شتەم نووسیوە کە پێشتر پێم گوتبووی، هەمووشی هەر ڕاستییە. خۆ ئەگەر لەسەر ئەوەش گیرابم، قەیناکا.

---

[26]– یاسینێ گۆلکێ: ئیدیۆمێکە واتای گەڕانەوە بۆ سەر شتە کۆنە بێکەڵکە سواوەکە.

"ئایا نازانی، ئێمە شێوازی وامان هەیە، ناچارت بکا دان بە هەموو ڕاستییەکەدا بنێی؟"

لێرەدا هیچ شتێک نەبوو وەڵامدەرەوەی بێ.

"باشە بۆچی شتێک نالێی؟"

ئاوەها لیکۆڵەرەوەکە بەسەرمدا تەقییەوە.

"ئایا پێتوایە بەو پارچە کاغەزانە ڕزگارت دەبێ؟ من ئەو نووسینەی تۆ دەخوێنمەوە، بەڵام ئامۆژگاریت دەکەم بە پێگەی خۆت، بە قسەکانتدا بچیتەوە. باشتر وایە کەللەڕەق نەبی."

چەندین جار - هەر خوا دەیزانی چەند جاران - یارۆی لێکۆڵەرەوە ئەو داخوازییە، هەمان هۆشداری و هەمان ئاماژەی ڕەش و شوومی لێ دووبارەکردمەوە. چەند سەعاتێک بەسەر ئەوەدا تێپەڕین کە پێم ناوەتە بارەگاکەیان. من بە نوێژی نیوەڕۆ گیرام، کاتێکیش دووەمین گفتوگۆمان بەرەو کۆتایی دەهات، تاریک داهات. من برسیم بوو، زیاتریش تێنوو بووم. داوام لە لێکۆڵەرەوەکە کرد بەڵکو قوومە ئاوێکم بدەنێ.

"بەڵێ بێگومان. وادەکەم چایەت بۆ بێنن."

من نەمدەزانی بۆچی هێنانی چایە پێویستی بە ئامادەکاری و ڕێکخستن هەیە، بەڵام ئەو بەڵێنەی لە بەردڵم خۆش هات، کەیفم پێهات. خەریکبوو لە تینوێتیان بڕستم لێ ببڕێ. دیسان لێکۆڵەرەوەکە منی لە ژوورەکەدا بەجێهێشت. کاتێکیش ئەو دەرچوو، پاسەوانەکە هاتەوە جێگەی خۆی. من دانیشتم و هەر چاوەڕێی چایەکەم کرد، لەو بەینەشدا دەستم بە خوێندنەوەی ژیانی «لۆرد باکۆنسفیلد» کردەوە.

ئەو دەســـتەی ســـەعاتم چەنـــد جارێـــک کەوتەخـــوار. مـــن لەســـەر خوێنـــدنەوەکەم بەردەوامبـــووم، تـــا ئەو کـــاتەی نـــۆرەی گـــۆڕینی پاسەوانەکەی باڵەخانەکە هات. عەریفێکی بچکۆلە لەگەڵ دەستەیەک لە سەرباز هاتنە ژوورەکە، داوای لە یەکیان کرد جێگەی پاسەوانی یەکەم بگرێتەوە و داوای لە پاسەوانەکەی منیش کرد لەگەڵی بڕوا. سەرنجمدا پاسەوانی یەکەمم شتێکی بە گوێی عەریفەکەدا چرپاند.

"ئاوەها؟" عەریفەکە بە دەنگێکی بەرز دوا، دەستبەجێش ڕووی لە من کرد ؛ "دەبینم تۆ کاتی خۆت بە خوێندنەوەی کتێبان بەسەر دەبەی، ئایا پێتوایە ئێرە ژووری خوێندنەوەی یانەیە؟ کێ بە تۆی گوتووە، کە بۆت هەیە بخوێنیتەوە؟"

منیش وەڵامم دایەوە: "لێکۆڵەرەوەکە ڕێگەی پێداوم."

"لێکـۆڵەرەوەکە؟ قســـەی ئەو لێـرە نـاخوا. ئـێمە ئێســـتا بەرپرســـیاری ژوورەکەین. ئەو سەربازەی لەوێ وەستاوە لە من بەرپرسە، منیش لە بەرانـبەر مەزنەکەی خـۆم. لێکـۆڵەرەوەکە دەســـەڵاتی نیـیە ... لێـرە بە دواوە خوێندنەوە نییە. تکایە ئاگات لەوە بێ!"

ئینجـا عەریـفەکە فەرمـانی پێکـردم کە ئەو کورسـییەی بەردەم مێـزەکە هەڵبگرم، لە قوژبنی ژوورەکە دایبنێم. ڕۆخی کورسـییەکە خەریک بوو بەر دیوارەکە بکەوێ، پشتەکەشـی ڕێک بەرانـبەر دیـوارەکە. هێشـتا بە تەواوی سەیری ئەفسەری پاسەوانیم نەکردبوو، کەم تا زۆر لە بـارێکی نەشـــیاودا دانیشـــتبووم، ڕووم لە دەرکە و لای چەپەشـــم لە دیـــوارەکە بوو.

"نەخێـر، نـابێ وا دابنیشـی،" خێـرا عەریـفەکە دانیشـتنەکەمی بـۆ ڕاسـت کـردمەوە. "دەی ڕووی خـۆت لە دیـوارەکە بـکە. ئینجـا تـۆش" وەهـای

گوت و ڕووی دەمی لە پاسەوانە نوێیەکە کرد، "کاری تۆ ئەوەیە ئەو بەو شێوەی گوتم دابنیشی، ڕێگەی نەدەی چیدی کتێب بخوێنێتەوە."

بەڵێ، گۆڕانێکی ڕیشەیی لە بارودۆخەکەم ڕوویدا. ئیدی لە جیاتی کتێب، دیوار هات. بەڵام دەبێ پێ لەوە بنێم، لە چەند ساتی سەرەتای دەرکردنم لە بەهەشتی عەدەنەوە - هەر پیاوێک و لە بن هەر هەلومەرجێکدا بێ، بەهەشتێکی تایبەتی خۆی هەیە کە لێیەوە دەردەکرێ - من بیرم لە دیوارە ڕەقوتەقەکە نەکردەوە، کە لە جیاتی کتێبەکەی «ماوریس» لەبەردەممدا قیت بووەوە. هێشتا هەر بیرم لەو ڕاگەیاندنە سەیر و سەمەرەی عەریفەکە کردەوە کە وتی: قسەی لێکۆڵەرەوەکە لێرە ناخوا ... لێرە ئێمە بڕیار دەدەین ...

من بیرم لە قسەی یارۆی لێکۆڵەرەوەکە کردەوە، کە پێیگوتم: "ئێمە هەموو شتێک دەزانین. باشتر وایە ڕاستییەکەمان پێ بڵێی." باشە، کەواتە لێرەدا کێ پێناسەی "ئێمە"ی لێکۆڵەرەوە و "ئێمە"ی عەریفەکە دەکا؟ باشە یەکێکیان ئەفسەری دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و ئەوی دیکەش بەردەستی ئەفسەری هەمان دەزگە نییە؟ هەروەها ئەوەشم لە بیرە، کە چۆن ئەو ئەفسەرەی دەزگەی ئاسایش بووە دادوەری من، بەر لەوەی دەست بە کارە فەرمییەکەی خۆی لە بەرانبەر مندا بکا، چۆن خۆی بەو سەربازەی دەزگەی ئاسایش ناساند. پێدەچوو لە یەکەمین قۆناغی گرتن، یان ڕاستر بڵێین زیندانیکردن، لە نێو دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا دەسەڵاتێکی دووسەرە بۆ گیراو یان بۆ زیندانی هەبێ. ئینجا ئەرکی لێکۆڵەرەوە ئەوەبوو دانپێدانان لە بن زمانی گیراوەکە دەربهێنێ. هەرچەندە کابرا نمرە و پایەی دادوەری لێکۆڵەرەوەشی هەبێ، بەڵام ڕەفتارەکەی لەوە زیاتر نییە، کە "گفتوگۆ"یەک لەسەر ڕێڕەوێکی ئاشنایانەدا بەڕێوە بەرێ. دەسەڵاتی ڕاستەخۆش بەسەر گیراوەکەدا، بەر دەسەڵاتێکی دیکە دەکەوێ. جێگەی گومانیش نییە، ئەم دووسەرەییەی دەسەڵاتە، لە

شوێنێک لە یەکێ لە پلە باڵاکانی فەرماندەیی نێو دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە بەیندا نامێنێ.

من چ وەک زیندانییەک و چ وەک پیاوێکی ئازاد لە ڕووسیا، لەو کاتەی ئەو سیستمە بێوێنەیە پەیڕەودەکرا، شتەکەم بۆ دەرنەکەوت. لەوانەیە ئەمە دەرچەی «چیکا» و «گی پی ئو» بێ کە لەلایەن «ژیرزنسکی»[27] یەوە داهێندرابێ، بەڵام پێشدەچوو تەنیا لەگەڵ هاتنی دژەشۆڕش (چەواشەیی) بۆ شۆڕشی ئۆکتۆبەر داهێنرابێ.

خۆ ئەگەر دەسەڵاتدارە حوکمڕانەکان سەرکردە بەلشەفیکەکان بگرن، کە جەماوەرێکی زۆریان هەیە، ئەوە شتێکی لۆژیکی بوو نەیاندەنە بەردەستی ئەفسەرەکان بۆ لێکۆڵینەوە، بەڵکو بیاندەنە دەستی «گاردۆڤۆیل» و «ستریلۆک»[28]، ئەوانەی گێرمەگێرم نازانن! ئەفسەری لێکۆڵەرەوەش خواست و ئارەزووی خەڵک جێبەجێدەکا کاتێ داوایدەکا بەوەی دوور بکەوێتە لە ئیغراکردن، لە هەڕەشە و ناوزڕاندن، ئەمەش بۆ ئەوەی دانپێدانانێکی تەواو لەو کەسانە وەربگرێ، کە تا دوێنێ بوو، فەرماندەری دروشمەکانیان بوون. ئاخر لێکۆڵەرەوە خوێندەوارە و دەزانێ کێ لە بەرانبەردا دانراوە؛ ئاوەها دیارە چ جۆرە مەترسییەک لە ئارادایە ...

لە سەرێکی دیکەوە، هەرچی «ستریلۆک - یاساوڵ»ـە بەدەر لە توندوبەندییێکی خۆزایی هیچ شتێکی دیکە نازانێ. ئەو بە ئاستەم سەرودەر لە خوێندنەوە دەردەکا، بۆ ئەو کارە کاڵا بەقەد باڵایە، هەر بۆیە پشتی پێدەبەسترێ. خۆ ئەگەر گەورەکەی، عەریفەکە فەرمانی پێبکا، پاسەوانی لە بەندکراوەکە بکا، کە پێیبگوترێ ئەوە تاوانبارە، ئەوا

[27]- چیکا Cheka و گی پی ئو G.P.U دوو دەزگەی هەواڵگری و لێکۆڵینەوەی پۆلیسی بوون لە لایەن سکرتێری ڕێکخراوەکانی سۆڤیەتی «فلێکس ئێدمۆندۆڤیچ زیزێنسکی (١٨٧٧-١٩٢٦) داهێندران.

[28]- گاردۆڤۆیل gardovoil و ستریلۆک strilokدوو ناون بۆ پاسەوان و ئێشکگر. نووسەر

بە هەموو شێوەیەک پاسەوانی دەکا و نایەڵێ مێشیشی لێ نزیکبێتەوە تەنانەت خودی لێکۆڵەرەوەش. خۆ ئەگەر بەندکراوەکە «یاگۆدا» ی سەرۆکی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش بێ، بە ئەو چی؟ خۆ ئەگەر تاوانبارەکە «یزشۆڤ»ی جێگرەوەی «یاگودا»ش بێ، چی لە پرسەکە دەگۆڕێ؟ ئەگەر هاتوو پیاوێک بێ بە فەرمی پێگەی سەرۆکی یەکێتیی سۆڤیەتیش بێ، ئەوا بۆ کابرای «ستریلۆک - یاساوڵ» هیچ ناگەیەنێ، چونکە لای ئەو تەنیا یەک شت دەخوا: ئەو کەسەی ئەوی لەوێ داناوە، هەر ئەویش دەتوانێ بەری بدا. دوای شۆڕش، دەزگەی هەواڵگریی نوێ لە ڕووسیا پەرەی پێدرا، بەڵام تەنانەت شۆڕش پشتیشی بە دەزگەی هەواڵگریی خۆی نەبەست. خۆ ئەگەر هاتبا و پشتی بە هەر یەکەیان بەستبا، باشتر وابوو پشت بە کۆلکە خوێندەوارەکان ببەستێ، ئەوانەی بە ئاستەم دەیانزانی بخوێنن و بنووسن.

ئێمە دژیەکی (پارادۆکسێک)ی دیکەمان سەبارەت بە ڕژێمی سۆڤیەت یاخود ڕژێمی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە بەردەمدا هەیە. دەسەڵاتی حکوومەت یان هێزی پۆلیس، شتێکی نائاسییە، بەڵام خستنە بەردەستی ئەو هێزە بۆ ئۆپەراسیۆنێک کە هۆشدارییێکی نائاسایی یاوەری بێ، ئاگادارکردنەوەیەکە سنوورەکانی ترس و ئاڵۆزی بێ. ڕژێم خۆی بۆ جەماوەر دانابوو، بەڵام هەموو متمانەیەکی بە دەزگەی ئاسایش هەبوو. تەنانەت ئەو متمانەیەش پێگەیەکی لە نێو بێمتمانەییدا هەبوو. خۆ ئەگەر ئێمە لە لایەن خەڵکانێکەوە دادگەییبکرێن کە لەڕێی دەزگەی ئاسایشەوە بێ، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ زۆرینەیان دوژمنی ڕژێمی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیین. بەڵام خۆ ڕژێم هەر بێمتمانەیی بە دوژمنەکانی نییە، جا ئەوسا چ دوژمنی ڕاستەقینە یان خەیاڵکردە بن، بەڵکو بێتمانەیی بە دۆستەکانی خۆی، بە خزمەتکارەکانی و بە پاسەوانەکانیشی هەیە ... "ئێمە لێرە بڕیاردەدەین،" ئەوە قسەی عەریفە کورتەباڵاکە بوو بە منی گوت، بە هەردوو

چاوەکانی خۆشم بینی، دادوەرەکە - کە دیاربوو چارەنووسی منی لە دەســـت بـــوو - بەر لە دەســـتپێکردنەوەی لێکـــۆڵینەوەکە مـــۆڵەتی لە پاسەوانەکە خواست.

لێکۆڵەرەوەکەم بۆ ئەوەی نیازپاکی خۆی بسەلمێنێ زیاتر لە جارێک پاسەوانەکەی گۆڕی. نزیکەی شەست سەعات بەو شێوەیە مامەوە، لە بەرانبەر دیوارەکە دایاننیشاندم. شەو هات و ڕۆیشت، ڕۆژی دیکەشی بە دوایـدا هـات. پاشـان شـەو و ڕۆژێکـی دیـکەش. کـاتێکیش شـەوی سـێیەم خەریـک بـوو تەواو ببـێ، دانیشـتنە نـاوازەکە کۆتـایی هـات و ئاساییەکە دەستی پێکردەوە ...

پێمـــوایە ڕەوتـــی ئەو دانیشـــتنە شەســـت (٦٠) ســـەعاتەی ڕوو لە دیوارکردن، باندۆرێکی کەمی بەسەر خوێنەرەوە هەبێ. منیش ئێستا دوای دە ساڵێک بە سووکی ئەو شتانە دەنووسمەوە. ئەوەی ڕاستی بێ، من بەختم هەبوو. دەنا دەبوایە هەشتا سەعات، سەد سەعات و بگـرە زیـاتریش ڕووەو دیـوارەکە دایانیشـاندبام. بەڵام گریمـانەیەک بـۆ خوێنەری خۆم دادەنێم کە تاقیکردنەوەیەکی سادە بکا: با کورسییەک لە بەرانبەر دیوار دابنێ، هەروەک چۆن ئاسایش وای لە من کرد و سـەعاتێک و دووان بەو جـۆرە دابنیشـێ، ئەژنۆکـانی بـداتە دیـوار و چاویشی لە دیوارەی بەرانبەرەوە بزکاتەوە. من دڵنیام ئەگەر خوێنەر هەر بەشـــێکی ئەو تـــاقیکردنەوەیە بکـــا - ئەمەش تـــاقیکردنەوەیەکی قورســـە، وەنەبـــێ هەر لە یەک گۆشەنیگاشـــەوە وابـــێ - ئەوســـا لە خۆشییە کێوییانەکەی من تێدەگا، کاتێ شەشت سەعاتەکە تەواو بوو، یەکســـەر لەســـەر دۆشـــەکەکەی نێـو زینـدان خـۆم لێـک کێشـایەوە و ڕاکشام.

خۆی ئەوە ڕاستە تەنانەت پنتێکی سەر دیواریش دەکرێ ببێتە کتێبێکی کراوە، خاڵێکی سەر دیوار دەکرێ ببێتە نمایشگەیەک بۆ نیشاندانی ئەو وێنانەی کە فەرامۆشکرابوون و یارمەتی مرۆ بدا بۆ لەبیرچوونەوە.

تەنانەت ئەو خاڵەی سەر دیوار دەکرێ باسی ماڵەوەش بکا؛ باسی ئەو دڵۆپە فرمێسکەی چاوەکانی منداڵیش بکا، کاتێ لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، چونکە مامۆستاکەی نمرەی کەمی داوەتێ، ئەوەش وەنەبێ لەبەر ئەوە بووبێ، کە دەرسەکانی نەزانیوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەیویستووە لە شابات (شەممە)دا ناوی خۆی لە قوتابخانەیەکی بێگانەدا بنووسێ و ویستوویەتی لە ئاست سووکایەتی و گاڵتەپێکردنی خەڵکدا بڵێ: "بەڵێ، من جووم و شانازیش بەوە دەکەم، کە هەوم." ئەو خاڵەی سەر دیوار نمایشی سەرهەڵدانەوەی پەڕجووئاسای گەنجێکی جوو دەکا، کە بە شانازییەوە لە نێو "سوتماک و وێرانەدا" هەڵدەستێتەوە، و چاوی پیرەمێردێک نیشان دەدا کە پڕ لە فرمێسکە، دەستی بە پەرجووەوە گرتووە، لە کاتێکدا وێردی سەر دەمی هەر شوکرانەبژێرییە کە ڕۆژی بەم ڕۆژە گەیشتووە. دەکرێ هەر ئەو خاڵە چیرۆکی یەکەمین دیداری لەگەڵ «زییڤ ژابۆتنسکی» بگێڕێتەوە. هۆڵی شانۆی پارێزگەکە گەورە نییە، بەڵام ئەوەندەی خەڵک تێدایە لێی زیادە. بۆ تۆ، بۆ تۆی کوڕوکاڵ، هیچ ژوورێک لە نێو هۆڵەکەدا یان گەلەرییەکەدا نەماوە، وەک ئەوە وایە هەر بینا بەسەریەکدا بڕمێ. بەڵام بە ئاستەم لە خوارووی سەکۆکە خۆت دەخزێنیە نێو ئۆرکێستراکە. لەوێ دادەنیشی، لەوێ لە خوارەوە جێی خۆت دەگری، ئەوسا لەگەڵ هەموو دەمارێکی جەستەتەوە هەستدەکەی گەزگەز باڵادەکەی، بەرز دەبێیەوە بۆ سەرەوە ... ئەرێ قەت بردوتەتەوە؟ نەخێر، لەوە زیاتر نا. تۆ بۆ هەمیشە تیشکۆ دەخەیتە سەر شتێکی نموونەیی. ئەو خاڵەی سەر دیوار خۆشەویستی سەردەمی لاویت بۆ دەگێڕێتەوە، لوتکەی شادی و کەیفخۆشیت بۆ دەڵێتەوە، هەر خۆشەویستی تافی گەنجێتی مرۆڤ بەرزەفڕ دەکا. دەکرێ خاڵەکە ڕۆژگاری کوێرەوەری بۆ خوێندکار بگێڕێتەوە، ئەو باڵانەی بۆ بکاتەوە کاتێ خوێندکارەکە وێڕای نەداری بەڵکو هەر لەبەر ئەوەش، لە کاتی سەرکەوتنی لە تاقیکردنەوەکاندا بۆ دەکرێنەوە. دەکرێ خاڵەکەی سەر دیوار، نیازکردە گرنگەکەت پێبڵێ، کە دەبێ

بێتەدی، هەرچەندە لە بن باری برسێتیشدایە، بەڵام ئەمەش هەر قەیدی ناکا! دەکرێ خاڵەکە یەکەمین دوانت بۆ باس بکا، کە بە گۆڵمەز کۆتاییهات، قسەی دڵدانەوە پلار و توانج، کە یەکەمیان بارگرانترە لە هی دووهەمیان، هەروەها چیرۆکی گوتاری دیکەت بۆ دەگێڕێتەوە، کە بە شێوەیەکی جیاواز کۆتایی پێهات. دەکرێ پنتەکەی سەر دیوار، یەکەمین ئەزموونی گیرانت بۆ بگێڕێتەوە، چونکە بە هۆی داخستنی دەروازەکانی «ئێرتز ئیسرائیل» لە لایەن بەریتانییەکان لە بەردەم کۆڕەوی جووەکان و خۆپیشاندانی "نائاشتیانە" لە بەردەم کونسولخانەی بەریتانیادا کرا. دەکرێ پنتەکە سەربردەی یەکەمین دیدارت لەگەڵ «ئورکی[29]» تاوانبار - چەتە» تاوانبارە پۆلۆنییەکان بگێڕێتەوە، کە ئەمەش خۆ ئامادەکردنێکی بە سوود بوو، تا دواتر لەگەڵ «ئورکی»یە ڕووسەکان، ئەو جۆرە زیندانییە دێرینانە و باڵندە بە ئەزموونەکانی زیندان ئاشنا بی؛ هەروەها بەو دزە پیشەمەندە بیژمۆتەی لە نێو دزەکاندا بە «گراف» ناوی دەرکردبوو، ناوی ڕاستەقینەشی «پۆتۆزسکی» بوو! خاڵەکەی سەر دیوار دەکرێ بریسکەی شۆڕشت پیبلێ، کە دژی هەموو ئەوانەی تێکۆشان «ئێرتز ئیسرائیل» بکەنە «فەلەستین»؛ چیرۆکی ئەو گەنجە جووانە، ئەندامانی «بێتار»ت بۆ بگێڕێتەوە، کە بە بەلەمێکی بچووک، لەوێ بە نوتەکی شەو لە یەکێ لە کەناراوەکانی خاکی باب و باپیران دابەزین و ڕێگەی خۆیان خۆشکرد، ئەمەش دوای بڕینی ئەو هەموو ئاستەنگانەی بەردەم کۆچ، بەوەی کۆچێکی قاچاغە، هەموو ئەوانەش بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی دووهەمی جیهان، لە میانەی جەنگەکە و دوای جەنگەکەش ڕێگەکەیان تەیکرد، چیرۆکی یەکەمین گرووپ بە ناوی «شالۆم تابتچینک»، کە لە مەیدانی «گیتۆی لوتزاک» بەڕێکەوتن. ئەو خاڵەی سەر دیوار دەکرێ کۆنفرانس و ڕێککەوتننامە، کۆبوونەوەکان و مشتومڕی دەمەتەقێکانی ڕۆژانی خۆش و ناخۆشت بۆ بگێڕێتەوە،

---

[29] - Urki

باسی خۆشەویستیی دۆستان، خاوەن دڵە گەرمەکانت بۆ بکا، باسی ئەو دڵە سەرسامانەی نەیارەکانیشت بۆ بکا. ئەو خاڵەی سەر دیوار نەوەک هەر بنکڕی[30] ئەوەی لەبیرت چۆتەوە بۆت دێنێتەوە، بەڵکو ئەو شتانەشت نیشاندەدا کە لە داهاتوودا ڕوودەدەن: خۆشیی دیداری ئەو خۆشەویستەی کە ماوەیەکی درێژە لە یەک دابڕاون، بریکسەی خۆشی لە چاوی ئەو دۆستانەی، کە بەخێرهاتنەوەت دەکەن، لەگەڵ ئەو جەنگە بەردەوامەی لەپێناو شتی پێشەنگدا دەیکەی، چونکە بووەتە ئامانج لە ژیان.

ئەو تاکە پنتە، تۆ لە نێو چوار دیواری چاوە زیندانییەکەدا دەردێنێ و بە ڕێگەی تەنگەبەردا، لە باڵەخانە ترسناکەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دەرت دێنێ و بەرەو دنیای ژیانت دەبا، بۆ ئەو جیهانەی هەیە و دووبارە دەبێتەوە. کاتێک لێیدادەنیشی و چاوت لەسەر خاڵەکە مۆڵلەق دەکەی، پەرجوو دەقەومێ. لە ڕێی خۆجڵەوکردن، ئەو خوڵقێنەرە تەلیسماوییەی گیانی مرۆڤ، یەکێ لە شتێکی ڕاستی دەڕوا و یەکێکی دیکە جێگەی دەگرێتەوە. ڕاستییەک باڵی خۆی بەسەر ئەوەی ونبووە بە تەوای دادەگرێ، ئەو ڕاستییەی گیانی تۆی بۆ عەودالە، ئەو ڕاستییەی تەنانەت دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش ناتوانێ خۆی بەسەردا بسەپێنێ.

ئەوەی من نووسیم بە تەنیا لایەنی گریمانەیی نەبوو. من ڕۆنەچوومەتە نێو تەلیسم. هەر ئەو ڕاستییەم هێناوەتە گۆ، کە نەوەک هەر لە دەوروبەری مندا ڕوویدا، بەڵکو لە ماوەی ئەو شەست سەعاتەدا، کاتێک ڕووبەڕووی دیوارەکە دانیشێنرابووم، قەوما. بەم جۆرە کاتەکە تێپەڕی. مەگەر هەر خودا بزانێ، کە چۆن و بە چ شێوەیەکی دیکە تێپەڕی.

---

[30]– ئەو شێوەی لە بنی مەنجەڵ دەمێنێتەوە و هەندێکیش ڕەق دەبێ، بۆیە پێویست دەکا بە کەوچک بیکرێنی.

بەڵام باشە ئەدی لە بارەی نوستن؟ لە تەلموددا هاتووە، ئەگەر هاتو کەسێک بۆ ماوەی سێ ڕۆژ چاوەکانی لێکنەنان، ئەوا دەمرێ. خۆ ڕەنگە لە توانای پیاودا هەبێ بۆ ماوەی حەفتا و دوو سەعاتیش چاوەکانی لەسەر یەک دانەنێ. ئەوانەی بایی خۆیان بەختیان هەیە، ئەویان تاقینەکردۆتەوە کە زۆر حاڵەتی کاتی وا بەسەر چووە، لەوانەیە نەزانن چۆن لە بن ئەو ڕەوشەدا مرۆ دەتوانێ بخەوێ. خۆ دەکرێ مرۆ بە پێوەش بخەوێ. من هەر بە تەنیا لە ڕووسیا نا، بەڵکو لە کاتی ئاسایی دیکەشدا، بۆ چەندین ڕۆژ و شەو بە قیتار بە درێژایی چیکۆسلۆڤاکیا و بە بەرینی پۆلەندا ڕۆیشتووم. خۆ ئەگەری ئەوە هەیە تەنانەت بە ڕۆیشتنیش خەوت لێبکەوێ. ئەوەشم لەگەڵ «ناتان فریدیدمان» تاقیکردۆتەوە، ئەو کات لەگەڵ ژنە گەنجەکانمان، هەر بە پێ لە بەشی ڕۆژهەڵاتی پۆلۆنیاوە ڕێگەمان بڕی، لەو کاتەی سوپای ئاڵمان بە تانکەکانی خۆی خاکی وڵاتەکەی دەکێڵا. ئێمە بۆ چەندین هەفتە بە پێ ڕۆیشتین، هەندێ جاریش لە بن بۆمبابارانی ئاڵمانەکاندا دەڕۆیشتین، ئەو بۆمبانەی لە پڕوپاگەندەی بەر لە جەنگ بە تەوسەوە بە بۆمبی "جێگرەوە" ناویان دەهات. ئیدی ئەوان بەو بۆمبە بێڕەحمانە کەوتبوونە ڕنینەوەی گیانی دەستە دەستە و پۆل پۆلی ئاوارەکان. زێدەڕۆیی نییە بڵێم: ئێمە بە خەوەوە دەڕۆیشتین، بە دەم خەوەوە ڕێگەمان دەبڕی.

بە بەراورد بەو بارودۆخە، من لە گرتووخانەی بارەگای سەرەکی دەزگەی ئاسایشدا شوێنێکی "نموونەی"یم هەبوو بۆ خەوتن. خۆ من بە پێوە نەبووم، نەشدەڕۆیشتم. بەڵکو دانیشتبووم. عەریفەکەی دەزگەی ئاسایش هەق بوو؛ ئاخر خۆ ژووری بەندیخانە، ژووری کتێبخانەی گشتی نەبوو، کورسی خۆشیشیان نەبوو. کورسییە ڕەقەکەم گەیشتبووە دیوارەکە، بە شێوەیەک ئەو کات، نەمدەزانی چی لەو چۆکە بەستەزمانانەم بکەم. هەمووشی هەر وەک یەک بوو، من دانیشتبووم، ئەوەش لەپاڵ باری دانیشتنی ئاسۆییدا باشترین ڕەوشی

دانیشتن بوو. هەر بۆیە لە ماوەی ئەو شەست سەعاتەدا، زیاتر لە جارێک، خەو بردمییەوە. تەنانەت خەونیشم بینی. لێ گەلۆ، پەشێوییەکە ئەوەبوو، هەر کاتێک لەبەر تیشکی ڕۆژ یان لەبەر تیشکی گڵۆپی کارەبا دەبۆرژام و بەلادا دەهاتم، سەربازە چەکدارەکە دەستێکی لە شانم دەدا، ئەوسا وەنەبێ بە بێڕێزی، بەڵکو بە دەنگێکی نزم بێداری دەکردمەوە:

"بۆت نییە بخەوی."

دەبوایە جارێکی دیکە چاوەکانم بکەمەوە، سێرە لە خاڵێکی دیکەی سەر دیوارەکە بگرمەوە. دیسان ڕۆح خەونی بە خەونەکانەوە دەبینی. بەڵام ئەمجارەیان بە بێدارییەوە.

هەر بە تەنیا دەنگی سەربازەکە نەبوو، کە دەنگێکی کڵۆڵ بوو، لە سەعاتە سروشتییەکانی خەودا، لە زنجیرەی خەونەکانی کردبم. بەڵکو ناو بە ناو، بە ڕۆژ و بە شەو، لێکۆڵەرەوەکە لە ژوورەکە پەیدا دەبووەوە و دەیپرسی:

"باشە، ئەرێ تۆ ئامادەی ڕاستییەکە بڵێی؟"

پرسیارەکە شتێکی ڕۆتینی بوو، وەڵامەکەشی هەر ڕۆتینی بوو. هەر پێویستی بە وەڵامدانەوە نەبوو.

لێکۆڵەرەوەکەش نە تووڕە دەبوو، نە گەفیشی دەکردن. بەڵکو خەندە دەیگرت. منیش سکاڵام لە دەست فەرمانی عەریفەکە پێڕانەگەیاند، باسی دانیشتینی بەردەم دیوارەکەشم هەر نەکرد. من لەسەر ئەوەبووم، لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا کە تووشی مرۆڤ دەبێ، هەندێک جار هەر بە بژاردەی خۆی، هەندێک جاریش بە بێ ئیرادەی خۆی، دەبێ لە توانایدا هەبێ واز لە هەموو شتێک بێنێ؛ لە ڕووی سەرەتاکانەوە، ئەو دەبێ دەستبەرداری بیرۆکەی سکاڵاکردن بێ. ئاخر

خۆ بە گشتی، هیچی لێ شین نابێتەوە؛ بەڵکو بە تەنیا هەر بە دڵی ئەو کەسانە دەبێ، کە شایان نین. ئاخر ئەدی "کاتێ دادوەرەکە" هاتە ژوور، نەیدەبینی من وەها دانیشتبووم؟ ئایا کە منیشی جێهێشت هەر بەو شێوەیە نەبوو، ئەمەش دوای ئەوەی پرسیارەکەی لێکردمەوە و بەڕوومدا بزە گرتی، دوای ئەوەی وەڵامەکەی منی وەرگرتەوە و پێکەنی؟ شتەکە ڕوون و ئاشکرا بوو، کە دەیزانی، بۆیە سکاڵاکردن بێ واتا بوو.

بەڵام من یەک سکاڵام هەبوو، تەنیا یەک سکاڵا، ئەویش سکاڵایەکی "ڕەوا". ئەو پێشتر بەڵێنی دابوو مشووری چایەکم بۆ بخوا. باشە چی لێهات؟ ئەوان خواردنیان بۆ ژووری گرتنەکەم نەهێنا. دیسان قسەی عەریفەکە ڕاست دەرچوو: خۆ ئێرە ژووری خوێندنەوەی یانەیەک نییە، تا یەکێک بە سەندەویچەوە لە خزمەتتدا بێ. لە ڕاستیدا لەبن ئەو بارودۆخەدا، خواردن گرنگییەکی وای نەبوو، جەستە "خۆی لەبیر دەکا" داوایەکی وەها بکا. بۆ من لە هەر بارێکدا ئەو پارچە نانەی لەگەڵ خۆم بردبووم، بەسم بوو. زەحمەت نەبوو لە بن ئەو بارودۆخەدا سێ ڕۆژ لەسەر یەک بە ڕۆژوو بیت. بەڵام تینوێتی شتێکی دیکە بوو. جەستە لە بن هەر هەلومەرجێکدا بێ، پرسی تینوێتی لەبیر ناکات.

لێکۆڵەرەوەکە بەڵێنی چایەی پێدابووم. دەی دەبا بیهێنێ! هەر کاتێک ئەو خۆی بە ژووردا دەکرد، سۆزەکەیم بە بیر دەهێنایەوە، داوام لێدەکرد بەڵکو مشووری بخوا، وەک سووربوونی قەرزدەرێک لەسەر سووەکەی خۆی. بەڵام بەرسڤی لێکۆڵەرەوەکە هەر هەمان شت بوو:

"ئۆو! هێشتا بۆت نەهاتووە؟ قەیدی نییە، ئارام بگرە، من مشووری چایەکەت دەخۆم."

دیسان "مشوورخواردن".

من بۆ شەست سەعات چاوەڕێ بووم، کەچی چایەکە هەر نەهات؛ لەوانەشە مشووری خواردبێ، بەڵام بۆ منیان نەهێنابێ. مرۆ وا دادەنێ خۆ ئەگەر هەنووکە لێکۆڵەرەوەکە لە ژیاندا مابێ، خۆ ئەگەر لە ماوەی جەنگەکەدا نەکەوتبێتە بەردەستی ئاڵمانەکان و جەنگەکە ئەوی وەک جووێک نەهاڕیبێ، یاخود ئەگەر ڕەوشەکەی لە دادوەرێکەوە نەگۆڕابێ و نەبووبێتە کەسێک کە خۆی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرابێ و دادگەییکرابێ، پێموابێ ئەگەر ئەو شتانەی بەسەردا نەهاتبێ و مابێ، ئەو هێشتا هەر خەریکی مشوورخواردنی چایەکەمە، کە چیدی پێویستیم پێی نییە و هەر خەریکی ڕێکخستنی چایە بۆ گیانی زیندانییە تێنووەکان، کە داوادەکەن بەڵێنەکەی بەدیبێنێ.

شەست (٦٠) سەعاتەکە تێپەڕی. تەنانەت دوای بەسەرچوونی ماوەکەش. من لەسەر ئاستێکی بچووک شتێکی تایبەتی چێژی فشارم تاقیکردۆتەوە، لەوانەیە خراپترینیان بێ، کە زانستی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی هەرە کۆن باوەڕی پێی هەبووبێ: ئەویش زەوتکردنی خەو بوو لە پیاو.

لەو دواشەوە بێخەویەی کە لە بارەگای سەرەکی ئاسایش بەسەرم برد، لێکۆڵەرەوەکە پەیدا نەبووەوە. لە جیاتی ئەو کەسێکی دیکە هات، یەکێک فەرمانی پێکردم جلەکانم لەبەربکەمەوە و کەلوپەلەکانیشم هەڵبگرمەوە. ئینجا خستمیانە نێو ترومبێلێک، کە یەک دوو کەسی دیکەی تێدابوون، هەرگیز نەمبینی بوون. یەکێک لەسەرنشینەکانی ترومبێلەکە بە گران و بە دەنگی بەرزەوە دادەدادی بوو، کە لە ختوخۆڕا گرتوویانە و ژنە گەنجەکە و کۆرپەلەکەی لە ماڵ بەبێ سەرپەرشت و پێداویست بەجێهێشتووە. ئەوی دیکەش بێدەنگ دانیشتبوو. یەکێک لە پاسەوانەکان هەوڵیدا بۆڵەبۆڵی کابرا ببڕێ و بە ڕووسی و بە زمانێکی شیرین و لووس پێیگوت:

"خۆ ئەگەر هیچی خراپت نەکردبێ، دوای لێکۆڵینەوە یەکسەر ئازادت دەکەن. لە یەکێتیی سۆڤیەتدا هەروەک وڵاتە سەرمایەدارەکان، خەڵک بەبێ هۆ ناگیرێ. هەرچی دەربارەی ژن و منداڵەکەشتە، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش لە زینداندا بمێنیتەوە، خەمی چیتە؟ ئایا لەبیرت چووە، ئەوان لە وڵاتی سۆڤیەتییەکانن؟"

گیراوەکە بەم قسانە کڕ بووەوە. هەرچی سەبارەت بە منیش بوو، تەنیا یەک ئارەزووم هەبوو - ئەویش نوستن بوو.

٤

# قانوونی تۆڵە

ڕژێمەکان دێن و دەڕۆن، بەڵام زیندان بۆ هەتا هەتایە هەیە، هەرچەندە گۆڕانکاری لە نێو چوار دیوارەکانیشدا بکرێ. کاتێک شۆڕشیش سەرکەوت، دەرگەی زیندانەکان کرانەوە و زیندانییەکان، قوربانیانی دەستی ڕژێم، کە تازە ڕووخابوو، ئازادکران؛ زۆری نەخایاند هەر دوای ئەوان، دیسان دەرگەکان لەسەر زیندانییە نوێیەکان، لەسەر قوربانیانی ڕژێمە نوێیەکە، کە تازە هاتبووە سەرتەخت، داخرانەوە. مرۆڤایەتی هێشتا هەر چاوەڕێی شۆڕشی شۆڕشەکان دەکا، زیندانییەکان نەگۆڕێتەوە، بەڵکو بەبێ زیندانی بەڕێوە بڕوا.

لەو کاتەی حکوومەتی ڕووسیای قەیسەری ڕیشەکێش کرا، بەندیخانەی ناوەندی لە «ڤیلنا» کە پێی دەگوترا «لوکیشکی» بە دیوارە ڕەق و زبرەکانی شاهیدێکی کەڕەی شۆڕشگەلێک، شاهیدی ڕووخانی ڕژێمەکان و هاتنە سەرکاری ئەوانی دیکە، شاهیدی گۆڕانکاری لە "جەماوەر" و لە نێو چاوە زیندانییە تاریکەکانی، شاهیدی گۆڕانکاری پاسەوانی دالانەکانی بوو. هەر شۆڕشێک پاسەوانی خۆی هەبووە، هەر جەنگێکیش دیلی خۆی؛ هەر پۆلە زیندانیەکیش نەقشی خۆی هەبووە. بە نیو دەرزەن زمان شت لەسەر دیوارەکانی ناوەوەی هەڵکەنراوە، نیشانەی بیرهێنانەوەی جەنگی شۆڕشگێڕی دژی ڕژێمی قەڕاڵ؛ خەبات بۆ ڕزگاری نیشتمانیی پۆلۆنیا و لیتوانییەکان، جەنگی

دژی ڕژێمەکانی پۆلۆنی و لیتوانییەکان؛ چەوساندنەوەی لێتوانییەکان لەسەر دەستی پۆلۆنییەکان و پۆلۆنی لە بندەستی لیتوانییەکان؛ زیندانیکردنی پۆلۆنی و لیتوانی بە یەکسانی لەسەر دەستی ڕژێمی نوێی ڕووسیا. منیش وەک شانازییەک زمانی عیبریم بۆ سەر دیوارە کۆنکرێتییەکەی «لوکیشکی» زیادکرد.

ڕۆژی یەکەمم لە زیندانی «لوکیشکی»دا سەیری دەوروبەری خۆم دەکرد، بە هاوزیندانییەکانی ژوورەکەم ئاشنا بووم. هەر چەندە دەوروبەرەکە بۆ من شتێکی نوێ بوو، بەڵام نامۆش نەبوو. ئەو ڕامانە پتەی سەر دیواری دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نیشانی دام، نوێبوونەوەی ژیانی ڕاستی بوو. پەنجەرە شیشەدارەکە، کە ڕوانینی زیندانیانی هاوتەریب دەکرد لەگەڵ خەتخەتی ئاسمان، من چەندساڵێک پێشتر هەمان دیمەنم بینیبوو، ئەویش لەناو زیندانی وارشۆدا بوو. ئەو کونەی لە دەرکەشدا بوو، کە ڕێی بە دەرکەوانەکە دەدا سیخوڕی بەسەر جووڵەی زیندانەییەکاندا بکا بێ ئەوەی هەر هەستیشی پێبکەن، ئەویشم لا شتێکی نامۆ نەبوو. «ئورکی - جەردە» پۆلۆنییەکان ڕاهاتبوون بەو کونە بڵێن «جوداس»، تومەز ئەمەش بۆ «جوادی ئەرزەروتی» دەگەڕێتەوە، کە لە چاوی مرۆڤایەتی هێمای ناپاکییە. لە زیندانی «لوکیشکی»دا هەمان ناویان لە کونەکە نابوو، هەرچەندە ناوەکەی بە تایبەت لە لایەن زیندانییە تاوانبارەکانەوە لێنەنرابوو. هەڵوێستی زیندانییەکان بەرانبەر "چاوی چاودێری" لەناوەکە خۆی هاتبوو. دیارە خەڵک نەوەک هەر ڕقیان لە کەسی خۆیان دەبێتەوە، بەڵکو قینیان لە هەموو شتێک دەبێتەوە؛ من هەرگیز شتێکی بێزراوم نەبینیبوو ئەوەندەی ڕقی ئەو کەسەی لەبن ناوی پیاوێکدا عیسای فرۆشت.

من هەموو شتێکی ئاساییم لەو قەفەسی ئادەمیزاددا بینیوە؛ هەر لە پێخەفێکی کایی، ڕەفە، مێزێکی ئاسایی، کورسییێکی کەچە، دەفرێکی گەورە، هەڵبەتە لەگەڵ سەتڵێکیش.

ئەگەر هەمووی بە سەریەکەوە وەربگری، زیندانەکەی «ڤیلنا» هەروەک ئەوەی «وارشۆ»؛ لەگەڵ هەموو ئەوانی دیکەدا لە لایەن پیاوەوە دروستکراوە بۆ لە قەفەسکردنی خودی پیاوە، بێگومان هەروەک ئەوە. ئاخر هیچ شتێکی نوێ لە ئاراد نییە. هەر ئەوەیە کە لەنێو زیندانەکەدا کەسێکی دەستپێک نەبی.

سەرباری ئەم حاڵەتەش، لە «لوکیشکی»دا شتێکی نوێ هەبوو، شتێکی هەستپێنەکراو لە ئارادبوو، کە نەوەک جەستە، بەڵکو مێشکی بەندکراوەکەشی داگیردەکرد. لە کەشوهەوای هەر زیندانێکدا، هەمیشە پرسیارێکی گۆنەکراو هەیە: "تۆ بڵێی کەی لێرە دەربچم؟" لە بەندیخانەی بن دەستی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیشدا پرسیارەکە ئەوەیە: "تۆ بڵێی ڕزگاربیم؟"

"تۆ بڵێی کەی کەسوکارم ببینم؟" هەموو بەندکراوێک ئەم پرسە وێردی سەرزاری بوو. هەرچی بەندکراوی دەستی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش بوو دەیپرسی: "تۆ بڵێی جارێکی دیکە چاوم بە کەسوکارەکەم بکەوێتەوە؟"

ئەو پیاوەی لەسەر پێشێلکاری قانوون گیراوە، بە مەراق یان بێ مەراق دەکرێ بپرسێ: "تۆ بڵێی چیم لێ بپرسن؟" هەرچی ئەو کەسەشە، کە لە لای دەزگەی ئاسایشەوە تۆمەتبار کراوە، دەپرسێ: "تۆ بڵێی چۆنم لێبپرسنەوە؟"

باشە چ پارێزەرێک بگرم؟ تۆ بڵێی دادوەرەکان کێ بن؟ تۆ بڵێی پارێزەری بەرگری داوای چ شاهیدێک بکا؟ ئەرێ کەنگی داگەییەکەیە؟

ئەمانە پرسیارگەلێکن لەسەر زاری هەموو تۆمەتبارێکەوەن؛ بەڵام ئەم پرسیارانە هی بەندکراوەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نین. ئاخر ئەو دەزانێ ئەوان هیچ شتێکیان سەبارەت بەو دۆزە نییە. لە جیهانی "کۆن"دا ئەوان گۆشەنیگایەکیان هەبوو؛ لە جیهانی "نوێ"ـشدا تەنیا یەک پرس کردەکییە: تۆ بڵێی ئەوان بۆ کوێم ڕاپێچ بکەن؟ ...

بەڵام لەو ڕۆژەی دەرگەکانی زیندانی «لوکیشکی» لەسەر من داخران، ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەم جار لە دابڕانی تەواوە هەناسەم هەڵمژی، تا ئێستاشی لەگەڵدابێ نازانم، من هیچ پرسیارێکم نەکرد. تەنیا پرسیارم لێکرا. من بێژمار پرسیارم لێکرا، هەستمکرد دەبێ وەڵامیانبدەمەوە. هاوزیندانییەکەم تێنووی هەواڵ بوو. ئەو شەش هەفتە بەر لە من گیرابوو. بۆ ماوەی چل ڕۆژی ڕەبەق بە تەنیا لەو چاوە زیندانییەدا دانیشتبوو. جێگەی سەرسوڕمان نەبوو تامەزرۆی دەمەتەقێیەکی مرۆڤانە بێ. شتێکی سەیرنەبوو، بیەوێ هەر شتێک سەبارەت بە جیهانی دەرەوەی چواردیواری زیندانەکە بزانێ. منیش ئەوەی لەسەرم بوو کردم، وەڵامی پرسە تاسەمەندەکانی بدەمەوە و قایلیبکەم.

هاوژووری زیندانەکەم کێڵگەیەکی بچووکی هەبوو، خۆشی ئەفسەرێکی یەدەگی سوپای پۆلۆنی بوو؛ بەوە تاوانبارکرابوو، گوایە سەر بە ڕێکخراوێکی نهێنییە، بەڵام ئەو نەچووبووە "باری ژێرزەمینی" تا بە ڕۆژی ڕووناک خۆی لەپشت شیشەی زیندانی ڕژێمی سۆڤیەت ببینێتەوە. گوناحە سەرەکییەکەی، کە بایی ئەوە بکا بیگرن، پێگە کۆمەڵایەتییەکەی بوو. کابرا پساغایەک یان کولاکێکی[31] گەورە بوو، ئەمەش واتای ئەوەی دەگەیاند، دەبێ شەرمەزار بکرێ و لەناو ببردرێ. هاوژوورەکەم بۆ ئەو "گوناحە بنەڕەتییەی" تاوانێکی دیکەشی بۆ زیادکرد، ئەویش هەر شتێکی کۆنباو بوو: پێش بیست ساڵ لە

[31]– نووسەر ناوێکی پۆلۆنی، یان ڕووسی داناوە pomieszchik، کولاکیش بە ڕووسی واتە جوتیارێکی دەوڵەمەند، لەوانەیە پساغا، دەرەقەتی واتاکەی بێ.

گرتنی، له ڕیزی پلەدارانی سوپای پۆلۆنی دژی ڕووسیا جەنگا بوو. دوای گـــرتنەکە بە هەرســـێکیان خەتابـــارکرا، بەڵام ئەوەی مـــایەی سەرسامی بوو، تۆمەتی سێهەمییان بوو. ئەو پرسیارەی لێکردم کە لە لێکۆڵەرەوەکەی خۆی کردبوو: "ئایا دەکرێ بە تۆمەتی ئەوە بگیرێم، کە خزمەتی سوپای وڵاتەکەی خۆمم کردووە؟" ئاخر ئەدی ڕێککەوتننامەی ئاشـتی لە ١٩٢٠ لەو کـاتەی جەنـگەکە کۆتاییهـات، لە نێـوان یەکێتیـی سـۆڤیەت و پۆلۆنیـا مـۆر نەکـرا؟ ئەرێ دەکـرێ هـاووڵاتییەک لەسـەر بەجێگەیانــدنی ئەرکـــی ڕەوای خـــۆی لێپێچیـــنەوەی لەگەڵ بکـــرێ؟" پرسیارەکان لە گۆشەنیگای پەسندکردنی پێواژۆکە ڕاست و دروستن. بەڵام ئاخۆ هاوزیندانییەکەم چۆن و چی لەبارەی پەسنکردنی پێواژۆ لە بـن هەژمـوونی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی دەزانـێ؟ ئەویش هەر وەک من بە تاقیکردنەوە پێی ئاشنابوو، بەوەی کە یەکێک لە بنەمـای قانوونەکـانی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی، قانوونی تۆڵەیە. دواتر هەر لە زیندانەکە بە دراوسێییەکی دیکە ئاشنا بووم، کە تەمەنی حەفتا و هەشت ساڵ بوو. ئەو لە ئاخر و ئۆخری تەمەنی دابوو، جەستەیەکی لەرزۆک و تێکشکاو، چاوەکانی کز، گوێی گران، قاچەکانیشی چیدی قورساییەکەی ئەویان پێهەڵنەدەگیرا. تەنانەت ئێمە دەمانگەیاندە سەر دەستاو. ئەرێ ئەو پیرەمێردە تێکشکاوە لەسەر چی گیرابوو؟ دەستپێکی کارنامەی سەربازییەکەی لە ١٨٨٠ کاندا بوو، گەیشـتبووە پـلەی سـەرپەلی لە سـوپای قەڕاڵ. ئەو بـۆ بیسـت سـاڵ دەچوو خانەنشینکرابوو، بەڵام نە تەمەنەکەی و نە پەککەوتەییەکەی لە دەستی سزای دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نەپاراست، بەوەی خزمەتی سەربازی قەڕاڵ کردووە. ئەو حوکمی هەشت ساڵ سزای لە ئۆردوگایەکی بێگاری زۆرەملێ بۆ بڕابووەوە، بەڵام فێڵی لە دەزگەی ئاسایشـــــی کۆمۆنیســـــت کردبـــــوو، ئـــــازادی خـــــۆی بەدەستهێنابووەوە، لێ نەوەک - بە شێوەی ساڵبەندییەکەی - کاتێک ئەو گەیشتبووە تەمەنی شەست و هەشت ساڵی، بەڵکو حەفت ساڵ بەر لەو مێژووە. ئەو کۆلۆنێلە کۆنە (کە ڕاهاتبوو بە هاوزیندانییەکانی بڵێ:

"تکایه پێم مەڵێن کۆلۆنێل. ئایا نابینن دابەزیوم و بوومەتە بیژمۆت؟) ساڵێک بەر لە گیرانی مردبوو. کەچی قانوونەکەی تۆڵە هیچ سۆز و بەزەیـــی نـــازانێ. خـــۆ ئەگەر ئەو بە دوای زەبـــوون و پیرەمێـــردە چێوزمەکاندا[32] بگەڕێ، ئەوانەی لەسەر لێوی قەبرن، باشە چۆن بۆچی مشـــووری ئەو خەڵـــکە نـــاخوا کە نیـــوەی تەمەنیـــان بەر لەو بەسەربردووە؟

یەکەمین هاوژووری زیندانم، پیاوێکی تەمەن مامناوەندی بوو، پیاوێکی بەڕێز و خاوەن خوێندن باڵا بوو. مایەی خۆشحاڵیم بوو لەگەڵی بدوێم و لەتەک ئەودا نـــان بخـــۆم. ئەو ڕاهـــاتبوو چـــاودێری بـــۆنەی ئاهەنگئامێزانە بکا، ئەوەش نەوەک لە ژووره بۆگەنەکەی خۆمان بەڵکو لە یەکـــێ لە هۆڵەکـــانی نـــانخواردن. خـــۆ ئەگەر لە بـــاری ئاســـاییدا، بۆنەسازی جوانییێک بداتە ژیان، ئەوا شتێکی زۆر گرنگ و مەزن بوو، ئەو بۆنـــانە وەک کۆلـــۆنێلە پیـــرەکە گـــوتەنی بـــۆ کـــوڕە بیژمۆتەکـــان سازبدرێ. بۆنەسازی، ناشیرینی مەرجەکانی ژیان ناهێڵێ، ئەوەت بۆ دەهێڵێـتەوە، کە تەنیـا لە نێـو چواردیـواری کـۆنکرێتی و پشـت دەرگە ئاسنینەکان، داببڕێی لە تەوژمێک ڕووداو.

دراوسـێکەم بـێ میـزاجیش نەبـوو، میزاجخۆشـی گرنگتـرین ئـامرازی دەسـتە تـا لە بەردەم ڕەشـەبای ئایندەدا بوەسـتێ. هەرچەنـدە کـابرا کەسـێکی پۆلـۆنی شـاناز بەخـۆ بـوو، - لە دە نمـرە شـانازییەی کە لە دنیـادا هەیە، پۆلـۆنیەکەی نـۆ پـلە بـوو - ئەو لەوە ڕاهـاتبوو، ناوبەنـاو ڕێگە بە خۆی بدا، هەندێک بە خەڵکی خۆشـی ڕابـوێرێ و پێبکەنـێ. ئەو ڕاهاتبوو هەندێ نوکتەی تایبەت لەسـەر ئەفسـەرەکانی سـوپای پۆلـۆنی بڵێ، تەنـانەت پلە هەرە باڵاکانیشیان، ئەوەی چووە نێو سـوپای قەڕاڵ هەرگیـز بە ڕەوانـی فێـرە پۆلـۆنیش نەبـوو. لە یەکـێ لەو بۆنـانەدا، ئەم ســـەربردەی خـــوارەوەی گێـــڕایەوە:" ژەنەڕاڵێکـــی نـــاودار لە ڕۆژی

[32] - چێوزمە: لەرزۆک و کەنەفت، واتە کەسێک هەر ئەوەندە بە گۆپاڵ بڕوا.

سەربەخۆییدا گوتارێکی ئاگرینی دەدا، بە پۆلۆنییە تێکشکاوەکەی گوتی: "سێ داگیرکەری دڕندە وڵاتە خێرلەخۆنەدیوەکەمانیان دابەشکرد. ئاڵمانە نەفرەتییەکان دەستیان بەسەر بەشێکیدا گرت، نەمساوەییەکانیش بەشی دووەمیان گرت و بەشی هەرە سەرەکییەکەش ئێمە بردمان! ... ڕەنگبێ ئەو چیرۆکە سەرسوڕهێنەرە بە تەواوی کۆن نەبووبێ. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا، بە گۆڕینێکی شێوە دەق، مارشاڵ «ڕۆکۆسۆڤسکی[33]»، هی ئەوەیە، ئەم سەربردەیە دووبارە بکاتەوە.

شتێکی باش بوو لەگەڵ دراوسێکەم نوکتە و گاڵتە بکەین. لەگەڵ ئەمەشدا شتێکی ئاسان نەبوو لەگەڵ ئەو کابرایەدا بژی. ئەو مەیلێکی بە جۆشی بۆ ڕێکخستن و سیستەم هەبوو. لە ژیانمدا وشکەمامۆستایەکی وام نەبینیبوو، کەسێک بوو فەرمانی ڕێکخستنانەی لە سەرووی پەیوەندی ڕێکخراوی خەڵکیدا دەدا. هەڵبەتە حەزکردن بە چارەی سیستم هەڵسوکەوتێکی سەرسامکەرە. دەق وەک جووێک من ڕێز و پێزانینم بۆ ئەو کارە هەبوو، وەک شتێکی بە تووێکڵی کەسایەتیەکەمان لە خودنمایشی دیاسپۆرادا، لە نێوان شتگەلێکدا و لە ونبوونی هەست بۆ سیستمپارێزی. خۆ ئەگەر ئەو ڕێکوپێکییە لە ژیانی ئاسایی مرۆڤدا شتێکی گرنگ بێ، ئەوا لەوەش گرنگتر ئەوەیە لەنێو چاوە باریکەلەی زینداندا هەبێ. ئێمە دەبوایە کاتی ڕێڕۆیشتنمان ڕیزبەندی بکەین، ئاخر بە یەکەوە نەماندەتوانی لە نێوانی پەنجەرە و دیواردا بڕۆین، دەبوایە نێوانمان دوو مەتر و نیو هەبوایە. دەبوو لە نێوان خۆمان کارەکانی خاوێنکردنەوە و سڕینەوەی ناوکەوە[34] چیمەنتۆکەی ژوورە زیندانییەکەمان دابەش بکردبایە، یان بردنی

---

[33] - ڕۆکۆسۆڤسکی: Rokossovsky (١٨٩٦-١٩٦٨) ئەفسەرێکی پلەباڵای ڕووسی بە ڕەچەڵەک پۆلۆنی بوو، پاشان بووە مارشاڵی یەکێتیی سۆڤیەت لە پۆلەندا وەک وەزیری بەرگری پۆلۆنی لە ١٩٤٩ تا لابردنی لە ١٩٥٦دا لەو پایەیدا مایەوە.

[34] ناوکەو: زەمینەی ژوور، خانوو، ئەرزیە.

سەتڵی ئاو و خاوێنکردنەوەی. دەبوایە بەرگەی ئازاری یەکدیش بگرین؛ هەر بە ڕاستیش، خۆ ئەگەر بمانتوانیبایە لە یەک دوور بکەوینەوە، ئەوا پاراستنی هەندێ ڕێوشوێنی لە نێو ئەو چاوە زیندانیە بچکۆلەیەدا زۆر گرنگ بوو، بۆ ئەمەش سوپاس بۆ گۆڕانکارییەکانی کات ...

دراوسێکەم هەم سەڵت و هەم وشکەمامۆستاش بوو. نازانم ئاخۆ ئێستاش هەر بە زگورتی[35] ماوەتەوە یان نا، لەبەر ئەوەی وشکەمامۆستا بوو، یان بۆتەوە وشکەمامۆستا چونکە هەر بەسەڵتی ماوەتەوە. هەر ئەوەندە دەزانم زۆر پەرۆشی پاکوخاوێنی بوو، ئامادە بوو بۆ چەندین ڕۆژ بە مۆنی لە شوێنی خۆی کڕ و بێدەنگ دابنیشێ، هەر لەبەر ئەوەی من بە هەڵە کەوچکەکەی خۆم لەسەر نیوەبەشە مێزەکەی ئەو دانابوو.

ئینجا دەزگەی ئاسایش کارێکی باشی کرد ناوبژیوانێکی لەنێوان دانایین، بەوەی زیندانییێکی سێهەمیشی هێنایە ژوورەکەمان. ئەویش عەریفێکی سوپای پۆلۆنی بوو، بە پیشەش بەرگدروو بوو، پیاوێکی گەنج و نەخوێندەوار، بەڵام تێگەیشتوو بوو. ئێمە سەرمان پێکەوە نابوو، چونکە لە چەند بابەتێکەوە دەرسم دەدایێ، بەتایبەتی مێژووی خەڵکی خۆی و نەتەوەکانی دیکە. ئەو بە دەورکردنەوە و خۆماندووکردنێکی زۆرەوە دەرسەکانی وەردەگرت و خۆی بۆ دەرسی ئایندە ئامادەدەکرد، کە هەندێ دەرس هەر دووبارەکردنەوە بوون:"لە نێو زینداندا" ئەو ڕاهاتبوو ئەو قسەیە بە خەندەیەکەوە بکا؛ "لێرەوە من خۆم بۆ ئەوە ئامادەدەکەم، کە لە قوتابخانە لە دەستم چووە." ئەو خولانە کە هەر بە پشت و پەنای یادەوەری کڵۆڵ و بەستەزمان بەڕێوەدەچوون، دەبوایە ئەو کاتە نەبڕاوەی دانیشتمان لە نێو زینداندا بۆ کورت بکردبایەوە. هاوەڵە زیندانییەکەی یەکەمیشم وەک یاریدەدەرێکی مامۆستا بوو، عەریفەکەی بۆ دەرسەکە ئامادەدەکرد،

---

[35] زگورتی: سەڵت

بەڵام زۆر جارانیش لەبەر سیستمپاریزی خۆی، لە کارەکە دەردەچوو. لەو نێوەدا بە تێپەڕبوونی کات، من و عەریفەکە بە گەمەی برادەرەکەمان ئاشنا ببووین. هەندێک جار ئەو پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی لەگەڵ من دەپچڕاند، هەندێک جارانیش لەگەڵ عەریفەکە وای دەکرد، جاری واش هەبوو هەردووکمانی بایکۆت دەکرد. لە بەرەنجامی ئەوەی هەردووکمان ببووینە قوربانی یارییەکەی، لەنێوان ئێمە جۆرێک لە پاڵپشتی، شتێکی سروشتی، بەڵام دەرنەبڕاو بۆ پەلاماردان دروست بوو، وێڕای ئەوەی ئەوان هەردووکیان پۆلۆنی بوون و منیش جوو.

ڕۆژێکیان ئەم هاوکارییە تێکشکا. ئەوکات دەمەتەقێمان بوو - یەکێ لەو گفتوگۆیانەی لە نێوان دیوارەکانی زینداندا درێژەی هەبوو - لەسەر جەنگ و بارودۆخی نێودەوڵەتی بوو. ئێمە باسەکەمان بە فەرەنسا و بەرەی ڕۆژئاوا کردەوە. هاوزیندانییەکەم، ئەفسەرەکە پێیگوتین کەوا لە میانەی جەنگی فۆنی"[36]دا، نامەیەکی لە برادەرێکیەوە پێدەگا کە ڕایکردبووە فەرەنسا، ئەمەش دوای کەوتنی پۆلۆنیا بوو لە شەڕەکەدا، لەوێ لە خزمەتی سوپای «سکۆرسکی» بوو. نامەکەش زۆر گەشبینانە بوو. "هێزی سوارەمان" بەم جۆرە برادەرەکەی نووسیبووی؛ "لە بەرانبەر تانکەکانی ئاڵمان خۆی ڕاناگرێ، بەڵام لە فەرەنسا تانک و فڕۆکەی زۆروزەوەند هەن؛ ئەوە هێزی ڕاستەقینەیە مرۆ دەکرێ پشتی پێببەستێ." "ئەرێ تۆ دەبینی"، هاوزیندانەکەم لە سەر گێڕانەوەکەی خۆی بەردەوامبوو؛ "ئەو هێزەی کە ئێمە بڕوامان پێ هەبوو، لە هێزە کەمەکەی ئێمە باشتر نەبوو، بەڵکو خێراتریش تێکشکا. ئایا ئەمە ئەوە ناسەلمێنێ، کە ئێمە باشبووین، زیاتر لەوەی بیرمانلێدەکردەوە، بەتایبەتیش دوای سەرکەوتنەکەی

[36]- جەنگی فۆنی Phoney War بەو ماوەیەی جەنگی دووەمی جیهان لە نێوان ١٩٣٩ تا ئەپریلی ١٩٤٠ دەگوترا، لەو کاتەی هێرشێکی برووسکەئاسا کرایە سەر پۆلۆنیا لە ئەیلوولی ١٩٣٩.

«ســـوابیانس[37]»؟" هاوزینـــدانییەکەی دیـــکەم، کـــۆنە عەریـــفەکە، هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشا و گوتی: "ئاخ، بەڵێ، خۆ ئەگەر ئێمە تەنیا ئەو تانک و فڕۆکانەی ئەوێمان هەبووایە!" لە وتەکانی هەردووکیاندا هەستمکرد ڕازیبوونێکی نامۆ لە بەرانبەر شکستی فەرەنسادا هەبوو، کە هاوپەیمانی وڵاتەکەشیان بوو. هەرواشبوو، ئەوەش ڕاستە، کە ڕازیبوون تێکەڵە لەگەڵ پەشیمانی، پەشیمانی لە سەرکەوتنی دوژمنە نێوخۆییە دڕندەکەیان و بەرفرەوانبوونی جەنگ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕەزامەندی. کاتێکیش ڕۆژەکان هاتن و تێپەڕین، لەوە تێگەیشتم دراوسێکانم، هەر تەنها هەستێکی گشتییان دەربڕی، ئەوێ دەمێ لە نێو پۆلۆنییەکان باوبوو. پێدەچوو، بەشێکی باش لە ڕاستی لەو بیردۆزەدا هەبێ، کە بنەمای دڵدانەوەی پەککەوتەیی - ئەوسا چ لەسەر ئاستی تاک بێ یان نەتەوە - لەو ڕاستیە دایە، یەکێک پەککەوتەیی لایدەیەک[38] لە هی خۆت زیاتر بەهەند هەڵبگرێ.

لە باسوخواسی فەرەنسا و پۆلۆنیادا چووینە سەر باسی پەیوەندییەکانی نێوان ڕووسیا و ئاڵمان. ئێمە هەموومان بەر لە گرتنەکەمان ئەوەمان بینیبوو، کە ئەو قیتارە نەوتهەڵگر و کاڵایانەی لە ڕووسیاوە بەرەو ئاڵمان دەڕۆیشتن، بە ڤیلنادا تێدەپەڕین. هەمووکمان ئەو برووسکە پیرۆزباییەمان خوێندەوە، کە هیتلەر لە ساڵڕۆژی شەستەمینی دا بۆ ستالینی ناردبوو. هەمووشمان ئەوەمان لەبیربوو، چۆن دەسەڵاتدارانی ڕووسیا وەڵامیان دایەوە، بەوەی کابرا گوتبووی، پەیمانی نێوان ڕووسیا و ئاڵمان پەیمانی خوێنە ... بەدەر لەوەش، هەمووان لەو باوەڕەدابووین، بەیەکدادانی هەردوولای پەیمانی خوێن شتێکی حەتمی بوو، زوو یان درەنگ هەر دەقەوما. بە ڕاستیش ئەو بۆچوونانە، هەر ڕاوبۆچوونی تاکەکان نەبوون. نزیکەی هەموو

---

[37]- سوابیانس: Swabians بە تەوسەوە بە ئاڵمانەکانیان دەگوت سوابیانس. لەڕاستیشدا سوابیانس ڕەچەڵەکێکی ئاڵمانین.

[38] غەریبە، غەوارە، بێگانە

هاوچەرخەکانی ئەوێ ڕۆژێ لە "دالانی بەلتیکدا" دەژیان، بە خەستی هەستیاندەکرد کە ڕۆژێک دادێ و کەسیش نەبوو سووکە گومانێکی لەسەر نەبێ، کە دالانەکە لەبەین نامێنێ و پێکدادانی ڕووسیا و ئاڵمانیش لە گوینە[39]، ئەمەو وێڕای ئەو هەموو ڕاگەیاندنانەی فەرمی، سەرباری نارەزایی دەرەکی و دراوسێ باشەکان، ئەو هاوکارییە دوولایەنییەی نێوان مۆسکۆ و بەرلین.

دراوسێکانم لە زیندان باسی نزیکبوونەوەی ئەو پێکدانانەی سوابین (ئاڵمان) و مۆسکۆییەکانیان دەکرد، بەشێوە ڕەزامەندییەک تەنانەت هەوڵیشیان نەدا بیشارنەوە. بۆ هۆیەکانیش وەنەبێ هەر هۆکاری نیشتمانیان هەبێ، بەڵکو بە چاوی خۆشیان دابەشبوونی وڵاتەکەیان لەنێوان "دراوسێکان" بینیبوو، بەڵکو هۆکاری کەسیی خۆشیان هەبوو. هاوزیندانەکەم، کۆنە ئەفسەرەکە گوتی:

"سەرباری ئەوەش ئایندە چی لە هەگبەدا بێ بۆ ئێمە، گومانی تێدا نییە کە شەڕەکە لە نێوان ئاڵمان و ڕووسیادا هەر دەقەومێ و ئێمەش لەو قەفەزە بۆگەنەدا ڕزگارمان دەبێ."

عەریفەکەش هەڵیدایێ و گوتی:

"من پێموایە سوابینەکان بەسەر مسقۆفەکاندا[40] سەردەکەون، خۆ ئەگەر ئاڵمانەکانیش هاتنە ئێرە، ئێمە ئازاد دەکرێین. تۆش، بەڕێز «بێگن» خەم مەخۆ، ئێمە لەپشتتین و یارمەتیت دەدەین."

[39]– لەگوینە: لەوانەیە، نێزیکە.

[40]– خوێنەری بەڕێز لە کوردەواریشدا، بەتایبەتی چل پەنجا ساڵیک لەمەوەبەر دەستەواژەی مسقۆف هەبوو، هەڵبەتە بۆ مۆسکۆیی دەگەڕێتەوە. لێرەشدا نووسەر هەر دەستەواژەی مۆسکۆڤیتس Moscovittes ی ئینگلیزی کە بە ڕووسی بەمۆسکۆڤیتچی دەخوێندرێتەوە بەکارهێناوە. منیش لەجیاتی مۆسکۆڤیتسەکە کوردان‌دنەکەی لای خۆمان (مسقۆف)م بەکار هێناوە.

منیش لە کانگەی دڵمەوە بەسەریاندا تەقیمەوە:

"جوامێرینە، ناتوانم بەشداری گەشبینییەکەی ئێوە بم. منیش دەڵێم ئەو هەرایەی نێوان ڕووسیا و ئاڵمان شتێکی حەتمییە و هەر دەقەومێ. خۆ ئەگەر هیتلەر ئینگلستان بشکێنێ ئەوا دەیەوێ ڕووسیاش داگیربکا، ئەگەر ئینگلیزیشی پێنەشکا ئەوا بە ناچاری هەوڵ دەدا ڕووسیا هەر داگیربکا. بەڵام من هەوڵ نادەم ئەو ڕاستییە بشارمەوە، بە لێکدانەوەی خۆم من زۆر ترسم هەیە. من ئەوەم پێ لە بیرناکرێ، لە ڕووداوی جەنگی ڕووسی - ئاڵمانیدا، چەندین ملیۆن جوو پێدەچێ بکەونە بن دەستی هیتلەر. ئاخۆ چیان بەسەردێ؟ ئێوە پێتان وایە لە جەنگی نێوان ئەوانەدا، ئێمە لێرە لەو زیندانەی لوکیشکی ڕزگاردەبین. بەڵێ، منیش دەمەوێ لێرە دەربچم، بەڵام کاتێک بیر لەوان دەکەمەوە، ئەوا بە خۆم دەڵێم، خۆ ئەگەر من بە نرخێکی وا ڕزگاربیم، پێمباشترە هەر لە کونجی زیندانی لوکیشکیدا بمێنمەوە، خۆ ئەگەر ئەوە ڕێگربێ لەوەی جووەکان بکەونە بن دەستی «گوستاپۆ». هەڵبەتە ئەو گفتوگۆیەمان تەنیا ئەکادیمیانەیە، ئاراستەی ڕووداوەکانی بەندە بە ئەوەی ئێمە دەمانەوێ؟ بەڵام بۆچی من بیشارمەوە؟ من نزا بۆ ڕوودانی شەڕێکی نێوان ئاڵمان و ڕووسیا ناکەم."

هەردوو هاوزیندانییەکانم وەڵامیان دامەوە، ئەفسەرەکە وەخت بوو لە دەهریبوون بتەقێ.

"بەڕێز، باشە ئەوە تۆ چیت گوت، شتێکی زۆر جیاواز بوو. سەبارەت بە گەلی تۆ هەمووشتێک لەسەر یەک پێوەر بڕیاردراوە: چی بۆ جووەکان باشە. لە ڕاستیدا لەمێژە پێمگوتراوە، هاوکاریی لەنێوان ڕیزەکانی هەموو جوودا هەیە، بەڵام تۆ ئەوەت بۆ سەلماندم، کە گەلەکەت لەبن هەر بارودۆخێکدا بێ پارێزەری هاوکارییەکەت بێ، تەنانەت لەنێو زیندانیشدا."

خوێندکارەکەش، کۆنە عەریفەکە، بە هەمان تووڕەبوونەوە لێم هاتە دەنگ.

"بەڵێ،" ئەو وەها دوا؛ "سەرجەم جووەکان خۆ بە یەکەوە گرێدەدەن. بەڕێز «بێگن»، هەوڵمەدە حاشایی لێبکەی. بۆچی، خۆ هەر تازە بۆ خۆت گوتت، کەوا باشترە ئێمە هەموومان لەنێو ئەو چوار دیوارەدا بڕزین، هەر بۆ ئەوەی هیچ زیانێک بە گەلەکەی تۆ نەگا."

باشە چیم بۆ مابووەوە تا وەڵامیانم دابایەوە؟ هەردووکیان باسیان لەوەبوو هاوکاری جووەکان خۆی لە خۆیدا تاوانە، وەک ئەوەی، ئەو شتەی قسەی لە بارەوە دەکەن پیلانگێڕی بێ، شتێکی ئەهریمەنانە بێ. ئای بۆ خاتری خوا! - منیش بە خۆم بیرمکردەوە - باشە جووەکان چی ما نەیکەن، کوا وەها بە یەکەوە نەنووساون؟ لە هەر جەنگێکی ئەورووپیدا، بەدەر لە دوایین جەنگەکە، جووەکانی وڵاتێک دژی جووەکانی وڵاتەکەی دیکە جەنگاون. پەرتبوونی نێوان جووەکان، فرەحزبی و ئاراستەی نێوانیان، شتێکە سەلمێندراوە! مارکسیستێکی بنجوو، ئەو کەسەی دەکرێ لە دنەدانی جەنگی دژی زێدەماف و هاوکاری بەرتەسکی نەتەوایەتی بۆ هاوکاری نێوەخۆیی نەتەوەی سەردەست کارابێ. ئاخۆ چەند خوێن ڕژاوەتەوە سەر سەکۆی قوربانی ئەو لەڕێ لادانە، ئەو سەکۆ قوربانییەی کە هاوکاری نێوەخۆی جووەکان شتێک نییە هەبێ یان شتێک نییە داخواز بێ! هەمووشی هەر بە بێ مەبەستە. ئەندێشەی ئەو هاوکاری و پاڵپشتی نێوخۆی جووەکان هەیە و هەمیشەش هەر دەمێنێ، ئەمەش لە مێشکی ئەوانی دیکەدا. لەم بارەشدا - خۆم لە خۆم دەپرسم - ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە ئەو بوختانە، ئەو تاوانبارکردنەی پیلانگێڕی هەڵبگیرێ؟ ئەرێ چارەنووسی ئێمە بێ وێنە نییە؟ ئایا ئەوەش بۆ هەموو جوو وەک یەک نییە؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، هاوکاری نێوخۆی جووەکان لە چاوی ئەفسانەی بیانییەکاندا ببێتە ڕاستییەکی جوولەکایەتی؟

هەڵبەتە هی ئەوە نەبوو هاوزیندانەکانم بەو پرسیارانە سەخڵەتبکەم. منیش هەستمکرد هەڵەیەکی سایکۆلۆژیم کرد و بێ مەبەست ئازارم دان، کاتێ گوتم من لەگەڵ دوعا بێدەنگەکانی ئەواندا نیم، نزا و پاڕانەوەی هیوای هەموو زیندانییەکان، دوعاکانی دڵدانەوەی تێکشکان. بەڵام یەک شتم پێگوتن: "جوامێران، ئەوەی ئێوە پێیدەڵێن هاوکاری نێوخۆیی جوولەکە، ئارەزوومە بەڕاستی وەرگەڕێ."

هەردووکیان بزە دایگرتن. خەندەکەشیان بۆ من لە وشەکانیان تاڵتر بوو. ئەوسا تارمایی سێبەرێک کەوتە نێوانمان، سێبەرەکە کەوتە نێوان خاوەن زەوییەکان و سەربازەکە لە سەرێک و خۆشم لەسەرێکی دیکەوە. ئەو سێبەرە هەرگیز بە تەواوی نەڕەویەوە، تەنانەت لەو ماوەی لە زیندانەکە بەیەکەوە بووین، هەندێک بە کاڵی بەرفرەوانتریش بوو.

ڕۆژێکیان، گۆڕانکارییێکی دیکە بەسەر قوتابییەکەم، بەسەر عەریفەکەدا هات. یەکەم جار کە یەکدیمان بینی، پێیڕاگەیاندم، کە ئەو دیندار نییە، تەنانەت ئەو هەر خواپەرستیش نییە. ئەو فێر ببوو زۆر چیرۆک سەبارەت بەو قەشانە بگێڕێتەوە ئەوانەی گوێیان بە قانوونەکانی سکهەڵگوشین[41] نەدەدا. ئەو بەخۆشییەوە چیرۆکی ئەو قەشەیەی دووپاتدەکردەوە، کە لە گوتارەکەی بۆ خەڵک دەیگوت: " ڕۆڵەکانم، گوێ لەو شتە بگرن کە بۆتان دەڵێم نەوەک چاو لەوەی بکەن کە دەیکەم." ئەو بێباوەڕییە ڕاشکاوانەیەی زۆر ببوە مایەی هەراسانکردنی هاوڕێ زیندانییەکەی دیکەمان، یارۆی ئەفسەر. ئاخر ئەو کاسۆلیکێکی دڵسۆز بوو، زۆریش نوێژی دەکردن. شتێکی سەرنجڕاکێش بەڵام سەیریش بوو، ئەویش ئەو دژبەریەی نێوان کوڕە نەخوێندەوارێکی کاسۆلیکی کە لە بیروباوەڕی باب و باپیرانی لایدابوو، لەگەڵ یەکێکی خوێندن باڵا کە بە خۆشی و بە جۆشەوە بەرەو ڕاسپاردەکانی

[41]- سکهەڵگوشین: خۆدوورگرتن، تقشف،

کڵێسای کاسۆلیک دەڕۆیشت، دەکرا تا ئەوپەڕی چاودێری ئەو شتانەی نێوان دیوارەکانی زیندانی لوکیشکی بکرێ.

لێ گەلۆ، بەیانییێکیان ئێمە هەردووکمان، ئەفسەرە پۆلۆنییەکە و من بەوە سەرسام بووین، بینیمان عەریفەکە هەر خۆی خۆی گۆشەگیر کردووە، لە کونجێکی چاوە زیندانەکەدا، لەسەر چۆک کەوتووە و بە بێدەنگی نوێژدەکا و دەپاڕێتەوە. کاتێکیش لە نوێژەکەی بووەوە، ڕووی لە ئێمە کرد و بە شەرمێکی دوودڵییانەوە گوتی: "من لە مەودوا هەموو ڕۆژێک نوێژی خۆم دەکەم. من هاتمەوە سەر ئەوەی بڕوام بە دین بۆ بگەڕێتەوە." ئەفسەرەکە، کە هەمیشە لەبەر بێسەروبەری لە پێگەی پەلاماردانــدابوو بۆ سەر عەریفەکە، ئیدی تووڕەییەکەی خۆی خواردەوە و هەردووکمانی بەوە سەرسام کرد، بە گەرمی دەستی گوشی. لەبەر چاوماندا پەڕجووی بووژانەوەی دیین خوڵقا. منیش گەواهی ئەوە دەدەم، بووژانەوەی ئۆل یارمەتی عەریفەکەی دا، لەو کاتەی زیندانییەکە بەردەوام بوو، بەوەی بەسەر غەریبی و خۆیدا زاڵ ببێ، غەریبیش بەشێک بوو باڵی بەسەر هەموو زیندانییەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی کێشابوو. من دەتوانم شایەتی زیاتریش بدەم، کە ئەم سەربازە نەخوێندەوارە تاکە زیندانی لوکیشکی نەبوو لە بێ بڕواییەوە بووبێتەوە دینداریکی بە پەرۆش. من بەندکراوی دیکەشم بینین، لە نێویاندا کەسانی ئاستبەرز لە ڕووی خوێندندا هەبوون، کەسانێک بە هۆی زانستەوە بە گومان بوون، کاتێکیش ڕەشبگیری پەیدا بوو و شەوانی لێکۆڵینەوە بەرفرەوان بوون و درێژەیان کێشا (بەتایبەتی ئەو ماوەی دوایی)، ئەو کەسە بێ باوەڕ و بەدگومانانە چاویان بڕیبووە هێزێکی نادیاری ئەودیو دیوارەکانی زیندان، بەڵکو ڕەحمیان پێبکا ... ئەمەش ڕاستی بوو، خۆم بە هەردوو چاوەکانم بینی، ئەو پیاوە لە دارمانەکەی خۆی بەدەر لە ئیمان، هیچ نەبوو پشتی پێ ببەستێ، هیچ شتێک نەبوو دڵی بداتەوە. دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی زۆر کەسی بۆ باوەشی دین

گەڕاندەوە ... شەوانی لوکیشکیش فێریکردین بۆ پیاوێک، کە خراپی بەسەر بێ، باشترە دەست بە بڕواوە بگرێ لەوەی پیاوێک باشی بۆ بێ.

لەو کەشوهەوایەی کە دین لای عەریفەکە بووژایەوە، بە شێوەیەکی سروشتی هاوزیندانیانم باشتر لەوە تێگەیشتن، ڕۆژێک پێمڕاگەیاندن، کە بۆ ڕۆژی دواتر من بە تەواوی دەست لە خواردن هەڵدەگرم. بەر لە هاتنی ئەو ڕەوشە، لەوانەبوو هاوزیندانەکانم فشەیان بە بڕیارە "پەڕگیرییەکەم" هاتبێ. ئێمە بۆ ماوەیەک لە زینداندا بە ئارامی بە سەرمان برد، ئەو ژەمە خواردنەی دەزگەی ئاسایش باندۆری خۆی بە سەرمانەوە هەبوو. چیدیکە برسی نەکراین. پێشتر لە برسان مردبووین. جیاوازیش لە نێوان ئەو دوو هەستە تەنیا لای ئەو کەسە دەردەکەوێ، کە تاقیکردبێتەوە و کەسێک بە برسییەتییەوە نوستبێ، بە برسیەتی بێدارکرابێتەوە، ئەوسا ئەو کاتەی دیسان پاڵدەکەوێ و دیسان بە برسێتی هەڵدەستێتەوە، ئینجا قەدری عافیەت دەزانێ. لەو جۆرە ڕەوشەدا، مرۆ وایلێدێ جلەوی خۆی بۆ وتەی ترسێنەر ڕابکێشێ: " ... پیاو لە ئاژەڵ بالاتر نییە."[42] زۆر لەوانەی لە نێو زیندانی لوکیشکی بوون، لە پارچە نانێک زیاتر، لە پێناو کەوچکە سووپێکی زیاتر، خۆیان لە بنی بنی سووکایەتییەوە بینییەوە. زۆر پیاو بە شەوقەوە بنی قاپەکەی خۆی دەلێستەوە. زۆر لە زیندانیانی دەزگەی ئاساییشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی وردکەنانیان دەکردە تۆپەڵ، بەر لەوەی بیخەنە ناودەمیان، وەهایان لێدەڕوانی وەک سەیری دوڕ و گەوهەر بکەن. ئەو پیاوانەی تووشی ئەو ڕەنجەڕۆییە ببوون، کاتی خۆی خواپێداو و حاڵ خۆش بوون. پێگەیان بەرز و دڵیان پڕ خرۆش بوو، تا ئەو کاتەی تالاوی برسێتییان نۆشی و چاویان لەو دەنکە شەکرانەی نێو کەوچک بوو، کە پێیان دەدرا بۆ ئەوەی نانە بۆرە

---

[42] – ئێکلێسیاتس iii ۱۹ (نووسەر)

ڕەقەکەی بەوەی لە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێی دەگوترا قاوە، نەرم بکەن و بخۆن.

بەخشینی سوپەکەم لە ئێواران، قاوەکەم لە بەیانیان، لەو نێوەشدا سوپی زیاتر لە هەندێک ڕۆژدا، ئەمەش هەمووی لە ژێر ئەو بارودۆخەدا، بێگومان هاوزیندانەکانم بەدەر لە پرسی دین، وەهایان سەیر دەکردم، هەر بە ڕاستی دینبووبم[43]. بەڵام هەردوو هاوڕێ چاوە زییندانییەکەم، هەوڵیان نەدا چیدی ڕێگریم لێ بکەن و لە بڕیارەکەم سارد بکەنەوە، هەر ئەوەندە بوو کە بە زەحمەتەوە توانیم قەناعەتیان پێبێنم، بەشەکەی منیش لە نێو خۆیاندا دابەشبکەن، بەتایبەتی ئەوەی لە ڕۆژی تۆبەکردندا کردم.

من لە بەرایی سەری ساڵی جوو ٥٦٩١ دا گیرام، بۆیە زەحمەت نەبوو، ڕۆژەکان بژمێرم - ڕۆژژماردنیش شۆپێکی ئاساییانەی زیندانییەکانە - تا ئەو ڕۆژەی دەگەمە ڕۆژی تۆبەکردن و لێخۆشبوون. دەمزانی چ ئێوارەیەک نابێ نان بخۆم، بۆیە بە ئێشکچییەکەم گوت کە بەشەکەی منیش بخاتە سەر بەشەکەی هەردوو هاوزیندانەکانم. ئێشکگرەش سەرسامانە پرسی:

"ئەوە چییە؟ نەساغی؟"

"نەخێر، نەساغ نیم. بەڵام ئەمڕۆ ڕۆژی دادوەرییە بۆ من."

"ڕۆژی دادوەری" چ ڕۆژی دادوەرییێک؟ جا ئەوە چ پەیوەندییێکی بە خواردنەوە هەیە؟"

"من جووم، لە ڕۆژی دادوەریشدا جووەکان نان ناخۆن."

43– دیین بووە: شێت بووە.

"دەی واز لەو شتە پڕوپووچانە بێنە. تۆ بیخۆ، لەسەر بەرپرسیارێتی من بیخۆ!"

لەرەی دەنگی خۆش بوو، مرۆڤدۆستانە بوو. منیش سوپاسمکرد بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتییەکەم هەڵدەگرێ. ئینجا دەرکەی کردەوە، شتێکی هاوشێوەی خەندەیەک دەربڕی و گوتی:

"بێنە پێشخۆرەکەت بێنە. با بۆت تێکەم."

"نـا، نەخێـر." منـیش خێـرا بەدحـاڵیبوونەکەیم ڕاسـتکردەوە، بەوەی سوپاسم کردبوو. "بۆ برادەرەکانم تێکە."

"هەی بێ مێشک!" بردەبردێکی وای لێهات.

منیش هیچم نەگوت.

نـۆبەتچییەکە شـانەکانی هەڵتەکانـدن، بە هاوزینـدانەکانمی گـوت کە قاپەکانی بۆ ڕابگرن تا زیاتریان بۆ تێبکا، ئەو بەشە زیادەیە لە چاوی ڕۆژی تۆبە و لێبوردنی جووەکان و بەڕۆژووبوونەکەیان، کە زیندانی «لوکشکی»ش هەڵی نەوەشاندەوە، هەرچەندە پارێزەرانی شۆڕشیش ئامادەبوون بەرپرسیارێتی دەستبەردابوونی هەڵبگرن ...

منیش پێم سەیربوو، تۆ بڵێی ڕۆژی تۆبە و لێبووردنی داهاتوو لە کوێ دەبم. ژنەکەم کە لە بن دەستی دەزگەی ئاسایش نەبوو، تۆ بڵێی لە کوێ بێ؟ ئەرێ دەبێ باوک و دایکە پیرەکەم، برا و خوشکم لە کوێ بن؟ ئەرێ دەبێ خەڵکەکەم لە هەردوو دیوی "بەرەکەوە" لە کوێ بن؟"

کاتێکیش مێشک وەڵامی پرسەکانی نەدایەوە، دڵ بە ترسەوە بە نوێژ و نزا کەوتە وەڵامدانەوە. کاتێکیش وشەکانم لەبەر دەگوتنەوە، ئەو وشە پیـرۆزانەی سنگاوسـینگ لە نەوەیەکەوە بـۆ یەکێکـی دیـکە گواسترابوونەوە، کاتێک بە بێدەنگی نوێژم دەکرد، هەستمکرد ئەو

پەرژینە تۆکمە و سەختەی منی لەو خەڵکە خۆشەویستە کردبوو، کەوت و لەبەین نەما. جارێکی دیکە "دوگمە نهێنییەکەی" ی مێشک کەوتەوە کار. زیندانەکە هەڵگیرا، دیوارەکان نەمان، لەوێدا شتێکی سەیر، تیرێژە ڕووناکی کەنیشتە (سیناگۆک) و ماڵە سادەکەی باوکم دەرکەوتن، لەگەڵ چاوە میهرەبانەکانی دایکەجوویێک هەر خۆشەویستی و پاکی و دینییان لێدەباری. درووودخوێندنەوە لە زیندانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ... ڕۆژی تۆبە لە لوکشیکیدا، تەنانەت شەوێکی وەهاش دەکرێ ببێتە شەوێکی دڵدانەوە، تەنانەت ڕۆژێکی وەهاش بە هەموو شتەکانی ژیانی پیاویش بناسرێتەوە.

شەو ڕابرد، رۆژیش هات و ڕۆیشت، ئیدی هەر ڕاستەوخۆ دوای ڕۆژی تۆبەکردن، شەوانی لێکۆڵینەوە هاتنەوە.

٥

# کێ ناوەکەی بە «ب» دەستپێدەکا؟

بە گوێرەی ڕێساکانی سیستمەکەی ئەوێ، دیسان بۆ لێکۆڵینەوە بانگ کرامەوە. یەکدوو سەعاتێک دوای کاتی خەوتن، چرپەی دەنگێک هات، دەرکەی چاوە زیندانییەکە سیرەی لێوەهات و کرایەوە. ئێمەش هەر هەموومان لە خەوێکی قووڵ بێدار بووینەوە. ئێمە هەر سێ هاوژوورەکە، زیندانی دێرینە بووین. ڕاهاتبوین لەبەر تیشکی گڵۆپی شەو وەنەوزمان بێ، لەبەر دەنگەدەنگ بخەوین، بە تایبەت لە سەعاتە یەکەمەکانی شەو، لەگەڵ ئەوەی گڵۆپەکە تا بەیانی نەدەکوژێنرایەوە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو، تا پاسەوانەکانمان لە کونە شۆفارەکە، لە کونی «جودا»دا سەیرمان بکەن، لەو کاتەی ڕازابووین چاودێریمان بکەن. بەڵام سەدای دەنگی پێی ئاشنا، سیرەی قفڵکرانەوە و شمشێر ڕاکێشان و کردنەوەی دەرکە، تەنانەت زیندانییەکە لە شیرین خەویشدا بێ، هەڵیدەستێنێتەوە. هەر بۆیە لەبەر دەنگەکە دەستبەجێ خەبەرمان بووەوە و سەرمان بڵندکرد، لە پشت کابرای دەرکەوانە نۆبەتچییەکە[44]، دوو کەسی دیکە بە جلوبەرگی فەرمیی یەکبەرگییەوە ڕاوەستابوون.

"ئەرێ ناوی کامەتان بە «ب»ـیە؟" یەکێک لەوان بە دەنگێکی نەوی بانگیکرد. ئەمەش تایبەتمەندییێکی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی

---

[44] – نۆبەتچی: ئێشکگر

سۆڤیەتی بوو. واتای ئەوەی دەگەیاند: ناوی کامەتان بە پیتی "ب" دەست پێدەکا؟

بە گوێرەی ئاسایشپارێزی ڕێنماییەکانی "حکوومەتی ژێرزەمینی" نەدەبوو بۆ داواکردنی زیندانی بۆ لێکۆڵینەوە بە ناوی خۆی، بە ناوی تەواوی خۆیەوە بانگبکرێ، نەبادا لە چاوە زیندانییە تەنیشتەکانی گوێیان لە ناوەکە بێ، یان لەکاتێک هەڵەیان لە ژووری زیندانەکە کردبێ، ئەوا ناوەکە بۆ سەرنشینانی ژوورەکە ئاشکرابێ. لەوەش زیاتر، لەبەر هەندێک هۆکار، دەرکەوانی نۆبەتچی بەدەر لە هەندێ باری تایبەتدا بۆی نەبوو بچێتە نێو چاوە زیندانییەکان "دوژمنانی گەل". لەبەر هەموو ئەو هۆکارانە، دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، وەها ڕاهاتبوو، نۆبەتچییەکان هەر لە دەرکەی چاوەزیندانییەکەدا بپرسن " ناوی کێ بە پیتی «ئا» دەست پێدەکا؟" یاخود "کێ بە «ز»ـێیە؟"، ئیدی کابرای زیندانی تێدەگەیشت و لە شوێنی خۆی وەڵامی دەدایەوە. خۆ ئەگەر ئەو کەسەی بە دوایدا دەگەڕێن لەوێ بێ، ئەوا بە تەنیا هەر هاوژوورەکانی، ئەگەر کەسی لێبێ، گوێیان لە وەڵامەکە دەبێ؛ لە کاتێکیش هەڵە لە لیستەکەدا کرابێ، ئەوا زیندانیانی نێو ژوورەکە نازانن، لە خۆیان بەدەر، ئاخۆ کەسێکی دیکە کەوتبێتە بەر دەستیان.

لەنێو چاوە زیندانەکەی ئێمەدا، تەنیا پاشناوەکەی من بە پیتی «ب» دەستییپێدەکرد. منیش چەندین ناوم گوتن. نۆبەتچییەکەش لە لیستەکەی بەردەستی ڕوانی.

"ناوی خۆت و ناوی باوکت،" بەم جۆرە لەسەر پرسیارەکانی بەردەوام بوو.

"مێناحیم وۆلفۆڤیچ."

"دەی خۆت بگۆڕە، بۆ لێکۆڵینەوە داواکراوی."

منیش خۆم گۆڕی. هاوژوورییەکانم بێدەنگبوون، بەڵام چاوەکانیان لەبلەبانانە شتیان تێدابوو. ئینجا لە ژوورەکە دەرچووین. بەلای پەیژەکاندا چووینەخوار. لەو نێوانەشدا تۆڕە وایەرێک ڕاچێنرا بوو، بۆ ئەوەی نەبادا زیندانییەک ڕابکاتە ئەو شوێنەی کە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش لەوێدا چیدی لێیان ناپێچێتەوە ... هەر لەوێ و بەڕێوە دوو تا سێ دەرکەم بۆ کرانەوە. پێدا تێپەڕیم و گەیشتمە حەوشەکە. زیندانی «لوکیشکی» گەورە بوو. ئینجا لە پڕێک فەرمانم پێکرا بوەستم و بەرەو دەستە ڕاست بابدەمەوە. پاسەوانەکان و من بۆ چەند خولەکێک لەوێ وەستاین. بەدەر لە دیوار هیچی دیکەم نەبینی، بەڵام گوێم لە تەپەی پێی بوو لە پشتمەوە دەهات. زەحمەت نەبوو ئەوە هەڵبکرێنی، کە ئێمە چووینەتە ناو قەڵەمڕەوی کەسێکی دیکە بۆ لێکۆڵینەوە، ئەو شوێنەش بە پێی ڕێنماییەکانی دەزگەی ئاسایش قەدەغە بوو ڕوخساری یەکدی ببینین. لە شوێنێکی دیکەدا تووشی زیندانییەکی دیکە هاتم ڕووبەڕووی دیوارەکە ڕاگیرابوو. لە گۆشەی چاومەوە پشتی کابرام دەبینی. لەوێدا هیچ کونێکی پیلانگێڕی دەزگەی ئاسایش لە ئارادا نەبوو.

لە کۆتاییدا بردرامە ژوورێکی بچکۆلەی گەرم و چراخان، لەوێ فەرمانیان پێکردم لەبەردەم مێزەکەدا دابنیشم. پاسەوانەکان منیان بەجێهێشت. بە تەنیا مامەوە، بۆ ساتێک، لە نێو ژوورە خۆشەکەدا کەیفمهات. بەڵام هەر کەمێک دوای ئەوە، ئەفسەرێک بە نیشانەی سەرشانی کاپتنێک و دەمانچەیەک بە قەدیەوە، هاتە ژوورەکەم و لە بەردەمم لەو سەری مێزەکەوە دانیشت.

دوای ئەوەی سەیری سەرە تراشراو و ڕیشە نەتراشاوەکەی کردم لێیپرسیم: "ناوەکەت «بێگن»ـە، «مێناحیم وۆلفۆڤیچ بێگن»؟"

منیش گوتم بەڵێ وایە.

"باشە" ئەویش لەسەر قسەکەی وەها بەردەوام بوو. "من دادوەری لێکۆڵینەوەکەی تۆم. ئەمەشیان یەکەمین دیدارمانە. لە داهاتوو دانیشتنی دیکەشمان دەبێ. درێژەی لێکۆڵینەوەکەش لەسەر تۆ بەندە، لەسەر بەرسڤی تۆ بۆ پرسیارەکانم وەستاوە. هەر بەو بۆنەیەشەوە، ئەوەی نووسیوتە خوێندوومەتەوە، بەڵام بێبایەخە. دەکرێ فڕێی بدەمە نێو تەنەکەی خۆڵەوە. تۆ دەبێ ڕاستییەکەم پێبڵێی. لە زیندانەکەتدا، هەڵبەتە فێری ئەوە بووی، بۆ تۆ وا باشترە ڕاستییەکە بڵێی، هەر ڕاستی دادت دەدا."

منیش داوام لێکرد دەست بە لێپێچینەوەکەی بکا و ئەوەشم خستەسەر: "دەکرێ بزانم چۆن بانگتبکەم؟"

لە یەکەمین لێکۆڵینەوەدا لە مەڵبەندی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، بە مانۆڕێکی زمانەوانی و بە پێی پێویست لە دەورەی ئەو وشانەدا دەسوڕامەوە، کە بۆ بەرانبەرەکەم بەکاریان بهێنم، وشەی وەک "هێژا"م بەکاردەهێنا. دەمزانی ئەو ناوە بۆ کەسێکی سۆڤیەتی نەدەگونجا، بەڵام بە گومان بووم لەوەی یارۆی لێکۆڵەرەوە لە کۆمەڵگەیەکی سۆشیالیستیدا بە "هاوڕێ" بانگبکەم. هاوڕێ زیندانییەکەم، ئەفسەرە پۆلۆنییەکە، وێڕای شانازبوونی بە خۆی، هیچ گومانی بۆ نەمابووەوە، بڕیاری دابوو بە هاوڕێ دەبێ پەیوەندی هاوڕێیایەتی بێتەدی. بەڵام کاتێک بانگی یەکێ لە دەرکەوانە ئێشکگرەکانی دەکرد "تۆڤاریچ"[45]، بە تووڕەییەوە وەڵامدەدرایەوە: "گورگێکی بۆرە هاوڕێت بێ!" منیش حەزم نەدەکرد لێکۆڵەرەوەکەم بە هەمان شێوە وەڵامم بداتەوە، پێشموابوو سەخت بوو لە ماوەی لێکۆڵینەوەکە خۆم لە وەسفێک، لە ناوێک دووربخەمەوە بۆ ئەوەی بە هۆیەوە ناوی لێکۆڵەرەوەکەم بهێنم.

---

45- تۆڤاریچ (tovarich) بە ڕووسی سەردەمی یەکێتیی سۆڤیەت واتە هاوڕێ.

"دەکرێ بە دادوەری لێکۆڵەرەوەی مەدەنی بانگم بکەی،" کاپتنەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی وەها وەڵامی دامەوە و ئینجا درێژەی پێدا: "ئێستاش دەی پێم بڵێ، لە کەیەوە تۆ زایۆنستی؟"

"لە منداڵیمەوە."

"سەر بە چ ڕێکخراوێکی؟"

"لە تەمەنی دە تا سێزدە ساڵییدا سەر بە «شۆمەر هاتسایر[46]» و لە تەمەنی پانزە ساڵی و بە سەرەوەش بوومە ئەندامی «بێتار».

"وەها دەبینم لە تەمەنێکی زووەوە دەستت بە چالاکی تاوانکارییت کردبێ."

"بۆچی تاوانکاری؟ پێموایە چالاکییەکان ڕەوا و لەبار بوونە."

"تۆ پێتوایە؟ هەر بە ڕاستیش زۆر گرنگە کە «مێناحیم وۆلفۆڤیچ بێگن» پێیوابێ! من پێت دەڵێم تۆ تاوانبارێکی سیاسی گەورەی. تۆ لەوە پۆلکتری[47] کە دە کەست کوشتبن."

"بەڵام بۆچی؟ چما؟"

"چونکە هەموو چالاکییەکانت دژەسۆڤیەت و دژەشۆڕش بوونە؟"

" بە چ پێودانگێک ئێمە دژەسۆڤیەت بووین؟"

---

[46]- شۆمەر هاتسایر Shomer hatsair جووڵانەوەی دیدەوانی نیشتمانیی جوولەکە بوو لە سەرەتای بیستەکان، لە سەرەتای سییەکانیشدا بووە حیزبێکی لایەنگری سۆڤیەتی بۆ زایۆنیزم. نووسەر.

[47]- پۆلکتر: بەدتر، خراپتر.

"دەی بوەستە، چیدی مەپرسە! تۆ بۆ ئەوە لێرەی کە وەڵامی پرسەکانی من بدەیتەوە، نەوەک من هی تۆ. باشە کێ وای لێکردی بچیتە نێو «بیتار»؟"

"هیچ کەس. من خۆم چووم."

"ئەوە ڕێی تێناچێ. لە لای ئێمە، کاتێک گەنجێک بیەوێ بچێتە نێو کۆسمۆمۆل[48]، ئەوا ئەندامانی دیکە دەیهێننە ڕیز. کێ تۆی هێنایە ڕیز؟"

"هیچ کەس. من دەچوومە قوتابخانە، لە شارەکەمدا دەیانناسیم، ئەوانیش بێ هیچ گرفتێک منیان لە ڕیزەکانی خۆیان وەرگرت."

"کەواتە بۆچی چوویتە ڕیزی «بیتار»؟"

"بەرنامەکەم بەدڵبوو. شتم لە بارەی «زییڤ ژابۆتنسکی» خوێندبووەوە و بیستبوو."

"ژابۆتنسکی؟ ئۆو، خۆ ئەوە کۆنە دۆستێکی ئێمە بوو! ئەو سەرکردەی فاشیزمی جوو بوو."

"ئەمە ڕاست نییە. «ژابۆتنسکی» دژەفاشیست بوو، ئەو لیبرالێکی ڕاستەقینە بوو."

"بەسیەتی، قسەی پڕوپووچ! ئێمە دەزانین «ژابۆتنسکی» کۆلۆنیلێکی دەزگەی هەواڵگری بەریتانی بوو."

"ئەمەشیان ڕاست نییە. ژابۆتنسکی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئۆردوویێکی سەربازی لە جووەکان پێکهێنا، هەر وەک سەربازێکی

---

[48]– کۆسمۆمۆل: ڕێکخراوی گەنجانی سۆڤیەتی.

ئاسـایی چـووە نێـو لەشـکرەکە، دواتـر پـلەکەی بەرزکـرایەوە، بـووە ئەفسەر (ملازم). ئەو کۆلۆنێل نەبوو، کاریشی بۆ دەزگەی هەواڵگریی بەریتانیا نەکرد. ئەو بۆ گەلی جوو تێکۆشا، تەنانەت بەریتانییەکان ڕێگەیان نەدا پێ بنێتە سەر خاکی فەلەستینیش، چونکە ئەو دژی سیاسەتی دژەجووی ئەوێ بوو."

"سەیرکە، سەیرکە! ئەو هەموو لەبلەبانییە! تۆ وا خۆت نمایش دەکەی، بەوەی لە بارەی سەرکردەکەتم باس کرد، تێکچووی."

"من وەها خۆم نمایشناکەم. «ژابۆتنسکی» مامۆستا بوو. ئەو بڕوای بە من بەخشی، یادەوەرییەکەی لای من زۆر خۆشەویستە. من زیندانییم، دەشـزانم دەبـێ وەڵامـی پرسـیارەکان بـدەمەوە، بەڵام تـا پـێم بکـرێ بەرگـری لە شـەرەفی مامۆسـتاکەم دەکەم. ئایـا تـۆ، ئەی دادوەری لێکۆڵەرەوەی مەدەنـی، بە هەمـان شـێوە ڕەفتـار نـانوێنێ، کـاتێ یەکـێ سووکایەتی بە یادەوەری «لینین» بکا؟"

سـەرەتا لێکـۆڵەرەوەکە حەوسـەڵەی خـۆی لە دەسـت دا. بە مسـت وەرگەڕایە مێزەکە و قیڕاندی:

"دیسـان تـۆ پرسـیارە پڕوپووچەکانـت دەکەیـتەوە! باشـە تـۆ ئەو «ژابۆتنسکی»یەی خۆتان بە «لینین»ـەکەی ئێمە بەراورد دەکەی؟ جـارێکی دیـکە زات نەکەی بەراوردێکـی وەهـا بـکەی! «لینـین» سـەرکردەی گەلان بـوو، مەزنتـرین پیتـۆڵی مرۆڤـایەتی بـوو، جـارێکی دیکە ناوی ئەو لەگەڵ ناوی یەکێکی وەک «ژابۆتنسکی»یەکەی خۆتـان نەهێنی!"

"جەنـابی دادوەری لێکـۆڵەرەوەی مەدەنـی، خـۆ مـن بەراوردەکە نـاکەم. تەنهـا دەمەویسـت تێـبگەم، تـۆ ئـازاری هەسـتی مـن وەک زینـدانییەک نەدەی."

ئەویش لەسەرخۆوە گوتی: "بە هیچ شێوەیەک هەستەکانت بۆ من گرنگ نین. وەڵامەکانت بۆ من جێگەی سەرنجن. دەی پێمبڵێ هەنووکە «ژابۆتنسکی» لە کوێیە؟"

منیش بەم پرسیارەی سەرمسوڕما. ئاخر خۆ ڕاشکاوانە باسی یادەوەری ژابۆتنسکیم بۆ کرد. تۆ بڵێی کاپتنەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، بایی ئەوەندە زیرەک نەبێ، ئەوەی گوتم لێتێگەیشتبێ کە پیاوەکە لە ژیاندا نەماوە؟ یان تۆ بڵێی ئەو ئەگەرە هەبێ، هێشتا نەیزانیبێ «ژابۆتنسکی» مردووە؟ بێگومان لێکۆڵەرەوەکەم لە نێو دەزگەی ئاسایشدا یەکێ بووە لە شارەزایانی زایۆنیزم. تۆ بڵێی هێشتا هەواڵی مەرگی «ژابۆتنسکی» پێنەگەیشتبێ؟ بەڵام خۆ پرسیارەکە کرا، منیش دەبوایە وەڵامی بدەمەوە.

"ژابۆتنسکی مردووە."

"تۆ دڵنیای؟"

"بە داخەوە، بەڵێ دڵنیام."

"دەیبینی، کەسێک نییە فرمێسکی بۆ هەڵڕێژێ."

"خەڵکێکی زۆر بۆی گریان."

"هیچ کەسێک فرمێسکی بۆ نەڕشت، وەک ئەوەی هیچ کەس نەبوو فرمێسک بۆ ئەو سیخوڕە نێودەوڵەتییە بڕێژێ، کە هەر کەمێک بەر لە ئێستا سەری بە تەور دوولەت کرا."

بۆ ساتێک پێگە و چارەنووسی خۆم لەبیرکرد. لەبەردەمم مریدێکی[49] نەوەکەی شۆڕش وەستابوو؛ گەنجێک، بە دڵنیاییەوە تەمەنی هەندێک لە سی ساڵ هەورازتر بوو. کاتێکیش «ترۆتسکی» یەکێک بوو لە سەرانی شۆڕشی ١٩٠٥، هێشتا ئەو لێکۆڵەرەوەیە هەر لەدایکنەببوو. ئەو کاتەش «ترۆتسکی» لەگەڵ لینین بە یەکەوە سەرکردایەتی شۆڕشی ١٩١٧ی سەرکەوتوویان کرد، لێکۆڵەرەوەکەم هەر منداڵ بوو. ئەو کاتەش ترۆتسکی بەرپرسی لەشکری سوور بوو، بە ڕێزەوەش ناوی لە لایەن ملیۆنان کەس دەهێنرا، ئەو هێشتا هەر نەوجەوان بوو. کەچی لێرە و ئەمشەو، لە شەوێکی پایزی ١٩٤٠دا، ئەو پاسەوانە گەنجەی شۆڕش، بە یەکێک لە گەورە سەرکردەکانی شۆڕش دەڵێ سیخوڕێکی نێودەوڵەتی، بە شانازییەکی دڵ پڕ لە قین و چێژی پیاوکوژێک دەربارەی ئەو لەناوبردنە دڕندانەیە دەدوێ. من هەژام و وەک بروسکەیەک لەمێشکمی دابێ وابوو: خۆ ئەگەر لە مێژوودا تۆڵەسەندنەوەیەک هەبێ، ئەگەر هاتوو مێژوو هاتبێتە سەر تۆڵەکردنەوە لە ترۆتسکی لە بەرامبەر گوناهەکانی، تۆ بڵێی تۆڵەیەک لەوە زیاتر هەبێ؟

لێکۆڵەرەوەکە بە تیژی منی هێنایەوە سەر دنیای ڕاستەقینە.

"ژابۆتنسکی لە کوێ مرد؟" وەهای لێپرسیم.

"لە ئەمریکا."

"ئەو لە ئەمریکا ژیا؟"

"نەخێر. ئەو لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگدا بەرەو ئەوێ چوو."

---

[49]– نووسەر وشەی disciple ی بەکارهێناوە، ئەو وشەیەش بۆ حەواری (حواري) و مریدەکانی عیسای مەسیح بەکار هاتووە، منیش وشەی مریدم پێ گونجاو بوو.

"بۆچی؟"

"بۆ ئەوەی تێبکۆشێ و سوپایەکی جوو ڕێکبخا."

"ئاوەها؟ بۆ ئەوەی کۆمەکی وڵاتە ئیمپریالییەکان بکا؟"

"بۆ ئەوەی لە دژی هیتلەری ئاڵمان بجەنگێ."

"قسەی قۆڕ! ئاخر تۆ دەتوانی هزرێک بە سوپا تێکبشکێنی؛ تەنیا سەرکردەکانی سوپا و ئەوانەی خوێنی چینی کرێکار هەڵدەمژن حەزیان لە جەنگی ئیمپریالیستانەیە، هەڵبەتە «ژابۆتنسکی» تۆش یارمەتی ئەوانی داوە."

«پراڤدا»[50] لە ڕێی ئەوەوە دەدوا. منیش حەزم نەدەکرد هەراسانی بکەم، بەرژەوەندیشم لەوەدا نەبوو وەها بکەم، بەڵام نەمدەتوانی هەستەکانیشم جڵەوبکەم.

"هیتلەرییەکی ئاڵمان هزر نییە. شتەکە کوشتنە، کوشتنێکی تایبەتی بۆ جوو."

"دەی هەنووکە، خەم لە جوو مەخۆ! تۆ و ئەوانەی وەک تۆن دوژمنی گەلی جوون، چونکە ئەگەر وەها نەبێ ئێوە یارمەتی شۆڕشتان دەدا نەوەک یارمەتی ئیمپریالیستەکان. بەڵام خۆ ئەم شەوە ئێمە باس لە ئاڵمان ناکەین، ئێمە باسی تۆ دەکەین. خۆت لە پرسەکە مەدزەوە."

ئەو نەیگوت ئاڵمانیای هیتلەر، نەشی گوت ئاڵمانیای "نازی" یان "فاشیست"، بەڵکو تەنیا گوتی ئاڵمان. ئاخر پەیمانی خوێن ئەفسەرەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پابەندکردبوو لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ زیندانییەکی تەواو دابڕاودا دەکرد.

---

[50]– پراڤدا ڕۆژنامە فەرمییەکەی یەکێتیی سۆڤیەت.

"باشە،" وەهای گوت و دەستی بە لێکۆلینەوەکەی کردەوە؛ " ئەرێ بەر لەوەی ژابۆتنسکی بچێتە ئەمریکا، لە کوێ دەژیا؟"

"دەقاودەق لە لەندەن."

"لە لەنـــدەن؟ بەڵام خـــۆ تـــۆ گوتـــت، بەریتانیـــا ئەوی لە فەلەســـتین دوورخستبووەوە!"

"ئەوە ڕاستە، بەڵام ڕێگر نەبوون لەوەی لە ئینگلیستانیش بژی."

بـۆ یەکەمـین جـار لێکـۆڵەرەوەکەم لە پـڕمەی پێکەنینیـدا. پێکەنینێکـی بە دڵ، بە زەوق و کوڵ بوو.

دوای ئەوەی هاتەوە سـەرخۆی گـوتی: "تـۆ دەتەوێ ئەو حەکـایەتەم بـۆ بهـــۆنیتەوە؟ هێشـــتاش دەتەوێ بـــڕوات پێـــبکەم؟ لە ســـەرێکەوە بەریتانییەکـان ڕێگەیـان نەدا ژابۆتنسـکی لە فەلەسـتین بـژی، کە هەر لە ژێـر قەڵەمـڕەوی خۆیانـدا بـوو، کەچـی لە سـەرێکی دیکەشـەوە لارییـان نەبـوو لە وڵاتەکەی خۆیانـدا بـژی؛ دە وەرە ئەم کەرەم لەو قـوڕە بـۆ بێنەدەر؟!"

"بەڵام خۆ ئەوە ڕاستیەکەیە." هەوڵمدا بڕوای پێبهێنم. "جەنـابی دادوەری لێکـۆڵەرەوەی مەدەنـی، سـەیرکە، بەر لە هەڵگیرسـانی جەنـگ، بەریتانیـا یەکێک لە کوڕە باشـەکانی «بێتـار»ی بە نـاوی « شـلمۆ بـن یوسـف» لەسێدارە دا. ئەو کات ژابۆتنسکیش لە لەندەن بوو، هەوڵـی زۆری دا لە قەنارەدانەکە بوەستێنێ. لە کۆتاییدا هەوڵەکـانی بێهـوودە بـوون، - «بـن یوسـف» بە دەم سـروودەوە چـووە بـن پەتـی سـێدارە - بەڵام ئەوە ڕاسـتییە، سـەبارەت بەو پرسـە لە لایەن وەزیـری کۆلۆنەکـان پێشـوازی لێکرا."

من بەوە دڵخۆش بووم، ئەو دەرفەتەم پێدرا بۆ ئەفسەرە سۆڤیەتەکەی ڕوونبکەمەوە، کە ئەندامەکانی «بێتار» باکیان بەوە نییە ژیانی خۆیان لە پێناو بیروباوەڕەکەیان بخەنە مەترسی، تەنانەت مەرگیش ڕێگەیان پێناگۆڕێ. بەڵام لە هەمان کاتدا، منیش ئەو دەرفەتەم پێدا، بپرسێ ئاخۆ بۆچی بەریتانییەکان حوکمی مەرگیان بەسەر «بن یوسف»دا دا. من بەسەرهاتی بەسەردادانەکەی عەرەبەکانم بۆ سەر جووەکان بۆ باسکرد، کە ئەوان بە شێوەیەکی ڕێکخراو و بە پشتگیری ئاژانە بەریتانییەکان هەڵیان کوتایە سەر جووەکان؛ پێمڕاگەیاند چۆن گەنجانی ئێمەش هەستیان بە ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ پەلاماردەرەکان کرد؛ چیرۆکی زیندانی «بن یوسف»یشم بۆ گێڕایەوە. ئەویش بێئەوەی بموەستێنێ گوێی بۆ شلکردم.

کاتێکیش لە گێڕانەوەکە بوومەوە، گوتی: "ئەو «یوسف»ـە ویستوویەتی عەرەبەکان لەسەر خاکی خۆیان ڕاوبنێ. لەوەدا ئەو کۆمەکی بەریتانییە ئیمپریالیستەکانی کردوە."

منیش لێم پرسییەوە: "کەواتە ئەدی بۆچی بەریتانییەکان لە سێدارەیان دا؟"

"دیسان ئەوە تۆ پرسیارم لێدەکەیتەوە؟ ئاخ، هەی «مێناحیم وۆلفۆڤیچ»، هێشتا فێرنەبووی بە شێوەیەکی لایەقانە بیربکەیتەوە. ئاخر تۆ لە جیاوازیی نێوان بابەتی خزمەتی بابەتییانە و بابەتی خزمەتی بۆرژوازی و ئیمپریالیزم تێناگەی. دەی نمونەیەک وەرگرە، نموونەی سۆشیالدیموکراتەکان، ئەوانەی ئینتەرناسیۆنالی دووەم، ئەوانەی سوێندیان خوارد کە دژی سەرمایەداری بجەنگن. لە ڕاستیشدا ئەوان ناپاکییان لە چینی کرێکار کرد. ئەوان باسکێکی بۆرژوازیین لەنێو چینی کرێکاردا، ئەوان لە دوژمنی کرێکارانیش بەدترن. لینین و ستالین پەردەیان لەسەر ڕوو هەڵماڵین. ئێمە،

کۆمۆنیست، دەمانەوێ دەمامکی هەموو ئەوانە لابدەین، کە خزمەتی بۆرژوازی نێودەوڵەتی دەکەن."

"بەڵام لینین گوتی دەبێ پشتگیری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی بکرێ."

"ئێوە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی نین. ئێوە ئاژانێکی بۆرژوازی ئینتەرناسیونال و باسکێکی ئیمپریالیزمن. ژابۆتنسکی کۆلۆنیلێکی دەزگەی هەواڵگری بەریتانی بوو، نوێنەرێکی بە ئاگای ئیمپریالیزم بوو. ئەو «یوسف»ـەش، یاخود هەر ناوێکی لێدەنێی، لەوانەیە بە نەخوازراوی خزمەتی ئیمپریالیزمی کردبێ ... هەرچی سەبارەت بە تۆشە، هێشتا دەیبینین. بەڵام دیسان ئەوەم پێمەڵێ، کە بەریتانییەکان ژابۆتنسکییان لە فەلەستین دوورخستبێتەوە و کەچی لە وڵاتەکەی خۆیان ڕێگەیان پێدابێ."

منیش نامرادانە گوتم: "بەڵام ئەوە ڕاستییەکەیە."

"بەسە، واز لە قسەی پڕوپووچ بێنە! ئێمە ئەو جۆرە ڕاستییانە دەزانین."

منیش هیچ بەڵگەوبەندێکی[51] دیکەم نەمابووەوە. هەستمکرد لەو خاڵە دۆڕاوم. لە ڕاستیشدا، ئەوەی من گوتبووم، خودی ڕاستییەکە بوو. بەڵام خۆ بە تەواوی لای ئەفسەری دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نەپەژراو[52] بوو. پرسەکەش هەر ئەوە نەبوو، من دژی لێکۆڵەرەوەکەم بووم؛ بەڵکو شتەکە وابوو، جیهانێک دژی جیهانێکی دیکە بوو، ڕوانین دژی ڕوانین بوو، نێوانیشیان خەرەندی دۆزەخ بوو.

---

[51]- بەڵگەوبەند: ئەرگومێنت.

[52]- نەپەژراو: پەسەندنەکراو، قبووڵنەکراو.

خودی ڕاستییەکەش نەدەکرا ببێتە پردێک؛ بەڵکو بەرەو دۆزەخ ملی لێدەنا.

لێکۆڵەرەوەکە بە تەوسەوە لەسەر لێپێچینەوەکەی خۆی بەردەوام بوو:

"باشە لە پاش هەموو شتێک، بۆچی ئەوەندە لە ژابۆتنسکی دڵنیای؟ بەڵکو ئەو لە خشتەی بردبی. پێتوایە ئەو هەموو شتێکی بۆ باس کردبی؟ هەر بەو بۆنەیەشەوە، ئایا تۆ باشت دەناسی؟"

"بەڵێ، پێموابێ باشم دەناسی."

"ئایا لە نزیکەوە بینیوتە؟"

"بەڵێ، ئەو یەک دوو ساڵەی دوایی بەر لە جەنگ، لە نزیکەوە بینیم."

"هەر کاتێک حەزت لێبووبا، دەچوویە لای؟"

"نەخێر، هەر ئەوکاتە دەمبینی، کە بانگی کردبام."

"چەند جاران تۆ ژابۆتنسکیت بینیوە؟"

"کتومت ناتوانم بیڵێم."

"بە نزیکەیی چەند جار؟"

"هەر بە ڕاستی زەحمەتە بیڵێم. پێموابێ هەمووی بەسەر یەکەوە زیاتر لە بیست جاران بینیومە."

"باسی چیتان دەکرد؟"

"شتی زۆر، فێرکردنی گەنجانی جوو، کێشە ڕێکخراوەییەکانی «بێتار»، دۆخـی فەلەسـتین، سیاسـەتی بەریتـانی، کـۆچکردنی گەنجـان بـۆ فەلەستین، پرسی جۆراوجۆر."

"ئایا دەمەتەقێتان لەسەر یەکێتیی سۆڤیەتەوە کردووە؟"

"نەخێر."

"درۆ دەکەی!"

ئەو بە پێـداگیرییەوە ددانـی لەسـەر دەردانـی وشـەی درۆ گیرسـاند، گۆکردنەکەشـی هاوکـات بـوو لەگەڵ بریسـکانەوەی چاوەکـانی، بەڵام وەک جووە چیکەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی شۆرەوی نەبوو، کە ئەوکات بەڕێزەوە بە شێوەی کۆ پێیگوتم.

منیش وەڵامـم دایەوە: "باشـە بۆچی دەبێ درۆ بکەم. ئایا حاشـاییم لە هیچ لە کار و چالاکییەکانی زایۆنزمی کردووە. زۆر بە سـادەیی هیچم بە بیرنـایەتەوە، کە ژابۆتنسـکی منـی بـانگکردبێ و باسـی یەکێتیـی سۆڤیەتی کردبێ."

"تۆ هێشتا بە بیرت نایەتەوە! لە زیندانەدا زۆر شتت بەبیر دێتەوە. دەی هەنووکە پێم بڵێ، بۆ چ جۆرە خەڵکێک بزووتنەوەکەتان لەگەڕدا بوو؟"

"خەڵکی هەموو چینەکان، زۆربەشیان لاو بوون."

"بەڵام زۆربەیان بۆرژوازی بوون."

"نەخێـر، بە پـێچەوانەوە. بەشـی هەرە زۆری خەڵکـی کـارکەری هەژار بوون، لە پۆلەنداشدا هیچ ئایندەیەکیان لەبەر دژەسامیێتی نەبوو."

"ئەمەش واتـای ئەوە دەگەیەنـێ، تـۆ خەڵکـت لە پرسـی کۆمۆنیسـت دەکردەوە و دەترفاندن."

ئێمە ئەوانمان بۆ هیچ شوێنێک نەدەڕفاند. ئەوان بە کامی دڵی خۆیان دەهـاتن. ئەوە خـۆ تێگەیشـتنێک بـوو، تـا ئەو ڕاددەیەی دەهـاتنە نێـو «بێتار»، ئەوان نەدەچوونە نێو پارتی کۆمۆنیست."

"ئاها. ئەوەیە!"

لەو قسـەیەی "ئـا ئەوەیە!" کە هاوکـار بـو لەگەڵ سـەر بەرزکـردنەوەی دەست، نیشانەی سەرکەوتنی پێوە دیاربوو.

لەو یەکەم "دەمەتەقێیە"دا، ئەوەی لێکۆڵەرەوەکە و من گوتمان، کرۆکی باسوخواسـەکە بـوو، بەڵام ئەوەش هەبـوو کە هەنـدێ شـتم گـوت، لە شـەوانی دیکەشـدا باسـم کردبـوو. ئەمەش پـوختە ڕاپۆرتێـک نیـیە. گفتوگۆکە زۆر لەوە درێژتر بوو. هەندێ جار بۆ پێنج تا دە خولەک لەسـەر یەک قسـەم دەکـرد و لێکـۆڵەرەوەکەش بـێ قسـەپێبڕین گـوێی لێـدەگرتم؛ هەنـدێ جـار درێـژەی دەدایـێ، بە ڕوونـی شـانازی بە دەستکەوتەکانی یەکێتیی سۆڤیەتەوە دەکرد. کـاتێکیش من ئەو لا باڵەم بەجێهێشـت کە چـاوە زینـدانەکەمی لێهەڵکەوتبـوو، میلـی سـەعاتی دیوارەکە لەسەر ١٠ی شەو بوو. کاتێکیش لێکۆڵەرەوەکە وشـەی "ئاهـا، ئەوەتـا"ی دەردا، مـن کـاتژمێرە گەورەکەی بازنـدی دەسـتیم بینـی، کە سەعات ٢ی بەرەبەیانی نیشاندەدا. منیش پێم سەیر بوو. تۆ بڵێی ئەوە لێپێچینـەوە بـووبێ؟ خـۆ ئەوە تـاوتوێکردنی باسـوخواس بـوو نەوەک لێکـۆڵینەوە. مشـتومڕێک بـوو لە نێـوان کۆمـۆنیزم و زایـۆنیزم، بەڵگەوبەنـدێک (لە کـاتی گێژاودا) بـوو لە نێوان دوو جیهـان، کە لەنێو یەک ژووری بچکۆلەدا بەیەک گەیشتبوون، ژووری کاری ئەفسـەرێکی ڕابەری سیاسیی یەکێتیی سۆڤیەت.

هەر زوو گومانەکـــانم ڕەوانەوە. لە ســـەعات دووی بەرەبەیانـــدا، ئەفســـەرەکە، کە هیچـــی لە و دەمەتەقـــێ دووروودرێـــژەکەی ئـــێمەوە نەنووسیبوو، پارچە کاغەزێکی سپی دەرهێنا شتێکی لەسەر بنووسێ. بۆ ماوەیەک بێ ئەوەی هیچ شتێکم پێبڵێ، هیچ شتێکم لێ بپرسێتەوە کەوتە ســـەر نووســـینەوە. کـاتێکیش لێبـووەوە، ئەوەی نووســـیبووی بۆخـۆی خوێنـدیەوە، جـارێکی دیـکە خوێنـدییەوە، هەنـدێ ڕسـتەی ڕەشکردنەوە، ڕستەی دیکەی لەسەر نووسینەوە، لەنێوان دێڕەکاندا نووسیەوە. دوای ئەوە، نیوەی کاغەزی دووەمیشی پڕکردەوە، پاشان دیســـان ڕاســـتیکردەوە. ئەو نووســـینەکەی بە وریـــاییەوە، بە بـــێ ڕاستکردنەوە و ڕەشکردنەوە لە لاپەڕەیەکی سپی دیکەدا نووسیەوە، ئەوسا کە لێبووەوە، ئەوەی لە شێوەی پرسیار و وەڵامی ڕاستەوخۆ نووسیبووی بۆی خوێندمەوە.

ئینجا لێی پرسیم: "دروستە"؟

کەم تا زۆر نووسینەکەی دروست بوو. لە ڕاپۆرتەکەیدا، لە پرسیاری ئەوەی، ئـاخۆ کەی چووبـوومە ڕیـزی «بێتـار» و لە بـنەوەش وەڵامـی دروستی منی نووسیبوو. لەوێدا ئەو پرسیارانەی دەربارەی ئەرکی بەجێهێنـراوی مـن لەنێـو بـزووتنەوەکەدا تێـدا بـوو، لە ژێـرەوەی پرسیارەکانیشدا وەڵامی منی بە تەواوی نووسیبوو. لەنێو ئەوانەشدا، پرسیار سەبارەت بە ژمارەی ئەو کۆبوونەوانەی لەگەڵ ژابۆتنسکی سـازم دابـوون، لە وەڵامیشـدا وشـەی ڕووسـی ”nyadinokratno“ی بەکارهێنابوو، کە واتای "زیاتر لە جارێک" یان دروستتر واتای "زۆر جاران"ی دەگەیاند.

"بەڵی جەنابی دادوەری لێکۆڵەرەوەی مەدەنی زۆر تەواوە،" منیش وەها وەڵامم دایەوە؛ "بەڵام بمبوورە کە دەڵێم، من چەند شتێکم بە تۆ گوت، حەزیشـــم دەکـــرد لە نێـــو ڕاپـــۆرتەکەدا هەبوونـــایە، کەچـــی تـــۆ نەتنووسیونەتەوە."

"هیچ شتێکی بۆ زیادناکەم." بە گرژییەکەوە وەهای پێگوتمەوە؛ پێتوایە من ئەو هەموو شتە قۆڕانەی تۆ دەخەمە نێو ڕاپۆرتەکەوە؟ من نامەوێ ئەو لاپەڕانە بە درێژدادڕی تۆ پڕبکەمەوە. من کۆنووسەکە دەنووسم نەوەک تۆ."

"بەڵێ، بەڵام خۆ نابێ مەحزرەکە هەمووی نەبێ." بەم قسەیە تێکۆشام، قەناعەتی پێبهێنم.

"نامەوێ هیچی دیکەی لێزیادبکەم." بە کەڕەپەوە وەڵامی دامەوە. "لە دادگەدا دەکرێ هەموو ئەو شتانە بڵێی، کە من لێرە لەو کۆنووسەدا نەمنووسیونەتەوە."

"کەواتە دادگەییش هەیە؟" منیش بە هەستێکی تێکەڵاو لە مەراق و دڵخۆشیەوە کەوتمە پرسیار.

"بێگومان، دادگەیی هەیە. تۆ لە یەکێتیی سۆڤیەتی، هەموو کەسێک مافی خۆیەتی دەستوەکەری[53] لەخۆی بکا ئەگەر تاوانکاریش بێ. دەی کەواتە، ئێستا واژۆ بکە!"

من هێشتا هەندێک دوودڵ بووم. پێم سەیر بوو، لەوانەیە لە بەرژەوەندی من بێ - ئای لە ساویلکەیی - گەر هاتبا و وام لێکردبا بینووسیبا، کەوا من هەژار بووم و دەرسی تایبەتیم داونەتەوە بۆئەوەی پارەی خوێندنەکەم دابینبکەم و یارمەتی ماڵباتەکەم بدەم، وەک ئەوەی باسم بۆ کردبا، باسوخواسی کەرەستەی مرۆڤدۆستی بزووتنەوەکەم بۆ بکردبا. بەڵام خۆ لە لام ڕوون بوو، ئەو هیچی وەهای بۆ کورتە پەخشانە خاوێنەکەی زیاد نەدەکرد. منیش ناکۆک نەبووم سەبارەت بە هەرچی ئەو لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسیبووی: من ئامادەی ئەو قسانە بووم و هەر کاتێکیش بێ واژۆی بکەم. منیش لە

[53]- دەستوەکەری لەخۆکردن: بەرگری لەخۆ کردن.

دڵەوە ئەو بەڵێنە ناوبۆشەی ئەوم ڕەتنەکردەوە، بەوەی لە داهاتوو دادگەییم لە پێشە، ئیدی دەرفەتێکم بۆ بەرگری لەخۆکردن دەبێ. بۆیە دەستم بۆ کۆنووسەکە برد. ئەو یەکەمین لاپەڕەی دایە دەستم، کە بە دەستخەتە جوانەکەی نووسرابوو، منیش لە خوارەوە واژۆمکرد. لە پەڕەی دووەم، ویستم واژۆکەم هەندێ لە خوارتر، هەندێ دوورتر لە دوا ڕستە دابنێم. کەچی لێکۆڵەرەوەکە پێیگوتم، دەبێ واژۆکەم ڕاستەوخۆ لە کۆتایی دوا ڕستەدا دابنێم، بۆ ئەوەی بواری هیچ کەس نەمێنێتەوە شتی بۆ زیادبکا. ئای لەو وردەکارییە!

"باشە،" ئەو وەهای پێگوتم؛ "ئێستا دەتوانی بڕۆیتەوە چاوە زیندانەکەت. ئایا هیچ سکالات هەیە؟"

"نەخێر، من هیچ سکالام نییە، بەلام پێمخۆشە ئەو کتێبانەم بدەنەوە، کە پێشتر لێیانوەرگرتووم، ئەمە لەگەڵ باقی شتەکانی دیکە."

"با سەیری بکەم، بەلام دڵنیا نیم ئاخۆ ڕێگەپێدراوە لە نێو زینداندا بخوێندرێتەوە." ئینجا هەڵستا و بەرەو دەرکە ڕۆیشت، تا بانگی ئەو پاسەوانانە بکا، کە یاوەرم بوون.

لە پڕێکەوە بیرۆکەیەکم بە مێشکدا هات.

"ئەرێ دادوەری مەدەنی،" لەو کاتەی ئەو هەڵستا وەهام پێگوت؛ "پێمخۆشە بۆ بەیانی وەرگێڕێکم بۆ بێنن. من لە هەموو شتێکت دەگەم، بەلام ڕووسی بە باشی نازانم و بە زەحمەتیش ئەو وشانە دەدۆزمەوە کە بمەوێ لە بەرانبەر پرسیارەکانت وەلامیان پێبدەمەوە، یان هەر شتێک، کە بمەوێ ڕوونیبکەمەوە."

"سەبارەت بە من، پێموایە بایی لێتێگەیشتن بە ڕووسی قسەدەکەی. بەلام خۆ ئەگەر بتەوێ بە شێوەیەکی شایستە وەلامەکان بدەیتەوە، هەوڵدەدەم بۆ دەمەتەقێی بەیانیمان، وەرگێڕێک ئامادەبکەم."

دەق ئەو گوتی: "دەمەتەقێ".

منیش سوپاسم کرد.

نەشمدەزانی بەو داوایەم هەڵەم کردووە یان نا.

دەست لە پشتەوە گەڕێنرامەوە زیندانەکەم. لە ڕێگەدا سەرم بۆ ئاسمان هەڵبڕی. ئای چەند ئەستێرە بە ئاسمانەوە بوون، چەندیش بە تەمومژ دەورەدرابوون!

بە دەنگــــی کــــرانەوەی دەرکەی چاوەزینــــدانییەکەم، هاوزینــــدانەکانم بێداربوونەوە، کاتێکیش دەرکەیان داخستەوە، بە سرتەوە لێیان پرسیم:

"ئەرێ هەموو شتێک باشە؟"

"زۆر تەواو، ئێمە قسەمان کرد ... من دەمەوێ بخەوم."

"شەوشاد! بەیانی قسە دەکەین."

بەڵام پشوی شەوەکەم کورت بوو. لەگەڵ زەردەی بەیانی، دەنگی فیکە، وەک چەقۆ هەوای «لوکیشکی» شەق کرد: کاتی لە خەو هەڵسان بوو!

## ٦

# یارمەتییەکانی وەرگێڕ

بۆ شەوی پاشتر دیسان لە سەرەتای خەوەکەوە بە خەبەریان هێنامەوە. پێیان گوتمەوە خۆم بگۆڕم، دەستم ببەمەوە پشتم و بەرەو لێکۆڵینەوە بڕۆم.

لەسەر مێزی هەمان ژوور، ئەم جارەیان دوو کەس دانیشتبوون: لێکۆڵەرەوەکەم، دادوەری مەدەنی، لە تەنیشت ئەویشەوە یەکێک بە جلوبەرگی مەدەنییەوە.

"ئەمە وەرگێڕەکەتە،" دوای ئەوەی لە بەرانبەریان دانیشتم، لێکۆڵەرەوەکە وەهای پێگوتم. "دەبینی، من داواکەتم بەجێهێنا."

منیش سوپاسم کرد.

"ئەمشەو،" لێکۆڵەرەوەکە بەم جۆرە دەستی بە قسان کرد: "دەمەوێ گوێم لە بەرنامەکەتان بێ، بەرنامەی بزووتنەوەکەتان - بەڵام هەموو شتێک هەر دەربارەی ئەوە! دەتوانی بە زمانی خۆت قسە بکەی. ئەم پیاوەش بۆ منی وەردەگێڕێ.

منیش هەناسەیەکی ئازادانەترم هەڵمژی. ئیدی پێویست نەبوو بە دوای وشەدا بگەڕێم، یان وشەی پۆلۆنی بە گۆکردنێکی ڕووسیانە دەرببڕم

و هەرگیزیش لەوە دڵنیانەبووم، ئاخۆ بە باشی بەرگوێیان دەکەوت یان نا.

"چاکە،" منیش بە ئارامی دەستمپێکرد، "بەرنامەکەمان زۆر سادەیە. گەلی جوو وڵاتی خۆی نییە و ئێمەش دەمانەوێ نیشتمانەکەی بۆ بگەڕێنینیەوە. ئێمە دەمانەوێ ئێرتز ئیسرائیل[54] بکەینەوە بە دەوڵەتی ئیسرائیل، لەوێدا بە ملیۆنان خەڵکی بێ ئایندە، جووەکانی هەندەران (دیاسپۆرا)، هی وڵاتەکان بگەڕێنینەوە." ئینجا ڕووم لە وەرگێڕەکە کرد: "دەکرێ ئەمەی گوتم دەق وەک خۆی وەربگێڕی: ئێمە دەڵێین ئێرتز ئیسرائیل ببێتەوە بە دەوڵەتی جوو. ئەمە پێناسەیەکی زۆر گرنگە، چونکە بەریتانییەکان لە جاڕنامەی[55] بلفۆردا نووسیویانە: 'دامەزراندنیماڵێکی نیشتمانی بۆ خەڵکی جوو لە فەلەستین' - لە فەلەستین؛ ئیدی ئەوان سوودیان لە ڕاڤەکردنی هەمەچەشنەی ئەم ڕستەیە بینیوە، بۆ ئەوەی خۆیان لە پابەندییەکان لە بەرانبەر گەلی جوو بدزنەوە. ئەمەش فرتوفێڵێکی خۆیانە."

وەرگێڕەکەش داوای لێکردم کاتی بدەمێ تا قسەکانم وەربگێڕێ. دوای یەک دوو ڕستە، لە ڕووسیەکەی ئەوە ڕوون بوو، ئەو لە من باشترە، هەرچەندە بەو شێوەیەش ڕەوان نەبوو. کاتێکیش لە وەرگێڕانی ڕستەکان بووەوە، لە هیکەوە ڕووی تێکردم و بە ڕووسی گوتی:

"باشە بۆچی تۆ باسی فرتوفێڵی بەریتانییەکان دەکەی، کەچی هیچ باسی فرتوفێڵی زایۆنیزم ناکەی؟"

"چ جۆرە فرتوفێڵێک؟" منیش نائاگایانە هەر بە ڕووسی وەڵامم دایەوە.

---

[54]- ئێرتز ئیسرائیل Eretz Israël واتە وڵاتی ئیسرائیل، ناوێکی کۆن و نەریتیانەی عبرییە بۆ دەستەواژەی تەوراتی بۆ خاکی کەنعان، خاکی بەڵێنپێدراو، خاکی پیرۆز و فەلەستین.

[55]- لێرەدا نووسەر وشەی جاڕنامە، ڕاگەیەندنامە Declarationی بەکارهێناوە نەوەک بەڵێن یان پەیمان.

"دەکرێ من وەڵامی بدەمەوە؟" وەرگێڕەکە بە خەندەیەکی پانکردنەوانە وەهای بە لێکۆڵەرەوەکە گوت.

"هاوڕێ، بەڵێ بێگومان! دەی بۆی ڕوون بکەوە، پێی بڵێ فرتوفێڵ تەواوی ژیانی تەنیوە."

ئینجا وەرگێڕەکە - نەوەک بە زمانی یدیشتی بەڵکو بە ڕووسی - سەبارەت بە بابەتی دووڕوویی زایۆنیزم کەوتە گوتاردان:

"زایۆنیزم - هەرچەندە سەبارەت بە ئامانجی هەنووکەیی، هیچ جیاوازی لە ئاراستە جیاجیاکانی نابینم - خۆی ساختەکارێکی گەورەیە. سەرکردەکانی زایۆنیزم، «هیرتزل»، «نۆرداو[56]»، «ژابۆتنسکی»، «وایزمەن[57]» و ئەوانی دیکە، هەرگیز نیازیان نەبووە دەوڵەتێکی جوولەکە لە فەلەستین دابمەزرێنن. ئاخر ئەوان ئەوەندە زیرەک بوون یان زیرەکن، کە بڕوایان وابێ بتوانن دەوڵەتێک لە فەلەستین دابمەزرێنن. ئایا ئەمە چۆن دەکرێ؟ باشە چی لە زۆرینەی دانیشتوانە عەرەبەکان دەکەی! ئەدی چی دەربارەی ئینگلیز؟ ئایا ئەوان واز لە فەلەستین دەهێنن؟ ئەوان ئەوەیان بۆ خۆیان بۆ نەخشەی ئیمپریالیستانەی خۆیان دەوێ! بە کورتی ئەوان، سەرکردە جوولەکان زانیان و دەزانن، کە بەرنامەکەیان هی ئەوە نییە جێبەجێبکرێ. کەواتە بیرۆکەکە چیبوو؟ ئەوان بیریان کردەوە، بەرنامەی دەوڵەتێکی جوو، یانماڵێکی نیشتمانی یان هەر شتێک کە پێت خۆش بێ ناوی لێ بنێی، بۆ ئەوە بوو جوولەکان، بەتایبەتیش گەنجی جوو، لە ڕیزەکانی شۆڕش دوور بخەنەوە. شتێکی خۆسەلمێنەرە، زایۆنیزمی ئەمڕۆش داردەستێکی گەمەی ئیمپریالیزمی بەریتانییە، بۆ ئەوەی بەهانە بدرێتە

[56]- ماکس نۆرداو Mak Nordau (١٨٤٩-١٩٢٣) سەرکردیەکی زایۆنستی، پزیشک، نووسەر و ڕەخنەگری کۆمەڵایەتی بوو.

[57]- حاییم وایزمەن Chaim Weizmann (١٨٧٤-١٩٥٢) دەوڵەتمەدارو سەرکردەی دیاری زایۆنیزم، لە ١٩٤٨یش کە دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرا، ئەو بووە سەرۆکی دەوڵەتەکە.

دەست بەریتانییەکان تا خەڵکی عەرەبی پێ بچەوسێنێتەوە؛ بەڵام ئەوە سەرەتایەکی بۆرژووازی نێودەوڵەتییە، بۆ ئەوەی جووەکان بەتایبەتی گەنجە باشەکانیان، بە دروستی و ساختەوە لە شۆڕش دووربخەنەوە و هێزەکانی شۆڕشی پێ لاوازبکەن. لە ڕاستیدا، دەکرێ مرۆ بڵێ، زایـــۆنیزم بەدەر لە شـــانۆگەرییێکی گاڵتەجـــار، بەدەر لەوەی، کە ئەنجامێکی تراژیدیانەی هەیە، هیچی دیکە نییە."

"کتومت، کتومت" دادوەرەی لێکۆڵەرەوە بە جۆشەوە قسەکەی پێبڕی و گـوتی: "منـیش هەر ئەوەم گـوت. زایـۆنیزم بەدەر لە شـانۆگەرییێکی گاڵتەجـاڕ، لە نمایشـی بـووکەڵەیەک، هیچـی دیـکە نیـیە. فرتـوفێڵێکی گەورەیە!"

بـۆ مـاوەیەک ئەوەم فەرامۆشـکردبوو کە لە کـوێم. چیـدی بەرگە یەکپۆشـییەکەی ئەفسـەری دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتیم نەبینی. چیدیش بیرم لە بەرگری لەخۆکردن نەکردەوە. هەموو ئەوەی هەستم پێیکرد، ئازارێکی گەورەی بە سوێ بوو، ئاخێک لە هەناومەوە، گۆشـت و ئێسـقانی پێکەوە دەسـووتاندم و هـی بەرگەگرتن نەبـوو، لە ناخەمدا یەک حەز سەری هەڵدا: بە توندی بەرەو ڕوویان ببمەوە. ئایا زایۆنیزم گاڵتەجاڕییە؟ ئەرێ تۆ بڵێی هێرتزل و ژابۆتنسکی بیانزانیبێ، دامەزراندنی دەوڵەتی جوو شتێکی نەکردەیە[58]، تەنها هەڵەوەڕی بوو، بۆ ئەوەیان بوو گەنجی جوو لە خشتە ببەن؟ من گوێم لە زۆر بیردۆز ببـوو - کۆمۆنیسـت، بەندیسـت[59] و سۆسیالیسـت - سـەبارەت بە عەودالـی ئـێمە بـۆ زایـۆن، بەڵام هەرگیـز گـوێم لە بیردۆزێکـی وەهـا نەبیـوو! وەڵامێـک بـۆ ئەوەی پێیـدەگوترا وەرگێـڕ لە کـانگەی دڵـمەوە هاتەدەر:

---

58– نەکردە: مەحاڵ، موستەحیل.

59– بەندیست Bundist ڕێکخراوی جووە سۆسیالیستە سێکیولارەکان بوو بۆ جووەکانی ڕووسیا، پۆلۆنیا و لیتوانیا.

"ئەرێ ئێوە بە چ هەقێک دەڵێن، زایۆنیزم گاڵتەجاڕییە؟ خۆ تۆ خۆشت جووی، وا مەزندە دەکەم مێژووی جووایەتیت خوێندبێتەوە. ئایا نازانی کە زایۆنیزم هەستێکی مێژوویی و مۆڕاڵییە، ئەوەش بەرلەوەی کۆمۆنیزم لە جیهان سەرهەڵبدا هەر هەبووە، پێش سۆشیالیزم، تەنانەت بەر لەوەی شتێک بە ناوی بۆرژوازیش هەبێ، هەبووە؟ لە ڕۆژگاری دەرەبەگایەتی (فیۆدالی)دا زایۆنیزم هەبوو، تەنانەت بەر لەوەش هەبووە. زایۆنیزم شانۆگەرییێکی گاڵتەجاڕی نییە؛ لەوانەی تا ئێستا هەن، ڕاستەقینەترین جووڵانەوەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی بووە لە مێژوودا. بۆ گەلانی دیکە، ئەوانەی لە ژێری نیری بێگانەدا بوونە، کێشەکە بە دەستهێنانی سەربەخۆیی بووە بۆ وڵاتەکانیان. کەچی لە دۆزی ئێمەدا، کێشەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە بوونمانەوە هەیە. لە ڕاستیدا زایۆنیزم هەبووە، دروست نەکراوە. زایۆنیزم ڕاچەنیوە. لە خوێن و فرمێسک ڕاچەنیوە، لە ژان و ناسۆرمان، لە چەوساندنەوە و تاسە و پەرۆشیمان ڕاچەنیوە. ئەو تاسەمەندییەش، ئەو پەرۆشییە لەمێژینەی "گەڕانەوە بۆ نیشتمان" لە نەوەیەکەوە دراوەتەوە نەوە و وەچەیەکی دیکە. مژدەدەرە ساختەکانیش شتیان لەوبارەوە گوتووە. هەر لەبەر ئەو عەوداڵبوونە بۆ زایۆن، خەڵکی ژیانی خۆشی و ئاسوودەیی خۆیان، خانوو و باڵەخانە کەشخەکانیان بەجێهێشت و ڕوویان لە وڵاتێکی چۆلگە و وێرانە کرد. ئەوان خوێندکار، دکتۆر، ئەندازیار بوون، چوون و کاری بازووی زەحمەتیان لەوێ کرد، لەوێ خەریکی وشککردنەوەی زۆنگاوی مێشوولەدار بوون، ئەوێ پڕ لە دەردی مەلاریا بوو، لێ بەرەنگاری بوونەوە، هەمووشی هەر لە پێناو «زایۆن[60]»دا بوو. بۆ ناوی زایۆن، باب و باپیرانمان هەموو شتێکیان لەسەر سەنگی مەحەک دانا. تەنانەت لە

[60]– زایۆن: ناوی شوێنێکە کە زۆرجار هاوواتای ئۆرشەلیمە و هەروەها خاکی تەوراتی ئیسرائیلە کە پیرۆزە. لە بنەڕەتیشدا وشەکە بۆ تەورات و ئایەتی سامۆئیل ٢ بۆ ٥٣٠ –٥٤٠ ی پێش زایین دەگەڕێتەوە، بە گوێرەی بنەماکەی شوێنەکە ئاماژەیە بۆ گردێکی تایبەت، کە بە شاخی زایۆن ناسراوە.

ڕۆژانی ئەمڕۆشماندا - خۆت دەبینی - چۆن «بن یوسف» سەر و ژیانی خۆی لە پێناو بڕوای بە «زایۆن» دانا، هەروەها خەڵکێکی زۆر زۆریش ئامادەن شوێنپێی هەڵبگرن. ئایا ئەوە هەمووی شانۆگەری گاڵتەجارییە؟ سەیرکە: من ئەندامێکی «بێتار»م، هەر لەبەر ئەوە گیراوم، کە زایۆنیستم. دەشزانم چارەنووسم تاڵتردەبێ، بەڵام خۆ هەمووی هەروەک یەکە، من گلەیی ناکەم. ساز و ئامادەم تا بەرگەی ژانوناسۆر بگرم، چونکە بڕوام بە شتەکان هەیە، هەر منیش نیم، هەر خۆم بەتەنیا تاکە جوویێک نیم لە پێناو بیروباوەڕەکەمدا ئازار بچێژم ..."

بۆ ماوەی نزیکەی دە خولەک قسەم کردن. وشەکانم زیاتر بە بوغز و قین ئاگراوی بوون. لە یەکێ لەو خاڵە هەستیار و وروژاوانەی هێنامە گۆڕێ، مشتی ڕاستەم لە دەستی چەپەم دا. وەرگێڕەکەشم نەیوەستاندم. بەڵام لێکۆڵەرەوەکە لێیپرسیم: "ئەرێ ئەوە چی دەڵێ؟ ئەرێ چی دەڵێ؟ شتێکی سەرنجڕاکێشە."

وەرگێڕەکەش کەوتەسەر ئەوەی قسەکانم وەربگێڕی. بۆ مایەی حەپەسانم لە نیوەی قسەکان، لەو شوێنەی باسی مژدەدرە ساختەکانم کرد بوو دەستی پێکرد.

"ئەو مەبەستیەتی بڵێ،" وەرگێڕەکە وشەکانی بە هێواشی هەڵدەبژارد؛ "تەنانەت لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا، ئەو مژدەدەرانەی وەک ئێستای نێو جوولەکە هەبوونە - (ئەمەش ڕاستە، لە مێژووی جووایەتیدا ئەوانە بە مژدەدەری ساختە ناسراون) - هەبوون بانگی جووەکانیان دەکرد بگەڕێنەوە بۆ فەلەستین، بەڵام هەموو کاتێکیش بێمرادانە کۆتایی پێدەهات."

"خۆیەتی، خۆیەتی!" ئەفسەری دەزگەی ئاسایش وەها هاواری کرد. "ئەویش هەر ئەوەی گوتمان دەسەلمێنێ. زایۆنیستەکان کەسانێکی

لەخشتەبەرن، ئەوانەی بانگی زایۆنیزم هەڵدەدەن نمایشێکی بووکەڵەییانەیە و هیچی دیکە."

"وەرگێڕەکە لە وەرگێڕانەکەی زۆ ورد نەبوو،" منیش ڕووی قسەم ڕاستەوخۆ لە لێکۆڵەرەوەکە کرد. "مەبەستم بو بڵێم مژدەدەری ساختەی سەدەکانی ناوەڕاست نموونەیەکن بۆ عەودالّی گەلەکەم، تەنانەت لەو مێژووە دوورەشەوە عەودالّی وڵاتەکەیان بوون، ئەو وڵاتەی لێ تەرەکرابوون[61]. هەروەها شتی دیکەشم وت، کەچی کاکی وەرگێڕ خۆی ماندوو نەکرد تا بیانگەیەنێ ... ئایا ڕێگەم دەدەی ئەوەی وتم، هەر بەخۆم بۆتی وەرگێڕم؟"

وەرگێڕەکە ڕەنگی سوور هەڵگەرا و گوتی: "خۆ هێشتا لێنەبوومەتەوە. من دەقاودەق وەک خۆی قسەکانت وەردەگێڕم."

بەڵام لێکۆڵەرەوەکە ڕووی خۆی لە من کرد و بە نیمچە سەرزەنشتکردنێکەوە گوتی:

"کەواتە بۆ چی پێویستت بە وەرگێڕ بوو؟ دەی باشە، بەردەوام بە!"

منیش بەو ڕووسییەی دەمزانی، کەم تا زۆر ئەوەی بە زمانی یدیشیم بۆ وەرگێڕەکەم باسکردبوو، دووبارەمکردەوە. سەرنجی ئەوەشمدا، لەگەڵ بەردەوامبوونم لەسەر قسەکردن، ڕووخساری لێکۆڵەرەوەکە پتر و پتر نیشانەی جدیبوونی لێدەرکەوت. ئەو هیچ قسەی پێنەبڕیم، بەڵام کاتێ لە قسەکانم بوومەوە، لەسەر کورسییەکەی خۆی هەڵسا، یەک دوو هەنگاو لەنێو ژووره بچکۆلەکەدا ڕۆیشت، بە هەندێ خۆنووشتاندنەوە قسەی بۆ کردم. قسەکانی وەک گڕکانێک بە سەرمدا ڕژا. لەو کاتەدا هەستمکرد، ئەو ڕۆڵی خۆی وەک لێکۆڵەرەوە لە

---

[61]– تەرەکردن: دەربەدەرکردن، وا لە کەسێک بکەی شوێنێک بەجێبێڵێ و بشترسێ بۆی بگەڕێتەوە.

بیرکردووە، هەروەک پێشتریش من ڕۆڵی خۆم وەک کەسێک کە لێی دەکۆڵدرێتەوە لەبیرکردبوو. ئەو بە هەموو ڕەقایەتی بیروباوەڕە دۆگماکەی لەبەردەمم قیت بووەوە، ئەو نوێنەری بیروباوەڕەی ئەو قوتابخانە هزریەی دەکرد، کە هیچ بوارێکی بۆ گومان نەدەهێشتەوە، ئەو قوتابخانە هزریەی وەنەبێ هەر بە تفەنگی دەستەکەی چەکداربێ، بەڵکو بە لێکدانەوەی دیالیکتیانەش چەکداربوو. ئیدی وەک هەورەبروسکە بگرمێنێ، زاری دەر بوو:

"دیسان پێتدەڵێمەوە، زایۆنیزم نمایشێکی بووکەڵەییانەیە! هەموو ئەو وشە ڕازاوانەی سەبارەت بەوەی گوایە زایۆنیزم لە ئەنجامی ژانوناسۆر و چەوساندنەوە هاتۆتەکایە، قسەی پڕوپووچە. ڕاستیی بابەتەکە ئەوەیە، شتەکە دروستکراوە؛ بەڵێ زایۆنیزم لەلایەن بۆرژوازی نێونەتەوەیی بۆ یەک مەبەست خولقێنراوە: ئەویش بۆ بەلارێدابردنی گوڕدەمی جووە لە ڕاستەڕێگەی ئەرکەکانی، بۆ شتێکی بێنرخی پووچ، نەبوونی دەوڵەت! ئەرێ ئەرکی ڕاستەقینەی جەماوەری جوو لە پۆلۆنیا یان لە وڵاتە سەرمایەدارەکانی دیکە چی بوو؟ تۆ ئەوەت باسکرد گوایە خەڵکی جوو چەوسێندراوەتەوە. ئەمەش ڕاستە. بەڵام بۆچی چەوسێنراونەتەوە؟ دیارە هێزی بیرکردنەوەت بایی ئەوەندە نییە وەڵامێکی ڕاستودروستی ئەم پرسیارەت بداتەوە. گوێ بگرە، من بۆتی ڕووندەکەمەوە. جوو لە پۆلەندا چەوسێنراوەتەوە، چونکە سەرمایەدارانی پۆلۆنی بەرژەوەندییان لەوەدابووە، خۆڵ بکەنە چاوی پرۆلیتاریای پۆلۆنی. سەرمایەدارەکان هانی ڕقلێبوونەوەی جووەکانیان دا، بۆ ئەوەی لە نێوانیاندا ئاژاوە و ڕق دروستبکەن. بەڵام ئەوەش فەرامۆش مەکە، هەر بە تەنیا جووەکان نەبوون، کە لە لایەن پۆلەندای سەرمایەداریدا دەچەوسێنرایەوە؛ هەر لەوێدا ئۆکراینی، بیلاڕووسی و لیتوانیش هەبوون. چەوساندنەوەی نیشتمانی بەشێکی جیانەکراوەی ڕژێمی سەرمایەدارییە. ئەوان چەکی دەستی چەوسێنەرەکانن، چەکی دەستی خاوەن کارخانە و زەوییەکانن. تەنیا

شـۆڕش چارەسـەری کێشـەی نیشـتمانی دەکـا و کۆتـایی بەو ڕق و کیـنەی گەلان و چەوسـاندنەوەی گەلێـک بە دەسـتی گەلێکـی دیـکە دەهێنـێ. ئەمەش هەر ئەوە بـوو کە بلیمەتەکـانی مرۆڤـایەتی وەک مـارکس، ئەنگلـز، لینـین و سـتالین بـۆی چـوون. هەر ئەمەشـە ئـێمە لە یەکێتیـی سـۆڤیەت وەک دەسـتکەوت پێیگەیشـتووین. لە یەکێتیـی سۆڤیەتدا زۆر ناسـنامەی نەتەوایەتـی هەیە، بەڵام هەموویـان بە ئاشـتی بە یەکەوە دەژین. هەموویان لە بن گۆشەنیگای لینین و ستالیندا ئازادن لە بەرەوەپێشـبردنی زمـان و کلتوورەکەیـان: لە شـێوە نەتەوەیـی و لە ناوەڕۆکیشدا سۆسیالیست. ئایا دەزانـی ئـێمە کۆمـارێکی ئۆتۆنۆمیـداری جووشـمان هەبـوو؟ ئەرێ نـابینی چـۆن شـۆڕش چارەسـەری کێشـەی نەتەوایەتی کردووە؟ ئایـا ئێوە لە پۆلۆنیـای سـەرمایەدارییدا چیتـان بۆ کـراوە؟ تـۆ دەبـێ بـۆ سـەرکەوتنی شـۆڕش تێبکۆشـی، هەر هەمووتـان بەیەکەوە: پۆلـۆنی، جـوو، ئـۆکراینی و بیلاڕووسـی. بەم شـێوەیە گەورەتـرین هێـزی شۆڕشـگێڕی بەرپـادەبێ، کـاتێکیش ڕۆژەکەی خـۆی هات، ئەوا لە پۆلۆنیاش وەک ئەوەی ئێمە لەژێر سـەرکردایەتی لینـین و سـتالین کردمـان، شـت دروسـت دەبـێ؛ ڕاپەڕینێکـی چەکداری ئـاپۆرای خەڵـک دژی چەوسـێنەرەکان و ڕامـاڵینی چینـی خـاوەن کارخـانە و زەویـوزار. باشـە لەبـری ئەوە ئێـوە چیتـان کـردووە؟ ئێـوە چـوونەتە شـوێنێکی بێدەوڵەت، بەرەو نەبوونی دەوڵەت! وەنەبـێ ئێـوە هەر لاڕێ بووبن، بەڵکو باری یاخیبوونیشـتان ڕێکخسـت، یاخیبوونێکی ئـاپۆرایی. ئەرێ باشـتر نەبـوو ئەگەر تێکۆشـابان و خزمەتـی بۆرژوازیەتتـان نەکردبـا! ئەرێ بـۆچی شۆڕشـتان وێـران کـرد! تـۆ بە ئـێمەت گـوت، هەمیشـە جـوو مەیلـی بـۆ فەلەسـتین هەبـووە. دەی بـا وەهـا دابنێـین ئەمەیـان ڕاسـتە. هەر واشـە، ئەمەش ئەنجـامی پەروەردەیەکـی دیاریکراوە. بەڵام زایۆنیزم ئەم مەیلەی بە شێوەیەکی دیکە قۆستەوە، خۆی خستەبن ئەرکی بـۆرژوازی نێونەتەوەیی. ئەم ئەرکە بە هەمـوو واتـایەکەوە چەواشـەکرا. مەبەستیشـی لە هەمـوو جیهـان هێـز لە شۆڕشـەکە دابمـاڵێ، ڕووتـی بکـاتەوە، لەڕێ لایبدا و بیکـاتە نمایشـێکی

بووکەڵەی ساختە بۆ دەوڵەتێک کە نییە. «بێگن» دیسان تۆ یەکێک بووی لە چەواشەکارەکان. تۆ و ئەوانەی وەک تۆ، وەنەبێ هەر لە شۆڕش لاتان دابێ، بەڵکو کاری یاخیبوونی خەڵکانی دیکەشتان کردووە. هەر بۆیەشە لە زینداندا ئاخنراوی، لەسەر ئەو کارانەی کە هەر خۆت لێیان بەرپرسی؟"

جۆش و خرۆشی لێکۆڵەرەوەکە تا دەهات پتر و پترتر دەبوو. خۆ ئەو هەر بە تەنیا قسەی بۆ من نەدەکرد، بەڵکو گوتاری دەدا. ئەو بە تاسە و بڕوا و قەناعەتەوە دەدوا. کاتێک مرۆ گوێی لەو گوتانەی ئەو بێ، دەبینی کە ئۆرگانێکی یەکگرتوو هەیە، پێیدەگوترێ بۆرژوازی نێودەوڵەتی، لەوێشدا سەرکردایەتییێک هەیە، کە سەرکردایەتی گشتییانە و سەرپەرشتی کۆمەڵێک نوێنەرایەتی دەکا. یەکێک لە نوێنەرایەتییەکانیشی زایۆنیزمە، ئیدی سەرکردایەتیی بۆرژوازی ڕێنمایی دەداتێ، پێیدەڵێ: "بڕۆ نێو جووەکان، ڕەنج و ماندووبوونیان بقۆزەوە، مەیلییان بۆ فەلەستیان بەکار بهێنە، بەرەو ئەو ئاراستەیان بەرە. فێڵیان لێبکە، وایان لێبکە قەناعەتبهێنن بەوەی هەوڵبدەن دەوڵەتێکی جوو دروستبکەن، بەمەش تۆ زەبری خۆت دەوشێنی: لاوازکردنی دوژمن - کە شۆڕشە - و لەباربردنیەتی، لەسەر ئەو پلانە چەواشەکارییە بڕۆ، کە لە لایەن سەرکردایەتیی بۆرژوازییەوە داڕێژراوە ...!

ئەو بونیادەی تەلارسازییە، کە لێکۆڵەرەوەکە دروستی کرد، بۆ وەستای لۆژیکی خۆیشی سەرسامهێنە ... ئاخر بە مەرجێک تەلارەکەی بنیادناوە، تۆ لە گۆشەنیگای وەستایەکەی وەهای دەبینی، لەو شوێنەش دەست پێدەکا، خشت لەسەر خشت دابنێ. بەڵام خۆ هەموو شتێک لە گۆشەنیگایەکەوە دەستپێدەکا، ئەویش خاڵی دەستپێک یان "خاڵی لاوازە" . دیارە «ئەرخەمێدس»، دۆزەرەوە دێرینەکەی قانوونەکانی سروشت، ئاماژەی بە پێواژۆکانی بیرکردنەوە دابوو کاتێ گوتی:

"خاڵێکی لاوازم بدەرێ و ئەوسا من دامەزراوەکەت لە بناغەوە بۆ دەهەژێنم." بنەمای گریمانەی لێکۆڵەرەوەکەم بپەژرێنە و دەکرێ بتوانی (یان ناچاربکرێی) بەو هەموو شتەی بۆی باسکردم، قایل بم؛ ئەوسا دەتوانی "لە بناغەوە بیهەژێنی". دەنا وازی لێبێنە، چونکە ڕۆنانەکەی هەر خۆی بەسەریەکدا دەڕمێ و دەبێتە کەڵەکەیەک لە ساختەیی کە بناغەکەی لەسەر گەمژەیی و تاریکبینیدا ڕۆنراوە.

خۆ ئەگەر توانیبام مشتومڕ لەگەڵ کاپتنەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بکەم و هاوشانی ئەو پێم لەسەر زەوی پتەو بوایە، دەکرا پێیبڵێم، کەوا ئەو دەرهەق قانوونەکانی لۆژیک هەڵەیکردووە، هەر بە خۆی گریمانەیەک دادەنێ و بە سەلماندنیشی ناوی دەبا، لە کاتێکدا شتەکە داخوازە بسەلمێندرێ و هێشتاش نەسەلمێندراوە. لە ژووری لێپێچینەوەکەدا، لە ژێر ئەو هەلومەرجەی "دەمەتەقێیەکەی" تێداکرا، بە زەحمەت دەمتوانی بە لێکۆڵەرەوەکەم بڵێم، لۆژیکەکەی شاشە. بەڵام خۆ ئەوە بیروڕای من بوو دژی هی ئەو؛ بنەمای گریمانەی من تەواو لە هی ئەو جیاواز بوو. منیش شتێکم بۆ شەڕ هەبوو، تەنانەت ئەگەر لە ژووری لێکۆڵینەوەکەشدا بێ. کاتێکیش دووانە ئاگرینەکەی تەواو بوو، داوام لە لێکۆڵەرەوە کرد:

"جەنابی دادورەی مەدەنی، دەکرێ شتێکت بۆ ڕوون بکەمەوە؟"

پرسیارەکە بە وریاییەوە گۆ نەکرا. لێکۆڵەرەوەکە ئاگری تێبەر بوو، بە تووڕەییەوە وەڵامی دامەوە:

"تۆ کەسێک نیت، تا شتم بۆ ڕوونبکەیتەوە، تۆ دەبێ خۆت ڕوون بکەیتەوە."

ئیدی قسەکەی خۆم ڕاستکردەوە و گوتم: "لەگەڵ ئەوەشدا، دەکرێ شتێکی دیکەی سەربار بکەم؟"

"دەی قسـە بکە. ئەمڕۆ لێت دەگەڕێم بدوێی، بەڵام بەرلەوە، گوێ لەو شــتەی مــن بگــرە، ســەبارەت بەو دکتــۆر و ئەنــدازیارانەی دەچــنە فەلەستین و لەوێ کاردەکەن. تۆ پێتگوتم تـا ئەوە بسـەلمێنی، زایـۆنیزنم شـانۆگەرییێکی گاڵتەجاڕییـانە نیـیە، بەڵکـو زایـۆنیزم بزووتنەوەیەکـی ڕاسـتەقینەیە. ئایـا دەزانـی تـۆ چیـت سـەلماند؟ تـۆ پاشـکەوتنخوازی کەسـایەتیی بـزووتنەوەکەت سـەلماند! باشـە ئێسـتا چـی دەکەی؟ تـۆ دەگەڕێیتەوە دواوە؛ تۆ توانستەکانت لەو گۆڕە فڕێدەدەی. لە یەکێتیی سـۆڤیەتدا، هەمـوو کەسـێک بە گـوێرەی پیشـەکەی خـۆی کاردەکـا؛ دکتۆرەکان خەڵک دەرماندەکەن و ئەندازیارانیش تەلار دروستدەکەن. ئەمەش شتەکانن و دەبێ هەرواش بێ ... ئەمەیە پەرەسـەندن. ئێمە لە ڕووسیا دەڵێن: خۆ تۆ بە ______ زەوی ناکێڵێ! ئایا لە مەبەستەکەم دەگەی؟"

"نەخێر، تێناگەم،" منیش وەهام پێگوتەوە. ئەو وشە ناقۆڵا ڕووسیەکەی بە خەندەیەکەوە دەردا، نەوەک نەفرەتێکی سووکایەتی پێکردن، بەڵکو وەک بەشێک لە گوتنێکی عەوام.

"مەبەسـتم لە socha سـۆچایە،" ئەو بەخێرایـی ڕوونـی کـردەوە – "دارجووتە، کاتی خۆی لە سەردەمی قەڕالدا زەوییان پێدەکێڵا. ئێستاش چیدیکە زەوی پێ ناکێڵین، ئێمە ئێستا دەزگە بەکاردەهێنین. لە یەکێتیی سۆڤیەتدا دامودەزگەی نوێمان هەیە، مرۆ دەبێ بۆ کارپێکردنی، بۆیان بخـوێنێ و فێرببـێ. بەڵام ئێـوە چیتـان کـرد؟ ئێـوە خەڵکـی خوێنـدەوار دەبەن و لەوێ لەسەر زەوییێکی بەیار و ڕووتەن فڕێیان دەدەن!

هەر بەو بۆنەیەشەوە، ئەمڕۆ تۆ کەسێکی زیرەکی دیکەی خۆت ئاسام بیردەخەیتەوە. ئەویش ئەندامی "گاشۆمەر گاتسایر"بوو، کاتێکیش ئازاد بـوو، لە تـۆ وێرانتـر بـوو، چـونکە خـۆی وەهـا نمایشـکرد، گـوایە بـۆتە سۆشیالیست، ئەو خزمەتکارە دەمامکدراوەی بۆرژوازی، ئەو ناپاکەی دژ بە چینی کرێکار! پێیگوتم لە فەلەستین هەروەک یەکێتیی سۆڤیەت

«کۆلخـۆز»تـان هەیە، ئـای لەو گێـل و گەمـژەیە! پێیوابـوو دەتـوانێ حەکـــایەتی وامـــان بـــۆ بهـــۆنێتەوە. ئەوان پارەیـــان لە ملیـــۆنێرە ئەمریکییەکـــان وەردەگـــرت و لەو کۆلخـــۆزانەدا خەرجییانـــدەکرد ...! نەخێـر، «بـێگن» نەخێـر! لەبلەبـانییەکەت دادت نـادا. بـزووتنەوەکەت پاشکەوتنخوازانەیە، شتێکە دژی یەکێتیی سۆڤیەتە، دژی شۆڕشە، دژی پێشکەوتنە."''

"جەنـــابی دادوەری مەدەنـــی،" منـــیش بە پشـــتکردنە وەرگێـــڕ، بە ڕووسیەکەی خۆم، ئاوەهـام بە لێکۆڵەرەوەکە گوت: "تـۆ نـاوی کۆمـارە ئۆتۆنۆمیـدارەکەی یەهوودییەکـانی سـۆڤیەتت هێنـا. ڕێگەم بـدە لەسـەر ئەم خـاڵە، لەسـەر پرسـی «بیـرۆ - بیجـان» بـدوێم، چـونکە شـتەکە بـۆ تێگەیشـتن لە ڕامـانی مـن زۆر گـرنگە. حکـوومەتی سـۆڤیەتی بڕیاریـدا هەرێمێکی تایبەت بۆ جووەکان لە یەکێتیی سۆڤیەت دابمەزرێنێ. ئەرێ بـۆچی وەهایـان کـرد؟ خـۆ جووەکـانی یەکێتـی سـۆڤییەت لە مافەکانـدا تەواو هاوشان بوون، ئەوان چیدیکە نەدەچەوسێنرانەوە. مرۆ دەتوانێ بڵێ، کێشەی جوو لە یەکیتی سۆڤیەتدا چارەسەرکرا. ئەگەر وابێ، باشە بۆچی هەرێمێکی تایبەت بە جوو هەبێ؟ بێگومـان حکوومەتی سـۆڤیەت گەیشتە سـەر ئەو بەرەنجامە کە ڕەوشـی جـوو، ڕەوشـێکی ڕیـزپەڕە و ناکرێ بە ڕەوشـی ئۆکرانییەکان یان بیلاڕووسـەکان بەراوردبکرێ. لە هەمـوو شـوێنێک، جـوو هەر کەمینەن، لە کاتێکدا هەر گەلێک پێویسـتە هەرێمـی تـایبەتی خـۆی هەبـێ. لێـرەوە، هەڵـبەتە، بڕیـاری نـاوچەیەکی ئۆتۆنۆمیـدار بـۆ جـوو، سـەریهەڵدا. بە کـردەوەش، ئەزمـوونی بیـرۆ - بیجان سەرکەوتوو نەبوو ..."

لە پڕێکەوە لێکۆڵەرەوەکە کە هێشـتا لە ناوەڕاسـتی ڕسـتەکەمدا بـووم، قسـەی پێبـڕیم: "بـۆچی وا دەڵێـی؟ ئایـا ئەزمـوونی «بیـرۆ - بیجـان» سـەرکەوتوو نەبوو؟"

لە گەرمەی بەڵگەوبەندهێنانەوە بۆ هۆکاری دەربڕینەکەم، شتێکم گوت، لە بەرژەوەندی مندا نەبوو، زۆریش درەنگ بوو قسەکەم بکێشمەوە. وەها درێژەم بە قسەکانم دا:

"ئەوە ڕاستییە، لە ناوچەی «بیرۆ - بێجاندا» و بە گوێرەی ئەوەی خوێندومەتەوە، لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا زیاتر لە سی تا چل هەزار جووی لێنیشتەجێ نییە، لە کاتێکدا لەنێو تەواوی یەکێتیی سۆڤیەتدا نزیکەی سێ ملیۆن جووی لێیە. ئەرێ هۆکارەکەی چییە؟ پێموایە هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، هەرگیز هەرێمی «بیرۆ - بیجان» هی جوولەکە نەبووە، هەرگیز نیشتمانی ئێمە نەبووە؛ هەمیشە – بەتایبەتی گەلە دێرینەکان - نیشتمانی خۆیان هەبووە. بەڵام لە چاوی من ئەوەی یەکلاکەرەوەیە، ئەو ڕاستییەیە، بڕیاری یەکێتیی سۆڤیەت بۆ دابینکردنی هەرێمێکی تایبەت بەجووەکان خۆیان.

"هەر بەو بۆنەیەشەوە، لە یەکێک لە دوا گوتارەکانی ژابۆتنسکی، بەر لە جەنگ، من گوێم لێبوو، ئەم ڕاگەیەندراوەی دا: 'جووەکانی ئەورووپا لەسەر دەمی گڕکان دان و هەرچییەک بکرێ بۆ ڕزگارکردنیان، بە باشی دەبینم. لە ڕاستیدا هێشتا بە تەواوی ئاشنای پڕۆژەی «بیرۆ - بێجان» نیم، بەڵام تا ئەوەندەی بتوانێ جوو ڕزگاربکا، بەلای منەوە ئەمە پلانێکی گرنگە.' دەی ئێستاش، هەی جەنابی دادوەری لێکۆڵەرەوەی مەدەنی، با وا دابنێین، کە شۆڕش لەسەرتاسەری جیهان سەرکەوتوو بێ ..."

"ئەوە تۆ چی دەڵێی؟" لێکۆڵەرەوەکە قسەی پێبڕیم. "دەی با وەها دابنێین، شۆڕش لە سەرتاسەری جیهان سەردەکەوێ؟ هەڵبەتە هەروا دەبێ! دەزانی بۆ چی؟"

منیش هیچم نەگوت.

لێکۆڵەوەرەوەکە بە ڕوومدا تەقییەوە: "چونکە مارکس، ئینگلز، لینین و ستالیان وەهایان فەرمووە."

هەر کاتێک ئەو ڕاگەیێندراوەم بیردەکەوێتەوە، بریسکەی چاوەکانی کاپتنە گەنجەکەم لەبەرچاوە، چۆن مشتی بە مێزەکەدا دەدا. ئەو بە هەموو سامناکییێکەوە بیروڕا دۆگمایی خۆی نمایشکرد. شۆڕش شتێکی حەتمییە و هەر سەردەکەوێ! وەنەبێ سەرکەوتنەکەشی لەبەر هەندێ هۆکاری چۆنایەتی یان هی دیکە بێ، بەڵکو "لەبەر ئەوەیە مارکس، ئینگلز، لینین و ستالین وەهایان فەرمووە ..."

دوای ئەو تێبینییە، لێکۆڵەرەوەکە ڕێگەی دا لەسەر قسەکەم بەردەوام بم.

"زۆر باشە، با وا دابنێین، شۆڕش لەسەرتاسەری جیهان سەرکەوت و ئەنجوومەنی باڵای جیهانیشی دامەزراند. با وەها دابنێین، کە نێردەی گەلی جوو هاتنە بەردەم ئەنجوومەنە باڵاکەی جیهان داوای نیشتمانە دێرینەکەیان کردەوە، بەوەی بدرێتەوە ئەوان و ببێتە هەرێمە تایبەتییە نیشتمانەکەی خۆیان. ئایا ئەنجوومەنی باڵای جیهان بە داواکارییەکەیان قایل نابێ؟ بۆچی نا، خۆ تەنانەت یەکێتیی سۆڤیەت دانی بەو پێویستییە نا، کە هەرێمێک تایبەت بۆ جووەکان تەرخانبکا؛ ئێ خۆ نیشتمانی مێژوویی جووەکانیش ئێرتز ئیسرائیلە. ئەدی ئەو مەیلە لە کوێوە هات؟ کاتی خۆی ئێرتز ئیسرائیل دەوڵەتی جوو بوو؛ کلتووری ئێمە بۆ ئەوێندەر دەگەڕێتەوە؛ زمانەکەمان لەوێ پەیدابووە. کەواتە هەڵەی چی لە خواستی ئێمەدایە، کە نیشتمانەکەمان بۆ گەلەکەمان بگەڕێنینەوە؟ جەنابی لێکۆڵەرەوەی مەدەنی هەر خۆت گوتت، هەرگیز هیچ ڕامانێکی ڕاستەقینە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی جوو لە ئێرتز ئیسرائیلدا نەبووە و هەنووکەش هەر نییە. بەڵام خۆ ئەوە پرسێکە پەیوەست بە بڕوا. هەر هزرێکی پێشەنگ بڕواداری خۆی هەن و ئەوانەش هەن کە بڕوای پێناکەن. ئەرێ خەڵکێکی زۆر لە ڕووسیا بڕوایان بەو ڕامانە هەبوو،

شۆڕشەکە سەردەکەوێ؟ جەنابی دادوەری مەدەنی، منیش یەکێکم لەو کەسانەی بڕوایان بەوە هەیە کە دەوڵەتی جوو هەر لە دایکدەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر بە خۆشم نەیبینم."

لێکۆڵەرەوەکەوە بە ڕەقییەوە پێیگوتم: "نەخێر، تۆ نایبینی."

ئەو وەڵامی پرسە گریمانەییەکەی منی نەدایەوە بەوەی کاتێ ئەنجوومەنی باڵای سۆڤیەتی لە هەموو وڵاتان پێکهات، دەکرێ چارەسەری کێشەی نێردەی جووەکان بکا، کە داوایان کردبوو ڕێگەی هەرێمێکی نیشتمانی بۆ گەلی جوو لە ئێرتز ئیسرائیل بدا. ئەو کەڕەپانە هەر ئەوەی دووپاتکردەوە، کە پێشتر گوتبووی.

"بەڵێ، شۆڕش چارەسەری کێشەی جووەکان دەکا، بەڵام خۆ گەلەکەی خۆت نایەوێ کێشەکە چارەسەر بێ. ئێوە لە جیاتی ئەوەی بخزێنە نێو ڕیزبەندی شۆڕش و خزمەتیبکەن، لێیهەڵدێن و یاخیدەبن. ئێوە یارمەتی دوژمنەکەی دەدەن، کە بۆرژوازی نێودەوڵەتی و ئیمپریالیزمی بەریتانییە."

کاتێک ئێمە ئەو قسانەمان لە نێوان خۆمان ئاڵوگۆڕ دەکرد، وەرگێڕەکە متەقی لێوە نەهات و لە خۆوە هیچ دەسپێشخەرییێکی نەکرد. ئەو هەر بەوە سەرقاڵ بوو، لە کاتی قسەکانی لێکۆڵەرەوەکە بە گەرمی سەر بۆ ئەفسەری دەزگەی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بلەقێنێ و ئەشهەدوی بۆ لێبدا. کاتێکیش من قسەمدەکرد، ئەو لەجێی خۆی بێ هەستوقوست دانیشتبوو. ناو بەناویش، هانام بۆ دەبرد بەڵکو وشەیەکی شیاوی ڕووسیم بۆ دەربڕین بۆ بدۆزێتەوە؛ ئەویش هەوڵیدەدا یارمەتی بدا، لێ هەموو جارێکیش هەر سەرنەدەکەوت، ئینجا دیسان کڕوبێدەنگ دەبووەوە. بەڵام کاتێک دەمەتەقێکەی من و لێکۆڵەرەوەکە گەیشتە ئەو ئاستە، وەرگێڕەکە ڕووی لە لێکۆڵەرەوەکە کرد و شتێکی بە بناگوێیدا

چرپاند. هەرچەندە من لە نزیکیشیان دانیشتبووم، بەڵام نەمزانی چی پێگوت. کەچی لێکۆڵەرەوەکە خۆی یەکسەر نهێنییەکەی بۆ درکاندم.

"شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش،" بەم جۆرە لێکۆڵەرەوەکە ڕووی تێکردم و گوتی: "هەڵبەتە تۆ بە پێویستت نەزانیوە شتەکەم پێ بڵێی. هاوڕێکەم بیریهێنامەوە، نامەی هێرتزلەکەی تۆ بۆ «پلێهڤی»[62]، پلێهڤی جەللادی قەڕاڵ، داوای لە حکوومەتی قەڕاڵ کردبوو پشتگیری نەخشەی زایۆنستی بکا و بەڵێنیدابوو، کە زایۆنیزم گەنجەکانی لە ڕیزی شۆڕشدا دوور دەخاتەوە. بە بیرمدێتەوە دەقی ئەو شتەم بینیوە، باش بوو وەرگێڕ ئەمەی بیرخستمەوە. باشە، کەواتە ئێستا بۆت ڕوونبووەوە، کێ دامەزرێنەری زایۆنیزم بوو؟ خۆ ئێستا ئێمە باسی بەڵگەنامەیەکی نووسراو دەکەین، بۆ ئەمەش قسەیەکی نەستەق هەیە: 'ئەوەی بە قەڵەم نووسرابێ، تەور ناتوانێ ڕەشی کاتەوە.' ئەوەش ڕوونە، کە هێرتزل ئاژانێکی بۆرژوازی نێودەوڵەتی بووە. ئەو خۆی سەلماندوویەتی. ئەو لە لایەن بۆرژوازیەتەوە نێردراوە تا پرۆلیتاریا لاوازبکا. ئایا تۆ بۆ ئەمە چی دەڵێی، ئێمە بەڵگەی ڕەش و سپییمان بە دەستەوەیە؟"

منیش شتم هەبوو بیڵێم، شتێک زۆرم حەزلێبوو، مخابن نەکرا بیڵێم. منیش بە ڕووسییە تێکشکاوەکەی خۆم قسەم بۆ لێکۆڵەرەوەکە کرد، لە هەمان کاتیشدا قسە بۆ ئەو نا، بەڵکو بۆ وەرگێڕەکەش بکەم، ئەویش بە ڕووسییەکی ڕاستەقینە. ئەوەشم بۆ نەچووەسەر. هەرچۆنێک بێ وەرگێڕەکە "هاوڕێ"ی لێکۆڵەرەوەکە بوو. بە بێدەنگی نەفرەتم لەو ساتە کرد، کە بەدەمی خۆم داوام لە لێکۆڵەرەوەکە کرد بەڵکو وەرگێڕێک لەگەڵ خۆی بێنێ. ئەویش وەرگێڕێکی وەها بوو! جوویەکی کۆمۆنیست. لەوانەشە پێشتر زایۆنستیش بێ، ئەو کەسەی نووسینەکانی هێرتزی خوێندۆتەوە و لە بیریشی ماوە.

---

62 - پلێهڤی Vyacheslav Konstantiovich von Plehve (١٨٤٦-١٩٠٤) بەڕێوبەری پۆلیسی پاشایەتی ڕووسی و پاشان وەزیری ناوەخۆ.

"من داوات لێدەکەم لەوە تێبگەی،" وەهام بە لێکۆڵەرەوەکە گوت: "کە هێرتزل هەستیدەکرد کارەسات بەسەر گەلەکەیدا دێ، ئێستاش دەبینین چەند لەسەر هەق بوو. ئەو دەوڵەتمەدارێک بوو بەڵام هیچ هێزێکی پاڵپشت نەبوو. ئەو خوازیار بوو لە فریادڕەسی گەلەکەی پەلەبکا، بۆیە بە دوای یارمەتیدا گەڕا. ئەوەی وەرگێڕەکە گوتی شتێکی نوێ نییە. «هێرتزل» لە سەردەمێکی تایبەتدا کاری کردووە. ئەو چووە لای سوڵتانیش، سەری لە قەیراڵی ئاڵمانیش دا، تەنانەت هانای بۆ پاپاش برد. هەستیکرد، گەلی جوو ناتوانێ چاوەڕێ بێ. «ژابۆتنسکی»ـش هەمان هەستی هەبوو. هەمووومان ئەو هەستەمان هەیە. هەی دادوەری مەدەنی، دەکرێ نموونەیەکت بۆ بهێنمەوە؟ کاتێ ئاگرێ لە ماڵێک بەربێ و تۆش بەڕێکەوت بەوێدا تێدەپەڕی. ئایا چی دەکەی؟ هەڵبەتە پەلە دەکەی تا زەنگ بۆ دەزگەی ئاگرکوژێنەوە لێبدەی، بەڵام ئەگەر هاتوو گوێت لە دەنگی ژن و منداڵ بوو و لە تاو گوڕیەئاگر هاواردەکەن، ئایا چاوەڕێ دەکەی تا ئاگرکوژێنەوە دەگاتە ئەوێ؟ بێگومان نەخێر، چاوەڕێی شتێکی وەها ناکەی. خۆت قۆڵی مەردانەی لێهەڵدەکەی، هەوڵدەدەی دەستبەجێ ژن و منداڵەکەی نێو ماڵە سووتاوەکە ڕزگاربکەی. ئەمەش کتومت ڕەوشی ئێمە بوو. ئایا دەزانی دژەسامیزم چی پێکردووین؟ خانووەکانمان ئاگردراون و خەریکە برا و ڕۆڵەکانمان لە ناویدا بسووتێن. ئایا دەتوانین ئێمە هەر چاوەڕێبین؟ دەی با وەها دابنێین، کە شۆڕش وەک دەزگەی ئاگرکوژێنەوە وایە بۆ ئەو جووانەی کە لە ڕێی دژەسامیزم لە پۆلۆنیا و ئاڵماندا، یاخود لە شوێنی دیکەدا دەچەوسێندرانەوە، بەڵام خۆ نەدەکرا ئێمە هەر چاوەڕێی ئاگرکوژێنەوەکە بین. چی دەبوو ئەگەر درەنگ کەوتبا، وەک ئەوەی زۆر جار لەگەڵ ئاگرکوژێنەوە ڕوو دەدا؟ ئێمە دەبوایە تێکۆشابایین ئەوانمان ڕزگارکردبا، «هێرتزل» و «ژابۆتنسکی»ـش هەر ئەوەیان کرد، هەر ئەو شتەیە کە هەمووومان دەیکەین."

لێکۆڵەرەوەکە قسەکەی پێبڕیم: "ئەوەیە تەلمودیزم[63]!"

تەلمودیزم! بۆ یەکەمین جارم بوو لە ژیان گوێم لەو وشەیە بێ. بەم شێوەیە وەرگێڕەکەشم لەم بارە ڕێزپەڕ نەبوو، خۆ ئەو تاکە جوو نەبوو لە لایەن دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی وەک وەرگێڕ ڕاهێنرابێ. جووە کۆمۆنیستەکان، هاوڕێ ڕووسەکانیان فێرکردبوو، باش دەرسیان دابوون، ئەوەیان فێرکردبوو - لەنێو زۆر شتدا - زاراوەی نوێی سووکایەتی پێکردن بۆ ئەو ئاوەزمەندییەی گەلەکەمان، کە بۆ سەردەمی هەرە کۆن دەگەڕایەوە. دەربڕینێکی نوێ لە لایەن زمانناسان و ئاژانە جووەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی داهێندرا: ئەویش تەلمودیزم بوو.

وەرگێڕەکە ئەو شەوە یارمەتیدەرێکی مەزن بوو. بەڵام نەوەک بۆ من، بەڵکو وەک توانستێکی وەرگێڕان بۆ خودی لێکۆڵەرەوەکە، بۆ ئەوەی ببێتە مایەی گلەیی و دۆزینەوەی "بەڵگەکان". وەرگێڕەکە کۆمۆنیستێکی سۆڤیەتی نەبوو؛ ئەو کۆمۆنیستێکی خۆجێی «ڤیلنا» بوو. زانیاری ئەو سەبارەت بە زمانی ڕووسی سنووردار بوو؛ هەرچی زانیاریشی دەربارە زایۆنیزم هەیبوو، هەر زۆر سنووردار بوو. بە پێچەوانەشەوە ئەو ببووە وەرگێڕێکی نایاب؛ هەرواش بوو، ئەو یاریدەدەرێکی تایبەتی یەکێ لە شارەزایانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو، سەبارەت بە پرسەکانی فەلەستین، ئەو شارەزا گەورەیەی کە بە هەموو جیددیەتەوە لێیپرسیم، ئەمەش کاتێک لێکۆڵینەوەکە بەردەوام بوو، بۆچی ئێمە، ئێمەی ئەندامانی «هاتسۆهار[64]» و «بێتار» لە پۆلۆنیادا نەچووینە ڕیزی بەرەی جەماوەری پارتە کۆمۆنیست و

[63]- تەلمودیزم: ڕێنماییینامەکانی شەریعەتی تەلموود، کە لە لایەن گەورە ڕابینەکانی جوو بەپێی شەریعەتی موسا داندراوە.

[64]- هاتسۆهار Hatsohar پارتی ڕیڤیژیۆنستی زایۆنیست، لە لایەن ژابۆتنسکییەوە دامەزرا. نووسەر.

سۆشیالیستەکان؛ لەکاتێکدا هاوڕێکانی ئەو، گەورە بەرپرسێکی دەزگەی ئاسایشیش، شارەزا لە کاروباری جوو پرسیاری لە زیندانییێکی «بەندیست»[65] کرد:

"هۆ کابرای «بەندیست»، تۆ لە ئینتەرناسیۆنالی دووەمدا بەیەکەوە لەگەڵ ڕیڤیژیۆنیستەکاندا بووی؟"

وەرگێڕەکەم نەوەک هەر نەیدەتوانی جیاوازی لە نێوان بەندیست و ڕیڤیژیۆنیستدا بکا، ئەو ئەوەندەشی نەدەزانی، کە ڕێڤیژیۆنیستەکان هەرگیز نەبوونە ئینتەرناسیونال، ئەو تەنیا ئەوەندەی دەزانی کە «بەند (مەبەست بەندیستەکانە)» ئەندامی ئینتەرناسیۆنالی دووەم نەبوو. ئەدی ئەو چی نەدەزانی؟ ئەو نووسینەکانی «هێرتزل»ی دەزانی، گوتارەکانی ژابۆتنسکی لە یاد بوو، بە کۆبوونەوەکانی «وازیمەن» و «مۆسۆلینی» دەزانی، جیاوازی هەردوو باڵی «لێفت پۆلای زایۆن»[66]ی دەزانی. من بەدبەخت بووم لە داواکردنی زایۆنستێک – یاخود دژەزایۆنیستێک –، ئینسکۆپلێدیایەک لە بن بەرگی وەرگێڕ، کە هەموو شتێکی دەزانی، بەناوە یەکەمەکان (پێشناوەکان)ی سەرکردەکانی بزووتنەوەی زایۆنستیشەوە.

کە "موناقەشەکردن"ەکە لە ژوورەکەی لێکۆڵینەوەدا بەردەوام بوو، هێڵەکانی دابەشبوون تەمومژاویتر بوون. دەمەقاڵی دووانە بوو بە سیانە. هەر سێکمان بە نۆرەی خۆی قسەمان دەکرد، هەندێک جاریش وەرگێڕەکە دوای مۆڵەت وەرگرتن لە لێکۆڵەرەوەکە ڕاستەخۆ ڕووی دەمی لە من دەکرد، وەک دەگوترێ هەموو کەرەستەی خۆی خستە سەرمێزەکە، ناوەڕۆکی کتێب، گوتارەکان، دووانەکان، نووسین و ڕۆژ و ناوەکانیش. هەڵبەتە هەموو ئەو کەرەستانە بە هەر شێوەیەک بێ

---

65– پارتی سۆسیالیستی جووی دژەزایۆنیست لە پۆلۆنیادا. نووسەر.

66– کرێکارانی زایۆن، بزووتنەوەیەکی چەپ بوو. نووسەر.

دەگەیشتنە دەست لێکۆڵەرەوەکە، ئەوەش چ ڕاستەوخۆ لە ڕێی هۆبەی جوو یان بەشی زایۆنیزم لە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، یاخود لە ڕێی ئاژانەکانی ئاسایش کە وەک وەرگێڕ هەڵدەسووڕان و لەسەر داخوازی من یان هەر لە ڕێی ئاژانە جووەکانی دیکە. لە یادەوەریشدا دەمزانی کۆمەڵگەی جوو لە «ڤیلنا» ئەو شەوە هیچی وەهای نەکرد، کە کاریگەری بەسەر چارەنووسی منەوە هەبێ. تەنانەت بە بێ ئەوانیش، هەر ئەوەم وەردەگرت کە وەرمگرت: هەشت ساڵ لە ئۆردوگای چاکسازی. ئەو ڕاستییەی کە من دەمڕاستی «بێتار» بووم لە پۆلۆنیادا بەس بوو بۆ ئەوەی لە لایەن کۆمسیۆنی ڕاوێژکاری تایبەتی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بڕیارم لەسەر بدرێ، ئەوسا نامەی هیرتزل بۆ «پلێهڤێ» لە گۆڕێدا بێ یان نەبێ. بەڵام وەرگێڕەکە هیچ ئاسانکاری بۆ نەکردم کاتێ لە ژووری لێکۆڵینەوەکە لە بەرانبەر پاسەوانی شۆڕش دانیشتبووم، کە بڕیاریدەدا – ئەو قسەیەشی ببووە بنێشتە خۆشەی بن ددان – بەوەی زایۆنیزم لە شانۆگەرییەکی گاڵتەجار هیچی دیکە زیاتر نەبووە.

ئەوێ شەوێ – ئەو شەوەی لە ژوورە دابڕاوەکەی لێکۆڵینەوەدا، لەپێناو گیانی بیروباوەڕی زایۆن و لەسەر شەرەفی هەموو ئەوانەی بڕوایان پێبوو جەنگام – شەوێکی دوورودرێژ بوو هەر نەدەبڕایەوە. مشتومڕە توند و گەرمەکە لەگەڵ کازیوەی بەیاندا کۆتایی پێهات. لەو شەوەدا هیچ کۆنووسێک تۆمارنەکرا.

کاتێکیش ژووری لێکۆڵینەوەکەم بەجێهێشت، کاتێک دەست بۆ پشتەوە دەرۆیشتم، لە دەرگەی ئاسنین بۆ دەرگەی ئاسنین، لە حەوشەیەکەوە بۆ حەوشەیەکی دیکە، هێشتا هەر لە بن باندۆری ئەو گێژاوەی نێو ژوورەکە و ناو ناخی خۆمدا بووم. هەستم کرد، وەک ئەوەی لە کۆنفرانسێک گەڕابمەوە، کە بەشدرای گفتوگۆیەکی قیناویم سەبارەت بە ئایندەی گەلەکەم کردبێ، هەنووکەش لە ڕێی گەڕانەوەم بۆ

هوتێلەکەم. باهۆزەکەش ئەوەندە گەرموگوڕ بوو، شەڕەکە بە تەواوی بۆ خۆی بردبوومەوە، خەیاڵەکەش ئەوەندە واقیعیانە بوو، کاتێک گەیشتمەوە دالانەکەی ئەو باڵەخانەیە، کە ژوورەکەی من خۆی لە نهۆمی سێهەمدا دەبینییەوە، ئیدی ئەو کات ئاوڕم لە ئەفسەری ئێشکگر داوە و وەک ئەوەی بەڕێوەبەری هوتێل بێ لێمپرسی:

"ئەرێ هیچ شتێکم بۆ هاتووە؟"

ئەفسەرەکەش نیگایەکی سەیری تێبڕیم، نەفرینێکی کرد و گوتی: "ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟ پێت وابێ ئێرە هوتێلە؟ دەی بگەڕێوە چاوە زیندانەکەت! ئەگەر هەر نامەیەکت بۆ بێ، بۆت دەهێندرێتە ژوورەکەت. پەککو، ئەرێ قەت بابایەکی وەهاتان بینیوە؟"

منیش هێشتا هەر لە ڕێی خۆم بووم؛ لە کۆنفرانسەوە بۆ هوتێلەکەم. بە سووکی پێم هەڵێنا، چەند هەنگاوێکم هاوێشتن، تا ئەو کاتەی پاسەوانەکە چرپاندی، بە دەنگێکی بەرز: "هێی، ئەرێ ئەوە چۆن دەڕۆی؟" ئیدی چوومەوە نێو چاوە زیندانەکەم! دەرکەشم لەسەر داخرا. هاوزیندانەکانم، هەروەک جاران پرسییان:

"ئەرێ چۆن بوو؟ تۆ باشی؟"

منیش وەڵامم دانەوە: "شەوێکی زۆر خۆش و سەرنجڕاکێش بوو. بەیانی بۆتان دەگێڕمەوە."

"بەیانی؟ بەیانی چی؟ خۆ ئێستا بۆتە بەیانی."

ئەو شەوە بۆ من خەو نەبوو. لەسەر چوارپایەکەم ڕاکشام، چاوم کراوە بوون، بە بێدەنگی نوێژی شوکرانەبژێریم کرد. کاتێکیش فیکەی بەیانی لێدرا، هەڵسامەوە.

بـــۆ شـــەوانی دواتـــر تەنیـــا لێکـــۆڵەرەوەکەم لە ژوورەکەدا بینـــی. لە دەســـتپێکی لێکـــۆڵینەوە و بـــێ ئەوەی چـــاوەڕێی پرســـیارێکی مـــن بکـــا، گوتی:

"نە من داوام لە وەرگێڕ کرد بێت و نە بانگیشـیدەکەمەوە. دوێنـێ بـۆم دەرکەوت، بە بێ یارمەتی وەرگێڕ بەڕەی خۆت لە ئاو دەردێنی. ئێمە پێویستمان پێی نییە. بە تەنیا قسەدەکەین."

گفتوگۆکەمان بەشێکی تایبەت بوو بە خزمەتەکانی من بۆ ئیمپریالیزمی بەریتـــانی. کـــاتێکیش بـــۆ لێکـــۆڵەرەوەکەم ڕوونکـــردەوە، کە ئێـــمە شـــاگردەکانی ژابۆتنسـکی، بـۆ ئەوە جەنگـاوین، کۆتـایی بە سیاسـەتی دژەجـووی بەریتانیـا لە فەلەسـتین بهێنـین و بـۆ ئەوەش خەباتمـان کردووە، دەروازەکانی فەلەستین بکرێنەوە و ڕژێمێکی کۆلۆنیکردن بێتە سـەر کـار، ڕێـگە بە لەخـۆگرتنی گـوڕەدەمی ئـاپۆرای جـوو بـدا، ئیـدی لێکۆڵەرەوەکە لە دوا خاڵدا وەستاندمی."

"ئەمەیان! لێرەوە دانت پێدا نا، کە بۆ بەرژەوەندی ڕژێمێکی کۆلۆنیـالی لە فەلەستیندا کارت کردبێ. ئایا هێشتاش هەر حاشایی لێدەکەی، کە تۆ و ئەوانەی وەک تـۆن، ئـاژان و داردەسـت، تەنـانەت ئـاژانی بەئاگـای ئیمپریالیزمی بەریتانی نەبووبن؟"

"جەنـــابی دادوەری مەدەنـــی، ئـــێمە لە خـــزمەت ڕژێمـــی کۆلۆنیالیـــدا نەبووین،" من وەهام پێگوتەوە؛ "ئێمە داوای ڕژێمێکی بە کۆلۆنیکردنمان کرد، ئەمەش دوو ڕامانی سەرتاپا جیاوازن."

"باشە جیاوازییەکەیان لە چی دایە؟ ئایا تۆ بۆ ئەوە تێدەکۆشی بمخەیتە بن کاریگەری لەبلەبانیی وشەکانت؟"

"نەخێـــر. ئەوە گەمەکـــردن نیـــیە بە وشـــەکان. ڕژێمێکـــی کۆلۆنیـــالی (ئیستعماری) واتـای ئەوە دەگەیەنێ، دەسـەڵاتی گەلێکی بێگانە بەسـەر

ولاَتێکدا بڕوا، کە هی خۆی نییە، ئێمەش دەمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ نیشتمانی خۆمان. ڕژێمی کۆلۆنیالی واتە وێرانکاری بمێنێ، ڕێگە لە پەرەسەندنی پیشەسازی بگیرێ؛ لە کاتێکدا ڕژێمی کۆلۆنیکردن[67] واتای چاکسازی کوشتوکاڵ، بەرفرەوانکردنی کەرتی پیشەسازی دەگەیەنێ، بۆ ئەوەی ڕێگە بە ئاپۆرای کۆچبەران بدرێ لێیدابکوتن. بەریتانییەکان دەیانەوێ ڕژێمێکی کۆلۆنیالی بێ، لە کاتێکدا ئێمە، لە ڕاستیدا دژەکۆلۆنیالین."

"تەلمودیزم! کۆلۆنیال، کۆلۆنیکردن، یەک دەست و هەمان شتن. سووک و ئاسان ئێوە خاکی جوتیارە عەرەبەکان زەوتدەکەن. ئایا دەزانی ئەوە چییە؟ ئەوە جەردەییە، تالاَنکردنە! سیاسەتی یەکێتیی سۆڤیەت هەمیشە دژی پاوانکردنی خاک و ولاَتی ئەوانی دیکە بووە. دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەریش، ئێمە یەکسەر ئەو خەڵکەمان ئازادکرد کە ڕژێمی قەڕاڵ چەوساندبوونیەوە، ئێستاش وەک دەبینی، ئێمە «ڤیلنا»مان داوەتەوە گەلی لیتوانیا، کەچی زایۆنیزمیش بە تەواوی واتای وشە جەردەیی، جەردەیە."

"ئێمە نامانەوێ دەست بەسەر خاکی جووتیارانی عەرەبدا بگرین. لەوێ، لە فەلەستین، زەویوزاری پانوپۆڕ هەیە، هەروەک سەردەمی کۆن یان هەر وەک ڕۆژگاری دەرەبەگایەتی، ئەم زەوی و زارانەش بەسەر جووتیارانی عەرەب و نشینگە کشتیارییە جووەکان دابەشبوون. لە چاخی ڕۆمانەکاندا بەشی ڕۆژهەلاَتی فەلەستین پێیدەگوترا پالاستینا سالوتاریس[68]، چونکە کێڵگەی گەنمی ولاَتەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بوو. ئێستاش سێسەد هەزار بەدەوی/ بێدون (ڕەوەند) لەوێ دەژین. لە

[67]- خوێنەری بەڕێز لێرەدا دوو زاراوەی لەیەک نزیک، تا ڕاددەیەک هاوشێوە بەلاَم تەواو جیاواز لە واتادا بەکارهێنراون، ئەوانیش دەستەواژەکانی Colonial regime کە واتای ڕژێمی کۆلۆنیالی (ئیستعماری، داگیرکاری) دەگەیەنێ لەگەڵ دەستەواژەی Colonisation regime واتە ڕژێمی کۆلۆنیکردن (ئاوەدانکردنەوە، کۆچبەر نیشتەجێکردن).

[68] -Palaestine Salutaris

سەردەمی زوودا لە نێوان حەفت تا هەشت ملیۆن کەس لە فەلەستیندا دەژیان. هەر وەک ژابۆتنسکی بە بەریتانییەکانی گوت، لە فەلەستیندا جێگەی عەرەب، جێگەی ملیۆنان جوولەکە و ئاشتی دەبێتەوە."

"هەمـوو ئەوەی گوتـت ـــــــ" سـەرچاوەی ئیتمۆلـۆژی[69] بەشـی یەکەمی ئەو وەسفەی بەکارت هێنا بە ڕوونی دیاربوو سایکۆلۆژیانە بوو. لەجێی خۆی چاوم زەقبوونەوە. لێرەدا یارۆی لێکۆڵەرەوە تێبینی ڕێسـای ڕێـز و لایەقبـوونی کردبـوو. هەڵـبەتە لێکـۆڵەرەوەکەم لەچـاو ئەوانـی دیـکە، کە لە خەڵکـی دیـکە گـوێم لێببـوو، بە سـەد ئـاو شۆرابووەوە[70].

"بـۆچی ئەو ـــــ؟" منـیش وا لێمپرسـییەوە و هەمـان ئەو وەسـفە بەکارهێنراوەی ئەوم دووبارە کردەوە.

بۆ ساتێک بە تەواوی خۆی لەبیر کرد و دەستی بۆ بوتڵە ئاوەکە برد، کە لەسەر مێزەکە داندرا بوو، ئینجا بەبێ ئەوەی بەرزیشیبکاتەوە، بە دەنگێکی هەڕەشە ئامێزەوە گوتی: "پەککوو، پەکوو لەو عەقڵە!"

منیش هیچم نەگوت.

لێکۆڵەرەوەکە سەری بوتڵەکەی کردەوە و گەڕایەوە سەر بابەتەکە.

"من پێت دەڵێم، ئەوەی لێرە گوتت، قسەی بەتاڵە. باشە بۆچی باسی ڕۆژگاری کۆن دەکەی؟ ئێمە دەبێ باسی ئەمڕۆمان بکەین. نان ئەو نانە ئەمڕۆ لە خوانە. هەر بە ڕاستیش بەرەو پێشەوە دەڕۆی. دوێنێ شـەو باسـی سـەدەکانی ناوەڕاسـتت کـرد، باسـی ئەو مـژدەدەرە درۆزنانەی خۆت، ئێستاش بازت دا، چوویە سەر سەردەمی زۆر کۆن،

---

69– ئیتمۆلۆژی etymological زانستی بنجوبناوانی وشە.

70– بە سەد ئاو شورابووەوە: ئیدیۆمەکە لە کاتی بەراوردا واتای باشتربوونی و پاکتربوونی ئەمەی دوایی دەگەیەنێ.

گەڕایتەوە بۆ ڕۆژگاری ڕۆمانییەکان. دەی واز لە ڕابردوو بێنە، قسە لەسەر بابەتی ڕۆژەڤ بکە! ئایا بۆت ڕوون نەبۆتەوە، کە بە ناردنی خەڵک بۆ فەلەستین و داواکردنی ئەو خاکەی، کە هی عەرەبەکانە، وا لە ئیمپریالیزمی بەریتانی دەکەن ستەم لە زەحمەتکێشان، کرێکاران و جووتیارانی عەرەب بکا، بەو بەهانەیەی گوایە دەیانپارێزێ؟ تۆ نەوەک هەر لێرە، یارمەتی بۆرژوازی نێودەوڵەتی دەدەی، بەڵکو لەوێش، لەو جێیە بێ دەوڵەتییەی خۆشت، بوونەتە داردەستی ئیمپریالیزمی بەریتانی، بەڵێ بە کردەوە بوونەتە ئاژان و داردەست."

ئەم ناکۆکییە زیاتر لە جارێک گۆ کرا. دیاربوو دووبارەکردنەوەی شتەکان یەکێ لە بەهرەکانی لێکۆڵەرەوەکە بوو. بەڵکو ئەوە شتێک بوو دەبوایە بیکا، بەشێک بوو لە سیستمەکە. لە سیستمی داهێزراندن.

ئەم جارەیان بەرسڤەکەی من بە شێوەیەکی سەرەکی بریتیبوو لە پرسیار.

"خۆ ئەگەر ئێمە داردەستی بەریتانیا بواین، ئەدی بۆچی بەریتانیا ڕێگەی نەداین بچینە فەلەستین؟ بۆچی دەمانچەوسێنێتەوە؟ بۆچی لە دوایین «کتێبی سپی»ـیاندا، لە ماوەی ئەو یەک دوو ساڵانەدا، لێنەگەڕاون یەک دانە جووش پێ بنێتە سەر خاکی فەلەستین؟ خۆ ئەگەر هەر بە ڕاستی ئێمە خزمەتکاری بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بین، لۆژیک وامان پێدەڵێ، دەبێ ئەویش کۆمەکمان بکا، نەوەک ڕێگەمان لێبگرێ. بەڵام کرۆکی دۆزەکە ئەوەیە، ئەوان لە هەر هەنگاوێکماندا بەربەستن. ئەوەش هەر ڕاستییە، بەر لە جەنگ ئێمە دەبوو بە نێو گەمارۆی بەریتانییەکاندا خەڵکی خۆمان بگەیاندبایە سەر کەناراوەکان، هەروەک چۆن «گاریبالدی» لە سەردەمی ئیتالییەکان کردی."

"دەی هەنووکە، بەراوردێک لەگەڵ ئەوەی «گاریبالدی» مەکە. ئایا دەزانی «گاریبالدی» کێیە؟ ئەو جەنگاوەرێکی ڕاستەقینەی ئازادی بوو، جووڵانەوەکەی پێشکەوتنخوازانە بوو، کەچی بزووتنەوەکەی ئێوە بە تەواوی پاشکەوتنخوازانەیە."

بۆ یەکەمین جار زانیم، کە کردەوەکانی ئەو ڕزگاریخوازە ئیتاڵییە لە قوتابخانەی سیاسیی یەکێتیی سۆڤیەتدا پەسەندبڕێ. هەر بۆیە «گاریبالدی» هەڵگری پێشکەوتنخوازیی بوو، نەوەک نوێنەری بورژوازی نێودەوڵەتی کە بۆ ئەوە دەستنیشانکرابوو ئەرکێکی لە ڕێلادەرانەی بۆ نێو کرێکارانی ئیتالی پێ ڕابسپێرن تا بە ئاراستەی وڵاتێکی بێدەوڵەتی وەک ئیتالیای سەربەخۆ و یەکگرتوو. ئای لەو بەختە! «گاریبالدی» لە سەدەی نۆزدەهەمین جەنگاوە، بەر لەوەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش پەیدابێ، مردووە، ئەگەر وانەبوایە ...

لە هیکەوە یارۆی لێکۆڵەرەوە بابەتەکی گۆڕی و گوتی:

"دەی دەوقاودەق پێمبڵێ، بەڵام هەر وەک خۆی، ئایا ئەرکی تۆ لە نێو ڕێکخراوەکەتاندا چی بوو؟"

ئەو پێشتریش ئەو پرسیارەی لێکردبووم. وەڵامی تەواویشی وەرگرتبووەوە. هەنووکەش دیسان: دەی، دەقاودەق پێمبڵێ."

منیش بە شێوەک لە سەرسامی، وەڵاممدایەوە، ئەمجارەیان بە دەربڕینێکی پۆلۆنیانە، کە تێهەڵکێشی ڕووسیەکەم کرد:

"من فەرماندە (کۆماندانت)ی «بێتار» بووم لە پۆلۆنیا."

"تۆ چی بووی؟" لێکۆڵەرەوەکە بە شێوەیەکی حەپەسان و تووڕەییەوە لێیپرسیم: "بۆچی، خۆ تۆ پێتگوتم، کە بەرپرسی هەموو چالاکییەکان

بووی، تۆ گوتت بە شێوەیەک لە شێوەکان سکرتێری گشتی بووی، هەنووکەش دێیت و دەڵێی 'فەرماندە - کۆماندانت' بووم."

منیش هیچی لێتێنەگەیشتم. نە لە هەڵچوونە لەناکاوەکەی، نە لە حەپەسان و نە لە توورەییەکەی. بۆچی ئەوانە تەلمودیزم بن؟

بۆم ڕوونکردەوە: "جەنابی لێکۆڵەرەوی مەدەنی من هیچ نیەتێکم لە گۆڕینی هیچ شتێک سەبارەت بە پێگەکەم نییە. من پێمگوتی، هەنووکەش پێت دەڵێمەوە، من ئەو پیاوەبووم، بەرپرس بووم لە چالاکییەکانی «بێتار» لە پۆلۆنیا، من فەرماندە (کۆماندانت)ی بووم، من سەرۆکی بزووتنەوەکە بووم لە سەرتاسەری پۆلۆنیادا."

"دەی کەواتە وەها بڵێ." لێکۆڵەرەوەکە بە ئاسوودەییەوە وەهای پێگوتمەوە؛ "تۆ سەرۆکی ڕێکخراوەکە بووی، ئەمەش وەک پێگەی سکرتێری گشتی وایە نەوەک فەرماندە!"

دیسان من تێنەگەیشتم.

تەنها زۆر دواتر، لەسەر لێواری ڕووباری «پێچۆرا»دا، لە سەر بانی کۆڵێتێکی سەر لێواری «پێچۆرا لاگ»، لە مەبەستەکەی تێگەیشتم. دیاربوو لە یەکێتیی سۆڤیەتدا بە فەرمی پلەوپایەی فەرماندە هەبوو. فەرماندە (کۆماندانت) هەروەک لای فەرەنسییەکان (کۆنسێرژێ - دەرکەوان)، کەسێک بوو لە خاوێنڕاگرتنی باڵەخانەدا بەرپرسیار بوو. خۆی لێکۆڵەرەوەکە ترسا نەبادا من لە بەرپرسیاریێتی "تاوانەکەم" پەشیمانبووبمەوە، ئینجا دوای ئەوەی دانمپێدانا، دیسان بام دابێتەوە و خۆم کردبێتەوە کەسێکی بەردەست - دەرکەوان - ی نووسینگەکەمان.

شەوی سێهەمینی لیکۆڵینەوەکە بەقەد ئەو شەوەی بابای وەرگێڕ بەشداری تێداکرد، درێژ نەبوو. کاتێکیش ئێمە لە یەکلابوونەوەی پرسی فەرماندە - کۆماندانت بووینەوە، بە کەسایەتییە توندوبەندییەکەی

خۆی، دەستی بۆ ئەو بارستە کاغەزە برد، کە هەمیشە لە بەردەمی داندرابوون، ئینجا کەوتە نووسینەوە. دیسان من بوومەوە تەماشاکەرێکی ناچالاک (پاسیڤ).

دوای ماوەیەک لێکۆڵەرەوەکە سەری بڵندکرد و گوتی:

"من وەها دەنووسم 'ڕژێمی کۆلۆنیکردن'، بەڵام دەمەوێ ئەوە بزانی، کە کۆلۆنیال و کۆلۆنیکردن هەر یەکن و هەمان شتن."

"دەی دەبا وابێ."

لێکۆڵەرەوەکە سەری بەسەر نووسینەکەی داگرتبوو، کاتێکیش لێی بووەوە، پرسیار و وەڵامەکانی بۆ خوێندمەوە. منیش بە وریاییەوە گوێم لێگرت و سەرنجمدا، بۆ مایەی سەرسامیم، لە یەکێ لە بڕگەکاندا، کە باسی بەرنامەکەمانی کردبوو وەهای داڕشتبوو:

"ئەزموونی بیرۆ - بیجانی یەکێتیی سۆڤیەت سەرنەکەوت. لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیداردا هەر سی تا چل هەزار کەس دەژیان. هیچ جۆرە ئەزموونێکی وەک ئەمە سەرناکەوێ، چونکە نیشتمانی جوو نییە."

منیش گوتم: "جەنابی دادوەری مەدەنی، هیچ جۆرە بڕگەیەکی وەها لە بەرنامەی بزووتنەوەکەماندا نییە."

"مەبەستت چییە؟ ئێ خۆ بە خۆت ئاوهات گوت. وەرگێڕەکەش گوێی لێبوو."

"بەڵێ ڕاستە من وەهام گوت، بەڵام ئەوە ڕوانینی من بوو لە میانەی موناقەشەکەدا، خۆ تۆ جەنابی دادوەری مەدەنی باش ئەو قسە ناودارە دەزانی: "Gedanken sind Zollfrei".

"ئەمە ئەڵمانییە. نازانم واتاکەی چییە؟"

"هـیچ بـاج لەسـەر کەسـێک نیـیە، کە چـۆن بیـر دەکـاتەوە،" منـیش ڕاسـتەوخۆ ئـازادانە وەرمگێـڕا و نەمتـوانی "بـاجی شـیاو' بە ڕووسـی وەربگێڕم.

"لەگەڵ ئێمەدا" ئەفسەرەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، بە هێواشـی بەڵام بە مەحکەمـی گـوتی: "تـۆ بـاجی بیرکردنەوەکانیشـت دەدەی، ئەگەر هـاتوو دژەشـۆڕش بـوون. ئـێمەش هەمـوو شـتێک دەربارەی هزرەکان دەزانین ..."

هەڵـبەت، هەرگیـز نەدەچـووە مێشـکم حاشـایی لەوەی گـوتم بـکەم. ڕاستبوو، لە میانەی گفتوگۆکاندا شتێکی وەهام پێگوتبوو. لە کـانگەی دڵیشـەوە، بە زەحـمەت دەمتـوانی لێکـۆڵەرەوەکە خەتابـاربکەم بەوەی ڕاستییەکانی لەنێو کۆنووسەکەدا شێواندبێ. هەموو ئەوەی داوام لێکرد ئەوەبـوو، بەم شـێوەیەی خـوارەوە وەڵامەکەم بنووسـێتەوە: "بۆچـوونم وابـوو ..." لە جیاتی "بۆچـوونی ئێمە وەهـا بـوو ..." بـۆ ئەمەشـیان قایـل بوو.

دیسـان: ئەوەی لە لایەن کۆمسـیۆنی ڕاوێژکـارانی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی بە تەنگەمـدا دەدرا و بڕیـاری لەسـەر دەدرا، بە بوونی پرسی «بیرۆ - بێجان» یان بە بێ ئەویش هەر دەقەومـا. بەڵام ئەوێ شەوێ، شتێکی گەورە فێر بووم. ئەوەی حیسابی بۆ دەکرا ئەمە بوو: "دەمەتەقێکە" بە هیچ جۆرێک "دەمەتەقێ" نەبوو. دەمەتەقێکە - بەو هەمـوو لـوتفەی تێیـدا نوانـدرا - لە ڕاسـتیدا لێکـۆڵینەوە بـوو. ئیـدی بە قەولی ئەو، "بە لای ئێمەوە" مرۆ دەبێ باجی هزرەکانیشی بدا ...

## ٧

# شەوە لێکۆڵینەوەی پتر

شەوانی لێکۆڵینەوە بەردەوام بوون. هەندێک جار کورتەماوەیەکیان لە نێواندا هەبوو. هەندێ جاریش، لێکۆڵینەوە لەسەر لێکۆڵینەوە، بە بێ پچڕان و ناوبڕ درێژەی هەبوو.

ڕۆژێکیان بیرۆکەیەکم بۆ هات، لە میانەی یەکێ لە لێکۆڵینەوەکان، بە لێکۆڵەرەوەکەم گوت:

"جەنابی دادوەری مەدەنی،" من وەها هاتمە قسە؛ "بەر لەوەی بگیرێم، دەستووری یەکێتیی سۆڤیەتم خوێندۆتەوە، خۆ ئەگەر هەڵەم نەکردبێ، لەوێدا بڕگەیەک هەیە، یەکێتیی سۆڤیەت مافی پەنابەری دەداتە هاووەڵاتییە چەوساوەکانی وڵاتە بیانییەکان، ئەوانەی بۆ ڕزگاریی نیشتمان تێکۆشاون. پێموایە من بەر ئەو پۆلێنکردنە دەکەوم. من ژیانم بۆ ڕزگاریی نیشتمانی گەلەکەم تەرخانکردووە و بۆیەش هاتوومەتە «ڤیلنا» چونکە لە لایەن دوژمنەکانمانەوە ڕاونراوم. قسەشی لەسەر نییە گەر هاتبا و لە وارشۆ کەوتبامە بن دەستی ئاڵمانەکان، لە سێدارەیان دەدام. وەهاشی بۆ دەچم، بە گوێرەی دەستوورەکە بێ لە یەکێتیی سۆڤیەت، مافی هەنوان و ژیانم هەیە نەوەک بخزێندرێمە کونجی زیندان.

لێکۆڵەرەوەکە کە تا ئەوکات بێدەنگ بوو، بە مەیل و لوتفەوە گوێی لە داوا و بەڵگەوبەندەکان گرتم، لە پڕ ڕەنگی دەموچاوی گۆڕا. سەرەتا سوورهەڵگەڕا، ئینجا سپیپاتە بووەوە. کابرا بە تەواوی خۆی لەبیرکرد. هەرگیز وەهام بە تووڕەیی نەبینیبوو. دوایین ڕێز و لوتف کە تێیدا بوو، هەڵڕژا و نەما. بە مستەکۆڵە لە مێزەکەی دا و بە هەموو دەنگی خۆیەوە بەسەریدا قیژاندم:

"چی؟ تۆ بڕگەی دەستوورەکەی ستالینم بۆ دەهێنیتەوە، هەی ئاوقاتی نەفرەتی؟ ئایا دەزانی چۆن هەڵسوکەوت دەکەی؟ تۆ وەک سیخوڕە نێودەوڵەتییەکە، ئەو سەگە هارە، وەک «بوخارین[71]»، دوژمنی مرۆڤایەتی ڕەفتار دەنوێنی. بەڵێ، بەڵێ؛ تۆش هەمان شت دەکەی، کە «بوخارین» خەریکبوو بیکا. ئەو چەند ڕستەیەکی لە نێو نووسینەکانی مارکس دەرهێنا و گوتی: 'دەبینن؟ من ڕاستم. مارکسیش هەروای نووسیوە.' بەڵام ستالین ئێمەی فێرکرد، گوێ بە هەندێ ڕستەی دەرهێنراوی نێو بەردەقەکە نەدەین. ئێمە دەبێ شتەکە بە خڕی وەربگرین، بە پێچەوانەوە ناتوانین بسەلمێنین کامەیان ڕاستە، بەڵکو دەکەوینە سەر دووڕیانی ساختەکاری. بەڵێ، بڕگەیەکی وەها لە نێو دەستوورەکەی ستالیندا هەیە، بەڵام خۆ بڕگەی پتریش هەن، بۆیە دەبێ تۆ هەمووی وەک خۆی وەربگری، نەوەک بە کەیفی خۆت شتی لێدەربهێنی. ئایا هەرگیز گوێت لە شتێکی وەها بووە! بنەپیتۆڵێک لە «ڤیلنا» پەیدا بووە یەکێ لە بڕگەکانی دەستوورەکەی ستالین بە نموونە دەهێنێتەوە و دەیەوێ قەناعەتیشم پێ بێنێ! ..."

من بەو تەقینەوە لە ناکاوە حەپەسام، هێدمە گرتمی. هێشتاش بە تەواوی تێنەگەیشتم بۆچی وەها لێم دەهەری بوو، دەقاودەقیش لەو پنتەی باسم کرد، ئەرێ باشە بۆچی حەوسەڵەی خۆی لە دەستدا؟

---

[71]- بوخارین Nikolai Bukharin(١٨٨٨-١٩٣٨) سیاسەتمەدار و تیۆرزانی شۆڕشگێڕی بەلشەفی، بە فەرمانی ستالین لە ١٩٣٦ گیراو لە ١٩٣٧یشدا لە سێدارە درا.

ئەرێ ئەوە هەر لەبەر پرسیارێک بوو، کە لەجەوهەردا ساویلکانە بوو، یان هەر زۆر سافیلکانە بوو؟ باشە نەدەکرا بە شێنەیی[72] وەڵامی بدابایەوە بەوەی بڵێ: "ئەم بڕگەیە بەسەر تۆ جێبەجێ نابێ." بەڵام ئەو هەر بەوەندەی نەکرد، بەڵکو بە هەموو دەنگییەوە هاواری بەسەرداکردم و بە مست لە مێزەکەی بەردەمی دا. بۆ یەکەمین جاریش بوو لێکۆڵەرەوەکە نەفرینێکی پیسی ناسراو وەک جوێن دەربدا. وای کرد پرسی دەستوورەکەم لە بەرچاو بکەوێ. بە لێکۆڵەرەوەکەم گوت، دەقی تەواوی بڕگەیەکم بۆ هێناوەتەوە نەوەک لەنێو بڕگەکەدا شتێکم لێدەرهێنابێ، ئەو بڕگە دەستوورییەش کە پەیوەندە بە بەندی مافی پەنابەریی ئەوانەی مەترسی ڕاوەدوونانیان لەسەرە، پەیوەندی بە شتی دیکەوە نییە و خودی سۆڤیەتاتی باڵا و ئەنجوومەنی نەتەوەکانیش پشت ڕاستی کردۆتەوە. لێ لەبەر شایستەیی دۆزەکە هیچی دی مشتومڕم لەسەر نەکرد. ئاخر سوودی چی دەبوو؟ لە سەرێکی دیکەوە، من ئامادەیی ئەوەم تێدا نەبوو لە میانەی قسەکاندا بەر شاڵاوی نەفرین و جوێن بکەوم، کە لێکۆڵەرەوەکەی دەزگەی ئاسایش بە بەکارهێنانی وشەی "تۆ" ڕووی تێکردم، هەر بۆیە وەک بەرتەکێک گوتم:

"جەنابی دادوەری مەدەنی، من ئەوەشم خوێندۆتەوە، لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا جوێندان بە قانوون قەدەغەیە، داوات لێدەکەم کاتێک قسەم لەگەڵ دەکەی ئەو جوێن و نەفرینانە بەکارنەهێنی. ئەوە ڕاستە کە من زیندانییم و چارەنووسیشم لەبەر دەستی تۆ دایە، بەڵام خۆ نابێ سووکایەتییم پێبکەی."

"وەها بە خۆت مەنازە."

[72]– بە شێنەیی: بە هێواشی، بە هێورەیی.

لێکـۆڵەرەوەکە ئەمەی پێگـوتم؛ دەق هەر ئەو وشـانەی هـاوڕێکەی لە مەڵبەنـدی دەزگەی ئاسایشـدا پێـی گـوتم، بەڵام لەو کـاتەوە تـا کۆتـایی لێکـۆڵینەوەکە جـارێکی دیـکە گـوێم لە وشـەی کرێـت[73] و ناوزڕانـدن نەبووەوە. ئەو زۆر جاری دیکەش بە سـەرمدا تەقایەوە، دەهـری بـوو، بەڵام قسـەی زبـر و نەفرینـی پێنەگـوتم. هەنـدێک جـار تەنـانەت زێدەمافیش لە خزمەت هەندێ مەبەست دایە.

جارێکیان، دیسان پرسـیارێکی سـافیلکەی زمـانەوانییم لە لێکۆڵەرەوەکە کردەوە.

"جەنـابی دادوەری مەدەنـی،" ڕووی قسـەم لە لێکـۆڵەرەوەکە کـرد؛ "تـۆ باسـی ئەوەت کـرد، بەگـوێرەی قـانوونی یەکێتیـی سـۆڤیەت، چـالاکییە زایۆنیزمەکـانی مـن لە پۆلەنـدادا تـاوانن، هەر لەبەر ئەو کـردەوانەش دەدرێـمە دادگە. بـۆ سـاتێک، جـارێ مـن حەقـم بەسـەر کرۆکـی ئەو کێشەوە نییە. هەروەک پێشتریش گوتم، شتەکە بە باوەڕەوە پەیوەستە. من بۆ چاکەی گەلەکەم وەهـام کردووە و تـا کۆتـایش کـارم کردووە. بەڵام دەمەوێ پرسـێکی ڕەوای ڕامـانی کێشـەکە تـاوتوێبکەم. خـۆ تـۆ خۆشت پارێزەری، هەڵبەتە لێشم تێدەگەی. ئەوەی من کردوومە، لە نێو چوارچێوەی دەوڵەتی پۆلۆنیاوە کردوومە؛ لەوێشـدا بە تەواوی هەمـوو چالاکییەکـانم ڕەوا و قـانوونی بوون. لەوێدا هـیچ قانوونێک نەبـوو ئەو جۆرە چالاکییانە قەدەغە بکا. دەوڵەتەکە، کار و کردەوەکانی ئێمەی کە بۆ هەموو کەسێک دیار و ناسراو بوون، بە ناقـانوونی دانەنـابوو، هـیچ قـانوونێکی دیـکەش لەوێ کە دەوڵەتـی پۆلـۆنی هەبـوو، نەیـدەخوارد. ئێسـتاش مـن لە یەکێتیـی سـۆڤیەتیی دام و قانوونەکـانی لەسـەر مـن پەیـڕەودەبن، بەڵام چـۆن دەکـرێ ئەو قانوونـانەم لەسـەر جێبەجێبکەن، کە ڕابردووشـم بگـرێتەوە؟ ئـاخر خـۆ ئەوە سـەرەتای دادوەریـیە، کە دەڵێ هیچ کەسێک لەسـەر کردەوەیەک سزا نادرێ، ئەگەر هاتوو پێشـتر

[73] – کرێت، ناشرین، بڵح. لە هەندی بنزاریشدا ناکرێت دەبێتە ناشرین.

و لەکاتی خۆی و لەو شوێنەی کارەکەی کردووە، بە تاوان لەقەڵەم نەدرابێ. من هەر وەهای دەبینم، ئەو ڕێسایە لە نێو قانوونی یەکێتیی سۆڤیەتیشدا دەقنووس کرابێ. کەواتە چۆن دەکرێ بە قانوون بە شتێک سزا بدرێم، کە لە ڕابردوودا کردبێتم؟"

ئەمجارەیان لێکۆڵەرەوەکەم بە قسەکەم تووڕە نەبوو. بە پێچەوانەوە، پرسیارەکەم خستیە سەر میزاجێکی خۆش. ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

"ڕەفتارە قانوونییەکەت خۆشحاڵم دەکا. هۆ «مێناحیم وۆلفۆڤیچ» ئەرێ ئەوە دەزانی، تۆ لە بن بەندی قانوونی سزادانەدا بەرپرسیاری؟"

"نەخێر نازانم."

"تۆ لە ژێر ماددەی ٥٨ی قانوونی سزادانی کۆماری دیمۆکراتی سۆڤیەتیی ڕووسیادا تۆمەتباری. ئایا دەزانی ئەم ماددەیە باسی چی دەکا؟ ئایا دەزانێ کێ دایڕشتووە؟"

"نەخێر، نازانم."

"کەواتە باشە بیزانی. ماددەی ٥٨ بۆ کردەوەکانی دژەشۆرشە، بۆ ناپاکی و لادانە، ئەم ماددەیە لە لایەن خودی ڤلادیمیر ئیلیچ لینینەوە نووسراوە."

"بەڵام چۆن بەسەر ئەو شتانەدا پەیڕەو دەبێ کە من لە پۆلۆنیادا کردوومە؟"

"ئاخ! «مێناحیم وۆلفۆڤیچ»، تۆ پیاوێکی ڕووقایمی. ماددەی ٥٨ لەسەر هەموو کەسێکی دنیا جێبەجێ دەبێ. ئایا گوێت لێمە؟ لە هەموو جیهاندا. پرسەکەش هەر ئەوەیە، ئاخۆ ئەو دەگاتە بەردەستمان، یان ئێمە دەستمان پێی ڕادەگا."

وێڕای ڕەوشـەکەم، وێـڕای ئەوەی مـن دەبـوایە چووبـامە بەردەسـتی دەزگەی ئاسـایش و ئەوانـیش منیـان گرتبـا و بیانخسـتبامە بەردەم مـاددەی ٥٨ (ئەوەش وەنەبـێ هەر بە شـێوەیەکی تیـۆری بەڵکـو بە کردەوە)، بەڵام هەر بەڕاستی ماهیمـام[74]. بۆ چەندین ڕۆژ هەر بیرم لەو وەڵامە ڕاشەکاوە و لە سزادانە کتوپڕییەکە دەکردەوە، کە دژبەری هەمـوو بنەمـایەکی ئـادەمیزادانە بـوو بـۆ ڕامـانی قـانوون. کەواتە دەوڵەتێـک هەیە، قـانوونی سـزادانی دانـاوە و بەتـایبەتیش بەنـدی دژەشۆڕش، کە هەر یەکێک لەو دوو ملیار و نیو[75] مرۆڤە دەگرێتەوە کە لەسەر ئەم گۆی زەمینەدا دەژین. تۆ بڵێی کێ بێ نەکەوێتە بن باری دژەشـۆڕش؟ لەوانەیە کۆمۆنیسـتەکان، ئەوانەی زۆر مانـدوو دەبـن، بە شـەو ڕۆژ کـاردەکەن، ئەو سـەرچڵییە بە ژیـانی خۆیـان بـکەن، بەوەی شـــۆڕش و دەزگەی ئاسایشـــی کۆمۆنیســـتی ســـۆڤیەتیی بهێنـــنە وڵاتەکانیان، ئەوان لەو بەندەی قانوونی تاوانەدا ڕیزپەڕبن؟ شـتی وەهـا لە گۆڕێـدا نەبـوو! لە زینـدانی لوکیشـکی و لە ئۆردوگـای زۆرەملێـدا، کۆمۆنیستی پۆلۆنیاییم بینین، کە خەباتی ژێر زەمینیان کردبوو؛ هەموو ساڵێک لە یەکـی ئایـاردا دەگیـران و لێکۆڵینەوەیـان لەگەڵـدا دەکـرا، لەم ساڵ بـۆ ئەوسـاڵ، هەبـوو بە چەندین سـاڵ لە کـونجی زینداندا ئـاخنرا بـوو. کە کـاتی خۆیشـی هـات، مـاددەی ٥٨ی لەسـەر جێبەجێکـرا. ئینجـا سـەرەکیترین بەرگریشـیان ئەو قسـەیە بـوو: "ئـاخر خـۆ لە پێنـاو کۆمۆنیزم، لە پێناو سەرکەوتنی شۆڕش، بە سـاڵ لە زیندانی پۆلۆنیای سـەرمایەداریدا بـووم. بە ئاسـانی دەتـوانی ئەمە پشتڕاسـتبکەیتەوە. شـاهیدت بـۆ دێنم. ئەدی باشـە چـۆن دەبـێ ئێسـتا بێیت و بڵێی و تـۆ دژەشۆڕش بووی؟"

لێکۆڵەرەوەکەش پێی پێدەکەنی.

---

[74] – ماهیمام: حەیران مام، حەپەسام، ئەوق مام.

[75] – هەڵبەتە ژمارەی دانیشتوان بە پێی پیوەری سەردەمی ئەوکاتەی گیرانی بێگنە.

زیندانی بووی "هەی ناپاک، تۆ زیندانکرابووی. دەی پێم بڵێ چەند؟"

"سێ ساڵ، پێنج ساڵ، حەفت ساڵی ڕەبەق ..." ئەوە وەڵامی خەڵکە دڵ بە خەمەکە بوو.

"کەواتە دوای ئەوە چیت بەسەر هات؟" لێکۆڵەرەوەکە وەهای لە کۆمۆنیستە دژەشۆڕشەکە دەپرسی.

ئەوسا بابای زیندانی بە دڵشکاوی و ساویلکەییەوە وەڵامی دەدایەوە:

"پاشان ئازادکرام و کارم بۆ شۆڕش کرد."

لێکۆڵەرەوەکە بە سەریدا دەگرماند: "کەواتە لە زیندان بەردرای؟"

"بەڵێ لە کۆتایی ماوەی زیندانییەکەمدا و بەگوێرەی حوکمەکە، لە زیندان ئازاد کرام."

"بۆچی، هەی گەندەڵ! خۆ تۆ کۆمۆنیستێکی دڵسۆز بووی، چۆن پۆلیسی سەرمایەداری تۆی لە زیندان ئازادکرد؟ ئەوە تۆ چ فرۆفیشاڵێکە؟ خۆ ئەگەر تۆ کۆمۆنیستێکی دڵسۆز بووبای، دوای چەند ساڵێکی کەم ئازادیان نەدەکردی. تۆ بۆ ئەوە ئازادکرای، چونکە بەڵێنت بە پۆلیسی نهێنی پۆلۆنی دابوو، کۆمۆنیستە دڵسۆزەکانیان بە گرتن بدەی. ئەرێ تۆ وا دەزانی ئێمە لە گوێی گادا نووستووین؟ دەی، هەنووکەش ڕاستییەکەمان پێ بڵێ، هەموو شتێکمان بۆ هەڵڕێژە! ..."

ئەوەی لە کۆمۆنیستەکان قەوما بەسەر پارێزەرەکانیشیاندا هات. زۆر لە پارێزەرەکان، لەنێویشیاندا، ماخۆی ئەو تێبینیانە، کە بەرگری لە کۆمۆنیستە تۆمەتبارەکان دەکرد، لە دادگەکانی پۆلۆنیا و لیتوانیا، لە بن دەسەڵاتی ڕژێمی سۆڤیەتی، خرانە بن بەندی ٥٨ و گیران. گەورەترین بەرگریکردنیشیان ئەمەی خوارەوە بوو:

"ئەرێ چۆن دەتوانی ئێمە بە کەسێکی دژەشۆڕش تۆمەتبار بکەی؟ ئێمە هەموو شتێکمان بە دڵسۆزی کرد و کاتی خۆمان بۆ بەرگریکردن لە کۆمۆنیستەکان تەرخانکردبوو، ئیشمان بۆ ئەوە دەکرد، ئەوان لە بن دەستی پۆلیس دەربهێنین."

لێکۆڵەرەوەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێی پێکەنین.

"تۆ بەرگریت لە کۆمۆنیستەکان کرد؟ ئەوە بۆ کێی دەهۆنیتەوە؟ ئەرێ هەر تۆ نەبووی دەستت لەگەڵ پۆلیسی نهێنی تێکەڵ بوو، ئەوان چۆن لێتگەڕان لە بەردەم دادگەی سەرمایەداریدا بەرگری لە کۆمۆنیستەکان بکەی؟ دەرکەوتنی ئێوە لە بەردەم دادگەکانی ئەوان، بەڵگەی ئەوەیە، کە ئێوە ئاژانی پۆلیسی نهێنی بوون و کۆمۆنیستە ڕاستەقینەکانتان بۆ ئاشکرادەکردن."

گلەیی و گازاندەی خەڵکە خەمبارەکە کپدەکرایەوە.

بەڵکو خودی تۆمەتبارکردنەکە بۆ خۆی شتە هەرەهەراسانەکە نەبێ بۆ دۆزی کۆمۆنیستەکان و بەرگریکارەکانیان، ئەوانەی بە خۆیان و بڕوانامەی دەستیان، دەچوونە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، خۆی ئەو بڕوانامانە بوونە بەڵگەیەک لە دژیان. ناخۆشی هەرە ڕاستەقینە خۆی لە بن ئەو ڕاستییەدا دەبینییەوە، کە لێکۆڵەرەوەکان لەو دۆزانەدا درۆیان نەدەکرد. بە پێچەوانەوە، ئەوان قەناعەتیان پێهێنرابوو، کە بەڵگەی سەلمێنەریان لەبن دەستدایە. خۆ نەوەک گریمانە، بەڵکو ڕاستییەکان نابێ دژبەرییان تێدا بێ. دیسان ئەوە جیهانێک بوو دژی ئەوی دیکە، نێوانیشیان خەرەندی هەزار بە هەزاری دۆزەخ بوو. لە جیهانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، هیچ پارێزەرێک نەبوو لەگەڵ چەوسێنەرانی مەعمیل و تۆمەتبارەکان دەستی تێکەڵ نەبێ. ئاخر چۆن مریدانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بڕوا بە جیهانەکەی دیکە بکەن (ئەو

جیهـــانەی وەهـــا ڕێنمـــاییکراون کە جیهـــانی چەوســـاندنەوەیە) بەوەی تۆمەتبار – ئەوسا چ سیاسی بێ یان تاوانکار – دوای حوکمدانەکەی، ڕۆژێک بێ حوکمەکە کۆتایی بێ و زیندانییەکەش ئازادبکرێ؟ ئاخر چـۆن بـڕوا بەوە بـکەن "لەوێ" ئەنجـوومەنی بەرگـری لە جیـاتی مەعمیلەکەی لە بەردەم پۆلیسی نهێنیدا قیتبێتەوە و بەرگرینامەی خۆی بخـوێنێتەوە، دژی ئەنجـوومەنی ڕاوەدوونـان و دژی ئەو حکـوومەتەی کە دایناوە، بوەستێتەوە؟ چۆن دەکرێ هەموو ئەو شتانە ڕێپێدراو بن؟

دوو جیهان. ئەو خەرەندەی دۆزەخیش کە دوو لەتی کردوون نەوەک هەر قووڵ نییە، بەڵکو بێ بنە. مۆتەکەش بەسەریدا زاڵە، گیانی ماددەی ٥٨ی قانوونـنـامەی سـزادانی و هەمـوو ئەوانەی پێیـوە پابەنـدن: "دەی کرێکارە ئازادیخوازەکانی هەموو وڵاتان ـ–ـ یەکگرن!" دەنا ....

شەوێکیان لێکۆڵەرەوەکە ئەم پرسیارەی خوارەوەی بۆ خوێندمەوە:

"ئەرێ لەوێ، چ پەیوەنـدییێک لە نێـوان تـۆ و پۆلیسـی نهێنـی پۆلۆنیـدا هەبوو؟"

وەڵامەکەی منیش خۆزاییـانە[76] بـوو: "جەنـابی دادوەری مەدەنـی. مـن وەڵامی پرسیارێکی لەم جۆرە ڕەتدەکەمەوە."

"مەبەستت چییە؟" لێکۆڵەرەوەکە وەهـای لێپرسـیم؛ "تـۆ دەبـێ وەڵامـی پرسیارەکانم بدەیتەوە."

"جەنـابی دادوەری مەدەنـی، تـۆ دەتـوانی لە کۆنووسـەکەی خۆتـدا بنووسـی، ئەو ڕەتیکـردەوە وەڵامـی ئەو پرسـیارە بـداتەوە، منـیش لە دادگە هۆکارەکەی بەیاندەکەم."

---

76 – خۆزاییانە: غەریزەییانە.

"ئاخر تۆ مافی وەڵامنەدانەوەی پرسیارەکانت نییە. بەڵام هەر بەڕاستی، بۆچی وەڵامی ئەو پرسیارە سادەیە ڕەتدەکەیتەوە: ئایا چ پەیوەندی لە نێوان تۆ و پۆلیسی نهێنی پۆلۆنیدا هەبوو؟"

"جەنابی دادوەری مەدەنی، ئەمە پرسیارێکە بۆ سووکایەتیپێکردن، خۆ من پێشتر پێمڕاگەیاندبووی، ئەگەر لەبەر باوەڕم ئازار بچێژم، ئەوا بەبێ پرتەوبۆڵە کارەکە دەکەم، بەڵام تا ئەو کاتەی برستم بەسەردا بشکێ، لەگەڵ سووکایەتیدا هەڵناکەم. من بۆ گەلەکەم تێکۆشاوم و هیچم لەگەڵ پۆلیسی نهێنی پۆلۆنیدا نەبووە. وەنەبێ هەر لەسەر خەباتەکەمان من زیندانی کرام، بەڵکو بەرپرسی پۆلیسی نهێنی گەفی ئەوەی لێکردووم، ئەگەر هاتوو خۆپیشاندان دژی بەریتانیا - کە لە ١٩٣٩دا زۆر جار دووبارە دەبووەوە - نەوەستێ، ئەوا فڕێمدەداتە ئۆردوگای زۆرەملێی «بێرزا کارتوسکا». ئینجا دوای ئەو هەموو شتە، تازە بە تازە، لێم دەپرسرێ ئایا چ جۆرە پەیوەندییێکم لەگەڵ پۆلیسی نهێنیی پۆلۆنیدا هەبووە!"

لێکۆڵەرەوەکە پێکەنی.

"دەبینی،" ئەویش وەهای پێگوتمەوە؛ "کە چ جۆرە پەیوەندییێکت بە پۆلیسی نهێنی پۆلۆنییەوە هەبووە. خۆت تازە بە دەمی خۆت گوتت، کەوا پۆلیسی نهێنی لە وارشۆ بانگیکردووی."

"باشە، جەنابی دادوەری مەدەنی، دەکرێ بە دلۆڤانییەوە لە وەڵامەکەتدا بنووسی: 'بەرپرسی پۆلیسی نهێنی وارشۆ بە دوایدا ناردم و هەڕەشەی لێکردم، بە قەولی خۆی ڕەوانەی "کێڵگەی سەوز"م بکا لە «بێرێزا کارتوسکا»'.

هێشتا لێکۆڵەرەوەکە بە ڕووخۆشی مابووەوە. ئەویش گوتی: "تۆ هەی «مێناحیم وۆلفۆڤیچ»، پیاوێکی پێکەنیناویت، هەر سووری ڕۆڵی

پاڵەوان ببینی. من لێناگەڕێم پرسیارەکەم بڕوا، تۆ دەبێ بەرسڤ بدەیتەوە. من لە وەڵامەکەدا دەنووسم: 'من هیچ پەیوەندییم بە پۆلیسی نهێنی پۆلۆنییەوە نەبووە،' بەڵام خۆ ئەگەر پێتوابێ ئەوان لە دادگە پێت باوەڕدەکەن، ئەوا خۆت گێلدەکەی."

"دەی با وا بێ."

شەوێکیان، لە میانەی گفتوگۆدا، لێکۆڵەرەوەکە بێ ئەوەی قسەکەی لە شێوەی پرسیار دابڕێژێ، گوتی: "ئەوە بۆ من ڕوون بۆتەوە، ڕێکخراوەکەت تۆی لێرە جێهێشتووە تا کردەی دژەشۆڕش بکەی."

منیش وەڵامم دایەوە: "هەر بە تەنیا یەک دوو ڕۆژ دەبێ، پێمگوتی کەوا لە «کۆڤنۆ»وە لیزەپاسێکم بۆ خۆم و ژنەکەم پێگەیشت، هەروەها ڤیزەیەکیش بۆ فەلەستین بوو، ئێمە لەسەر ئانوساتی ڕۆیشتن بووین، گرتنەکە ڕێگەی لە سەفەرەکەمان گرت. ئەو ڕاستیانەش هی ئەوەن لە هەر ساتێکدا پشتڕاستبکرێنەوە، ئەوە ڕاست نییە، کە هیچ کەسێک منی لێرە جێهێشتبێ، منیش نیازم نەبووە لێرە بمێنمەوە، ئێمە هەموومان ویستوومانە بچینە فەلەستین، بڕۆینەوە نیشتمانەکەمان."

"باشە،" لێکۆڵەرەوەکە بەرەنجامێکی لە قسەکەم هەڵهێنجا و گوتی: "کەواتە تۆ بەوە تاوانباری، پلانی هەڵاتنت لە یەکێتیی سۆڤیەتەوە هەبووە. هەڵاتن لە یەکێتیی سۆڤیەت سەرپێچییە و لەسەر ئەوە دەبێ سزا بدرێی."

کاتێکیش ئەو شتانەم بە هاوزینداننییەکانم ڕاگەیاند، هەرسێکمان لە قرتەی پێکەنینمان دا. ئەوەندە بە دەنگ پێکەنین، پێکەنینەکەمان گەیشتە گوێی پاسەوانە نۆبەتدارەکان و تووڕەی کردن. ئینجا نۆبەتچییەکە دەرکەی ژوورەکەی کردەوە و گوتی: "دەبینم لێرە زۆر کەیفخۆشن. ئەرێ پێتان خۆشە شادمانترتان بکەم؟"

ئێمەش وەستاین. کاتێکیش دەرکەکە داخرایەوە کۆنە ئەفسەرەکە گوتی: "ئەو ڕاست بوو. هەمیشە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ڕاستەوخۆ ئەگەر لە یەکێتیی سۆڤیەت بمابایەوە، ئەوا تاوانت دەکرد. ئەگەر بشتویستبا لە سۆڤیەت دەربچی، هەر تاوانت دەکرد. خۆ ئەگەر بتویستبا هیچ تاوانێک نەکەی، نەدەبوو لە دایکبووبای!"

شەوێکیان کاتێک گفتوگۆ تەواو بوو، لێکۆڵەرەوەش لە نووسینەکەی بووەوە، گوتی:

"بەیانی کەسێکی نزیکت دەبینی. ڕووبەڕووی یەکێک دەبیتەوە."

منیش بە خێرایی لێمپرسی: "لەگەڵ کێ؟"

"بەیانی بۆت دەردەکەوێ. تۆش نابێ هیچ پرسیارێکی ناپێویستی لێ بکەی."

نزیکەی هەموو شەوە خەولێزڕانەکە و ڕۆژە هەراسانەکەم بەسەربرد. قوتابییە هاوزیندانییەکەشم پشتگوێ خست. عەریفەکە بە سەعیکردنەوە خۆی بۆ دەرسەکە ئامادەکردبوو و منیش یەک دوو پرسیارم لێکردن، بە دەم خەیاڵ ڕۆیشتنەوە وەڵامەکانیم کەوتنە بەرگوێ و تەواوی دەرسەکەم لەسەر تەختە پێگوت. عەریفەکەش لەسەر پشوودانەکە ناقایل نەبوو. هەردووکیان، چ ئەو و چ پیرەئەفسەرەکە تێگەیشتن هەست بەچی دەکەم، بۆیە منیان بۆ هزر و مەراقی خۆم بەجێهێشت.

من هەر زۆر لە مەراقدا مامەوە. تۆ بڵێ لەگەڵ کێ ڕووبەڕووم بکەنەوە؟ باشە بۆچی لێکۆڵەرەوەکە پێی نەگوتم ئاخۆ ئەو کەسەی کە "لێمەوە نزیک بوو" کێیە، دەیهێننە بەردەمم؟ تۆ بڵێی ئەوان ژنەکەمیان گرتبێ؟ جارێکیان ئەو هزرانە چوونە نێو مێشکمەوە نەمتوانی لە دەستیان قوتار بم. "نەخێر، ئەوە نابێ،" وەهام بەخۆم گوتەوە، لە

دەرگەکەوە بەرەو پەنجەرە بە ڕاوێچکە[77] دەڕۆیشتم و دەهاتمەوە. کاتێکیش لە لای پەنجەرەکە بەرەو دەرکە بامدایەوە ترس چرپاندییە بن گوێم: "هەر دەبێ وەها بێ؟" هەوڵمدا لەگەڵ خۆم ئاشت ببمەوە هەندێ خۆم هێور بکەمەوە، بە خۆمم دەگوتەوە خۆ تازە هەر شتێک قەومابێ، هیچی لەگەڵ ناکرێ، ڕۆژ ئەوەیە کە تێدا دەژین؛ خۆ ئەوە بە تەنیا هەر ئێمە نین بەو باهۆزەی ڕووی لە جیهان کردووە، ژیانمان خاپووربووە.

تا دەهات شەپۆلی ترس پتر هەڵدەکشا. باشە بۆچی بە هۆی منەوە ئازاری پێبگا؟ خۆ من گیراوم، بەڵام دوای هەموو شتێکیش، هەمیشە ئەوانی دیکەم هانداون ئامادەی قوربانیدان بن و ئەمەش بە ڕاستگۆیی و بڕواوە ئەنجام بدەن؛ کەواتە ئێستا، دوای ئەوەی داوام لە خۆم کرد خۆی لەبەر تاقیکردنەوەکە بگرێ، بۆیە نابێ پرتەوبۆڵە بکەم، دەبێ بە ئیرادەوە بیپەژرێنم. بەڵام بۆ دەبێ ژنەکەم بکەوێتە ئەو داوەوە؟ چما؟ باشە ئەو، بەو نەخۆشییەی خۆی، چۆن لێرە لە زیندان بە بێ داودەرمان هەڵدەکا؟ بەڵام کێ دەڵێ ئەو گیراوە و ئێستا لە نێو برادەراندا نییە؟ دیسان گەڕامەوە سەر ئەو پنتەی، کە لێیەوە دەستم پێکرد، بەوەی مێشکی خۆم هەندێ بحەسێنمەوە.

ئەرێ بۆ خاتری ئاسمان، تۆ بڵێی ئەو ڕۆژە چۆن بڕوا؟ تۆ بڵێی کەی کاتی لێکۆڵینەوەکە بێتەوە؟ تۆ بڵێی کەی بزانم؟

لە نێوەڕاستی ترسەکەمدا، بیرم لە ڕۆژانی ڕابردوو کردەوە، ڕۆژانی خۆشی، ڕۆژانی هیوا، ڕۆژانی جۆشوخرۆش. لەگەڵ یادکردنەوەیدا دڵم بە خورپە کەوت، بۆ ئەو ڕۆژەی کاتێ کچێکی تەمەن حەڤدە ساڵانم

---

[77]– ڕاوێچکە: لە مەودایەکی نزیکەوە هاتن و چوون، هۆڵەندی وشەی ijsberen یان بۆ هەیە، واتە وەک ورچی نێو سەهۆڵبەندان لە شوێنی خۆی بێت و بچێ، حاڵەتەکە لە کورتەپیاسە دەچێ، بەڵام دەبێ بە هەمان شوێندا بگەڕێتەوە، من هاوواتای ئەم وشەیەم بە کوردی نەدەزانی، تا ڕۆژێکیان هاوڕێی نووسەر کاک «کەریم کاکە»، دوای خوێندنەوەی ڕۆمانی «خانووەکەی مزگەوتێ»، گوتی دەزانی ئەو حاڵەتە بە کوردی پێیدەڵێن ڕاوێچکە.

بینی و بە خۆمم گوت: تۆ بڵێی ببێتە ژنم. بۆ ڕۆژی پاشتر ئەو شارەم جێهێشت، کە ئەوم تیا بینی، ئەو شارەی بۆ پیشەکەم تێدا خوێند، ئینجا نامەیەکی یەک دێڕیم بۆ نووسی: "خاتوونەکەم، کە بۆ یەکەم جار تۆم بینی، هەستمکرد بە هەموو ژیانم دەتناسم." ... پاشان پێم گوت، دەکرێ ژیان قورس بێ، پێمڕاگەیاند لەوانەیە هەرگیز پارەمان دەست نەکەوێ، بەڵکو لەوانەیە زۆر کێشەمان تووش بێ، بارگرانیمان بێتەسەر، ئەگەر هەیە زیندانیش بکرێین، چونکە ئێمە بۆ ئێرتز ئیسرائیل خەبات دەکەین. ئەویش پێیگوتمەوە، کە لەو کێشە و ئاریشانە ناترسێ.

دوای ئەوەی شەوێکی زستان لە وێستگەی قیتار چاوەڕێم کرد. ئەو لە ماڵی خۆیەوە هات و منیش هەروەک جاران لە گوتاردانێکی نێو خەڵک. ئیدی ئەوم لەگەڵ خۆم بردە ماڵی باوانم و ئەوانیش خۆشیان ویست. بۆ ڕۆژی پاشتر بە هۆی دوانێکم، ئەوم بەجێهێشت. پاش ئەوە نامەیەک لە «ڤلادیمیر ژابۆتنسکی»یەوە هاتبوو، تێیدا نووسیبووی:

"من هەر ئەوەم بۆ تۆ دەوێ، کە بۆ کوڕی خۆم بە ئاواتی دەخوازم. لە ژیانی مندا ڕۆژانی سەخت هەبوون، بەڵام زۆر ڕۆژی خۆشیشم بینیون. هەنووکەش کە پیر بووم، دەزانم خۆشترین ڕۆژ ئەو ڕۆژەیە، ئەڵقە لە پەنجەی کچێک دەکەی و ئەو کۆپلە نۆ وشەیەی پێ دەڵێیتەوە ..."

پاشان ڕۆژی زەماوەندەکەمان هات ... پیرەکان دڵخۆش، گەنجەکان بە زەوق و ژابۆتنسکیش لەنێو شاهیدەکاندا بوو. دوای ئەوە مۆڵەت نەبوو؛ نە مانگ، نە هەفتە تەنانەت ڕۆژێکیش پشووم نەبوو. بۆ ڕۆژی پاشتر بەرەو وارشۆ، بۆ بزووتنەوەکە، بۆ کار، بۆ ڕێکخستنی گەورەترین هەڵمەتی کۆچبەری بۆ فەلەستین، ڕێچکەشکاندێکی گەورە

بەبێ مۆڵەتنامە (بڕوانامە)[78]ی بەریتانی. دیسان ژنەکەم بە تەنیا لە ماڵ مایەوە، کەچی بۆڵەبۆڵیشی نەکرد. من لەسەر بەڵێنەکەی خۆم بووم - لە داهاتوودا کێشەمان دێتە پێش - ئەویش هەر لەسەر سۆزی خۆی بوو، کە نەترسێ و دەست و پێم نەبەستێتەوە، پاشان دوای ئەوە، هەموو شتێک دارما. جەنگ هەڵگیرسا. ئێمە ناچارکراین وارشۆ جێبهێڵین. هەر بە پێ کەوتینەڕێ، لە ژێر باران و بۆمبارانـدا بە کۆڵەپشتەوە هەر بڕۆ و هەر بڕۆ، گیانی خۆت دەربازکە. خێزانەکەم لە هەموو وێستگەیەک دەوەستا، بەڵام لە یەکێکیان، کاتێک بۆ پشوودان وەستاین، نەخۆشییەکەی سەریهەڵدایەوە، نەخۆشییێک دەکرا لە ناوییبا. دوای ئەوە، ئەوم گەیاندە لای ماڵە باوانی، ویستم لەوێ بۆ ماوەیەک لە ماڵە باشەکە بەجێیبهێڵم، دەنا لە ڕێگە زیانی پێدەگەیی. ئەمەش لەو کاتەی کە بە قاچاغ لە سنوور دەپەڕینەوە. بەڵام خۆ هەوڵەکەم بێ ئەنجام بوو. ئەو سوور بوو: "بۆ هەر کوێ دەچی، منیش لەگەڵت دێم."دیسان بە یەکەوە کەوتینەوە ڕێ، لە کۆتاییدا بە سەلامەتی گەیشتین. ئێمە لەسەر ئەوەبووین ئەوێ بەرەو ئێرتز ئیسرائیل بەجێبهێڵین، ئەمەش بەر لەوەی ڕاڕەوەی «بەڵتیک» لەنێوان ڕووسیا و ئاڵمان لەبەین هەڵبگیرێ، بەڵام خۆ دەبوو شوێنەکەمان بدەینە دۆستێک. دۆستەکەمان پێش ئێمە بڕوا، ژنەکەشم لەوە ناکۆک نەبوو. ئەو گوتی؛ "قەیناکا. ئێمە جارێکی دیکە دەڕۆین،" ئینجا دوای ئەوەی هیوای ڕۆیشتن و دەرچوونمان کز و کزتر دەبوو؛ لە بەرانبەردا، دەرفەتی گرتنم و لەیەک جیابوونەوەمان تا دەهات زیاتر و زیاتر بێسنوور دەبوو. ئەو کات لەو ماوەیەی کە چاوەڕێمان دەکرد پێمگوتم؛ "باشە، من ئەو بەڵێنەی دابووم بە تەواوی دەیبەمەسەر. دەکرێ تووشی زیندان ببم." لە ڕاستیدا من لە ژێر بارودۆخی دیکەدا، لە ئێرتز ئیسرائیلدا بیرم لە زیندان دەکردەوە، بەڵام خۆ «لوکیشکی»یش زیندان

[78]- لێرەدا مەبەست ئەو ڕێپێدانەی بەریتانیا بوو کە لە شێوەی ڕێنامە، باوەڕنامە بە کۆچبەران دەدرا، کە بەرەو فەلەستین کۆچبکەن.

بوو. دیسان ئەو ناقایلی نیشان نەدا، هەوڵی نەدا کارم تێبکا، کە خۆم بشارمەوە یان ڕابکەم.

هەموو ئەو وێنانەی بە زەیندا دەهاتن، ڕەوانەوە. ئەوان هەر دەهاتنەوە. دڵشادیانکردم، پڕیانکردم لە تاسە و غەریبی. لێ دیسان ترس لە ناخمدا زیاتر بوو. تۆ بڵێی ئەویان گرتبێ، یان وازیان لێهێناوە؟ بە بێدەنگی پرسیاری گۆنەکراو لەسەر یەک لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون. کێ نالێ ئەم دیدارە لەگەڵ یەکێ لە برادەرەکانمان نییە کە گیرابێ؟ تۆ بڵێی لێکۆڵەرەوەکە چ مەبەستێکی ئەهریمەنانەی هەبێ، کاتێ گوتی: "بەیانی یەکێک دەبینی، کە لێتەوە نزیک بوو؟"

لە کۆتاییدا ڕاکشانی ڕۆژەکە بەرەو کۆتایی دەچوو. نانی ئێوارەمان پێدرا. هاوزیندانەکان فشاریان خستمەسەر نانەکەم بخۆم، تا بە درێژایی شەوەکە بە بەهێزی بمێنمەوە. چاوەڕوانی فیکەی خەوتنمان کرد، مەراقتر لەوەی کاتێ پرسیارە چرپەدارەکە دێ: " ئەرێ کێ ناوەکەی بە «ب»ـایە؟" کاتێکیش لە کۆتاییدا وادەکە هات، بە خێرایی هەروەک کاتێ ئاگرکوژێنەوە گوێی لە فیکەی ئاگرکەوتنەوە دەبێ، خۆم گۆڕی. ئای ئەگەر توانیبام هەر بە غاردان بەرەو ژووری لێکۆڵینەوە بڕۆم! بەڵام خۆ غاردان قەدەغە بوو. تۆ دەبوایە بە هەنگاوی ژمێردراو بڕۆی، نە ئەوەندە هێواش نە ئەوەندەش خێرا. حەزم دەکرد لەو ڕێڕەودا چاوم بە هیچ زیندانییەک نەکەوێ، چونکە کاتێ ڕووکردنە دەستەڕاست و دەستەچەپم لە دەست دەدا! بەڵام ئەو شەوە ڕێڕەوەکە چۆڵ بوو. تاکە لە دەستدانی کات هەر ڕۆیشتنەکە بوو. من بردرامە ژووری لێکۆڵینەوەکە، لەوێدا تەنیا لێکۆڵەرەوەکەم بینی.

پێی گوتم: "دانیشە."

لە مێشکی خۆمدا قسەی دوێنێ شەوم هەڵگرتبوو، هیچ پرسیارم لێنەکرد.

"لەوانەیە حەز بکەی بزانی، ئاخۆ ئەم شەوە کێ دەبینی، وانییە؟"

"جەنابی لێکۆڵەرەوەی مەدەنی، بێگومان وایە."

"کەواتە هەندێکی دیکە چاوەڕێ بە. ڕاستەخۆ بۆت دەردەکەوێ."

منیش زۆرم چاوەڕێ نەکرد. هێندەی نەبرد، دەرکەی ژوورەکە کرایەوە، ئەو بە یاوەری هاوڕێیانی لێکۆڵەرەوەکە هاتە ژوور، مێجەرێکی دەزگەی ئاسایش، «دکتۆر یاکۆب شێختەر»ی هێنایە ژوور.

«د.شێختەر» لە «کراکاو»، یەکێ لە سەرکردەکانی پارتی ڕێڤیژیۆنیست بوو. دواندەرێکی بەناوبانگ بوو، هەر یەک دوو هەفتە بەر لەوەی خۆم بەرەو پیری بانگهێشتنامەی شارەوانی «ڤیلنا» بچم، گیرا بوو. بەر لە گرتنی ئەو، یەکە بەیەکی سەرکردەکانیان گرتبوون، ئەندازیار «شێسکین» و «داڤید کنۆل»، هەردووکیان سەرکردەی «بیرت ها چایال» بوون، ئەو ڕێکخراوە جەماوەرییەی جووە دێرینەکان، ئەوانەی لە ژێر ئاڵای ژابۆتنسکیدا گردببوونەوە.

دوای ئەوە بۆم دەرکەوت، هیچ کامێک لە بیچمە سەرەکییەکانی بزووتنەوەکەمان لە «ڤیلنا» نەگیرابوون، لە کۆتاییدا ئەوان بە شێوەیەکی تەواو قاچاغ، لە ڕێی «مۆسکۆ» و «ئۆدێسا»وە دەربازببوون و گەیشتوونەتە فەلەستین. پێموابوو دەستی دەرفەت، کە هەندێ جار لە ناو دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی یەکلاکەرەوەیە، دەستی لەو شتەدا هەبوو. ئەو کەسانە بۆ بەشێکی زۆر ناسراو بوون، برادەرەکەشم، باوکی «داڤید یوتان» لە لایەن دەزگەی ئاسایشەوە بانگکرابوو - ئەمەش بەر لەوەی من بگیرێم - پێیگوترا بوو، دەبێ کوڕەکەی لە ماڵ چاوەڕێ بکا، چونکە بەدوایدا دەنێرن. «داڤید یوتانیش» بۆ یەک دوو ڕۆژ چاوەڕێیکردن، کەچی ئەوان هەرگیز بە دوایدا نەچوون و قەتیش بانگیان نەکرد ...

کۆبوونەوەی ژووری لێکۆڵینەوەکە لە نێوان «د. شێختەر» و من زیاتر ئەوی سەرسامکرد. هەرچەندە نەشمزانی ئاخۆ بۆچی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە، پێشتر دەمزانی دکتۆر گیراوە. «شێختەر»یش بە ڕۆڵی خۆی، هیچ شتێکی سەبارەت بە گرتنی من نەدەزانی، ئیدی لێرە من بە تەواوی شکۆمەندی زیندانییەکی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لەبەردەمیدا قیت دانیشتبووم.

هەردوو لێکۆڵەرەوەکە بە شێوە فەرمییەکی تەواوعەیارەوە لەگەڵمان جووڵانەوە. ئاگاداریان کردینەوە، نابێ لەگەڵ یەک قسە بکەین، بەڵکو تەنیا لە کاتی پرسیاردا وەڵام بدەینەوە. بەڵام بە گشتی و سەرباری گرنگیدان بە بۆنەی ڕووبەڕووکردنەوەکە، ئەو دانیشتنەی نێوان دوو زیندانییەکە هیچی بۆ دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی تێدا نەبوو.

ئەوان بە نۆرە پرسیاریان لێکردین، ئاخۆ کێ لە بەدەستهێنانی ڤیزای فەلەستین بۆ ئەندامانی بزووتنەوەکە (هەندێکیان بەر لە شۆڕش لە لیتوانیا و هەندێکیشیان پاش شۆڕشەکە) بەرپرسیارە. سەروسەودای ڤیزادانەکە دوای ئەوەی حکوومەت درایە دەستی یەکێتیی سۆڤیەت. هەمووشی بە زانیاریی ئەوانەوە دەرچووبوون. لە ڕاستیدا هەموو شتێک قانوونییانە بوو و کەسی لەسەر نەدەگیرا. بەڵام کاتێ تۆ گیرای، تاوانەکەت ئەوە بوو: هەوڵتداوە لە یەکێتیی سۆڤیەت هەڵبێی و پیلانت بۆ هەڵاتنی ئەوانی دیکە داڕشتووە.

لە وەڵامی پرسیاری لێکۆڵەرەوەکاندا گوتم، من بەرپرسی زانیارییەکانی ڤیزاکان بووم لە نووسینگەی فەلەستین لە «کنۆڤۆ»، دواتر بۆ ماوەیەکیش لەژێر دەسەڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتیدا بوو و سەلماندنەکەشی هەر لەسەر ناوی من بوو، چونکە من بەرپرسی بێتار بووم. «د. شێختەر»یش لە وەڵامدا گوتی، ئەویش دەستی لەو پرسەدا هەبووە. ئێمە هەردووکمان هەمان ڕاگەیانراوی خۆمان

دووبـــــارەكردەوە. وەلامەكانمـــــان لە ژوورەكەدا نووســــــرانەوە، ڕووبەڕووبوونەوەكە كۆتاييهات.

باشە ئەوان بۆ وەهايان كرد؟ تا ڕۆژی ئەمڕۆش نەمتوانی شتێک بڵێم. تۆ بڵێی ئەوان هیوایان بەوە هەبووبێ، ئێمە لە ژوورەكەدا دژی یەكدی بوەستتنەوە، یەكدی بەو كارانە تاوانبار بكەین، كە لە بەرچاوی دەزگەی ئاسایش بەدبوون و لەبەرچاوی خۆشماندا كاری باش بوون؟ تۆ بڵێی ئەوان چێژیـان لەوە وەرگرتبـێ، زینـدانییان تێكبەربـدەن و لەگەڵ یەک بكەونە مشتومڕ؟

خۆ ئەگەر ئەوان هیوایان لەسـەر ئەوە هەڵچنی بووبێ، ئەوا بێ ئومێد بوون. بەڵام لەوانەیە ئەو ئەگەرە هەبووبێ، ئەوان بۆیە ئەو دیدارەیان ڕێكخســـتبێ، چـــونكە یەكێـــک لە نەریتەكـــانی دەزگەی ئاسایشـــی كۆمۆنیســـتی ســـۆڤیەتی وەهـــا بـــووبێ؟ ئـــاخر ئەوەش ڕاســـتییە كە ڕووبەڕووبوونەوە یەكێ لە شێوازەكانی لێكۆڵینەوە بوو. هەندێک جار ئەنجامیشی دەبوو؛ یەكێک شاهیدی لەسەر ئەوی دیكە دەدا. بێگومان هەمیشـــە ئەم حـــاڵەتە خۆشـــییەكی بـــێ هاوتـــای بە دەزگەی ئاســـایش دەبەخشی، كە سەیری بابا بەدبەختەكان بكەن ...

كۆبوونەوە لەگەڵ «شێختەر» تەواو بوو. ئێمە خواحافیزیمان لێككرد و نیگاكانیشمان لە وشەكانمان ڕەوانتر بوون. دیسان یەكدی دەبینینەوە ... ڕۆژ هەر هەڵدێتەوە ...

٨

# دانپێدانان یان ئاشکراکردن

شـەوێکیان بەر لەوەی بچینە سـەر تەختەنوسـتنەکان و لێیڕابکشـێین، منیان بۆ ژووری لێکۆڵینەوە بانگکرد. پێدەچوو دوادانیشتنم بێ لەگەڵ لێکۆڵەرەوەکە.

"ئەم شـەو،" لێکـۆڵەرەوەکە وەهـای پێگـوتم؛ "ئـێمە دەگەیـنە دەرەنجـامی لێکـۆڵینەوەکە. لێـرەدا کـاری مـن لەگەڵ تـۆ تەواودەبـێ. ئەوەی هێشـتا ماومانە تەواوکردنی کۆنووسەکەیە."

منیش لێمپرسـی: "جەنـابی دادوەری مەدەنـی، کەی وادەی دادگەیـیەکەم دێ؟"

ئەمجارەیان پێینەگوتم پرسیاری بێ سەروبەر نەکەم. بە لێتێگەیشـتن و لوتفەوە وەڵامی دامەوە.

"ئەمەیان بە پەیوەندی بە منەوە نییە. ئەرکی من ئەو لێکـۆڵینەوەیە بـوو. ئەوانی دیکە ڕۆژی دادگەییەکە دادەنێن.." ئەم قسـەیەی کـرد و سـەری بەسـەر کاغەزەکانـدا گـرت و شـتێکی نووسـی، ئینجـا کـورتەدەقێکی بـۆ خوێندمەوە:

"مـن دانـی پێـدادەنێم تاوانبـارم بەوەی سـەرۆکی ڕێکخـراوی «بێتـار» بـوومە لە پۆلۆنیـا و بەرپرسـیاری کارەکـانی بێتـارم، داوام لە گەنجـانی جوو کردووە بێنە ڕیزی «بێتار»ەوە."

"تکـایە لە خـوارەوە واژۆی بـکە." لێکـۆڵەرەوەکە ئەمەی بە ڕێـزەوە پێیگوتم، ئینجا دەکرێ بگەڕێیتەوە ژوورەکەت. بەم جۆرە لێکۆڵینەوەکە کۆتایی هات."

منـیش هەڵمـدایێ؛ "جەنـابی دادوەری مەدەنـی، تـۆ هەمـوو شـتێکت دەقـاودەق نووسـیوەتەوە، هەڵـبەتە منـیش واژۆیـدەکەم، بەڵام دەمەوێ داوایەکت لێبکەم، یەک گۆڕانکاری لە وشەکەدا بکەی."

"چ گۆڕانکارییێک؟ دیسان گۆڕانکاری! چییە، خۆ سادە و ڕەوانە!"

"ئەوە ڕاسـتە، گۆڕانکـارییەکە تەنیـا لە ڕسـتەی یەکەمە، لە بـری ئەو ڕسـتەیەی وەهـا دەسـتپێدەکا ' مـن دانـی پێـدادەنێم کە تاوانبـارم بە' ... تکایە بکرێتە، ' من ئاشکرایدەکەم کە من وابوومە .... باقی ڕستەکان بێ خەوشن و منیش ئامادەم واژۆیبکەم."

سەرەتا لێکۆڵەرەوەکە تێنەگەیشت.

"مەبەسـتت چیـیە، کە نەنووسـم مـن دانـی پێـدادەنێم؟ ئـاخر خـۆ هەر بەخـۆت دانت پێدانا، کە سـەرۆکی جووڵانەوەکەتـان بـووی لە پۆلۆنیـا، هەر بەخـۆت گوتـت، کە تـۆ بەرپرسـیاری هەمـوو چالاکییەکـان بـووی، هەر بە خۆشت گوتت، تۆ بەنێو شـارەکانی پۆلۆنیا گەڕاوی بۆ ئەوەی کۆبوونەوە لەگەڵ لاوانی جووی ڕێکخراوەکەتدا بکەی. ئەدی من چیم نووسـیوە؟ مـن هەر ئەوەم نووسـیوە، کە گوتـووتە، کەواتە بـۆ چـی گۆڕانکاری بکەم و جارێکی دیکە دانەیەکی دیکەی لەبەر بنووسمەوە؟"

"جەنابی دادوەری مەدەنی،" هێشتا هەر هەوڵم دەدا بۆی ڕوونبکەمەوە؛ "من هیچ گلەییم لە وشەکانی نێو ڕستەکان نییە. من گوتوومە، کە سەرۆکی «بێتار» بوومە لە پۆلۆنیا و دیسان دووپاتی دەکەمەوە و ئامادەشم کۆنووسەکە لە هەر کاتێکدا واژۆبکەم. بەڵام ناتوانم ئەو ڕاگەیانراوە بەوە شێوەیەی نووسراوە؛ ' دانی پێدادەنێم کە تاوانبارم بە' واژۆ بکەم ... بۆ من ڕوونە، لە چاوی تۆش ئەمە تۆمەتبارکردنێکی کوشندەیە، بەڵام لە چاوی من هیچ تۆمەتبارکردنی تێدا نییە. بە پێچەوانەوە، من دەزانم لەپێناو گەلەکەم ئەرکی خۆم بەجێهێناوە؛ ئەوەش ئامانجم بووە لە ژیان. لە بەردەم دادگەییەکەش هەوڵدەدەم شتەکە ڕوون بکەمەوە."

هێشتاش لێکۆڵەرەوەکە لێمتێنەگەیشت. لە بەشی سەرەتای ئەو گفتوگۆیەماندا و لە ڕەفتارەکەی بۆم دەرکەوت، هەستم کرد لێکۆڵەرەوەکە وەها خۆی دەرناخا کە لێی تێنەگەیشتبێ، بەڵکو هەر بە ڕاستی ئەو "تەلمودیزم"ـە نوێیەی منی بۆ قووت نەدەدرا. وشەکانی: "من دانی پێدادەنێم کە تاوانبارم بە ..." دیاربوو کارێکی ڕۆتینی ئەو بوو بۆ کۆنووسنووسینی لێکۆڵینەوەکان. کەواتە بۆچی لە پڕێکەوە پێشنیازی گۆڕینی بۆ بکەم؟"

"دەی پێم بڵێ،" لێکۆڵەرەوەکە وەهای پێگوتم بێ ئەوەی لێم تووڕە بێ؛ "ئایا تۆ سەرۆکی بێتار بووی لە پۆلۆنیا، یان تۆ بەرپرس نەبووی؟"

"بەڵی، من بەرپرس بووم."

"کەواتە تۆ چیت لە من دەوێ؟ کە تۆ هەو بووی - واتای ئەوە دەگەیەنێ تاوانباری!"

"نەخێر، جەنابی لێکۆڵەرەوەی مەدەنی. تاوانبار نیم. ئەمەش هەموو ئەو جیاوازییەی نێوانمانە. لە چاوی تۆ، زایۆنی بوونم، ئەندامێتی بێتار،

تاوانبـاربوونی مـنه. بـۆ منـیش، ئەوە خزمەتێکـی گەلەکەم بـوو. مـن تێدەگەم، دادگە بەگوێرەی قانوونی سۆڤیەتی دادوەریم بەسـەردا دەکا، لەوانەشــە حیســابی هەســتی مــن نەکــا لەو بــارەیەوە و بەهەنــدی هەڵنەگرێ. من خۆم لەسەر ئەو ئەگەرە ڕاهێناوە. بەڵام تۆ دەتەوێ من، بە ســەلماندنی خــۆم، "مــن تاوانبــارم" واژۆبــکەم. نــاتوانم ئەمە بــکەم، چونکە ئەوەم نەسەلماندووە کە تاوانبار بم."

خەریکبوو لێکۆڵەرەوکە لێم توورە ببێ.

"کەواتە، واژۆی مەکە!" وەهــا هــاواریکرد. "ئایــا پێتــوایە پێویســتم بە واژۆی تـۆ هەیە؟ دەتـوانم ئەو کۆنووسـە بە بێ واژۆکردنیشـت بـدەمە دادگە."

منیش هیچم نەگوت.

لێکۆڵەرەوەکە بیرۆکەی خۆی گۆڕی.

"بەڵام مــن هەمیشــە بەم شــێوەیە تۆمارنــامەکە دادەخەم، ئێســتاش دەمەوێ کۆتـایی بەو کۆنووسـە بێنم. باشـە بـۆچی واژۆی نـاکەی؟ مـن تەنیا ئەوەی گوتووتە، نووسیومە. بۆچی واژۆی ناکەی؟"

دیســـان ڕوونکـــردنەوەم دایەوە. ئەویـــش چیـــرۆکەکەی خـــۆی دووبارەکردەوە.

بێهـوودە بە ڕووسـیە شـڕەکەم بە دوای وشــەی نوێـدا گەڕام، تـا بە شێوەیەکی جیاوازتر، ئەوەی پێشتر دەرمبڕیبوو، بیڵێمەوە.

ئینجا ئەو کەوتە هەڕەشەکردن.

منیش لەناوخۆمدا گرمۆڵە ببووم. "ئەمە کاتی دادگەییە،" وەهـام بە خـۆم گـوتەوە. "بەڵکـو تـاقیکردنەوەیەکی یەکـلاکەرەوە بـێ. ئەگەر لێیـدەرباز

نەبم، ئەوا هیچ واتایەک بۆ ژیان نامێنێتەوە. ئاشکراکردنی تاوانباربوونی خۆم بەوەی سەرۆکی «بێتار» بووم؟ نەخێر، نا، لە ژێر هیچ بارودۆخێکدا! دەی هەرچی دەکا با بیکا، من واژۆی ناکەم."

لە خودا پاڕامەوە بەڵکو لەو کاتە پێویستییەدا بە هانامەوە بێ. ئاگاشم لێنەبوو وشەکانی دوعاکەم بە دەنگەوە گۆکردن.

ئیدی لێکۆڵەرەوەکە بەسەرمدا قیژاندی: "ئەوە چیت گووت؟"

"جەنابی دادوەری مەدەنی، هیچم نەگوت."

مەبەستت چیە کە هیچت نەگوت؟ ئایا لە ڕووی من درۆ دەکەی؟ چۆن، خۆ گوێم لێبوو قسەت دەکرد."

"من هیچم نەگوت. لەگەڵ خۆم دەدوام."

لێکۆڵەرەوەکە لە قرتەی پێکەنینی دا.

"سەیریکە،" بە تەوسەوە پێیگوتم، "وا خەریکە لەگەڵ خۆی قسە دەکا! ئەرێ قەت پارێزەرێکت دیوە لەگەڵ خۆی بدوێ! قسە لەگەڵ خۆت مەکە." بە بێزراوییەوە گوتی؛ "باشتر وایە بە گوێم بکەی. پێت دەڵێم پێویستە ئەم کۆنووسە واژۆ بکەی، دەنا خراپت بەسەر دێ."

وشە گاڵتەجاڕییەکانی ئازاریاندام، بەڵام هیچ بەرتەکێکم نەبوو. لە ڕاستیدا خۆشیم بەوە هات، کە کەشەکە هەندێک سووکتر بووەوە.

"جەنابی دادوەری مەدەنی،" منیش وەها تێهەڵچوومەوە؛ "داوات لێدەکەم لێم تێبگەی، کە من دان بە وشەی 'تاوانبار'دا نانێم. خۆ هەموو ئەو شتەی داوات لێدەکەم، تەنیا ئەوەیە ئەو دوو وشەیە لە پوختەنامەی نووسینەکەت بگۆڕی. بۆ من ئەو شتە زۆر گرنگە، بەڵام ئایا گرنگییەکەی لە چاوی لێکۆڵینەوەکەدا چییە؟ خۆ لە هەموو بارێکدا،

هەموو شتەکان دەچنە بەردەم دادگە، ئینجا دادوەرەکان ئەو کەسانەن، کە بڕیاردەدەن، تاوانبارم یان نا."

"خۆ تۆ ئەوەم فێر ناکەی ئاخۆ چی لە ڕوانینی لێکۆڵینەوەدا گرنگە! دیسان بە لۆژیکەوە ئامۆژگاریت دەکەم: واژۆی بکە و لێکۆڵینەوەکەش کۆتایی پێ دێ، ئیدی بە سەلامەتی لە ژووره زیندانییەکەت دادەنیشی."

"جەنابی دادوەری مەدەنی، ناتوانم. من دڵنیام، ئەگەر هاتوو واژۆی بکەم، زۆر شت لە دەستدەدەم، تەنانەت لە ڕوانگەی تۆشەوە. هەر چۆنێک بێ، خۆ تۆش ئایدیالیستێکی ..."

"من ئایدیالیست نیم." لێکۆڵەرەوەکە یەکسەر قسەی پێبڕیم و بە تەوسەوە گوتی؛ "من کۆمۆنیستم و ماتریالیزمی مێژوویيش ئەو شتەیە کە لای من دەیخوا."

"نا، نەخێر،" خێرا بەدحاڵیبوونەکەم ڕاستکردەوە و گوتم؛ "مەبەستی من ئاماژە نەبوو بۆ کێشەی فەلسەفی ئایدیالیزم و ماتریالیزم. مەبەستم ئەوەبوو بڵێم، بە خاترجەمییەوە تێدەگەی، کە سەرمەشقی نموونەیی چییە، واتای ئامانجی بەرز چییە. ئەی تۆ ئامادە نیت، ژیانت بۆ نموونە پێشەنگی خۆت بە قوربان بکەی؟"

"پرسیارەکەت بێ مێشکانەیە. هەڵبەتە، خۆ ئەگەر داوام لێبکرێ وەها بکەم، ئەوا لەهەر ساتێکدا ئامادەم گیانم بۆ سەرکەوتنی شۆڕش، بۆ وڵاتی سۆڤیەت بەختبکەم."

"چاکە، منیش هەر ئامادەم."

"ئامادەی بۆ چی؟"

"بۆئەوەی گیانم لە پێناو نموونەسەرمەشقی خۆم دابنێم."

"باشە تۆ چ نمونەیەکی سەرمەشقت هەیە؟ ئایا ئەو شانۆ گاڵتەجارییە بووکەڵەییە نمونە سەرمەشقە؟ باشە تۆ چۆن لە نمونەسەرمەشق گەیشتووی؟ تەنانەت ئەوەی تۆ، هی ئەوەی نییە تاڵە موویێکیشی بۆ بە قوربان بکەی، کەچی ژیانی تۆ قەیناکا. کێ ژیانی تۆی دەوێ؟ خۆ تۆ گەنج و ڕۆشنبیری. خۆت گوتت دەتەوێ خزمەتی گەلەکەت بکەی. خۆ تۆ تا ئێستا خزمەتی گەلەکەت نەکردووە، بەڵکو خزمەتی دوژمنی گەلەکە و دوژمنی مرۆڤایەتیت کردووە. ئەوەش ڕاستە کە تاوانەکەی تۆ زۆر گەورەیە، من ناتوانم بڵێم ئاخۆ دادگە چ بڕیارێکی لە بارەوە دەدا، بەڵام ئەگەر تۆ وەک پێویست هەڵسوکەوت بکەی، ئەگەری ئەوە هەیە دەرفەتێکت پێبدرێ کاری باش بۆ گەلەکەت بکەی. بێگومان، سەرەتا تۆ دەبێ بخرێیتە بن قۆناغێکی پەروەردە و نۆژەنبوونەوەی پەروەردە."

"بە یارمەتی یەزدان،" نیوەی قسەکەم بۆ خۆم بوو کە گوتم، "بەڵکو هێشتا بمەوێ کار بۆ گەلەکەم بکەم."

"خودا؟ ئایا باوەڕت بە خودا هەیە؟"

بێ نیازانە بابەتەکەم گۆڕی. پێشم خۆش بوو کە گۆڕا.

"بەڵێ، هەڵبەتە بڕوام بە خودا هەیە."

"من دەبینم لەم بارەیەشەوە تۆ پێویستە سەرلەنوێ پەروەردە بکرێیتەوە. بەڵام پێویستە ئەوە بڵێم، ئەم قسە پووچانەم لێ چاوەڕێ نەدەکردی هەی مێناحیم وۆلفۆڤیچ. باشە چۆن بڕوات بە خوا هەیە؟"

"من مامۆستای زانکۆم بینیون بڕوایان بە خوا هەبووە. زانای مەزنیش هەن بڕوایان بەخوا هەیە،"

"قسەی قۆڕ! ناکرێ زانا بڕوای بە خوا هەبێ. ئەوانەی تۆ ئاماژەیان پێدەکەی، کە باوەڕیان هەیە، ئەوانە مووچەخۆری دەستی بۆرژووازیەتن. ئەرێ هەر بەڕێکەوت، دەکرێ پێمبڵێی بۆچی بڕوات بە خودا هەیە؟"

"ئاخر ئەوە بۆ ڕوونکردنەوە، شتێکی سەختە، هەی جەنابی دادوەری مەدەنی. باوەڕ شتێک نییە، مرۆڤ بە شێوەیەکی ئاوەزمەندانە ڕوونیبکاتەوە."

"شتەکە ئەمەیە. باوەڕبوون بە خودا، شتێکە کە دژبەری ڕووناکبیریی ئادەمیزادە، کەواتە چۆن بڕوات پێی هەیە؟"

"باوەڕبوون شتێکی دژبەری ڕووناکبیری نییە؛ بەڵام پیاو لە ڕووناکبیری، لە تێگەیشتنی خۆیدا ناتوانێ هەندێ شت بە شێوەی ئاوەزمەندانە تێبگا، بەم جۆرە باوەڕ بە هێزێکی باڵاتردەکا."

"ئایا شتی وا هەیە کە مێشک تێی نەگا؟ شتی وا لە گۆڕێدا نییە! دەکرێ لە زانستدا وەڵام بۆ هەموو شتێک هەبێ."

"هەمووی وەک یەکە، هێشتا زانست نەیتوانیوە کێشەی ژیان و مردن چارەسەربکا."

"کێ ئەو شتانەی بە تۆ گوتووە؟ زیندەوەرزانی هەموو شتێکی پەیوەندیداری بە ژیان و مردن لێکداوەتەوە."

"من مەبەستم پێواژۆی ژیان نییە، بەڵکو مەتەڵی ژیانە. ئاخۆ ژیان لە کوێوە هاتووە؟ خۆ من باسی پەرەسەندنی زیندوەرزانی ناکەم، بەڵام ئەوەی پێیدەڵێن "هۆکاری سەرەتایی" ئیدی زانست ناتوانێ ڕوونیبکاتەوە. دیارە من بایی پێویست نەمخوێندووە تا ڕوونکردنەوەی

زانستی بزانم. هەرچۆنێک بێ، ئەوە دەزانم، زانست شتی مەزنی بەدیهێناوە، بەڵام ناتوانێ شتێکی مردوو زیندوو بکاتەوە."

"ئەوە تۆ باسی چی دەکەی؟ هیچ شتێک نییە زانست ڕوونی نەکاتەوە. هەڵبەتە پرسەکە پرسی پەرەسەندنە. دوو سەد ساڵ، تەنیا دوو سەد ساڵ بەر لە ئێستا، مرۆڤ لەوەی ئێستا کەمتری دەزانی. ئێمەش شت زیاتر دەزانین لەوانەی سەد ساڵ بەر لە ئێمە ژیاون. زانست لە پەرەسەندندایە. ڕۆژی ئەوەش دێ هیچ تەلیسمێک بۆ زانست نەمێنێتەوە. من بڕوام بە زانستە، هەر بۆیەشە بڕوام بە خودا نییە. تۆ باسی مەتەڵی ژیانت کرد. ئایا دەزانی، زانستی داودەرمان لە یەکێتیی سۆڤیەتدا، لەوەدا سەرکەوتووە مردوو زیندووبکاتەوە؟"

"نەخێر. من شتم لەو بارەوە نەخوێندۆتەوە."

"چاکە، من وا ئەو ڕاستیەت پێدەڵێم. بۆخۆم خوێندوومەتەوە، بە نەشتەرگەری دڵ، ژیانیان بۆ کەسی مردوو گەڕاندۆتەوە. ئەوەش ڕاستە کەسەکە پاش نەشتەرگەرییەکە زۆر نەژیا، بەڵام خۆ ئەوە تەنها سەرەتایە. من خاترجەمم، کە زانست ئەو کێشەیە چارەسەر دەکا. هەر بەڕاستی، پێمخۆشە و بە پێویستی دەزانم شت لەو بارەیەوە بخوێنیتەوە؛ من دەزانم لە چ جیهانێکی خۆشگوزەراندا بووی تاکو ئێستا. ئەگەر هاتوو ئەو گوتارەم دۆزیەوە، بۆت دەنێرمە ژووری زیندان. ئایا ڕێگەپێدراوی لە زیندان شت بخوێنیتەوە؟"

"نەخێر، هێشتا هیچ کتێبیان بۆ نەهێناوین. هەروەها دوو کتێبەکەی خۆمیشیان بۆ نەگەڕاندوومەتەوە."

"ئۆو، بەڵێ. زیندانییەکان تەنیا دوای بە ئەنجامگەیاندنی لێکۆڵینەوە، دەتوانن بخوێننەوە."

نەرمونیـانی و کەیفخۆشییەکەشـی بە هەمـان شـێوە کتـوپڕییەکەی دەستپێکرد، ڕەویەوە.

ئەمجارەیـان بە توندییەوە گـوتی: "بەسـیەتی فەلسـەفاندن. کاتێـک لێکـۆڵینەوەکەت کۆتاییهـات، کتێبەکـان وەردەگـریتەوە. بەڵام خـۆت کەللەڕەق کردووە و ناتەوێ کۆنووسەکە واژۆ بکەی."

"جەنابی دادوەری مەدەنی، خۆ من دەمەوێ واژۆی بکەم، بەڵام داوات لێدەکەم دوو وشە، هەر تەنیا دووشەی لێ بگۆڕی."

"هاتیەوە سەر بەزمەکەی خۆت؟ چی بگۆڕدرێ؟ پێویستە چی بگۆڕم؟ خـۆ مـن کتومـت قسـەکانتم نووسـیوەتەوە. خـۆت گوتـت سـەرۆکی «بێتار» بووی لە پۆلۆنیا، منیش هەر ئەوەم یاداشتکردووە."

"بەڵێ، بەڵام من تاوانبار نیم."

"ئاها، ئاوا، تۆ تەواو تاوانباری! تەنانەت خۆشت بە خۆت نازانی ئاخۆ چەند تاوانباری!"

بەم جۆرە بەڵگەوبەندەکان بۆ چەندین سەعات درێژەیان کێشا، هەڵبەتە بە پـلە و ئاسـتی هەمەچەشـنە، بە هەڕەشـە و مەرایـی، بە دووبارەکردنەوەیەکی هەراسانی هەر هەمان هۆ."

ئینجـا لە هـیکەوە دەرکەکە کـرایەوە و هـاوڕێیەکەی لێکـۆڵەرەوەکە، مێجەری دەزگەی ئاسایش وەژوور کەوت.

لێکۆڵەرەوەکە پێی گوت: "ئەرێ سەبارەت بەو شتە چی دەڵێی؟ واژۆی ناکا."

"چی واژۆ بکا؟" مێجەرەکەش بێوەییانە لێیپرسییەوە.

"کۆنووسەکە."

"چی؟" ئینجا مێجەرەکە ڕووی لە من کرد. "دەبینم دەتەوێ ڕۆڵی پاڵەوان ببینی. ئێمە پێشتر ئەو جۆرە پاڵەوانانەمان بینیون. من ئامۆژگاریت دەکەم، بۆ خۆت باشە، واژۆی بکەی. بە گشتی تۆ بەختت هەیە، کە لێکۆڵەرەویەکی دادوەری وەهات هەیە. چما واژۆی ناکەی؟"

"جەنابی دادوەری لێکۆڵەرەوە،" منیش پێم گوتەوە؛ "من پاڵەوان نیم و ڕۆڵی پاڵەوانانەش ناگێڕم. پرسەکە پرسی باوەڕە. من ئەمە واژۆ ناکەم، کە بڵێم تاوانبارم، چونکە بڕوام بە نموونە پێشەنگی خۆم هەیە."

"ئەوە باسی چی دەکا؟" مێجەرەکە ڕووی پرسیاری لە لێکۆڵەرەوەکە کرد.

لێکۆڵەرەوەکەش دەقەکەی بۆ خوێندەوە و ئەوەشی خستەسەر: "نایەوێ واژۆی لەسەر بکا."

"تۆ ڕەتیدەکەیتەوە واژۆ لەسەر ئەمە بکەی؟" دیسان مێجەرەکە ڕووی پرسیاری لە من کردەوە؛ "بۆچی؟ خۆ ئەوە ڕاستییە. چۆن دەتوانی شتێک ڕاستی بێ و واژۆی لەسەر نەکەی؟"

خەریکبوو ئەو هۆکارانەی بۆ دووبارە بکەمەوە کە بۆچی واژۆی ناکەم - هەر خواش دەزانێ چەندین جارم گوتبووەوە! بەڵام لەو ساتەدا بیرۆکەیەکی دیکەم بۆ هات و منیش یەکسەر گوتم، وەنەبێ هەر لەبەر ئەوەی لە ڕوونکردنەوەی پێشووترم ماندوو بووبم، بەڵکو بیرۆکەیەکی قانوونیانەی دروست بوو.

"جەنابی دادوەری مەدەنی،" بەم جۆرە کەوتمە قسە؛ "هەر ساتێک ئامادەم کۆنووسەکە واژۆبکەم، بەڵام چۆن ئەوە واژۆبکەم کە بڵێم من تاوانبارم؟ من دەمەوێ بەرگری لەخۆم بکەم، پێشمومایە مافی بەرگری

لەخۆکردنم هەیە. کاتێک دەچمە بەردەم دادگە، هەوڵ دەدەم بیسەلمێنم تاوانبار نیم. ئەوەش دەبێتە بەرگری لەخۆکردنم، تاکە بەرگری لەخۆکردنم دەبێ. بەڵام چۆن دەتوانم لە دادگە بەرگری لەخۆم بکەم، ئەگەر پێشوەختە دانم بەوەدا نابێ، کە تاوانبارم؟"

کاتێک گوێی لەم قسەیەم بوو، مێجەرەکە شتێکی نە بە من، نەبە هاوڕێکەی نەگوت، بەڵکو بەخۆی گوتەوە: "دادگەیی! سەکۆی دادگەی بدەیتێ، سەکۆیەکی بۆ لەبلەبانیی بدەیتێ!'

ئینجا پرسی: "دەتەوێ قەناعەت بە کێ بێنی؟ ئێمە؟ (چیکیست) ئاسایشە دێرینەکان؟"

لەو کاتەی گیرابوم، یەکەمین جارم بوو گوێم لە وشەی کۆنینە بێ کە وشەیەکی سامناک بوو: چیکیست (ئاسایشی دێرین)! ئای بە چ شانازییەکەوە وشەکەی گۆ کرد! بەڵام چیکیست شتێکی لەوە گرنگتری گوتبوو. ئەو بەڵێنی هاوڕێکەی دووبارە نەکردەوە بەوەی کە دادگە لە گۆڕێدایە. ئەو گوتی: "دادگە' دەی سەکۆیەکی بدەرێ!'

ئینجا مێجەرەکە ژوورەکەی بەجێهێشت، منیش بە تۆنە دەنگێکی قێزەون و نامرادانە بە لێکۆڵەرەوەکەم گوت: "جەنابی دادوەری مەدەنی، چەندین جار پێتڕاگەیاندم، کە دادگە لە ئارادایە، هەنووکەش لە مێجەرەکە تێگەیشتم، هیچ شتێکی وەها لە ئارادا نییە."

لێکۆڵەرەوەکە بە گەرمییەوە وەڵامی دامەوە: 'من لێکۆڵەرەوەی تۆم. من پێمگوتی دادگە هەیە، کەواتە دادگە دەبێ! بەڵام سەرەتا ئێمە دەبێ لێکۆڵینەوەکەمان تەواوبکەین. دەی پوختەکە واژۆ بکە و با کۆتایی پێبێ."

لەو کاتەوە چیدیکە لێکدانەوەی ئایدیۆلۆژیانەم بەکارنەهێنا. قەناعەتە قانوونییەکەم دووبارەکردەوە: ئەگەر هاتوو تاوانباربوونی خۆم واژۆبکەم، چی بۆ دادگە دەمێنێتەوە؟

بۆ نزیکەی هەموو شەوەکە، ئەرگومێنت سەبارەت بە دوو وشەکە لە نێو پوختەی کۆنووسکە هەر لە گفتوگۆدا بوو. لە کۆتاییدا لێکۆڵەرەوەکە گوتی:

"تۆ ئازاری خۆت دەدەی. تۆ وام لێدەکەی نەخۆش بکەوم، تۆ هەروەک مەیمونێک وای، هەرگیز منیش نامەوێ جارێکی دیکە بتبینمەوە. من وشەی دانپێدانانەکە ڕەشدەکەمەوە و وشەی: ئاشکرای دەکەم ... ئیدی بەم جۆرە ..."

منیش کەیفم پێهات. هیچی دی گوێم بەو شتە بێ بایەخانە نەدایەوە.

لەبەر نزیکی هەردوو زمانی پۆلۆنی و ڕووسی لە یەک، توانیم لە جیاوازی کەم نێوان وشەکانی priznauio کە واتای ئاشکراکردن، ئاشکراکردنی ڕاستییەک، لەگەڵ وشەی priznaius کە واتای داننان، داننان بە تاوانی دەگەیاند. بۆیە داوام لە لێکۆڵەرەوەکەم کرد وشەی prinzaio بنووسێ نەوەک priznaius. تەنانەت خۆی لە گوورە نەبرد وەڵامیشم بداتەوە. ئەو پارچە کاغەزەی پێشوی دڕاند و دەقێکی دیکەی نوێی نووسیەوە و بەم شێوەیە بوو:

"من دانی پێدادەنێم کە سەرۆکی بێتار بووم لە پۆلۆنیا ..."

منیش بۆم دانەنەواند!

واژۆم کرد. منیان گەڕاندەوە ژوورە زیندانەکەم.

٩

# مەتەڵی دانپێدانان

بەر لە دەستپێکردنەوەی چیرۆکی زیندانیکردنەکەم، حەز دەکەم لێرەدا شتێک بڵێم، لە ناخی ئەزموونمەوە سەبارەت بە هەڵهێنانی ئەو لوغزەی، کە بۆ پازدە ساڵ و زیاتر بۆتە مەتەڵی جیهان، ئەویش مەتەڵی دادگەکانی یەکێتیی سۆڤیەتە.

پێموایە بە ئاستەم جیهان بە هاتنەپێشەوەی باسوخواسی "پیلانگێڕی" دژی یەکێک یان دژی گرووپی دەسەڵاتدار لە ڕووسیا یاخود و لە وڵاتانی هاوپەیمانی سەرسام بووە. ئاخر خۆ لە مێژووی زۆر لە وڵاتان ڕوویداوە، دەقاودەقیش وەنەبێ هەر کۆمۆنیستەکان بن، حاڵەتی پیلان بۆ ڕووخاندنی حکوومەتەکان هەبووە کە بەدەر لە فەرمانی ڕەخنە لەخۆگرتن، ڕێگەیان بە ڕەخنەگرتن لە بەرانبەر نەداوە. بە گوێرەی بەڵگەکانی «ئێدوارد بێنێس» سەرۆکی کۆچکردووی چیکۆسلۆڤاکیا، ژێرخانی وەها بۆ بیرکردنەوە هەبووە کە مارشاڵ «توکاچێڤسکی» هەر بە ڕاستی بە نیاز بووە، جۆرە "شۆڕشێکی پۆناپارت"ییانە لە یەکێتیی سۆڤیەتدا بەرپابکا. ئەگەر لەسەرێکی دیکەشەوە، ئەگەر مرۆ وای دابنێ، «زینۆڤیێڤ»، «کامێنێڤ»، «بوخارین» و «ڕیکۆڤ» کە دۆست و هاوڕێی «لینین» بوون (هەروەها ڕەخنەگریشی بوون)، گوناحیان تەنیا لەوەدا بووبێ، لەمێژبوو ستالینیان دەناسی و زیاتر باوەڕیان بە بۆچوونی خۆیان

لەوەی هــی ئەو هەبــوو، ئەوا دەبــێ ئەوە لە بیــر بکەیــن، لە مێــژوودا، هەروەهـا لە حـاڵەتی ئەندێشـەی پیلانگێڕیدا، لە لایەن فەرمانڕەوایـان بە خۆیـــان ئەو شـــتەیان ســـازکردووە و لە لایەن خۆشـــیانەوە پەردەی لەسەر هەڵدراوەتەوە هەر بۆ ئەوەی نەیارەکانیان لەناوبەرن. هەروەک «فۆشــێ» وەزیـری دامـودەزگەی پۆلیسـیی نـاپلیۆن گوتـوویەتی: "هەر وەزیرێکــی ڕێزلەخۆگرتــووی پــۆلیس دەبــێ لە نێـو کۆڵەپشــتیدا بەلای کەمییەوە یەک دوو نەخشەی پیلانگێڕی لە دژی دەوڵەت هەبێ ..."

دادگەکــان لە «مۆســکۆ» و «ســۆفیا» یــان «بوداپســت» و «پــراگ» مــایەی سەرســامین، ئەوەش وەنەبــێ هەر لەبەر تۆمەتبـارکرنەوە بــێ بەڵکو لەبەر تۆمەتبارکراوانە. چاودێرانی دەرەوەی بازنەی هەژموونی کۆمۆنیســتی، هەســتیارن یــان بە جــۆرێکی دیــکە، دەکـرێ بڕوایــان بە تۆمەتبارکردنەکانی داواکاری گشـتی «ڤیشنسکی[79]» و شـاگردەکانی هەبێ، یاخود تۆمەتبارنامەیان یەکێک بێ لە پیلانەکانی فوشێی."ئـاخر لێــرەدا ئەگەری ســێهەم نیــیە. لە هەردوو حــاڵەتەکەدا، چــاودێران - کەسانی ئازاد - وەستاون و سەرسامن و دەیانەوێ بزانن: چی بەسەر تۆمەتبارەکاندا هات؟

خۆ ئەگەر ئەوان بە ڕاست دژی دەسەڵاتدار هەڵستابنەوە، ئەگەر ئەوان بڕوایان بەوە هەبێ دەسەڵاتداران لە ڕێگەی ڕاست لایان داوە، ئەگەر ئەوان لە ڕژێمی کۆمۆنیستی بێهیوا بووبن و بڕیاریاندابێ بۆ ڕژێمێکی دیکە خەبات بکەن، یان ئەگەر هاتوو هەر بە کۆمۆنیستی مابنەوە، بەڵام بــۆ ئەوە ڕاپەڕیــبن، کە کۆمۆنیســتی ڕاســتەقینە بهێنــنەدی، هەروەک ئەوەی شـتەکە لە تـافی لاوێتیدا لە مێشـکیان چەسـپبووە، کە بە هەمـوو ژیانیــان هەمیشــە هەر خەونیــان پێــوە بینیــوە کە وای لێبــێ؛ باشــە لەو حاڵەتـدا ئەدی بـۆچی دان بە باوەڕەکانیـان نـانێن بەوەی هەوڵیـان بـۆ

[79]- ڤیشنسکی Andre Vyshinsky (١٨٨٣-١٩٥٤) سیاسی و یاساناس و دیپلۆماتی سۆڤیەتی. ڤیشنسکی بە داواکاری گشتیی جۆزیف ستالین لە دادگەکانی مۆسکۆ ناسرابوو.

داوە، بەوەی خەباتیـــان بـــۆ کـــردووە؟ زۆر لەوانەی لە ســـۆڤیەت تۆمەتبارکران شۆڕشگێڕێ دێرین بوون. زیندان، قەفەزی تۆمەتباری، ئازار و ئەشکەنجەدان و تەنانەت سێبەری مەرگیش بۆ ئەوان شتێکی نوێ نەبوو. ئەوان خەڵکانێکی بەئەزموون بوون. ئەوان شێوازەکانی جەنگی شۆڕشگێڕی فێر ببوون، ئەوان نەوەک لە "خولی ئێوارانە"، بەڵکو لە "زانکۆکان"ی ژێرزەمینی، لە ڕاوەدوونان و ژانوناسۆر فێرببوون، دەرسیان وەرگرتبوو. ئەوان لە بەردەم لێکۆڵەرەوەکان، دادوەرەکان و لە سێدارەدەرەکان زیاتر لە جارێک نەترسانە وەستابوون، ئەوان سەری خۆیان نەوینەکرد، بۆ کەمێ بەزەیی نەپاڕانەوە، بەڵکو ئەوان بۆ نموونە پێشەنگی خۆیان جەنگان. کەواتە دەکرێ بپرسین، ئەرێ گەلۆ، دوای ئەوە چی بەسەر هەر هەمان خەڵکدا هات، کە لەبەردەم لێکۆڵەرەوەیەکی "چێکا[80]"، لەبەردەم داواکاری گشتیی سۆڤیەت، لە بەردەمی جەلادی سوور ڕاوەستێندران؟ ئەرێ بۆچی دانپێدانانەکەی ئەوان هاوڕێ نەبوو لەگەڵ ڕاگەیەنراوێکی شاناز و ڕوون وەک ئاوێتەبوونی شەڕڤان لەگەڵ ئەرکەکەی، خەڵکانێک کە شەقڵیان گرتبێ: "ڕاستی لەگەڵ ئێمەدایە نەوەک لەگەڵ دەسەڵاتداران."

لە سەرێکی دیکەشەوە، ئەگەر تۆمەتبارکراوەکان قوربانی دەستی پیلانگێڕی بن، ئەگەر ئەوان هیچیان دژی حکوومەتەکانیان نەکردبێ، ئەرێ چی بەسەر باری خۆزایی و خۆپاراستنیان هات؟ باشە ئەوان هەر هەمان ڕەفتاری کە خەڵکانێک دەنوێنن کە ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە؟ ئەرێ بۆ چی ئەوان هاوارناکەن و ناقیژێنن: "ئێمە بێتاوانین جیهانیش دەبێ بزانێ ئێمە لەسەر هەقین؟"

---

[80]- چێکا Cheka ڕێکخراوێکی ڕژێمی یەکێتیی سۆڤیەت بوو تایبەت بە لێپێچینەوە لە چالاکییەکانی دژەشۆڕش. زۆر لە دوژمنە ڕاستی و ناڕاستییەکانی ڕژێمی لینینی لەناوبرد کە لە ١٩١٧ تا ١٩٢٢دا دامەزرابوو، دواتر دەزگەی OGPU جێگەی گرتەوە. وەرگێڕ.

لەساڵیادی شۆڕشەکاندا، ئەوسا چ زانستی، کۆمەڵایەتی یان نیشتمانی بــووبن، ئەو دۆخە هەر هەبــوو، کەســانێک ژیــانی خۆیــان کــردبێتە قوربــانی بیروباوەڕەکەیــان و کەســانێکیش بیروباوەڕەکەیــان کــردبێتە قوربــانی پاراســتینی ژیــانی خۆیــان. کەچــی تۆمەتبــار لە دادگەی سۆڤیەتیدا بیروباوەڕی خۆی دەکاتە قوربانی، هەر بۆ ئەوەی لە ژیاندا بمێنێتەوە. جیهانیش سەرسامە. باشە تۆ بڵێی چی ئەوانی گەیاندبێتە سەر ئەو حاڵەتە دووادنەی حاشالێکردن، ئەرێ ئەو بارە بێپێشینەیە لە مێژووی شۆڕشدا؟

هەڵــبەتە ئەوە نەتەنیــا پرســێک نیــیە، دواپرســمان نیــیە لە ڕووی ئەو دیــاردەیەی، کە ئێمە گەواهیــدەر بــووین و لە ســییەکانی «مۆســکۆ» و چلەکانی «سۆفیا» و پەنجاکانی «پراگ» ڕوویاندا. هێشتاش دەکرێ ببینە گەواهیدەر لە ...؟ دەکرێ کەسێک زیاتر بپرسێ: ئەرێ مەبەستی سیاســی "ئەنــدازیارانی ڕۆح" چیــیە کە داوای ئەوە لەوانە دەکــا بمــرن، دۆزەکەشــــیان تەنــــانەت بەر لە وەی گـــوللەی ســـۆز و بەزەیـــی لەپشتەســەریان بــدرێ، هەبــووە؟ زەحمەتــیش نیــیە وەڵامــی ئەو پرســە بــدرێتەوە. ئــاخر خــۆ دەســەڵاتدارانی مۆسکۆش دەرچــووی "زانکــۆ"ی جەنگـــی شۆڕشـــگێڕین. ئەوان ئەوە فێربـــوونە یەکـــێ لە هۆکـــارە یەکلاکەرەوەکانی جەنگ لە نێوان "زەبوون"، ئایدیالیستەکان و "بەهێز" دەسەڵاتدارەکان "شاهیدی خوێن"ی تۆمەتبارکراوەکەیە، کە ژیانی خۆی لەپێنـــاوی نمـــوونە سەرمەشـــقەکەی خـــۆی بەخشـــیوە. لەبەر ئەو شەهیدناســــــییەدا، جــــــووە بێدەســــــەڵاتەکان توانیــــــان لەبەردەم چەوسێنەرانیان بووەستنەوە؛ هەر لەبەر ئەوەش بوو، کریستیانێتی، لە بیروبــاوەڕی ئــاینزایەکی بچــووکەوە بــووە دینــی جیهــان؛ چــونکە شەهیدناسی، ڕامانی ئازادی بەسەر تیروکەوانی ستەمکارانی هەموو کیشــوەرەکان، زاڵکــرد، لەو هەمــوو ناوچانەشــدا بە هــۆی یــاخیبووە عیبرییەکانی ئێرتز ئیسرائیل، لە ڕۆژگاری هاوچەرخماندا، بەسەر هێزی داگیرکــاری بەریتــانی و ســوپاکەیدا ســەرکەوت. ئەوەش ڕێســایەکی

زێڕینــی مێــژووەوە: خــوێنی بــاوەڕداران ژیــانی بیروباوەڕەکەیــانە. دەســەڵاتدارانی مۆســکۆ دەزانــن، ئەم ڕێســایە نەوەک هەر شــتێکی بیـردۆزییە بەڵکـو ڕاسـتییە، لە ئەزمـوونی کەسـەکی خۆیـان ئەو شـتە دەزانن. هەر بۆیە ئەوان ڕێگە بە هیچ کارێکی پاڵەوانانە، ڕێگە بە هیچ شەهیدناسییەک لەسەر سەکۆی گشتی دادگەدا نادەن. بە پێچەوانەوە، سـەکۆی دادگە، تـا ئەو کـاتەی کـاری پێـدەکرێ، بـۆ تێکوپێکشـکاندنی ئایـدیۆلۆژیای شـاهیدانی خـوێنی تۆمەرتبارکراوەکـانە. مـێجەرەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش لە ژووری لێکۆڵینەوەکە بە منی ڕابوارد: "دادگەیی! دەی سەکۆیەکی بدەرێ!" بەم وشە تەوسدارانە هاوڕێی لێکۆڵەرەوەکە هۆکارە سەرەتاییەکانی سیستمی لێکۆڵینەوە و دادوەری دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ڕوونکردەوە. لێرەدا هیچ سەکۆیەک لە ئارادا نەبوو. لێبژاردەی بەردەمی تۆمەتبار ئەوەیە: دادگەیەک بە لەناوبردنێکی ئایدیۆلۆژی یان تێکشکاندنێکی دەروونەکی (سایکلۆژی) بە بێ دادگە.

دەکــرێ یەکێــک بپرســێ: ئەرێ ســەرچاوەی دنەدانــی ڕۆحــی ئەو دەســەڵاتدارانەی کـرەملین چییـە، کە بڕیارەکانیـان لێهەڵـدەهێنجن بـۆ ئەوەی دانپێدانامەی پەشیمانی بەسەر تۆمەتباردا بسەپێنن؟ وەڵامی ئەم پرسیارەش هەر ئاسانە. هەموو ستەمکارێک بە سروشت "باوکانە"یە. لەوێـدا لە نێـو گرێـی باوکەتیـدا، لایەنــی ئــایەتیی و نــایەتی هەیە. دەسەڵاتدار باوکە، بابەتەکەشی منداڵەکانن. باوکی دەسەڵاتدار سەیری منـداڵەکانی دەکـا، ئەگەر بـاش بـوون، دەسـتیان بەسـەردا دێنـێ، ئەگەر خـراپیش بـوون سـزایان دەدا. گرێـی بـاوکەتی لە ڕژێمـی سـۆڤیەتیدا گەیشــتە تــۆپکەی هەڵچــوونی خــۆی، ئەوەش لەو کــاتەی مریــد و شـاگردەکانی بەتەنیـا هەر لە کەشـوهەوای سیاسـییدا نەبوون بەڵکـو لە بـواری ئابووریشـدا هەبـوون. دەسـەڵاتدار بـاوکە، کە ڕۆزی و قـووت دابەشدەکا، نانی بندەستەکەش لە دەستی دەسەڵاتدارەکەوەیە، هەروەک ئەوەی منـداڵ لەسـەرمێز چـاوەڕێی دەسـتی باوکیـان بکـا. زانراویشـە

باوک زۆر جار خۆی تێکەڵ سزادانی کوڕەکەی ناکا، بەڵکو داوای لێدەکا دان بە هەڵەکەی خۆیدا بنێ، پەشیمان بێتەوە و داوای لێخۆشبوونیش بکا. تەنانەت لە ڕابردووی باوکە سزادەرەکانیشدا هاتبوو کە دەبێ ڕۆڵەکانیان دەستی سزادەرەکەشیان ماچبکەن.

کەواتە لەوانەیە یەکێ مشتومڕ لەسەر ئەوە بکا، ئەگەر گرێی باوکەتی لە لەلای دەسەلاتداران لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا گەیشتبێتە لوتکە؛ ئەوا گرێی تەواوکاری، گرێی منداڵی دانیشتوانی یەکێتیی سۆڤیەتیش گەیشتۆتە ترۆپکی خۆی. بەم جۆرە "منداڵە بەدەکان" دەستی "باوکەکانیان" ماچدەکەن؛ تەنانەت ئەگەر دەستەکان سزادەر، ئەشکەنجەدەر و خنکێنەریش بن. لێرەدا بێ سێودوو هەندێ ڕاستی لەبن ئەو ناکۆکبوونەدا هەیە، بەڵام هێشتاش ئەمە، دیاردەی "دانپێدانانەکان"ی ئەو کەسانە ڕووناکاتەوە، کە بە خۆیان کاربەدەست بوونە، هەندێ جار کاربەدەستی دڵڕەقیش، هەر بە تەنیا ئەوەندەش نا، بەڵکو شۆڕشگێڕەکانیش دەیانزانی، کە ژانوناسۆر چییە.

مرۆ دەبێ دان بەوەدا بنێ، ئەو دیاردەیەی ناو بەناو لە دادگەکانی یەکێتیی سۆڤیەتدا بە دیاردەکەوت، بەدەر بوو لە هزری پەسەندکراوی مرۆڤایەتی. ئاخر خۆ شتێکی ناکاو و سەرسامکەر نەبوو، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو چاودێرە بێئەزموونەی هەوڵ دەدا مەتەڵەکە هەڵبێنێ و ئەوەی لە نێو مێشکی تۆمەتبارەکەدا گوزەر دەکا بپشکنێ و بەو ئاراستەیە بڕوا کە چووەتە نێو قەڵەمڕەوی تەلیسم و بەو ئەنجامەش بگا، دەرمان بەکارهێندراوە، ئەوەش هەر بەتەنیا لایەنە زانستییەکەی لای دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ناسراوە. هەڵبەتە ئەمەش شتێکە بۆ زانست، کە دادوەری بەسەردا بکا و یەکلاییبکاتەوە. بەڵام خۆ ئەگەر کەسێکی لابەلا و ئاساییش بپرسێ: ئەرێ دەرمان هەیە یادەوەری مرۆ کارا بکات و وەهای لێبکا ناوی بیچم و نیازەکان بدا و بۆ چەندین سەعات دابنیشێ، کتومت هەر ئەو شتەی پێچەوانەی

ئەوەی بڕوای پێهەبووە بە ڕاستی زانیوە بڵێتەوە، بەڵام ئەوە هەمووی لە هۆشی وندا (عەقڵی شاراوە) نیشتۆتەوە؟ لێرەدا دەرمان هەیە کە ئیرادەی مرۆڤ ببزوێنێ؛ هەندێ کەس پێیدەڵێ دەرمانی ڕاستی. ئەرێ دەرمانی درۆش هەیە؟ من لەو بڕوایەدام، بە دەرخستنی ئەو پرسیارە زۆر کاریگەرە، ئەوەش لەپێناو ئەوەی بگەینە بەرەنجامێک کە لە چیرۆکی دانپێدانانەکانی لێکۆڵینەوەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا سامناکییێکی زۆر هەیە، لەوێدا هیچ شتێکی جادوویی لەئارا نییە.

ناکۆکبوونی من لەسەر ئەوەیە کە «فشاری ئاسایی» - ئەوەی لە ژوورەکانی لێپێچینەوەدا ئاساییە - وەک ئەشکەنجەدان بە لێدان، یان ئەشکەنجەدان بە بێ لێدان، هۆکارێکی یەکلاکەرەوە نییە لە دانپێدانانەکاندا، گومانی تێدا نییە لەگەڵ هەبوونی دژەناکۆکی (بەرپەچدانەوەی ناکۆکبوون) کە شتەکە بە مەبەست دەگا. ئەمە تەنها مشتومڕێکە. من نە ئەشکەنجەدرام نە لێشم درا. هەرچەندە بە شێوازی دیکە هەڕەشەم لێکرا بەوەی بۆچوونی لێکۆڵەرەوەکان چ لە مەڵبەندی دەزگەی ئاسایش و چ لە زیندانی «لوکیشکی» بسەلمێنم، لێ هەڕەشەکانیان نەگەیاندە سەر، تەنانەت لەو حاڵەتەی لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیشیان شکستیانهێنا. دەکرێ من بەڵگەی زیاتریش لە بەرژەوەندی دەزگەی ئاسایش بخەمەڕوو. لە ژوورەکانی زیندان و لە کۆڵیتەکانی ئۆردوگای چاکسازییدا تووشی سەدان زیندانی ئەوێ دەمێ هاتم. هیچ کەسیان لێینەدرابوو، ئەشکەنجەش نەدرا بوو. چەند کەسێکیان پێیانگوتم، بیستوویانە هەندێ لە ئەفسەرە پۆلۆنییەکان لە لایەن لێکۆڵەرەوەکانیان قامچیکوت کراون. کاپتنێکی پۆلۆنی کە لە یەکێ لە ژوورەکانی زینداندا لەگەڵم بوو، بۆی گێڕامەوە؛ شەوێک لێکۆڵەرەوەکەی لوولەی دەمانچەی لەسەر لووتی داناوە و گوتوویەتی: "دەی بۆنی بکە! دەی هەنووکە چیت لە ژێر سەرە." ساردایی لوولە ئاسنینەکە گەیشتە لێوی سەر ڕووی کاپتنەکە. ئەویش هەستی بە

ئارامی نەکرد. بەڵام لێکۆڵەرەوەکە لێینەدا، نە بە دەسکی دەمانچەکە نە بەدەست لێینەدا. دەکرێ بگوترێ بەخت یاوەری هاوزیندانەکەی لوکشکیم بوو لەو دەمەدا. ئێمە بردراینە ژووره زیندانییەکان لەو کاتەی بە شەپۆلی خەڵکیان گرتبوو. هەینێ[81] "دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی شێوازی تایبەتی "پاڵاوتنی" خۆیان بەکار نەهێنا بەڵکو هەر شێوازێکی "پاڵاوتنی" ئاسایی. بۆ بیست ساڵ «لیتوانیا» لە دەرەوەی هەژموونی دەستڕۆیشتووی سۆڤیەت بوو. ئینجا لەشکری سوور "شۆڕشی حوزەیران"ی ڕێکخست. پێ بە پێی لەشکری سوور و شۆڕش، تۆڵەستێنان و پاسەوانان جۆرێک لە ئۆپەراسیۆنی "سەرچاککردنی کۆمەڵایەتییانە"یان بە ئەنجام گەیاند. ئەو کات هیچ "دادگەیەکی پەروەردەیی بۆ خەڵک" ساز نەدرا. مەبەستیش لە گرتنەکان بۆ لەناوبردنی توێژێک لە "گومانلێکراوان" بوو لە نێو هەموو نەتەوە و چینەکان. ڕۆشنبیران، سوپای گەل، زاناکان، بەتایبەتیش بیچمە سیاسییەکان بەدبەختبوون لەوەی بە کۆمەڵ بە بێدەنگی، بێ دادگەیەکی ئاشکرا شوێنبزر کران ... هەموو ئەمەش بە سووکوئاسان لەسەر بڕیاری "کۆمسیۆنی ڕاوێژکاری" بوو، ئەوکات لە شوێنێک لە مۆسکۆ دەستبەکاربوون.

منیش زۆر بەخت یارم بوو. یەکێک بووم لەو دەیان هەزار مێگەلە زیندانیانەی، کە پێشوەخت مۆریان لەنێوچاوان درابوو، کە سەرنگوم بکرێن، ئەوسا چ بە لێکۆڵینەوە لەگەڵداکردن بێ یان بەبێ لێکۆڵینەوە بێ. لێکۆڵەوەرەکەم بۆ ساتێکیش گومانی نەبوو، کە من تاوانبار نەبووبم. لە کانگەی دڵییەوە گوتی: "تۆ هەوبووی (بەرپرسی بێتار بووی)؟ ئەمەش واتای ئەوە دەدا کە تۆ «تاوانباری»!" بە هەمان شێوەش، منیش بۆ یەک سات دوودڵ نەبووم، کە ڕاستم و لەسەر هەقم. هەڵبەتە، هەرگیز شتێکی وەهام بە مێشکدا نەهات، حاشایی بکەم،

[81]– هەینێ: ئەوکات.

که "هەوبووم" و ئەو پێلێنانەش کاریگەرییێکی تەواوعەیاری بۆ هەردووکیان هەبوو، هەم بۆ لێکۆڵەرەوەکەم و هەم بۆ بنەماکانیشی. هەرچەنده لێکۆڵەرەوەکەم هەر نەیدەویست بە تەنیا ئەوە ئاشکرابکەم که "هەوبووم"، بەڵکو دەبوو دانپیێدابنێم. که "من تاوانبار بووم." ئەو درۆشی نەکرد، که گوتی ئەوانی دیکه وەهایان کردووە. ئەفسەرانی سوپا ... سەرهەنگ (عەقید) و موقەدەمێک"[82] لە سوپای پۆلۆنی، دانپێدانانیان واژۆکرد بەوەی، ئەوان تاوانبار بوونە. کاربەدەستی پلەباڵا دانیان بە تاوانبارکردنی خۆیاندا نابوو بەوەی بە پرسی دامودەزگە، یان بەڕێوەبەر بوونە لە وەزارەتی ناوخۆی لیتوانییدا. ئەوان پوختەی کۆنووسەکانیان بە بێ ئەشکەنجەدان، بەبێ ئەوەی لێشیانبدرێ، واژۆکرد؛ ئەوەش وەنەبێ لە غافڵگیری بێ، بەڵکو لەبەر بێخەوی بوو، لەوەیان بووە هەر چۆنێک بێ لە کۆڵیانبێتەوە، بۆ ئەوەی کۆتایی بە ئەشکەنجەدانی دەروونیان بهێنرێ.

یەکێ لە هاوزیندانەکانم، که کاتی خۆی ڕائید"[83] بووەوە باشیش لەگەڵی ببومە ئاشنا، بۆی گێڕامەوە؛ ئەو تێبینی لەسەر وشەکانی نێو کۆنووسەکە هەبوو. داوای گۆڕینی کردبوو. ئەویش هەڕەشەی لێکرا و خراپ لەگەڵی جووڵانەوە، بەڵام لەسەر داواکەی هەر مکوڕبوو"[84]. ئەویش هەر ئەو کاتە کۆنووسەکەی واژۆ کرد، وشەی دانپێدانانیشیی ڕەشکردبووەوە. دیارە کارمەندانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بایەخێکی تایبەت بە جیاکردنەوەیەکی وردی نێوان "لێرەدا دانی پێدادەنێم که من وەها بووم ..." و "پێیلێدەنێم که من تاوانبارم بە ..." نادەن. دانپێدانانی بنەمایی "من هەوبووم" – که من و هەندێ لە

---

[82]– بە داخەوە لەوانەیە لە وەرگێڕانی ئەو پلە سەربازییانە دەقاودەق نەبووبم. کۆلۆنێل Colonel: عەقید؛ lieutenant colonel موقەدەم.

[83]– ڕائید: مێجەر، major.

[84]– مکوڕبوون: سووربوون.

زینـدانیانی دیـکه شـانازیمان پێـوه دەکـرد - خـرایەوه مسـتیان. هەر ئەوەش بوو، کە ئەوان پێوستیان پێ بوو.

هەڵبەتە ئەزمـوونی مـن هەمـووی تەواونەبوو. مـن نە "دانـم پێدانا" و نە "ئاشکراشـم کـرد". ئـاخر مـن نەبـردرامە بەردەم دادگە. بەڵام بـا وای دابنێین، کە لێکۆڵەرەوەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە چەند زیندانیکراوێکی تایبەت بدەن و ئەشکەنجەیان بدەن. قسەشی لەسەر نییە، لێکۆڵەرەوەکە ئامرازی وەهای هەیە تا پیاوەکە لە ڕووی جەستەییەوە تێکوپێک بشکێنێ. هیچ قانوونێکیش لە یەکێتیی سۆڤیەتدا نییە، لێدان و کوتان لە ماوەی لێکۆڵینەوەدا قەدەغەبکا. ئێ خۆ ژووری لێکـۆڵینەوەش دابـڕاوە ... یەکـێ لە کۆمۆنیسـتە گیراوەکـان، کە دواتـر باسـیدەکەم، بـۆی گێـڕامەوە کە لە ژووری لێکـۆڵینەوەی زینـدانی «تۆمسـک» چـی بەسـەرهاتووە. بـۆی گێـڕامەوە، چـۆن "شـارەزای" لێکۆڵێنەوە بە جووڵەیەکی تەڕدەستانە بازیدا و پێچکی کورسییەکەی شکاند، ئیدی هەر بە و پەلاماردانە توندوبەندەی مستی بۆ هێنابوو و بە سەریدا قیژاندبووی: "ئایا دانی پێدادەنێی یان نا، دانی پێدا دەنێی یان نـا؟" زینـدانییەکە کە سـەرکردەیەکی گرنگی سۆڤیەتیش بـوو، تەنیـا بـۆ یەک شـت لە پەلامـاردەرەکەی پـاڕابووەوە: مسـتەکە لەسـەر دڵـی نەدا، چونکە پێشتر لەبەر نەخۆشی دڵ ناڵاندویەتی.

لـێ گەلـۆ. ئایـا دیـاردەی دانپێدانان و ئاشـکراکردن لە ڕێـی مشـتەکۆڵە بەرزکـردنەوە و ئەشـکەنجەدانی جەسـتەیی ڕوونـدەکرێتەوە؟ ئایـا پۆلیسـەکانی دیـکەش، هـی وڵاتەکـانی دەرەوەی بـازنەی یەکێتیـی سۆڤیەت، لە گیـراوی دیـکەی بندەسـتی خۆیـان نەداوە؟ ئایـا ئەوان لە ژوورەکانی لێکۆڵینەوە، چ هی پۆلیسی مەدەنی یان سـەربازی، ئـازار و ئەشکەنجەیان بەکار نەهێنـاوە؟ لە قـانوونی زۆر لە وڵاتـان هەوکـردن و ڕووشـانی جەسـتەی زینـدانی قەدەغەیە، بەڵام تـۆ بڵێـی کـێ بە ڕاسـتی حاشـا لەوەبکـا، کە لێکـۆڵەرەوە هەمەڕەنگەکـان بە ئەنقەسـت ئەو

قەدەغەکراوانەیان پشتگوێ نەخستووە؟ کێ نکوولی لەوە دەکا، لە زۆر لە دۆزەکان کە ڕەفتاری دڕندانەی پاسەوانان دژ بە قانوون، تەنانەت هەر نەگەیشتۆتە بەردەم گوێی زانیاریی خەڵکیشەوە؟ چ کەسێکی ڕاستیویست هەیە. نکووڵی لەوە بکا، کە تاوانبارە فەرمییەکان زۆر بە دەگمەنی سزادەدرێن؟ لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ هێزێکی پۆلیس لە دنیادا نییە شان لە شانی پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەتی و هۆبەکانیان لە وڵاتە پێوەلکاوەکانی لەو بوارە بدا. لە میانەی مێژووی لێپێچینەوەدا، بە زۆر شێوە و شەقڵی و قۆناغی خۆیدا، شتەکان ئەوەمان بۆ دەگێڕنەوە کە حاڵەتی وەها هەن، لە ژمار نەهاتوون، کە تێیدا ئیرادە و ڕۆحی ئەشکەنجەدراو تێکنەشکاوە. وەک ڕاستییەکیش. ئەوانەی لە نێو بازنەی لەناوبردنی یەکێتیی سۆڤیەتیدا "دانیان پێدا ناوە"، کەسانێکی وای تێدا بووە، پێشتر لە لایەن هێزی پۆلیسی دیکەوە دەرگەی دۆزەخیان لەسەر کراوەتەوە، کەچی نە ڕووخاون، نە تێکشکاون!

کەواتە، ئەدی کردنەوەی گرێکوێرەی مەتەڵی ئەو ڕۆژانەمان لە کوێیە؟

بە لێکدانەوەی خۆم، کە لە نێزیکەوە لە ناو دۆخەکەدا بووم، هۆکاری یەکلاکەرەوە و گردەبڕانە لە پشت ئەوانەی لەبەردەم جەلادەکانیان دانیان پێداناوە کارەکەی خۆیانیان بۆ ئاشکرا کردوون، دەزانم. سێ هۆکارن.

یەکەمین هۆکاری گرنگیش دابڕاندنە.

مەبەستم دابڕانی جەستەیی (فیزیکی) نییە، کە لە قانووندا بە وشککردن[85]، گۆشەگیرکردن ناسراوە. ئەمەیان هەڵبەتە بە شێوەیەکی

---

[85]– باوکم چەند جارێک ئەم سەربردەی خوارەوەی بۆ گێڕاوینەتەوە: کاتی خۆی، لە سەرەتای حەفتاکان، لە گوندی گرتکی دۆڵی ڕوستێی باڵەکایەتی، ئێمە پارتی بووین، کادیر و شتی وەهاش بووین، کاری کۆکردنەوەی زەکاتی دەغڵودان لە جوتیاران و دابەشکردنی پێشمەرگە بەسەر ماڵان و ئازوقە کۆکردنەوە، بەتایبەتی نان بۆ پێشمەرگە و بارەگاکانیان.

ڕەهـا لە بـن قەڵەمـڕەوی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی پەیڕەودەکرا. کاتێک یەکێک لە لایەن دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستییەوە دەگیرا، هیچ کەس لە خزم و کەسوکار نەدەبوو سـەردانی بکەن، بەدەر لەوەی کە تـۆ پـێش ڕێـگە دوورودرێـژەکەی پەروەردەکـردنەوە، خواحافیزیان لێبکەی. هیچ پارێزەرێک بۆ قسەلێوەرگرتن بانگ ناکرێ تا لە جیـاتی تـۆ بەرگریـت لێبکـا. بەدەر لە هاوزینـدانییەکان و یـارۆی لێکۆڵەرەوە هیچ کەس نابینی. کاتێک پێت نـایە سـەر کۆسـپەی دەرگەی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی، ئیـدی ونـدەبی. ئەنـدامانی ماڵباتەکەت تەنیا بۆیـان هەیە، یەک شـت بـزانن - هەندێک جـار ئەوەش مەیسـەر نەدەبـوو - گـوایە: تـۆ لە بـن دەسـت و شـوێنێکی "سـەلامەت" دای. دیـواری دابڕانـدنەکە هـی مەزنـدەکردن نییە، نە لە بەرزی و نە لە ئەستوورییەکەی. گومان هەیە هیچ شتێکی وەک ئەو دابڕانە هەبێ.

بەڵام لە دیواربەندی مادیدا، دیوارێکی دیکەیان ڕۆنا. ئەویش بۆ چاوی ئـادەمیزاد دیـوارێکی لێـڵ و تەمـاوی بـوو. کەچـی لەنێـو خۆشـیدا زۆر توندوبەند، مەحکەم، وەک ئەوی دیکە ئاسن و پۆڵا، چیمەنتۆ و قوللەی چاودێری نییە، کە ببڕدرێ. دیـواری دووهەم، بەرزەکەیـان، هەر ئامـاژە نەبـوو بـۆ ڕژێمـی دابـڕان بەڵکـو بـۆ دابڕانـی ڕژێـم. ئەو دابـڕانەش لە مێژوودا بێ وێنە بوو.

---

ڕۆژێکیان هەمووومان، پارتییەکانی گرتک و ڕوست لە ماڵێک لە گرتک کۆبووینەوە. لە گوندەکەمان تەنیا پیاوێک هەبوو، شیوعی بوو، بەربەرەکانێی ئێمەی پارتی دەکرد، ئێمەش نەماندەزانی چی لێبکەین. لەنێو خۆماندا هەر مقۆمقۆمان بوو، چۆن چارەی بکەین. یەکێک لە جوتیارەکان، کەس بە کڵاوی نەدەپێوا، دەستی بڵندکرد و هەڵیدایێ و گوتی من دەزانم چی لێبکەین: با هیشک (وشک)ی بکەین. ئێمەش سەرمان سووڕما، ئاخر خۆ دار نییە وشکبکرێ، چۆن؟ کابرا گوتی، لەناو گوند هاموشۆی ناکەین، زبارەی ناکەین، بانگی ناکەین، کەر و گا و ئامرازی کشتوکاڵی نادەینێ، ژنی نادەینێ، ژنی لێناهێنین... بەم جۆرە هیشکی دەکەین، تا بە حاڵی خۆی دەزانێ و هۆشیاردەبێتەوە و دێتەوە ناومان و تۆبەدەکا" لێرەدا مەبەستم وشەی وشککردنە کە هاوتای دابڕان و گۆشەگیرکردنە.

لە هەر ڕژێمێکی دیکەدا، کاغەزێک لە وشەکانی زیندانی یان لەو کەسەی لێدەکۆڵدرێتەوە یان لەو کەسەی دادوەری بەسەردادەکرێ چاپدەکرێ. خۆ ئەگەر گیراوەکە شەڕڤان بێ، کە نموونە سەرمەشق و چالاکییەکانی لە دەرەوەی قانوونی فەرمی بێ، ئەوا لە بن دەستی هەر ڕژێمێکی دیکەدا، نامەیەکی چاپکراو یان دەستخەت دەردەچی تێیدا بۆ بازنەیەکی هاوڵاتیان، بچووک یان گەورە ڕووندەکرێتەوە، کە کەسەکە لەسەر چی گیراوە، چی لێ داوادەکرێ و لە ڕاستیشدا ئاخۆ تۆمەتبارەکە چی گوتووە. زانیارییەکانی ئەویش دەگەنە کەسێک، بە بێدەنگی دەیبیستێتەوە یان هەڵوێستەکە تۆماردەکرێ، ئەمانەش چەند شتێکن هێز دەدەنە بەر شۆڕش و خەباتگێڕ. ئەوەش بۆ مەیلومەرامی ڕاگەیاندن نییە. شتەکە داواکارییەکی جوامێرانەیە بۆ خزمەت، ناسنامەی پیاوێکی ئامانجدارە، کە ئامادەبووە گیانی خۆی لەپێناودا دابنێ. پیاوێک ئامادەی بەرگەگرتنی سووکایەتی، کوێرەوەری، برسێتی، ئەشکەنجە، ترسی مەرگ و خاپوورکردنی ژیانە، هەمووی هەر لە پێناوی نمونەی پێشەنگ، ئیدی ئەوە خەباتگێڕە ئەوسا چەکدار بێ یان بێچەک، کەسێک بێ باوەڕی لەنێو دڵدا هەڵگرتبێ، زانایەک بێ لە مێشکی خۆیدا یاخود خەباتکارێکی ئازادی بێ لە گیانی خۆیدا. ئەگەر ئەو یەکێک بێ لە نێو کۆمەڵە خەڵکانێک یاخود هەر بە تەنیا بێ، ئەو ئامادەی بەرگەگرتنی ئازارە، تەنانەت گەر ئەشکەنجە بدرێ و لە پێناو ئەوەی بڕوای پێیەتی بشمرێ هیچ باکی نییە، کاتێ بزانێ ئەوەی قوربانی بۆ داوە شایستەیە، بەوەی ئەو خزمەتی ئامانجێک دەکا، بە لای کەمی لەپێناو نموونە سەرمەشقێک سەری ناوەتەوە، کە داخوازی شوێنکەوتووی دیکەیە، خەباتگێڕی زیاتر یان کەسانێکی دیکە لە ئەزموونەکەی ئەو زیاتر فێر ببن و ببێتە دەرسوپەند بۆیان، هەروەها ئامادەیە بە دەردەسەری بژی لەوەی ژیانێکی خۆش و ئاسان بەسەر ببا. ئەگەر ئەوە نەبێ، ئەدی چۆن دۆزەکە سەردەکەوێ؟ چۆن لاواز بەسەر بە هێزدا زاڵدەبێ؟ چۆن ستەمکار دەڕووخێ؟ چۆن ئازادی بەدی دێ؟ لەو ڕوانگەیەوە خەباتکار وەک دایکێک وێنادەکرێ، خۆزای

سەرەکی و زۆر لە خۆزا سرووشتیەکانی خۆی سەرکوتدەکا، خۆزای خۆهێشتنەوە دەکاتە قوربانی خۆزایەکی شایەستەتری دیکە، ناسنامەی ژیانی خۆی لەپێناو ناسنامەی ڕۆڵە خۆشەویستەکەی بەخت دەکا. خەباتکار هەروەک دایکێکە، ژیانی خۆی دەخاتە مەترسی تا ژیانی ڕۆڵەکەی لە مەترسی ڕزگاربکا، ئاوەها خەباتکار ئامادەیە گیانی خۆی بەختبکا بۆ ئەوەی دڵنیابێ لە بەرگرتنی خۆشەویستییەکەی، کە بڕوای پێیەتی، ڕۆڵە ڕۆحییەکەیە ئەویش: نموونە پێشنگەکەیەتی.

ئەمەیە گیانی خەباتکار. ئەمەیە پەیام. بەڵام ئەگەر خەباتکارەکە بزانێ، خزمەتەکانی لەبەرچاوناگیرێن و بە شایستە دانانرێن، ئەگەر بزانێ هیچ کەس گوێی پێنادا، کەس پێینازانێ، کەسیش نایەوێ گوێی لە قوربانیەکەی بێ؛ ئینجا ئەو سەرەداوی نێوان خۆی و ئەو نموونە پێشەنگەی، کە بۆی تێکۆشاوە ونـدەکا، ئەوسا لە ناخی ناسینەوەی ئەرک و پەیامەکەیدا بە تەواوی لە بەین دەچێ و گیانە ئازاردراوەکەی دەپرسێ: تۆ بڵێی کێ پێیبزانێ؟ کێ دوام دەکەوێ؟ کێ جێگەم دەگرێتەوە؟ ئایا قوربانییەکەم چی تێدابوو، بۆ چ مەبەستیک ئەشکەنجە بدرێم؟

لە پشت ئەو جووت دیوارەی لە لایەن ڕژێمی سۆڤیەتییەوە لە دەوری زیندانە تایبەتییەکان ڕۆنراوە، ئەم پرسیارانە حەجمانی لێدەبڕن. بەڵکو هەموو زیندانییەکیش ئەم پرسیارانە نەکا، بەڵام زۆربەیان دەیکەن. لەوانەشە ئەوان ڕاستەوخۆ پرسیارەکانیان لێنەکەن؛ بەڵام ڕۆژێک، یان شەوێک هەر لێیان دەپرسن: ئەرێ مەبەست چییە؟ وەڵامەکەشی ئەوەیە: لێرەدا هیچ مەبەستێک نییە. کاتێکیش ئەوە ڕوو دەدا، زیندانییەکە دەفەوتێ، بەڵام فەوتانێکی جەستەیی نا - کە سەد لە سەد مسۆگەرە - بەڵکو بۆ خزمەتکردنی نموونەپێشەنگی جەللادەکەی. بەبێ هیچ داوودەرمانێکی جادوویی، تەنانەت بەبێ هیچ ئازار و ئەشکەنجەیەکی "ناسراو"یش، بەڵکو بە شێوازی سروشتی خۆی ئەو

دیواربەندییە دووسەرەیە، ئامانجە دووسەرەکەی خۆی بەدی دێنێ: لێرەدا هیچ بەڵگەی خۆقوربانیدانێک بۆ ئەو نموونەپێشەنگانەی نین، کە دەسەڵاتداران دژی وەستاونەتەوە؛ لێرەدا بەڵگەیەکی خۆلەناوبردن بۆ دەسەڵاتدارە زاڵەکان هەیە.

خۆ ئەگەر هاتباو «بوخارین» وەهای دانابا کە «پراڤدا» ("ڕاستییەکە") ئەو قسەیەی کە بۆ لێکۆڵەرەوەکەی دەکرد چاپ کردبا، یاخود ئەوەی بیوستبا کە بۆ دادوەرەکەی بڵێ؛ خۆ ئەگەر بەلای کەمی ئەوەی لە حیسابی خۆی دانابا، لێرە و لەوێ لە شوێنێک بە دزییەوە، بڵاونامەیەک بە ناوی "ڕاستییە ڕاستەقینەکە" دەرچووبا و گوتەکانی ئەوی بڵاوی کردبایەوە؛ خۆ ئەگەر بیتوانیبا مەزندەی ئەوەی کردبا، قسەکانی بگەیشتبایە گوێچکەی لێکۆڵەرەوە لاوەکە، مریدی شۆڕشەکە، ئەوەی لەبەردەم مندا توانجی ئەوەی تێگرت گوایە "سیخوڕێکی نێودەوڵەتییە"؛ خۆ ئەگەر بڕوای وەها بوایە، قسەکانی لەنێو هاوولاتیانی پایتەخت یان لە نێو شار و گوندەکاندا بڵاو کرابانەوە، ئەگەری هەبوو دەسەڵاتداران بە سیاسەتی دژەشۆڕش تاوانباری بکەن (ئەگەر هەر بە ڕاستی دژیان وەستابایەتەوە)، یاخود مەردانە تۆمەتەکانی دەسەلاتی ڕەتدەکردنەوە. بەڵام «بوخارین» زانی پراڤدا ڕۆژانە هەر ئەوە بڵاو دەکاتەوە گوایە ئەو دوژمنی مرۆڤایەتییە، گوایە ئەو سیخوڕێکی نێودەوڵەتییە، کەوا ئەو سەگێکی هارە، ئەو ناپاکێکی پیسە، هەمو ئەمانە بەر لە دادگەییکردنەکەی تەنانەت بەر لەحوکمدانەکەشی. «بوخارین» دەیزانی هەموو ڕۆژنامە و ڕادیۆکانی وڵات، هەر نووسینەکەی پراڤدا بە لێزیادکردنی پڕ لە جوێن و نەفرەت، دووبارە و چەند بارەیدەکەنەوە. هەروەها ئەوەشی دەزانی، "ڕاستییە ڕاستەقینەکە" هەر لە یەکێتیی سۆڤیەت سەرهەڵدەدا و ڕاستیەکەی ئەو دەردەخا. هەر بۆیە «بوخارین» دەیزانی هیچ هاووەڵاتییێکی ئەو نە گوێی لێدەبێ و نە گوتەکانی ئەو دەخوێننەوە، بەڵکو هەر هەموویان قەناعەتیان پێدەهێنرێ، یان هەر بەڕاستی بەوە بڕوادەکەن، کە ئەو لە

ئاژانێکی بۆرژوازی نێودەوڵەتی و دوژمنی شۆڕشی پرۆلیتاریا زیاتر هیچ شتێک نەبووە. بە زانینی هەموو ئەو شتانە، هەر دەبوو شەوێک لە شەوان لە خۆی بپرسێتەوە: باشە سوودی چییە؟ ئینجا بگاتە ئەو بەرەنجامە: "واژۆ بکەی و واژۆ نەکەی. شتێک لەگۆڕێدا نییە ..."

لێکۆڵەرەوە گەنجەکەی من، ئەوەی بێ چەندوچوون بڕوای وابوو، بوخارین کاتێ سەرۆکی «کۆمینترن[86]» بوو، سیخوڕ بووە، «ترۆتسکی»یش هەر لەو کاتەی سەرۆکی سوپای کرێکار و جوتیاران بوو، ئاژانێکی بۆرژوازی بووە، بۆ گیانی شەکەتی ئەوانەی تاوانبارکرابوون و دەبرانە بەردەم مەرگ یەک کلیلی لە دەست بوو، ئەویش ئەوە بوو هیچ گۆرانییەکی داڕسانیان[87] بۆ نەڵێ، بەڵکو بەڕەوازانینی حوکمدانەکان. کلیلی دووەمیش لە دەستی چیکییە (پۆلیسە) دێرینەکەی دیکەم، هاوڕێی لێکۆڵەرەوەکەدا بوو، کە بەخۆی دەگوتەوە: "دادگەیی! دەی سەکۆیەکی بدەرێ!" ئەو کلیلانەش دەرگەی جیهانێکی دەبڵ دابڕاندن دەکەنەوە، لەوێدا گەورەترین مەتەڵ هەڵهێندرا، لەوێدا سامناکی هەیە، بەڵام تەلیسم نییە.

لە جیهانی دابڕاندندا، هەڕەشەکانی سەر ماڵباتی گیراوەکە هێزێکی قەناعەتپێکەری گەورەی هەیە. گومانیشی تێدا نییە، دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئەو هەڕەشانەیان لە دەست دێ. خەباتکاری ڕاستەقینە لە پێناو نموونەپێشەنگی خۆیدا دەربەستی ژانوناسۆر دێ، بەڵام خۆ هەموو شتێکی ئەو، دەکرێ بە بەڵا بۆ سەر ئەوانەی خۆشەویست و نزیکی ئەون بشکێتەوە. تەنانەت ئەگەر سەرلەبەری بارودۆخەکە لە هی لێکۆڵینەوەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی

[86]- کۆمێنترن Comentren هەروەها بە ئینتەرناسیونالی سێهەمیش ناسراوە، ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی نێودەوڵەتی بوو بۆ بەرەوپێشبردنی کۆمۆنیزمی جیهانی (١٩١٩-١٩٤٣)
[87]- داڕسان: ئالّنگاری (هەورامانییە)، [تەحەدا (تحدی)، بەرۆکگیرییکی نایەتی]. لە فەرهەنگی خاڵدا وەک «پەلاماردان»یش هاتووە.

سۆڤیەتی جیاواز بێ، ئەگەری ئەوە هەیە، تێکۆشەرەکە لە سۆنگەی هەڕەشە و ڕاوەدوونانی ژن و منداڵیدا نامراد و دەستبەردار ببێ. لەگەڵ ئەوەشدا تێکۆشەری وەها هەبووە، نەبەردانە بەرانبەر ئەو هەڕەشانە وەستاوەتەوە و بۆی نەسەلماندوون. ئەم جۆرە دۆزانەش هەروەک ڕۆژانی بەرهەڵستکاری شۆڕشگێڕی دژی ڕژێمی قەڕاڵ، لە ماوەی یاخیبوونی خۆشمان لە ئێرتز ئیسرائیل هەبوون.

دەگوترێ کەوا «فلیکس ژێرژینسکی» کە دوای سەرکەوتنی بەلشەفیکەکان بووە بەرپرسی دامودەزگەی چیکا، ئەزموونی سامناکی خۆی لە تراژیدیای سەردەمی ژێرزەمینی وەرگرتووە. ژاندرمەکانی «ئۆکهرانا»ی قەڕاڵ، نەوەک هەر لێیکۆڵراوەتەوە و لەکاتی لێکۆڵینەوە دراوەتە دەستی ئەشکەنجەدەرە جەهەننەمییەکان، بەڵکو هەر بە ئەنقەست و لەبەرچاوی خۆیشیدا سووکایەتییان بە دەستگیرانەکەی کردووە و هەتکیانکردووە. ڕێی تێدەچی، لەبەر ئەوەی ئەو قوربانی دەستی دڕندایەتی بووە، کە کاتی خۆیشی داهات، بە هەمان دڕندایەتی ڕەفتاری لەگەڵ قوربانییەکانی خۆیدا کردبێ. بەڵام ئەوە ڕاستییەکە «ژێرژینسکی» لە بن لێکۆڵینەوەی «ئۆکرانا»دا نەڕووخا. ئەو خۆگرانە لەبەردەم ئەشکەنجەدەرانی وەستا و لەپێناو ڕزگارکردنی ئەو ژنەی خۆشیشی دەویست، لە بیروباوەڕی خۆی پاشگەز نەبووەوە و سووکایەتی بە نموونە پێشەنگەکەی خۆی نەکرد.

«یاگۆدا»ش کە بۆ ماوەیەک سەرۆکی ئەو دەزگەیە بوو، بە دەستی ئەوانەی لە ڕابردوودا گرتبوویان ڕووخا بوو "دانی بە هەموو شتێکدا نابوو". مرۆ نازانێ ئاخۆ هەڕەشەیان لێکردووە، یان کەسانی دڕندە و دڵڕەقی وەک خۆی گەفی لەناوبردنی خێزانەکەیان لێکردووە. بەڵام ئەگەر ئەوان بەم جۆرە گەفیان لێکردبێ، ئەوا زەحمەت نییە کاریگەری شتەکە لەسەری مەزندە بکرێ. گیراوەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هەروەک «فلیکس ژێرژینسکی» دامەزرێنەری

دەزگەکە بە بەخـت نەبـوون. ئـاخر ئەو لە لایەن دەزگەی «ئۆکرانـا» لێپێچرایەوە. ئەو کاتی خۆی بۆ نموونەپێشـەنگێک جەنگا و بڕواشـی وابـوو کە هەڵوێسـتەکەی لەنێو برادەرەکانیـدا دەناسـرێتەوە و دەبێـتە مـایەی پێشـوەچوون و سـەرکەوتنی نموونەپێشـەنەگە هاوبەشـەکەیان. کەچـی ئەوانـی دیـکە هەر لەنێـو خۆیانـدا پێزانینـی ئەرکەکەیـان تەفروتونـاکرا، شـەو لە دوای شـەو دادەشـۆران و لەجێـی پێزانینـی قوربانیدانەکەیان هەر بەیـار و نەزۆکـی و بێهوودەیی بوو. ئیدی خۆ ئەگەر مەبەسـتێک بـۆ ژانوناسـۆرەکە نەمێنێـتەوە، باشـە بـۆچی ئەو ماڵباتـانە ئـازار بچێـژن؟ گومـانی تێـدا نیـیە، هەرچەشـەی ئـازاردانی خـاوخێزانی زینـدانی، – هەروەک بەڵێنـی ئازارنەدانیـان – یەکـێکە لەو هۆکارانەی کە تێکیاندەشکێنێ.

هەڵـبەتە هەمـووی هەر وەک یەکە چ داوای بەزەیـی "بەڵێنـی" لێبـوردن، لێخۆشـبوون لە گوناهەکانیـان، مـاوەی پەروەردە و نـۆژەنکردنەوەی پەروەردە: ئەمەش دوای ئەوەی ڕێگە بە تاوانبارەکە بدرێ بگەڕێتەوە نێـو کـۆمەڵگە، کـار لەگەڵ خەڵـکەکە بکـاتەوە. بـا کەسـیش نەڵـێ ئەو بەڵێنانە پووچ و بەتاڵن و زیندانییەکانی دەزگەی ئاسـایش ئەمە دەزانن و بڕواشـــیان پێنـــاکەن. لەپێنـــاو هیـــوای ژیـــان، مـــرۆڤ هەرگیـــز دەستبەرداری دوا ساتیش نابێ. ئایا برا هەشبەسەرەکانمان لەو کاتەی تەنانەت کە چاڵی مەرگی خۆیان بە خۆیان لێدەدا، بڕوایان بەوە نەبوو لە دەستی بکوژە ئاڵمانەکان ڕزگاردەبن؟ ئەو قسـەیە ڕاسـتە: Dum spiro, sper [88] تـا هەناسـەم مـاوە، هیـوام هەر هەیە. هەر لەبەر ئەوەشـە، بەڵێنـی چەور، یـارمەتی ئەوە دەدا، "واژۆ"ی ئەو کەسـانە بە دەست بێ، کە گەڕانەوەیان نییە.

هەموو ئەوانە تەنیا شتی لاوەکین بۆ هۆکاری یەکلاکەرەوەی پێواژۆی تێکشکاندن، کە ئەویش دابڕاندنە.

---

[88] – گوتەیەکی لاتینییە.

هۆکاری دووەمیش بۆ زیندانی، ئەوەیە لێ نەگەڕێی بخەوێ. ئەمەشیان بۆ من چ لە مەڵبەندی دەزگەی ئاسایش و چ لە زیندانی لوکیشکی ئاشنا بوو. دۆخەکەش یاوەرێکی دانەبڕاوە بۆ هەموو لێکۆڵینەوەیەک لە ڕووسیا. دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە زۆری بە شەو کاردەکا. بەتایبەتیش هەموو لێکۆڵینەوەکان لە ماوەی نێوان یەکەم تا سێهەم ماوەی ئێشکچی شەو دەخایەنێ. بە ڕۆژیش نوستن قەدەغەیە، تەنانەت چاوگەرمکردنیش[89] هەر یاساغە. ڕێنمایش بۆ کاراکردنی ئەم حاڵەتە لە زیندانەکانی ڕووسیا بەرکارن. پاسەوان، یان دەرکەوانی ئێشکگر بەرپرسە لە سەپاندنی ڕێنماییەکە. بۆ ئەوەی ڕێ لە زیندانی بگیرێ بخەوێ (نەوەک تەنیا بۆ ئەوەی ڕێگە لە خۆکوشتن بگرن)، دەلاقەیەکی "جودا (سیخوڕی)ی" لە دەرکەی ژوورە زیندانەکان کراوەتەوە. خۆ ئەگەر لەو کونە جودا (سیخوڕی)ـیەدا یارۆی ئێشکچی ببینێ تۆ لەسەر کورسییە شەقوشڕەکە دەبۆرژێی و وەنەوز دەدەی، دەتەوێ هەندێک چاو گەرمبکەی، یەکسەر پاسەوانەکە جیڕە لە دەرگە دەهێنێ و دەیکاتەوە و ئاگادارتدەکاتەوە: "ئەرێ باشە نازانی کە بۆت نییە بخەوی؟ خۆ ئەگەر بخەوی ئەوا دەتبەینە carcer (زیندانی تەنیایی)." باشتریشە نەخەوی لەوەی بتبەنە چاوە زیندانی تەنیایی. ئەوەشیان هەر لە لوکیشکی پێی ئاشنا بووم.

کەواتە ئەمە پێواژۆکەیە، هەروەک لە میانەی ئەو شەوانەی لێکۆڵینەوەم لەگەڵداکرا: سەرەتا زیندانییەکە لە شیرین خەودا بێدار دەکرێتەوە. لێکۆڵینەوەکانیش تا سەعاتەکانی زەردەی بەیان درێژە دەکێشن. لێکۆڵەرەوەکەش خەوی خۆی کردووە و بە حازروبازری هاتووە. ڕاستە ئەویش بەشەو کاردەکا، بەڵام خۆ بە ڕۆژ بە کاملی سەڵتەنەتەوە لە ناو پێخەفە سپییەکەیدایە. خۆ ئەگەر هاتوو لێکۆڵەرەوەکە ماندوو بوو، یەکێکی دیکە جێیدەگرێتەوە. دەزگەی

[89]– چاوگەرمکردن: سەرخەوشکاندن، سووکەخەو، چاو لەسەریەک دانان بۆ ماوەیەکی کورت. قیلولة.

ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە لێکۆڵەرەوانی کەم نییە، هەروەک ئەوەی لەو کەسانەشی کەم نییە، کە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکا. دوای شەوێک لە لێکۆڵینەوە، گیراوەکە دەبرێتەوە ژوورە زیندانییەکەی خۆی و بە گێژییەوە سەری دەخاتە سەر سەرینەکەی. یەکسەر خەوی لێدەکەوێ، بەڵام زۆر نابا فیکەی هەڵستان لەخەو و دەستپێکی ڕۆژێکی نوێ لێدەدا. ڕۆژیش دادێ، سێ ژەمەکانیش دێن، وای لێدەکا بەردەوام برسی بێ؛ شەو دێتەوە، بە تاریکایی شەو لێکۆڵینەوەکە دەستپێدەکاتەوە. ئاوا دیسان و دیسان هەمان شت دووبارە دەبێتەوە ... شەو لە دوای شەو بۆ ماوەی چەندین هەفتە، بۆ چەندین مانگ، بۆ ماوەیەکی بێ کۆتایی. ئیدی لە مێشکی ئەو زیندانییەی لێیدەکۆڵرێتەوە، تەمومژێکی لێپەیدادەبێ، خەریکە شەقڵی خۆی پەیدابکا. ڕۆحی بەرگی مردن دەپۆشێ، قاچەکانی لەرزۆک دەبن، تەنیا یەک ئارەزووی دەمێنێ: بخەوێ، هەر کەمێک بنوێ، هەڵنەستێتەوە، ڕابکشێ، پشوو بدا، شت فەرامۆش بکا. "بنوێ، بمرێ، بنوێ ... لەوە زیاتر نا." هەر کەسێک تامی ئەو حەزەی تاقیکردبێتەوە، دەزانێ تەنانەت نە برسێتی و نە تینوێتیش بە خەوزڕان بەراوردناکرێ. تووشی بەندکروای واهاتووم، هەر لەبەر خاتری ئەوەی لە لایەن لێکۆڵەرەوەکە بەڵێنی پێدراوە، تۆمەتنامەکەی واژۆکردووە، لەکاتێکدا بەڵێنی ئەوەی پێنەدرابوو ئازادبکرێ، بەڵێنی ئەوە نا خواردنی بۆ ئامادەبکرێ، بەڵکو تەنیا بەڵێنی ئەوەی پێدرا بوو، ئەگەر هاتوو واژۆیبکا، ئەوا لێیدەگەڕێن بخەوێ! ئیدی ئەوانیش واژۆیان کرد. بۆ ئەوان هیچ ئامانجێکی بۆ ئازار چەشتن نەمابووەوە، هەر دەیانەویست ڕێگەیان پێبدرێ بخەون، بنوون ... ئەوانیش واژۆیانکرد، ئیدی هیچ شتێکی لە دنیادا نەمابۆوە پاڵیان پێوە بنێ بۆ ئەوەی جارێکی دیکە سەرچڵییەکی وەک ئەو شەو و ڕۆژانە بکەنەوە ... شتە سەرەکییەکە خەوتن بوو.

هۆکاری سێهەم بۆ کۆمۆنیزمە دڵسۆزەکان، بۆ سەرکردەکانیان، بۆ ئەندامە کارا و خزمەتکارەکان، ئەوانەی لە دەرکەی ژووری لێکۆڵینەوە

چـــوونەژوور، سەیروســـەمەرە بـــوو. جیهـــانەکەی ئەوان بەســـەریاندا خـــاپوور کـراو، هـیچ جیهـانێکی دیکەشـیان بـۆ نەمـابووەوە، نە لە سـەر زەوی و نە لە نـاخی خۆیـان و نە لە ئاسـمانیش. ئەوان پیـاوی مەزن بوون؛ ژیان و مەرگی هەزاران لە بەردەستی ئەواندا بوو. هەنووکەش وەک سـەگیان لێهـاتووە، بەڵکـو لەوەش بەدتـر؛ ئەوان بـوونەتە "سـەگی هار". خۆی دارِمان، کە دوورە لە هەر کەوتنێک، بەسیەتی بۆ شـکاندنی ئێسکوپروســـکی ئەوەی لە بەرانـــبەر لێکـــۆڵەرەوەکە وەســـتاوە، لێکـۆڵەرەوەکەش هێشـتا ئامـادەیە هەر بیشـکێنێ. خەڵکـی کڵـۆڵ دەڵـێن گـــوایە خۆیـــان نمـــوونەی کۆمۆنیســـتی دڵســـۆزن، بەڵام هەر زوو ناچـــاردەکرێن دان بەوەدا بنـێن، کەسـێکی دیـکە هەیە بڕیـاردەدا کە کۆمۆنیستی نموونەیی چییە و چۆن کەسێک بەو ئەنجامە دەگا. ئەوان هەر ئاوەهایـان نەگووتـووە، بەڵکـو نووسـیویانە وەهـا بـووە؛ بڕوایـان پێبووە و لە ڕاستیشدا هێشتا هەر بڕوایان پێ هەیە. بەڵام ئەو پیاوەی "بڕیار دەدا" زۆر دوورە و دەسەڵاتێک، کە نوێنەری ئەوە لەبەردەم ئەو خەڵـکەدا دانیشـتووە و داوایـان لێـدەکا، لەبەر خـاتری کۆمۆنیسـتی نموونەیی، تەواوی دانپێنانی هەڵەکانیان، خەتاکانیـان، تاوانەکانیـان واژۆ بکەن. لێرەدا ئەوان چۆن وەڵام بدەنەوە؟ خەبات بۆ چی بکەن؟ لەپێناو چی ئازار بچێژن؟ سوودی چییە؟ کێ شـوێنپێیان هەڵدەگرێتەوە؟ باشـە چـۆن دانپێیـدانانێن، ئـاخر ئەدی لەبەر خـاتری حـزبەکە، لەبەر خـاتری شۆڕشەکە نییە؟

ئەم سیســتمە کە لە لایەن دەزگەی ئاسایشــی کۆمۆنیســتی ســۆڤیەتی داهێنـــدراوە و لە ڕێـــی تیشـــکی شـــارەزاو بە ئەزموونەکـــانیش کونوکەلەبەرەکـــانی پڕکـــراوەنەتەوە و ســـەلمێندراوە، بە بنەمـــا بـــۆ ســەرکردە کۆمۆنیستەکان بـووە، لەبەر هەر هـۆیەک بـووبێ ئەوانەشـی گرتووەوە دووبارە بەر بەرنامەرێژکردنەوەی پەروەردە کەوتن.

لێرەشدا بە گوێرەی سیستمی تێکشکانی ڕۆحی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هیچ کەسێک لە کۆمۆنیست و سەرکردە کۆمۆنیستەکان ئاسانتر دەستناکەوێ بەبێ ئەوەی هیچ ئازارێکی جەستەییشیان پێبگا بڕووخێن.

## ١٠

# بەردەرگە

کاتێک لێکۆڵینەوەکە تەواو بوو، بڕیارمدا تەڵاقنامەیەکی مەرجدار بۆ ژنەکەم بنێرم، ئەم پرسە لە مێشکمدا گینگڵی دەدا تا شەقڵی خۆی وەردەگرت. یەکەمین جاریش، کە بیرۆکەکە بە خەیاڵمداهات، بەر لە بیست سەعاتی ئەو ماوەیە بوو، کە لە لێکۆڵینەوەکەدا پێمگوترا: "دیدارێکت لەگەڵ کەسێکی نزیک لە خۆتەوە " هەیە. ئەو شەوە و هەموو ئەو ڕۆژەی بە دواشیدا هات، تا ڕاددەیەک ئەرخاینبووم، ئەو کەسەی لێکۆڵەرەوەکە ئاماژەی پێکرد و ڕووبەڕوو دەیبینم، ژنەکەم بێ. مەراقی ئەو دیدارە منی خستە سەر کەڵکەڵەی بیرۆکەی تەڵاقدان، کاتێکیش بڕیارەکەمدا، خۆم بەوە لە خشتە نەبرد، کە بە هۆی بڕیارەکەم ژنەکەم لە مەترسی گرتن یان لە وڵات دەرکردن بپارێزم. چونکە ئەوەی وایلێکردم ئەم بڕیارە بدەم، شتێکی دیکە بوو.

کۆتاییپێهاتنی لێکۆڵینەوەکە، کۆتایهێنان بوو بەو مەراق و گرژییەی ڕۆژ و شەو پێیەوە گرفتار بووم. چیدی بیرم لەوە نەدەکردەوە ئاخۆ لێکۆڵەرەوەکە لە شەوی پێشتر چی لێپرسیم و منیش چیم وەڵامدایەوە، یاخود ئایا لە شەوی دادێ تۆ بڵێی لێکۆڵەرەوەکە چیم پێبڵێ و منیش دەبێ چۆن وەڵامیبدەمەوە. من بیرم لە ئایندەی خۆم کردەوە. بیرم لەو شتە دەکردەوە، ئاخۆ بە تەواوی لەگەڵی ڕادێم و تۆ بڵێی چی بۆ من تێدابێ و شاردبێتەوە. ئەمەش بەشە بەختی من بوو،

کەواتە دادەدادی بۆ چییە؟ هەرچەندە دڵیش ژیان و ئازادی دەویست، چـاوی لەسـەر ڕۆژی ئـازادکردنم بـوو لە زینـدان و ئەوەشـی ڕەتدەکردەوە لە نێوەڕاستی چاوەڕوانییە شادمانییەکەیدا بپرسێ: "تۆ بڵێـی ڕۆژەکە بـێ؟ ئەرێ کەی دێ؟ مێشـکیش ئەو قسـەیەی لێکـۆڵەرەوەکەی لەبیرنەدەچـووەوە: "دادگەیـیەکەت لەپێشـە. دەکـرێ وادەیەکـی پەروەردە و نـۆژەنکردنەوەی پەروەردەشـت لە پـێش بـێ." منـیش نەدەکـرا لە خـۆم نەپرسـمەوە: "تـۆ بڵێـی تـا کۆتـایی قۆنـاغی سەرلەنوێ پەروەردەکردنەوەکە بژیم، تۆ بڵێی دۆخەکە تێپەڕێنم؟ تۆ بڵێی ماوەکە تەواو بکەم و بگەڕێمەوە؟"

"ئینجا دیسان" لەگەڵ خۆم کەوتمەوە مشتومڕ، "جیابوونەوەکە دەکرێ ماوەیەکی درێژ بخایەنێ، لەوانەیە ... ڕەنگبێ دوای ژمارەیەک ساڵ، کەس هەر نەشزانێ ئاخۆ ئێسکوپروسکم لە کوێ کەوتوون. سەبارەت ئەم شتەش نابێ بۆڵەبۆڵ بکەم. باشە ئەدی من سوێندم نەخوارد، ئەدی لە کانگەی دڵەوە نەمگوت: ژیانی خۆمی لە پێناودا دادەنێم؟ خۆ من بەتەنها نیم؟ باشە خۆ ئەگەر پاشەڕۆژم جێی گومان بێ، بۆچی ئایندەی ژنەکەشم لەگەڵ خۆم بفەوتێنم، کە بێهودە هەر چاوەڕێی هاتنەوەم بکا؟ خۆ ئەو تەنها بیست ساڵانە. هێشتا ژیانێکی زۆری لە پێشدا ماوە. ئایا من بەختی ڕەشبکەم بە پرچی سپییەوە هەر چاوەڕێی گەڕانەوەم بکا، کێ دەڵێ دەگەڕێمەوە؟ کێ دەڵێ لەو دابڕانە بێکۆتاییە سەر دەردێنمەوە؟ ئایا ئەرکی من ئەوە نییە، پێیبڵێم، ئەگەر لە ماوەیەکی دیارکراودا نەهاتمەوە، باشتر وایە چاوەڕێم نەکەی؟ ئایا ئەرکی من ئەوە نییە ژیانی ئەو لە وێرانکردن ڕزگار بکەم؟"

لە ژووری زینداندا، هەموو تایبەتمەندییێک چ هی جەستەکی بێ یان هی هۆشەکی لە بەین نامێنێ. گیانی زیندانییەکە لە دابڕانی خۆیدا بە دوای قەرەبـووکردنەوەدا دەگەڕێ. بەقەد بەرفرەوانبـوونی ئەو مەودایەی نێـوان زینـدانی و کەسـوکار، ئەوەنـدە مەوداکەی لە غەوارەکـان

نزیکدەبێتەوە. زیندانییەکە ئامادەیە سەبارەت بە هەموو شتێک لەگەڵ هاوزیندانییەکانی بدوێ. ئامادەشە سەبارەت بە هەموو شتێ پرسوڕایان پێبکا. حەزی لێیە دەربارەی هەموو شتێ بیروبۆچوونیان وەربگرێ. لە ژووره بچکۆلە زیندانییەکەی ئێمەشدا، سێ کەسی دابڕێنراو دانیشتبوون. ئەو سێ کەسانەش زۆر شتی هاوبەشیان لەگەڵ یەکدا نەبوو. هەر یەکێکیشیان لە جیهانێکی جیاوازەوە هاتبوو، خوازیاریش بوون بگەڕێنەوە جیهانێکی جیاواز. بەڵام تەنیایی، هەرسێ غەریبەی لەیەک نێزیککردبووەوە. ئەو تەنیاییە دڵی هەردوو هاوزیندانەکانی بۆ من و هی منیشی بۆ ئەوان کردبووەوە.

منیش سەبارەت بە بیرۆکەی تەڵاقدانی ژنەکەم لەگەڵ هاوزیندانییەکانم دوام و لێم پرسین ئاخۆ ڕایان چییە.

سەرەتا ئەوان لێم تووڕە بوون. گوتیان بە باسکردنی ئەو هزرە، خەمێکی دیکەت سەبارەت بەماڵومنداڵ تووشکردین و خەمت بۆ خێزانەکانی ئێمەش داهێنا. ئەوانیش ئەو جۆرە کەشەیان نەدەویست. جارێکیان کۆنە ئەفسەرەکە گوتی، لە زیندان، بەتایبەتیش لە زیندانی لوکیشکیدا، هیچ ڕوانگەیەکی وانەبوو، سەری خۆمان بە پرسی خەمی کەسوکار، کە لە دەرەوەی دیواری زیندانەدا بوون، بهێشێنین. "ئاخر هەر چۆنێک بێ، ئێمە ناتوانین یارمەتیان بدەین،" ئەو ڕاهاتبوو بەو لۆژیکە حاشاهەڵنەگرە بدوێ؛ "باشە هەرچەند خۆمان سەبارەت بە ماڵومنداڵمان بە خەم بکەین، چی لێ شیندەبێتەوە؟" کۆنە عەریفەکەش بە تەواوی لەگەڵ قسەی کابرا کۆک بوو، بە زۆرینە بڕیار درا، منیش دەبێ بە خۆمدا بچمەوە و نابێ خەم لە کەسوکارم بخۆم و باسی ئەو پرسەش هەر نەکەمەوە. بە ڕۆژ و هەفتە ئێمە باسی تەقەکردن لە مەل و ئەنگاوتنیان، خواردنەوەی باش، کەشیش و ژەنەراڵەکان، گۆرانی، ئۆپێرا و مێژوو سیاسەتمان کرد. ئێمە دەربارەی زۆر شت دواین؛

کەچی باسوخواسی خێزانەکانمان نەهێنایە گۆڕێ. بەڵام بۆ بەشی یەکەمی بڕیارەکە ...

سپێدەیەکیان کۆنە عەریفەکە دوای نوێژ و دوعا، دوای خواردنەوەی قاوەکەی، دەستی بە گێڕانەوەی حاڵی خۆی کرد، زۆر جارانیش باسی خەوەکانی شەوی بۆ دەکرین. بەم جۆرە کەوتە قسە: "هەموو شەوەکە، خەونم بە پیرەدایکەکەمەوە بینی." ئینجا بۆی گێڕاینەوە کە لە خەوەکەدا، دایکی چی لەبەردابوو، پرسیبووی ئاخۆ جزمە نوێیەکانی لە پێدا تەنگ نین، ئاخۆ چۆن کاتی خۆی سەری بۆ شانەدەکرد، چۆن بەڵێنی پێدەدا (هەربە کوڕە بچکۆلەکەم بانگیدەکرد) کە دیسان بەیەک دەگەنەوە، چۆن کوڕەکەش لێیپاڕایەوە، پێیبڵێ ئەو ڕۆژە کەی دادێ، دایکەش پێینەگوت، بۆی باسکردین، کە دایکی لە خەونەکەدا چەند بە خەمباری خەندەی بۆ کردوە ... ئیدی لەپڕ کۆنە عەریفەکە هەڵسایەسەرپێ و لەبەر خۆیەوە منگەمنگێکی لێوە هات: "دایکە، دایکم، هۆ دایکە پیرەکەم." چاوەکانیشی لە فرمێسکدا دەدرەوشانەوە. ئینجا لەپڕێک لەسەر کورسییەکە هەڵسا و چووە قوژبنەکە، کە هەمیشە بۆ نوێژ و دوعا بەکاری دەهێنا، ئەمیش دوای ئەوەی گەڕابووەوە سەر ئیمانەکەی. ئەو پیاو بوو، سەربازێک بوو، کەسێک بوو شەرمی لە فرمێسکەکانی خۆی کردەوە. کۆنە ئەفسەرەکە و منیش هیچمان نەگوت. دیاربوو کوڕەکە بۆ دایکی گریابوو. ئەو پیاوە هەراشیش ببوو، هەمیشە دایکی هەر بە "کوڕە بچکۆلەکە" بانگی دەکرد. هەڵبەتە دایکەش زۆری بۆ گریاوە؛ سەربازەکە، پیاوەکە، عادەتەن چاوی وشکە. بەڵام هەندێک جار ... کە فرمێسکەکانی دایکی لەگەڵ هی ئەو بەیەکدەگەن، دەڕژێنە جۆگەیەک، دەڕژێنە ڕوبارێکی مەزنی کوێرەوەری مرۆڤایەتی کە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی بۆ نییە و لە هەمان کاتیشدا بێ ئامانجە ... عەریفەکە بۆ ماوەیەک لە کونجی خەڵوەتەکەی هەڵسا. زیندانەکەش کڕ

و بێدەنگ. ئێمەش ئاماژەی ئەوەمان بۆ نەکرد، ئەو دژی بڕیارەکە بۆتەوە و "خەم"ی لێدەخوا.

بەڵام هەردووکیان، چ کۆنە ئەفسەرەکە و چ کۆنە عەریفەکە ئەوی ڕۆژێ کە باسی بڕیارەکەم سەبارەت بە ژنەکەم بۆ کردن، منیان بە پێشێلکردنی دەستوور و ڕێکەوتنەکەی نێوانمان تاوانبارکرد. نەخێر ئەوە نوێکردنەوەی پشتگیریکردنی نێوانیان نەبوو دژ بە من. ئەوان لەسەر هەق بوون. ئەفسەرەکە ڕایگەیاند؛ تازە تێگەیشتم بۆچی ئەو دوو سێ ڕۆژەی ڕابردوو کڕ و بێدەنگ بووی؛ بۆچی وەها دیار بوو، من لەو گفتوگۆ و دەمەتەقێیەی گشتی و ڕۆژانە دوورەپەرێز بووم. کۆنە عەریفەکەش پێیگوتم، هەنووکە ئەو دەزانێ، من لە ماوەی داڵغەکانمدا بیرم لەچی کردووەتەوە و بۆچی لە کاتی خۆی پرسیارەکانی دووبارەکردەوە، بەڵکو وەڵامێکی دەستکەوێ. "ئێمە دەبێ لەو شوێنە بۆگەنەدا یارمەتی یەکدی بدەین" ئەو دەردەدڵەکەی وەها دەربڕی؛ "نابێ خۆمان هەر لە هزری خۆماندا شەتەکبدەین. ئێستا دەبینین تۆ لەو ڕۆژانەی ڕابردوودا چەند نیگەرانی بووی. تۆ پێیلێدەنێی ئێمەش وەک تۆ هەمان مافمان هەیە. ئێمەش لەمە بە دواوە دەبێ لە بارەی خاوخێزانمانەوە نیگەرانبین، ئەگەر هەر یەکێک هەر بە بیرکردنەوە بەوان سەرقاڵبێ، کەواتە چۆن دەتوانین یارمەتی یەکدی بدەین؟"

ئەوان ڕاست بوون، گرنگترین شتیش ئەوەبوو، لە دلۆڤانیان بوو. منمنایەتی( خۆویستی)[90] ئەوان بە مەبەستی کۆمەککردنی من بوو. منیش داوای لێبووردنم لێکردن و سوپاسمکردن. ئەوانیش گازاندەکانیان دووبارە نەکردەوە، بەڵکو لەسەر ئەوە سووربوون، دەبێ

---

[90]- ئیگۆیزم egoism، بڕوانە لیستی زاراوەکانی کۆڕ لە کتێبی «زاراوەسازی پێوانە»ی مامۆستا مەسعوود محەمەد. ل.495. «منایەتی»یش دەگەیەنێت، لە گەردانداا «منمنۆکێ»شی لێ پەیدا دەبێت.

بڕیارەکەم بە کورتی لەبەرچاوبگرن بە جۆرێک دوای ئەوەی دوابڕیار، مـن دەبـێ بتـوانم نیگەرانییەکەم ڕابگـرم و دیسـان گـوێ لە ئامـاژەی چیرۆکەکـانی ڕاوی ئەفسـەرەکە بگـرمەوە یـاخود چیرۆکەکـانی بەرەی پێشـــەوەی جەنـــگ، کە عەریـــفەکە دەیگێـــڕانەوە. هەر بە ڕاســـتیش تـاوتوێکردنەکە کـورتی خایانـد. یاوەرەکـانم - بەگـوێرەی ڕێسـاکانی ئاگادارکردنەوە - بە هەردوو دیودا بڕیارەکەمیان هەڵسـەنگاند. هەڵبەتە ئەوانــیش نەگەڕانەوەی منیــان بەلاوە نــا، هەروەک چــۆن لە کــاتی بێئومێـدبوونیان، منـیش ئەوەم ڕەتکـردەوە، کە ئەوان گـوایە جـارێکی دیکە ناگەڕێنەوە نێو مـاڵ و منداڵیان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا، بۆ مـایەی سەرســـامی و بـــۆ مـــایەی کەیفخۆشـــییە ســـەیرەکەم، ئەوانـــیش بڕیارەکەمیان سەلماند. ئەفسەرەکە پێیگوتم:

"دڵنیـام ژنەکەت ئەو "دیـارییە"ت لێوەرنـاگرێ، بەڵام کتومـت هەر لەبەر ئەوەشـــە تـــۆ بـــۆی دەنێـــری. بە تەمـــای خـــوا، هەردووکتـــان بەو لەیەکجیابوونەوەیە پێدەکەنن." منیش دەستیم گووشی.

سەبارەت بەو مـاوەیەی ئـاخۆ دەبێ تەڵاقدانەکە بۆ چەند مەرجداربێ، ئاخۆ ژنەکەم چەندم لەسەر بووەستێ تا تەڵاقی خۆی وەردەگرێ، ئێمە هاوڕا نەبووین. من لە بەڵگەنامەکەدا نووسیبووم ئەگەر لە مـاوەی سـێ ســاڵدا نەگەڕێــمەوە ئەوا ئــازادە؛ "لێــرەوە جیــابوونەوە بــۆ ژنەکەم دەستەبەردەبێ و ئیدی ئەو ئازادە." کۆنە ئەفسەرەکە ڕای وابوو، دەبێ ئێمە دەستکاری ماوەکەی بکەین و بۆ پێنج سـاڵ درێژبیکەینەوە. کۆنە عەریـفەکەش پشـتگیریی کـرد. منـیش پێشـنیازەکەیانم پەسـەند کـرد. هەردووکیشـــیان قـــایلبوون، ئەگەر پێویســـتیش بکـــا، ببـــنە شـــاهیدی بەڵگەنامەکە. بەپێی شەریعەتی موسا، بۆ مـارەکردنی کچێک، پێویستت بە دوو شـــاهیدی شایســـتە دەبـــێ، بەڵام بـــۆ بەڵگەنـــامەی تەڵاقـــدانێکی مەرجـدار، لە زینـدانی لوکیشـکی و بـۆ کەسـێک کە لە کـانگەی دڵـتەوە

خۆشتویستبێ، ئەوا دوو شاهیدی "ناشایستە[91] ئامادەن، کە هەردووکیان ڕەبەن (زگورتی) بوون.

من خەریکی جێبەجێکردنی بڕیارەکەم بووم، ڕەفتارێکی تاڵ و دڵڕەقانەش بوو، بەڵام خۆ ئەو کارە پێویستی بە کاغەز و قەڵەم و مەرەکەب هەبوو، ئەوانەش لە زیندان و لەژێر دەسەڵاتی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی شتێکی ئاسان نەبوون. بۆ نووسینی شتێکی وەها و ناردنی بەڵگەنامەکە، پێویستی بە قایلنامەی لێکۆڵەرەوەکە هەبوو، بەڵام خۆ لێکۆڵینەوەکەش کۆتاییهاتبوو، چیدی لێکۆڵەرەوەکەم نەدەدی. بۆ ئەوەی قایلنامەی لێکۆڵەرەوەکەم وەربگرم، دەبوایە داوانامەیەک بدەمە دەست سەرپەرشتی زیندانییەکان. بۆ ئەوەی ئەو داوانامەیەش بدەمە سەرپەرشتیاری زیندان، دەبوایە پەسەندنامەی ئەفسەری بەرپرسی لاباڵی زیندانەکە وەربگرم. ئەرێ بۆ خاتری خوا، بەم جۆرە چۆن دەتوانێ تەلاقنامەیەک بنووسرێ؟ ڕۆژان هاتن و ڕۆیشتن. لەو نێوەشدا ساڵی ١٩٤٠ لە کۆتاییەکەی نزیکدەبووەوە.

لە سەعاتە بەراییەکانی یەکەمین ڕۆژی یانیوەری ١٩٤١دا، خۆمان بۆ ئێوارەی پێشتر هەر لە ژووری زیندانەکەمان ئاهەنگۆکەیەکمان گێڕا. لەڕاستیدا ئەو ڕۆژەی ساڵێکی لە ئەوی دیکە لەیەک جیادەکردەوە، لە زیندانی لوکیشکیدا هیچی جیاوازتر نەبوو لە ڕۆژانی دیکە. لە سپێدەی سەری ساڵی نوێدا هەر هەمان ئەو قاوەیەی ڕۆژانی پێشتریان پێداین لە ئەنگۆرەش لە کاتی تاریکداهاتندا هەر هەمان سووپ، ئیدی ئاو بێنە و دەستان بشۆ. فیکەی ئاگادارکردنەوەی کاتی خەویش هەر هی جاران بوو. لە کاتی ئاسایی خۆیدا لەسەر تەختەبەندەکانمان پاڵمان دایەوە. گوێمان لە تەپەی پێی ئاسایی بوو، لە پشت دەرکەکانەوە

[91]– لێرەدا مەبەست لە ئاوەڵناوی شایستە و پێچەوانەکەی، مەرجە قانوونییەکانە بۆ کەسێک کە بۆ شاهیدی دەست بدا.

دەهـات و هەر ئەوە پێشـبینی دەکرا، کە لە کونی جـودا (شـۆڤارییەوە) سـەیردەکرێین. هاوزینـدانەکانم خەویـان لـێکەوت، دوای بڕیارێـک بە نهێنـی، دوای یەک دوو سـەعاتی دیـکە مـن بێـداربوومەوە، وێـڕای هەبـوونی کـونی جـودای شـۆڤاری، خـواردنەوەیەک بە بـۆنەی سـەری سـاڵی نـوێ، ئەویـش لەو کـاتەی کـاتژمێری شـارەکە، زەنـگەکەی دەگەیشتە ژوورەکەمان، لە نیوەی شەودا لێیدا. ئیدی ئەوان بانگهێشتی سەر ئاهەنگیان کردم و منیش پەژراندم.

لە ڕۆژی پێشـتردا، ئامادەکاری پێویسـتمان کردبـوو، بەڵکو شـتێک بـۆ خـواردنەوەی شـەو دابینـبکەین. ئـێمە بە تەنیـا هەر نیـوەی قـاوەکەی بەیانیمـان خواردبـۆوە. خـۆ ئەوەش شـتێکی هیچـی زینـدانی دەسـتی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نەبوو، ئەوەی کاتێک لە خەو ڕادەبێ، ئەوەی دەچێـتە سـەر پـێخەفەکەی، بە شـەو و بەڕۆژ، لە خەو و لە سـەعاتەکانی ڕۆیشتنیشـیدا هەر برسـییە و هەر برسـی، مەگەر تەنیـا لە خەونەکانیدا تێر بێ.

زەحمەتترین شت بۆ زیندانیی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هەڵگرتنی بەشێک لە خورادنەکەیەتی، یان لێکردنەوەی پارچەیەک نـان و هەڵگرتنی بۆ دواترە. زۆر زیندانی هەبوون، ئەوەیان پێنەدەکرا، لەژێر هەر بارودۆخێکدا بوایە نەیاندەتوانی جڵەوی برسیەتییەکەیان بگرن و هەر لە بەیـانیەوە ئەوەی بۆیـان دەهـات، هەڵیـان دەلووشـی و پـارچە سەموونەکەیان قووت دەدا، بێ ئەوەی هیچ بۆ دواتر بهێڵنەوە، ئیدی تـا ڕۆژی دواتـر هەر بە برسـێتی ڕایاندەکێشـا. ئـای بە چ ئیـرەییێکەوە چاویـان لە هاوزینـدانیەکەیان دەکـرد، کە دەیـانتوانی نـانەکەی خۆیـان بـکەنە سـێ پـارچە، بـۆ بەیـانی، بـۆ نیـوەڕۆ و بـۆ شـێوان، شـتێکی لێهەڵبگـرن! جـار لەدوای جـار بەڵێنیـان بە خۆیـان دەدا، ئەوانـیش وەهـا بـکەن: "تەنیـا یەک پـارچەیەکی دیـکە، ئینجـا ئەوی دیـکە بـۆ دواتـر هەڵـدەگرم؟ ئـای چەنـد جـاران ئەوان بەڵێنەکەیـان شـکاند؟ هەروەک

بەدمەستێک بەڵێنیان بە خۆیان دەدا، کە ئەمە دوافڕیان بێ، ئینجا قومێکی دیکە و فڕێکی دیکەیان لەسەر دەکرد، ئیدی بۆ بەدبەختی زۆریان هەروایان کرد، لە برسان بڕستییان لێبرابوو، پارچە نان دوای پارچەنانیان لوول دەدا و دەیانخستە نێو دەمیان، هیچیان نەدەهێشتەوە، بەم جۆرە دەبوایە تا سپێدەی پاشتر بە سکی برسی کاتەکە بەسەر بەرن، چاوەڕێی پارووە نانی داهاتوویان دەکرد تا هەڵیلوشن.

لە هەر زیندانێک کە بۆی چووم و لە هەر کۆڵێتێکی ئۆردوگای زۆرەملێ کە تێیخزێندراوم، تا ئەو ڕادەی پەیوەندی بە نانەوە هەبێ، دەکرا زیندانییەکان بەسەر دوو بەرەدا پۆلین بکەی: ئەوانەی هەموو خواردنەکەی خۆیان بە یەکجار هەڵدەلووشی و ئەوانەی دەستیان بە نانەکەی خۆیانەوە دەگرت، بەڵام هەر هەمووشیان هەر برسی بوون. لە نێو ژوورە بچکۆلەکەدا، ئێمەش ببووینە دوو بەش. کۆنە عەریفەکە هیچی بۆ خۆی نەدەهێشتەوە. لای خۆی بڕیاریشیدەدا، شتێک بهێڵێتەوە، پارچە نانێک پاشەکەوت بکا بۆ دواتر، بەڵام بە دەگمەن بەڵێنەکەی خۆی دەبردەسەر. کەچی ئەفسەرەکە و من هەندێ لە خواردنەکەمان هەڵدەگرت. تەنانەت ئەفسەرەکە بۆ پاشەکەوتکردنی خواردنەکەی پێوەری شکاند، منیش چاوم لە ئەو کرد. هەردووکمان بەشە خواردنی خۆمان، بەشە نانەکەمان نەوەک هەر دەکردە دوو بەش، بەڵکو دەمان کردە سێ تا چوار (!) پارچەش. خۆمان ڕاهێنابوو، پارچەنانێکی بچووک بۆ بەیانی، بۆ ئەو سەعاتە زۆرانەی بەیانی پێش وادەی فیکەی دابەشکردنی سەرلەنوێی نان، بهێڵینەوە. شەرم لە خۆم ناکەمەوە، دان بەوەدا بنێم، چەندین ڕۆژ هەبووە، لەگەڵ هەڵسانەوەم یەکسەر چاوم لەسەر ئەو پارچە نانە بووە، کە هەر بە قەدەر یەک دەنکە زەیتوون دەبوو، لەسەر ڕەفەم دانابوو. ئای چەند دڵخۆش دەبووم کاتێ پارچە نانەکەم هەر لە شوێنی خۆی مابوو! ئای چەندیش بە تام بوو! تۆ بڵێی ئەوانەی شتی بەتام دەخۆن، تامەکەی بزانن؟

شتێکی ئاسانیش نەبوو قومە قاوەیەکی بەیانی هەڵبگری، بینینی ئەو قومە قاوە بۆرەیە هێشتا هەر لە نێو کوپەکەتدا ماوە و نەخوراوەتەوە. شتەکە شتێکی ئاسان نەبوو - بەتایبەتیش بۆ نەوسن[92] - کە ببینی پەرداخێکی نیوەپڕ، دەفرێکی بەسەردا دراوە، لەسەر ڕەفەکە دانراوە و بە درێژایی ڕۆژەکەش دەستی لێنەدراوە. بەڵام خۆ نەوسنیش بۆ شەوێک خۆی دەگرێ، سەری ساڵ کۆتایی پێدێ و ساڵێکی دیکە دێ، ئیدی مرۆ دەبێ بەگوێرەی دابونەریت، گەرووی خۆی هەندێ تەڕ بکا. لێرە کە نە ڤۆدکا هەیە نە هیچ، دەی با قومێک "قاوە" بخۆینەوە!

گومانم نەبوو گەر لە گێژەنی شەوی سیلڤیستەردا[93]ی زیندانی یەکێتیی سۆڤیەتییدا هەڵنەستابامایەوە، ئەوا کۆنە ئەفسەرەکە خەبەری نەدەکردمەوە، ئەویش بە "سەعاتی هەناو"ی خۆی کە دەنگدانەوەی سێ چارەگەکەی کاتژمێری شار بوو، هەڵدەستایەوە. منیش دوای ماوەیەکی دوورودرێژی لێکۆڵینەوە نوستبووم، لەوەش خەو قووڵتر نەبوو. ئەفسەرەکەش خانەخوێ بوو. ئەو بە هێواشی لەسەر چوارپایەکەی هەڵسایەوە و دەستمان دایە کوپەکانمان. ئێمە لەسەر لای چوارپایەکە دانیشتین و چاوەڕێمان کرد، بێدەنگی باڵی بەسەر دەوروبەرماندا کێشابوو. لە پڕێکەوە پەردەی بێدەنگی دڕا. کاتژمێرەکە لێیدا: یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج ... ئەوەش دوازدە! ئێمەش هیوای "ساڵێکی خۆش"مان بۆ یەکدی خواست و "پەرداخەکانمان" بەرزکردەوە. کووپەکانمان لەیەک دان و بە بۆنەی سەری ساڵی نوێوە خواردمانەوە.

ئێمە نەمادەزانی، نەوەک هەر پێدەنێینە ساڵێکی نوێ، بەڵکو دەچینە قۆناغێکی نوێشەوە. ساڵی ١٩٤٠ تێپەڕی، ساڵ، ساڵی سەرکەوتنی

---

[92]– نەوسن: کەسێک کە زۆر حەزی لە خواردن و خواردنەوە بێ، خۆی لەبەر ڕانەگرێ و دەمودەست هەڵیقۆڕێنێ یان حەپەلووشی بکا و هیچ بۆ دواتر نەهێڵێتەوە.

[93]– مەبەست دواشەوی ساڵە، شەوی ٣١ی دیسێمبەر.

ئاڵمـان بـوو بەسـەر فەرەنسـە، سـاڵی «داونـکەرکە[94]» بـوو، سـاڵی گۆڕینی سڵاوی نێوان هیتلەر و ستالین، ساڵی پەیمانی خوێنی نێوان ئاڵمان و مۆسکۆ بوو. ساڵی ١٩٤١یش هات، ساڵی هێرشی ئاڵمان بۆ سـەر ڕووسـیا، سـاڵی پەلامـاری ژاپـۆن بـۆ سـەر ئەمریکـا، سـاڵی پەڕینەوەی گڕی ئاگری جەنگ لەم کۆتایی جیهانەوە بۆ ئەو کۆتایی جیهـان، بـۆ ئـێمەش سـاڵی ڕۆیشـتن و ونبـوون بـوو بـۆ بـاکووری هەرەدوورەدەست ...

ئێمە ئەو شـتانەمان نەدەزانـی، بەڵام خواردمـانەوە، پەرداخەکانمـان تـا چۆڕاییان[95] تێداما، هەڵمانقۆڕاندن.

چەنـد ڕۆژێکـی کەم دوای "ئـاهەنگی" سـەری سـاڵ، دەرکەی ژوورە زیندانییەکەمان کرایەوە، گوێم لە سرتەی پرسیارێک بوو: "کێ ناوەکەی بە (ب) دەستپێدەکا؟"

پرسیارەکە سەرسامیکردم. تۆ بڵێی لێکۆڵینەوەکە دەستی پێکردبێتەوە؟ خـۆ ئەگەر وەهـاش بـێ، دەبـێ شۆڕشـێک لە نێـو دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بەرپابووبێ؟ ئاخر کاتەکە ڕۆژ بوو، شەو نەبوو. باشـــە بـــۆچی بە ڕۆژی ڕوونـــاک پرســـیارم لێـــدەکەن؟ بەڵام کاتێـــک دەرکەی ژوورە زیندانییەکە کرایەوە و لە گۆشـە تەسـکەکەدا نوێنەری دەزگەی ئاسـایش وەسـتابوو، لیسـتێکی بە دەسـتەوە بـوو، چـاوەڕێی وەڵامیـدەکرد، کـاتی ئەوە نەبـوو پرسـیاری ئەوەی لێبکـرێ و چـی و چۆن. مرۆ دەبوو وەڵامی بداتەوە.

---

[94]– مەبەست ئەو کشانەوە سەرکەوتووانەکەی سوپای بەریتانیا بوو، لە بەرەی داونکەرکەی فەرەنسی بۆ دیوی بەریتانیا. بەمە سوپای بەریتانیا لە تەفروتوناکردن و بەریتانیاش لە داگیرکردن پارێزرا. شایانی باسە سووربوونی چەرچل لەسەر بڕیاری ملکەچنەکردن بۆ ئاڵمان و کشانەوەی داونکەرکە شتێکی چارەنووسسازانە بوو بۆ وڵاتەکە و بۆ چارەنووسی جەنگەکە.

[95]– چۆڕایی: دوادڵۆپ.

دوای ئەوەی وەڵاممدایەوە، ناوی خۆم و باوک و باپیرم پێگوت، کابرا گوتی "بە کەلوپەلەکانیشتەوە."

ئەمەش بڕیارێکی دیکەی دەزگەی ئاسایش بوو، لە نێو دیوارەکانی زینداندا سەدای دایەوە، هەندێک جار بە ڕۆژ و هەندێک جاریش بە شەو. لەجیاتی ئەوەی بڵێ "کەلوپەلەکانت بپێچەوە و لەگەڵمان وەرە" ئەو ڕستە پەڕێندراوەی: "بە کەلوپەلەکانیشتەوە". لێرەدا بۆنەی وەها هەبوون مرۆ هیوای لێپەیدا بکا؛ بەگشتیش ترسێکی قووڵی لێ پەیدادەبێ. حاڵەتی ئازادکردن لە زیندانی بندەستی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لەوانەیە لە هەزار کەس یەک، یەک لە دە هەزار یەک بێ و فەرمانەکەش واتای ماڵ بگەیەنێ! بەڵام خۆ فەرمانەکە واتای دیکەش دەگەیەنێ: بەرەو شوێنێکی نادیار.

هەر لەبەر ئەوەشە ترس لە دڵی زیندانی زیاترە لە هیوا.

پاش ئەوەی دواجار گوێم لە لێکۆڵەرەوەکەم بوو، هیچ خەیاڵم لەسەر واتای وشەکانی "بە کەلوپەلەکانیشتەوە" هەڵنەچنی.

کۆنە عەریفەکەی هاوزیندانیم پێیگوتم: "تۆ بۆ ژوورە زیندانێکی دیکە دەگوازرێیتەوە."

منیش هەروەها بیرملێکردبووەوە.

عەریفەکە ئەوەندەشی لێزیادکرد؛ "حەیف، هێشتا زۆری مابوو تا فێری ببین."

منیش هەر وەک ئەو بەداخ بووم.

لەو ژوورە بچکۆلەی زیندانەدا، پتر لە سێ مانگ تێیدا مابوومەوە؛ واتای ئەوەی دەگەیاند سەد ڕۆژ و سەد شەوی ڕەبەق لە زینداندا بووم. خەریکبوو لەگەڵ هاوزیندانەکانم ڕادەهاتم، هەروەها ئەوانیش.

لەوێش ئاستەنگ لەنێوانماندا هەبوو. تەنانەت دەمەقاڵێشمان لەگەڵ یەکدا هەبوو. بەڵام توانیشمان یەکدی بناسین، بەیەک ئاشنابین، ڕاهاتین لەیەک تێبگەین و گەردنی یەکدیش ئازاد بکەین. ئێمە کۆمەڵگەیەکی بچکۆلەمان لەنێو خۆماندا پێکهێنابوو، قانوون و عورفی نەنووسراویشمان لەنێواندا هەبوو. لێرەدا کەمێک دەرسمدایەوە و زۆریش فێربووم. لێرەدا بەنێو لێکۆڵینەوەدا شۆڕببوومەوە؛ لێرەدا بڕیارێکی دڵشکێنیشم دا ... بە داخەوە مایەی بەزەیی بوو ... مەراقبووم ئاخۆ هاوژووی دیکەی زیندانیم کێ دەبن.

بەڵام خۆ لە زینداندا کاتی ئەوەت نییە کوڵی دڵت هەڵبڕێژی. لە دەمی پاسەوانەکەوە هاوارکرا، قیژەیەک، لە زیندانێک بۆ یەکێکی دیکەی نێو قەڵەمڕەوی یەکێتیی سۆڤیەتیدا، گوێت لێدەبووەوە، ئەمەش بۆ هەموو زیندانییەکان، بۆ هەموو ئەوانەی لە وێستگەیەکەوە بۆ ئەوی دیکە دەگوازرانەوە، بۆ هەموو ئەوانەی لە ئۆردوگای زۆرەملێ بوون وەک یەک سەدای دەدایەوە: "Davia! Paskaraya! دەی خێراکە، دەی بە پەلە"! منیش دەبوایە هەر بە پەلە کەلوپەلەکانم بپێچمەوە و خواحافیزی لە هاوژوورەکانم بکەم.

کۆنە عەریفەکە، کوپ، دەفر و کەوچکە دارینەکە لەسەر ڕەفەکە بۆ هێنامە خوار. ئەوەش ئەو کەلوپەلانە بوون، کە زیندانیی لێنەدەگەڕا لێیجیاببنەوە. منیش جلەکانم کۆکردنەوە. خۆ زۆریش نەبوون. لەو ماوەیەدا هەر دەستە جلێکی کەتانم پێگەیشتبوو. لەنێو یەکێک لە پارچە جلەکاندا، گەنجینەکەم ئاشکرا بوو، هەر چەندە بچکۆلانەش بوو. ئەویش فلچەی ددان بوو. ئای لەو شتە وردانە! ئێمە هەمیشە بە دوایدا دەگەڕاین، دڵنیاش بووم گەڕانی ئێمە بە دوای ئەو شتانە زیاتر بوو لە کنەوپشکنینی کاربەدەست و پاسەوانانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی. خۆمان بە دوای هێمایەک، بە دوای هەڕەشەیەک دەگەڕاین؛ بەڵکو لە نێو سەردەستە، لە بن یەخەکان

شاردرابێتەوە. هیچمان نەدەدیتەوە. تەنانەت بە بێ ئەوەش، کەسێک هەبوو بیری دەکردی، کەسێک هەبوو خەمی لێدەخواردی، کەسێک هەبوو بیری لێدەکردییەوە ...

"دەی خێرا بە،" پاسەوانەکە وەهای پێگوتمەوە. بەڵێ دەبێ بوخچەکەت تێکبنێی و بڵێی خواحافیز.

عەریفەکەی خوێندکارم هەڵسا یارمەتیم بدا، بەڵام هاوزیندانیەکەی دیکەم کڕوبێدەنگ لەولا وەستا بوو. وەک ئەوەی بەختمان هەبێ، ئەو لەبەر پەلامارێکی ڕێکخستنی خۆیدا بوو، یەکێک لە پەلامارە توندەکانی، بۆیە لە ماوەی بیست سەعاتی ڕابردوودا نە لەگەڵ من نە لەگەڵ عەریفەکەش قسەی نەکردبوو. باشە ئەدی چۆن بەجێیبێڵم؟ بەڵام خۆ کاتی بیرکردنەوە نەمابوو، هیچ کاتێک بۆ "ئاشتبوونەوە" نەمابوو لەدەستیدەم، ئیدی هەمیشە و بەگوێرەی پەسەندنامەی خۆم. من دەستم درێژکرد، ئەویش هەموو شتێکی پێشووی فەرامۆش کرد و بە گەرمی دەستی گووشیم.

"خواحافیز، بەختێکی باش!"

کۆنە ئەفسەرەکە توانی بەجۆرە هاوارکردنێکەوە ئەمە بڵێ: "پێمباشە جارێکی دیکە بیر لە پرسەکە بکەیتەوە، منیش هەروەها."

"سوپاس، زۆر سوپاس. خواحافیز، بەختێکی باش!"

منیش لە مەبەستەکەی گەیشتم. هێشتاش پێمنەکرا بوو تەلاقنامەکە بنێرم.

پاشان دەرکەی ژوورەکە لە پشت من و لەڕووی هاوزیندانییەکانم داخرایەوە.

ئەوەبوو جارێکی دیکە، نەمبینینەوە.

١١

# مانگرتن له خواردن

ئەو ژوورە منیان بۆ برد، گەورە و درێژ بوو، ژوور نەبوو قاوش بوو. دوازدە چارپایەی ئاسنین بە دیوارەکە هەڵنرابوون، بەڵام قاوشەکە جمەی دەهات، نزیکەی سی (٣٠) کەسی تێدا بوو. هیچ ژوورێک وەک ئەوێ نەبوو. پێخەفەکانی ئەو قاوشە[96] گشتییانە بۆ ئەوە نەبوون دابنرێنەوە بهێنرێنە خوارەوە، هەروەک پێخەفی ژووری تەنیایی، کە ئەویش بۆ ئەوە نەبوو ڕابخرێ. ئێمە هەموومان هەر لەسەر ناوکەوەکە دەخەوتین.

بەشی زۆری زیندانییەکانی ئەوێ سەر بە سوپای پۆڵۆنی بوون. لەنێویاندا ئەفسەرێک هەبوو، بۆنی ساردی لوولەی دەمانچەی لێکۆڵەرەوەکەی کردبوو. من دووواندم، بەڵام خۆ مەحاڵ بوو خۆپارێزییەکەی بشکێنی. ئەو ئەفسەرێکی سەر بە هێزی سوارە بوو، وەک هەر سەربازێکی هێزی سوارە کەمبین و سنووردار بوو، وەک سەرکەشی ئەسپەکەشی خۆشاناز بوو.

---

[96]– نووسەر لێرەدا باسی دوو جۆرە ژووری زیندان دەکا، ژوورێکی ئاسایی کە جێی یەک تا سێ کەسی تێدا دەبێتەوە، لەگەڵ ژوورێکی گەورە کە جێگەی زیاتر لە دە کەسی تێدا دەبێتەوە، ئینجا ئەو ناوی ژووری بەکۆمەڵی لێناوە، وەک زانیومە و بە پرسیاریش زیاتر بۆم ڕۆنبووەتەوە، بۆ ئەو ژوورە گەورەیەی نووسەر باسی دەکا، وشەی قاوش پڕ بەپێستیەتی، هەرچەندە لەوانەشە قاوش زیاتر بۆ هۆڵی نەخۆشخانەکان بەکار بێت، بەڵام بۆ زیندانەکانیش هەر بەکار دێ.

لێرە شتێکی ئەوتۆ نییە دەربارەی قاوشەکە بگوترێ. هەر بۆ تەنیا چەند ڕۆژێکی کەم لەوێ مامەوە. لەوێوە لەگەڵ ژمارەیەک لە زیندانیان، براین بۆ قاوشێکی دیکە. بەڵام بەر لەوەی لەو قاوشە نوێیەشم ڕابێم و هاوژوورەکانم بناسم، دیسان گوێزرامەوە - کەسیش نەیدەزانی مەبەست لەو گواستنەوانە چییە - قاوشی سێیەم، ئیدی هەر لەوێ مامەوە تا زیندانی لوکیشکیم بەجێهێشت. ئەو ڕۆژەی گەیشتمە ئەو قاوشە جێگیر و هەمیشەییەی خۆم تا ئەوکاتەی لە لوکیشکی بووم، گرێی ئەو مەتەڵە بچکۆلەیەم هەڵهێنا، کە لە ڕۆژانی لێکۆڵینەوەکەدا لێم عاسێ ببوو. شەوێکیان لە درێژەی گفتوگۆی لێکۆڵینەوەکان، باس هاتە سەر بابەتی تیۆری مارکسیزم، کۆمۆنیزم و زایۆنیزم، ئەوسا لێکۆڵەرەوەکە لێیپرسیم: "ئەرێ «بێرنستاین» دەناسی؟"

"بەڵێ،" منیش وەها وەڵامم دایەوە؛ "شتم لە بارەیەوە خوێندۆتەوە. ئەو دامەزرێنەری ڕیڤیژیۆنیزم (نۆژەنکردنەوە) بوو لە نێو سۆشیالیزمدا."

"ئەوە باسی چی دەکەی؟" لێکۆڵەرەوەکە ئاوەها و بە حەپەسانەوە لێم هاتە دەنگ.

"سەبارەت بە «بێرنستاین»، سەبارەت بەو بەڵگەوبەندە مەزنەی لە نێوانی ئەو و «کاوتسکی»دا هەبوو."

"ئۆو، وای لە تۆ و لە فڵتەفڵتەکەت!" لێکۆڵەرەوەکە هاڕاند[97]ی و لەسەر بابەتە سەرەکییەکەی خۆی ڕۆیشت.

منیش لێیتێنەگەیشتم. هەینێ نە لە واقوڕمانی لێکۆڵەرەوەکەم و نە لە پلارە تەوساوییەکەی نەگەیشتم، ئەو تێنەگەیشتنە هەر مایەوە تا گوێزرامەوە قاوشی چوارەمی زیندان. نەریتئاسا خۆم پێناساندن، ناوی

[97]- هاڕاندن: هاوارکردن، قیژاندن.

خۆمم بۆ گوتن، ئەوانیش خۆیان بە من ناساند. یەکێک بە دەنگێکی بەرز و مەحکەمەوە گوتی: "بێرنستاین."

«مۆردەخای بێرنستاین» یەکێکبوو لە سەرکردە جووەکانی پارتی زایۆنستی دژەزایۆنیزم لە پۆلۆنیا، کە بە «بەند» ناسرا بوو. لێکۆڵەرەوەکەی زیندانی لوکیشکی مێجەرەکەی هاوڕێی لێکۆڵەرەوەکەم بوو. بێ گومان هەردوو لێکۆڵەرەوەکە "ڕامان"ی خۆیان لەسەر مەعمیلەکانیان دەگۆڕییەوە. ئیدی پرسیارە ڕێکەوتەکەی لێکۆڵەرەوەکە سەبارەت بە «بێرنستاین» شتێکی ناسروشتی نەبوو، بەڵکو ڕاستییەکی حەپەساوی ئاشکراکرد. ئەفسەرێکی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، کە شاگردێکی قوتابخانەی مارکسیزم، مریدێکی شۆڕشەکە بوو، گوتەکانی لە کورتەیەک لە مێژووی پارتی بەلشەفی بە نموونە دەهێنانەوە، هەرگیز گوێی لە ناوی «ئێدوارد بێرنستاین» نەببوو، هەر وەک من لە زۆر لە پێشێلکارییەکانم، گوێم لەناوی «مۆردەکای بێرنستاین » نەببوو. پەروەردەی مارکسیستەکانی سۆڤیەت بۆ نەوەی نوێ تاکڕەهەندانە بوو، زۆر دوور بوو لە وەی مێژووی مارکسیزم مشووری بۆ دەخوارد.

«بێرنستاین» بووە مایەی پێکەنین، کە باسی بەدحاڵیبوونی ناوەکەم بۆ کرد. منیش بە پرسیارەکەی لێکۆڵەرەوەکە سەبارەت بە پێگەی ڕیڤیژیۆنیستی بەندیت لەنێو ئینتەرناسیونالیستی دووەم، پێکەنیم. ئەو جیاوازییە ئایدیۆلۆژییەی بیروبۆچوونی نێوانمان نە دەکرا بە پردێک بەیەک بگەیەندرێ، تەنانەت لە شوێنێکی وەک لوکیشکیش هەر نەدەکرا. بەڵام پیاوەکە خاوەن دڵێکی باش بوو، عیبری دەزانی، تەنانەت دەیتوانی لەو کاتەش پێبکەنێ، کە سەری شتەکانیش بە قوڕ گیرابێ. ئیدی ئێمە بوینە برادەری زۆر باش.

من سەرکردەیەکی دیکەی «بەند»یم لە زیندانەکەدا دۆزییەوە. ئەویش «د. لیفشیتز» بوو، لە نەشتەرگەری ددانددا پزیشکێکی بەناوبانگ بوو لە

«وارشـۆ». ئەو وەک دوژمنـی گەل، وەک نـوێنەری بـۆرژوازی لەنێـو چینی کرێکاراندا و وەک "ناپاکێک لەگەڵ پۆلیسی پۆلـۆنی دژی پارتی کۆمۆنیست" تۆمەتباکرابوو، گیرابوو. ئەویش هەر وەک برادەرەکەی بە لێکۆڵەرەوەکەی خۆی گوتبوو، کە پارتی کۆمۆنیستی لە پۆلۆنیادا پڕ ببوو لە ئاژانی پۆلیسی و ئەو شتەشی وەک ڕاستی دەهێنایەوە بەوەی «کـۆمینترن» پـارتەکەی بـۆیە هەڵوەشـاندبووەوە چـونکە لە ئـاژانی هەسـتیار و وروژێـنەر سـیخناخ ببـوو. هەر بـۆیە دەسـت لە سـەرانی «کـۆمینترن» نەدرا. بەڵگەوبەنـدەکەی ئەویـش هـیچ دادی نەدا. ئەویـش وەک دژەئەرگومێنت گوێی لە بەندوباو بـوو، وەک ڕیزپەڕ تەماشـاکرا. بەڵام ئەو لە زینـدانـــدا ئـــازاری زۆری بینـــی، بەتـــایبەتی بە دەســـت برسیەتییەوە. بە پێچەوانەی هـاوڕێکەی و بە پێچەوانەی منیشـەوە، ئەو هەر بە سروشـتی خـۆی کەسـێکی ڕەشـبین بـوو. بەڵام لە سـەرێکەوە، بیروبۆچـوونێکی گەشبینانەشـی دەربـڕی: "ئەگەر هیـتلەر بـبەزێ،" ئەو قسـەکەی وەهـا کـرد و دانیشـی لەسـەر وشـەی ئەگەر دانـا، "تـۆی زایۆنیست بەری سـەرکەوتنی دەڕنییەوە چونکە بە دڵنیـاییەوە ئەوکات بەریتانیـا دەوڵەتێکتـان دەداتـێ." بە کـردەوەش بەریتانیـا دەوڵەتـی نەدا، بەڵکـو دەوڵەتەکە ڕۆنـرا. خـۆ نـاکرێ مـرۆ کتومـت بە دوای بەدیهـاتنی پێشبینییەکاندا بڕوا.

لە قاوشەکەدا، کە ١٦ پێخەف و بەژمـارەش شەسـت گیـراوی تێدا بـوو، جـــووێکم دۆزیـــیەوە. ئەو نە ســـەر بە «بەدیســـت»ـــەکان بـــوو نە زایـــۆنیزمیش بـــوو. ئەو بە هـــیچ شـــێوەیەک نە ســـەرکردە بـــوو نە سیاسـیش. ئەو دزێکـی وارشـۆیی بـوو، کەسـێکی لێـزان و دێـرین لەو هـێڵەی گرتبـوویە بەر. باشـە ئەرێ ئەو چـۆن خـرایە بەنـدیخانە بەبـێ ئەوەی بتوانێ شتێک لە «ڤیلنا» بدزێ؟ باشـە ئەو چـۆن خـرایە قاوشـی سییاسییەکان، کە پڕ بوو لە بیچمی ناسـراو، ئەفسـەری پلەبـاڵا، دادوەر، مامۆستا، ئەفسـەری پۆلیس و جێگری وەزیری کاروبـاری حکوومەت؟ زۆر بە ئەستەم گومـان لە شـارەزایانی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی

سۆڤیەتی دەکرا، کە لەنێو ئەو هەموو خەڵکەدا بەدوای دزاندا بگەڕێن و وەک نوێنەری ئەوان بیانگرن و گوێیان لێبگیرێ. هەر بە ڕاستیش ئەو کەسێکی شەرمن بوو، لەوانەیە هەر بە سروشت وابووبێ یان بە هۆی ئەو کۆمەڵگەیە بووبێ کە کەوتبووە نێویان، بەڵام لە پیشەکەی خۆی بەهیچ شێوەیەک شەرم لەخۆکێش نەبوو. هەر لە بەر پیشەکەشی، زۆر لە زیندانییەکان وریابوون و لێینزیک نەدەکەوتنەوە، تەنیا لە کاتی گەمەی دامە نەبێ. دزەکە لە گەمەکەدا مەعلان بوو، لە هەموو ڕۆشنبیرەکانی دەبردەوە، خوانەخواستە ئەوانیش نەیاندەویست فەندوفێڵی پیشەکەی لێفێرببن، بەڵکو چۆنەتی جووڵاندنی داشی دامە و گەمەکانی لێفێربن. تۆ بڵێی ئەویان بۆیە هێنابێتە قاوشەکە تا زیندانەییەکان لێی وریا بن و ئەویدیکە فەرامۆش بکەن - ئەمجارەیان ڕۆشنبیرێک - کەسێک خرابووە نێو زیندانییەکان کە دەیزانی چۆن بدوێ و چۆن خەڵکیش بهێنێتە قسە؟ گریمانەی فێڵێکی دووسەرە بەتایبەتیش لەنێو کاروباری پۆلیسی نهێنیدا، هەمیشە بە شتێکی لۆژیکی دادەندرا. بەڵام گفتوگۆیەکی زۆر لەگەڵ دزەکەدا، پێموابێ لەم دۆزەدا شتەکە زۆر سادەتر بوو. ئەو هەوڵیدا بوو بگاتە «ڤیلنا»، ئیدی ئەو شتانەشی لێگیرابوون، کە لەکاتی بۆمبارانکردنی وارشۆدا بەدەستی هێنابوون. (د. لیفشیتز کە گوێی لە چیرۆکەکەی ببوو، بە توندی سەرکۆنەی کردبوو، کە چۆن ڕەوشەکەی بۆ خۆی قۆستۆتەوە. دزەکەش بە لەسەرخۆیی وەڵامی دایەوە: "خۆ ئەگەر منیش نەمبردبا، یەکێکی دیکە هەر دەیبرد، کەواتە جیاوازییەکە لە چی دایە؟") کاتێک کابرا لە سنوور نزیک دەبێتەوە، لە لایەن دەستەیەکی گەڕۆکی سۆڤیەتی دەگیرێ، ئینجا نەوەک بە دزی و تاڵانوبڕۆ تۆمەتبار دەکرێ، بەڵکو بە تۆمەتی سیخوڕیکردن! "باشە من چ جۆرە سیخوڕێکم؟" ئیدی بابای دز وا لێیدەپرسین. ئەو هەر لەو کاتەی کڕوکاڵ بووە بە زیندان ئاشنا بووە، بەڵام لەوە تێنەدەگەیشت، کە لەبەر تاوانی پیشەکەی (کە دزییە) نەخراوەتە بەندیخانە. لە زیندانیشدا هیچ وەڵامێکی ئەو پرسیارەیان نەدایەوە، بەڵام لەو نێوەدا پلەکەی بۆ تاوانباری سیاسی

بەرزکــرایەوە و وەک ســـیخوڕێکی نێــو "ســـیخوڕەکانی بــۆرژوازی ئاژانەکانی ئیمپریالیزم" لەقەڵەمدرا.

ئەو قاوشــە گەورە وەک کــوورەی هەنـگ وابـوو، هاوزینـدانێکی تەمەن حەفتاوهەشـت سـاڵە، کە کـاتی خـۆی کۆلۆنێـل بـووە لەگەڵ برادەرێکـی خــۆم دۆزیەوە لە ســوپا کــۆنە مــێجەر بــوو. ئیــدی بە ڕۆژ گفتوگــۆ گەرموگوڕ بوو. وەک ڕێسـایەکیش ئەو باسوخواسـانە بەسـەر گرووپە لە یەک جیاوازەکان دابەشـببوو. لە هەر کۆمەڵگەیەکیشـدا مرۆ بە دوای کەســانی نزیــک لە خــۆی دەگەڕێ یــان ئەوکەســانەی کە دیــارن لەو نــزیکن. لە زیندانیشـــدا جــۆرە یــانەیەکی تــایبەت هەبــوو. بەڵام لە قاوشەکەی ئێمەدا زینـدانی وەهـای تێدابوو، هەوڵیاندەدا گیـانی بـاش و ورەی بەرز بپــارێزن. هەر بە دەستپێشــخەری ئەوان، خــول لەســـەر زمان، لەسـەر وێژە و مێژوو ڕێکخران. ئێمەش موناقەشـەی گشـتیمان دەکـرد. لەنێـو زۆر شـتدا، لە کەسـێکی نەخوێنـدەوار، کە هەرگیـز نـاوی «ماتەرلینک[98]»ی نەبیسـتبوو، گوێگری بابەتێـک بـووین لەسـەر ژیـانی مێشەهەنگ، چونکە کابرا زانیـاری سەرسـوڕهێنەری لەسـەر کاروبـار و شـێوەی ژیـانی هەنگـدا هەبـوو، ئـاخر پیشــەی بـوو. ئـێمە بـۆ چەنـدین سـەعات گوێمـان لێگـرت، ئەویـش باسـی "شانشـینی" هەنگی بـۆ کـردین، ئینجــا ئــێمە بە یەکــدەنگی ڕامــان وابــوو، کە بــابەتەکەی ئەو، لە زۆر لەوانەی خاوەن پلەوپایەی خوێندنی باڵا بوون سەرنجڕاکێشتربوو.

بـۆ ئەوەی خۆمـان لەبیـربکەین، کێبەرکێـی دامە و شــەترەنجمان لەنێـو خۆماندا ڕێکخست. داش و دارەکانی گەمەکەمان لەو پارچە نـانەی هەر بە خۆمان دەبەخشـی، دروسـتکردبوو، هەندێکیشـیان سەرسـوڕهێنەرانە جوان بوون. کاتێکیش پاسەوانەکان دەستیان بەسەر ئەو شتانە داگرت، ئـاخر ناوبەنـاو شــەوان قاوشــەکەمان دەگەڕان، ئینجـا بە شـتێکی دیکـە

---

[98] – ماتەرلینک Maurice Maeterlink(١٨٦٢-١٩٤٩) نووسەر و شاعیر و شانۆنامەنووسی بەلجیکی، کە لە ساڵی ١٩١١دا خەڵاتی نۆبلی ئەدەبیی پێبەخشرا.

یاریماندەکرد. مرۆڤ ئاژەڵێکی جڤاکییە، ئەمەش وا لە مرۆ دەکا بگاتە ئەو بەرەنجامە، قاوش باشتر بێ لە ژووری تاکەکەسی.

لە نێو قاوشەکەدا زیندانی وا هەبوو، هەوڵیان دا پەرە بە تواناکانیان بدەن ئەمەش بۆ مەبەستی زۆر کردەکی. ئەوان نەوسن بوون، زیاتر لەوەی کێبرکێکەر بن لەسەر برسیەتی، لەژێر باری برسیەتی و قاتوقڕیدا دەیانناڵاند. کاتێکیش نۆرەی سووپەکە دەهات، چ نیوەڕۆ بوایە یا کاتی شێوان، هەوڵیاندەدا یەکەمین کەس بن، وەری بگرن. ئامانەکەیان[99] بەدەستەوە بوو، دەیانەویست بچنە لای گۆشەی دیوارەکە و خێرا بەشەکەی خۆیان هەڵقوڕێنن. ئەوسا دەچوونە لای دەرکە و پێشخۆرەکانی خۆیان بە کەمەئاوەکە دەشوشت - ئاوی قاپشوشتنیش بەنرخترین شت بوو لە قاوشەکەمان - و قاپەکانیان بە خاولییێک وشک دەکردنەوە، ئینجا سەرلەنوێ لە دوای دواوەی نۆرەکە ڕیزیان دەبەستەوە، ئاخر هێشتا ڕیزەکە تەواو نەببوو، هەموویان بۆیان تێنەکرابوو. هەندێ جار کە پاسەوانەکە لە بژاردنی ئەوانەی بەشە سووپی خۆیان وەردەگرت، هەڵەی دەکرد، ئەوا دەرفەتیان هەبوو قاپە سووپێکی دیکەش وەربگرنەوە، یان لە حاڵەتێک ئێمە ئەو کەسانەمان لەنێو ڕیزەکانی خۆمان دەگرت بە شێوەیەک، پاسەوانەکە هەستی پێنەدەکرد. بەڵام لە زۆر باریشدا ئەوان بەدەر لە ڕستە جوێنێک بە زمانی ڕووسی، هیچی دیکەیان هەڵنەدەکڕاند. "هەی بە نەفرەت بی، بۆ فێڵ دەکەی؟" ئیدی پاسەوانەکە وەهای بە سەردا دەقیڕاند؛ "ئەدی بەشەکەی خۆت وەرنەگرت؟" ئەوکات نەوسنەکانیش بە شەرمەزاری و بە دەستی بەتاڵەوە پاشەکشەیان دەکرد. نەشیان دەتوانی وەڵامی سووکایەتیپێکردنەکە بدەنەوە. بۆ ڕۆژی پاشتر، هەوڵیاندەدا هەمان بەزم دووبارە بکەنەوە. ئای برسیەتی ... برسیەتی وا لە مرۆ دەکا عەقڵی لە دەستبدا و کارێکی بێشەرمانەشی پێبکا.

---

99- ئامان: قاپ، دەفر.

کاتێکیش ژمارەی زیندانییەکان زیادی دەکرد، دەرفەتی دەبڵ ڕیزبوونەوە هەبوو، دەیانتوانی بەم جۆرە دووجار قاپەکانیان پڕبکەنەوە. هەموو ڕۆژێ، هەوڵیاندەدا بەڵکو بەختیان هەبێ. خۆ نەوسنەکان پێشنیازی ئەوەیان کرد، هەموو زیندانییەکان هەروەها بکەن، بەڵام هەر زیندانییەکانی دیکە بوون، مەیلیان لێنەبوو. بۆ ئەوان بەشە ئاساییەکە "بەس بوو". تەنانەت لەو چەند بۆنە کەمانەی کە پاسەوانەکان، ئەوانەی سووپەکەیان دابەشدەکرد، جارییان دەدا کە ئەمرۆ بەشێکی زیاتریان پێدەدرێ، کە بە شکۆوە ڕایاندەگەیاند: "ئەمڕۆ بەشی زیاتر وەردەگرن"، ئیدی ئەوان، لەو بەشە زیادەیەشدا بۆ خۆیان هەڵنەدەگرت، بەڵکو دەیاندایە ئەو کەسانەی لە برسان دەیانناڵاند. برسیەتی برسیەتییە، بەڵام لێرەدا ئیرادەی مرۆ یەکلاکەرەوەیە!

شتێکی سەیریش بوو، کابرای دزەکە هەرگیز دەبڵ نۆرەی نەدەگرت. ئەو پیشەکەی هەر لە دەرەوە بەکاردەهێنا. ئەوەش بنەمایەک بوو بۆ ئەو، هەر لەوەش ئەو شتەی لێ بەدینەکرا. جارێکیان، کە دراوسێیەکی ئەو، گلەیی ئەوەی کرد، شتێک لە نێو پریاسکەکەی دیار نەماوە. شتێکی سەیر و نامۆ بوو، هەروەک لە بیرم مابێ، هەر تەنیا ئەو جارەیان، ئەم شتە لە قاوشەکەماندا ڕوویدا. هەڵبەتەدا لەو دۆخەدا، بە بیری کابرای شت لێونبوودا نەدەهات، گازاندەکە بباتە لای کاربەدەستانی زیندان. خۆی ئەوە شتێکی نێوەخۆیی بوو، دەبوایە دەسەڵاتی خۆجێی نێو قاوشەکە، کێشەکە یەکلابکاتەوە. ڕاستەوخۆش گومانەکە چووە سەر کابرای دز. بەڵام دوای کنە و پشکنینێکی نهێنی، ئەوکات لەکاتی جیاجیادا، لە نۆڕینی ئاودەست و شتەکانی دیدا بەدەرکەوت، دزییەکە لە یەکێکی "کۆمەڵگەکەی ئەوێ" ئاشکرا بوو، نەوەک لە دزە پیشەمەندەکە.

لە ماوەی زیندانییەکەدا، ئێمە تووشی دیاردەیەکی ناسروشتی دیکە هاتین. لەنێو زیندانییەکان، بەتایبەتیش لەنێو پۆلیسەکاندا، لەشساغ،

چوارشانە هەبوون؛ هەروەها کەسانی ڕۆشنبیری لەڕ و لاواز و جەستە زەبوونیش هەبوون. بەڵام هەمیشە هەر لەشساغەکان بوون داوای پزیشکیان دەکرد (کە ئافرەتێک بوو)، ئەویش ئاساییانە بە حەبێکی ئەسپرین بەڕێیدەکردن، پزیشکەکە حەبەکەی بە دەرمانی هەموو دەردان دادەنا و بەتەوسیشەوە پێیدەگوتن "خۆ من پزیشکی خانەوادە" نیم! "لەڕولاوازەکانیش" هەستیاننەدەکرد نەخۆشن و گلەییان نەبوو. دیاربوو گیانی بەرز ئەوانی ڕاگرتبوو، هەر گیانەکەبوو، ببووە قەڵغانی پاراستنی جەستەکانیان.

لەنێو ئەو چوارشانانەدا، کەسانێک هەبوون لەگەڵ هەر سەرئێشە و ئازارێکیاندا دەهاتنە لای "تەلەفۆنچییەکان". تەلەفۆنچییەکانیش ئەو زیندانیانە بوون، بە چەندین سەعات بە گوێی سووکی خۆیان لە لای دەرکە دەوەستان و چاودێرییان دەکرد، ئاخۆ کەی پزیشکەکە دێت و دەیانپشکنێ. ئەوان گوێقولاغکەر بوون. ناو بەناو لە ڕاڕەوەکە شتێکیان دەبینی یان گوێیان لە سرتەی شتێک دەبوو، ئیدی بە هاوقاوشەکەی خۆیان دەگوت، دەی کڕبن[100]، هەندێک بێدەنگ بن بزانین چییە. هەندێک جار بە گوێمان دەکردن و بێدەنگ دەبووین، بەڵام زۆر جاریش هەر گوێمان بە سەرنجەکەی ئەوان نەدەدا. ئاخر خۆ نەشمان دەتوانی هەر بە گوێیان بکەین. ئەو نمایشە ڕۆژانە و بۆ چەندین سەعات هەمان زوڕنای جارانیان لێدەدایەوە. تەلەفۆنچییەکان شوێنەکەیان بەجێنەدەهێشت و لەسەر گوێقولاغکردنیان بەردەوامبوون. جار هەبوو لە پڕێکەوە هاواریان دەکرد: "هات!" بەڵام دەردەچوو خەبەردانەکەیان ورد و دروست نەبوو. بەڵێ، ئەو دەهات، بەڵام نەوەک بۆ لای ئێمە. لەگەڵ ڕوودانی ئەو بەزمەش، کەچی هێشا ئەوان بێ تەما نەدەبوون. دوای ناوبڕێک دیسان دەگەڕانەوە سەر هەمان بە زمی خۆیان، گوێیان بە کونی دەرکەوە دەنا، هەروەک بیستۆکی گوێی

[100]– کڕبن: بێدەنگبن.

پزیشک، دیسان گوێیان ڕادەگرتەوە ... تا لە کۆتاییدا پەیدا دەبوو. ئەویش مەنجەڵەکە بوو! هەڵبەتە ئێمە بە چاوێکی لێتێگەیشتووانە سەیری ئەوانمان دەکرد. ئەو شەیتانە بەستەزمانانە پێیانوابوو بە گوێهەڵخستنیان بە هەناسەڕاگرتنەوە، بە دەنگدانەوەی تەپەی پێی ئەوانەی خواردنیان دابەش دەکرد، ئەوا دەبنە مایەی خێراترکردنی هاتنی سووپەکە کە برسیتری دەکردن. برسیەتی. هەر برسیەتی ...

ئێمە تەلەفۆنچیی دیکەشمان هەبوون. ئەوان فەرمانبەری ڕاستەقینەی خزمەتگوزاری گشتی بوون، لە لایەن هەمووانەوە ڕێزیان لێدەگیرا و خۆشیش دەویستران. ئەوان مجێزی برسیەتی جەستەیان نەدەبینی، بەڵکو هی ڕۆحیان دەبینی. لە چاکەی ئەوان، وێڕای هەموو شتێکیش، دیوارە دابڕەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دەشکێندرا (هەرچەندە هەر بە یەک ئاراستەش بوو). ئەوان دەنگوباسیان بە زیندانییەکان دەدا، هەواڵی ئەو دنیا بەرفرەوانەی کە هەمووان عەودالی بوون. دەگواستەوە.

لە یەکێک لە گۆڕەپانەکانی «ڤیلنا»، هەندێک لە دووری زیندانی لوکیشکییەوە، بڵندگۆیەک داندرابوو. ئەمەش ئەو ئامێرە بوو کە یاوەری ڕژێمی سۆڤیەتی بوو لە هەر وڵاتێک، لە هەر ناوچەیەک، لە هەر شار و لادێیەک و لە هەر گوندێکی دوورەدەست. هەر لە بەیانییەوە تا شەو، هەندێک جار لە بەیانییەوە تا سپێدەی دواتر. ئەو بڵندگۆیە بەردەوام و لەسەر یەک دوان، موزیک، گوتاری ڕۆژنامە، گۆرانی، هەواڵ، جاڕنامە، بڕیار و ڕاگەیەنراوەکانی پەخشدەکرد. هەڵبەتە ئەم میکانیزمە بەردەوامەی قسەکەری بە دیسیپلینی حیزب و حکوومەت بۆ "دوژمنانی گەل" نەبوو، بۆ ئەوان ئاراستە نەکرابوو، بەڵکو ڕووی قسەیان لە هاووڵاتییە دڵسۆزەکان بوو، ئەوانەی مافیان هەبوو ڕۆژ ببینن، ئیدی لە دەمی ئەو بڵندگۆیەوە دەیانزانی ڕەوش چۆنە و ئاخۆ چەند شادمانن. بەڵام لەو "سیستەمەی بڵندگۆ"یەدا،

کەمتەرخەمییێکی نێوخۆیی ڕوویدا، یەکێک لە لێکەوتەکانی و بە هۆی با، کە زانایانی سۆڤیەت نەیانتوانی بوو ئامێرەکە باشتر بکەن، تەنانەت بە یارمەتی کارمەندانی دەزگەی ئاسایشی هەر بەربەستیان بۆ دروست نەکرا، ئەوەبوو بایەکە کارێکی وای کرد ئەو وتانەی لە بڵنگۆیەکەدا هاتنەدەر، بە ئاراستەیەکی نەخوازراودا، بەسەر دیوارەکانی زینداندا دەهاتن، ئەوسا "دوژمنانی گەل" گوێیان لە دوان و وتارەکان دەبوو، بەڵام خۆ ئەوەش هەر قەدەغە بوو گوێ لەوە ڕابگرن: ئاخۆ چی لە جیهاندا دەگوزەرێ.

هەر بە ڕاستیش تەلەفۆنچییەکانمان هەر وەک بەلەمە چارۆکەدارە کۆنەکان، ئیشەکەیان بە ئاراستەی با بەند بوو. ئەگەر هاتبا و با باش بووبا، ئاراستەکەی لە بەرژەوەندی ئێمە بووبا، ئەوا ناو بەناو لە ڕێی ئەو "خزمەتگوزارییە گشتییەدا" دەگەیشتە ئەو دوو ژوورەی کە لە نهۆمی سەرەوە بوون و ڕوویان لە گۆڕەپانە دوورەکە بوو، ئینجا لە ڕێی ئەوانیشەوە هەواڵەکان دەگەیشتنە بارەگای سەرەکی ئێمە. ئەگەر بایەکەش بە ئاراستەی ئێمە هەڵینەکردبا، هیچ شتێک دادی نەدەدا، نە هەوڵ و ماندوبوون و گوێسووکی تەلەفۆنچییەکانمان و نە قڕوقەپلێکردنی زیندانیانی قاوشەکانیش. هەواڵەکان نەدەگەیشتن و ئیلەلا و بڕایەوە!

کاتێکیش هەواڵەکان دەگەیشتن، یەکسەر بە درێژی و پانی زیندانەکە دەگەیەندرا: بە درێژی، لە ڕێی لوولەی ئاو دەگەیشتە هەموو قاوشەکان، بە بەرینیش لەڕێی دیوارەکانەوە.

تەکنیکی گواستنەوە و گەیاندنی هەواڵەکان سادە بوو. یەک لێدان بۆ "پنت (خاڵ) بوو، دوو لێدان واتای داشی دەگەیاند. هەموو پیتەکانی ئەلف و بێ بەگوێرەی کلیلێکی ڕێککەتوو، خاڵ و داش و تێکەڵەی

هەردووکیان هەبوون. بە کورتی: «کۆدەی مۆرس»[101] پەیڕەودەکرا. ئەوەش ڕێسایەکی گشتی بوو کە "تێلێگراف"ێکی نێوخۆیی لە هەموو بەندیخانەکاندا هەبوو. شتێکی سەرنجڕاکێش بوو، تەنانەت لە زیندانی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سۆڤیەتیشـدا، گیـانی «مـۆرس» بە زیندووی و نەگیراو زاڵ بوو.

تەلەفـۆنچییە بوێرەکـانی ئـێمە لە بـن مەترسـییێکی هەمیشـەییدا کاریاندەکرد. ئەو دەمەی کاتی وەرگرتنی هەواڵەکان یان ڕاگەیاندنی شـتێکی وەهـا، دەبـوایە یەکێکیـان ببـایە پاسـەوان، لە پشـت دەرکە خۆیدانووسـاندبا[102]، بە یەک دوو هەنگـاویش ڕاسـتەوخۆ لە دووری ئەو، پاسـەوانی دووەم دانرابـایە تـا پێشـبینی لەپڕ بەسـەرردادانی[103] ئاشکرابکەن و دەمی پەنجەرە شوومەکەی جودا (شۆڤار)یش بگرن. بەڵام خۆ ئەو کردە پێشبینییە هۆشدارییانە هەموو کات دادی نەدەدا. هەنـدێک جـار، ئەفسـەری ئێشـکگر، کە بە مەبەسـت پـێڵاوی لاسـتیکی لەبەر دەکـرد، دەیتـوانی بە پێـدزیلکە بێـتە بەردەرکە، لەپڕ بیکـاتەوە و تەلەفـۆنچییەکە بگـرێ، خـۆ ئەگەر کـابراش بە داوەوە نەبـێ، ئەوا هەر هـیچ نەبـێ هەسـت بە کەسـی دیـکە دەکـا لە پەنـا دیـوارەوە خـۆی دانووسـاندووە. هەنـدێک جـار ئـێمە "بروسـکەکانمان" هەر لەو کـاتەی سـەرۆکی زینـدان یـان یەکـێ لە ئەفسـەرەکان کە ناوبەنـاو سـەردانی دەکردین پێمان دەگەیشت. ئەوسا خۆمان "کەڕە" دەکرد، هەروەک چۆن بە تەواوی دراوسـێکانمان خۆیـان "کەڕە" دەکـرد کـاتێ هەوڵمـان دەدا پەیوەنـدییان پێـوە بگـرین، ئەم دیـمەنەش لەو کـاتەدا کە ئەفسـەری بەرپـرس لە پەروەردەکـردنەوە کە لەنێـو قاوشـەکەیان ئامـادە دەبـوو.

---

[101]- کۆدەی مۆرس Morse code کۆدەیەکی پیتەکانی ئەلفبایە، کە بەدوای یەکدا دێن و هەر یەکەیان بەندە بە کورتی و درێژیی ئاماژەی ڕۆناکیی یان دەنگەکەی.

[102]- دانوسان: خۆمەلاسدان. خۆ لەبۆسەدانان. ئەم دانوسانە زۆر جیاوازە لە وشەی دانوستان، هەندێک جار بە دانوسان دەنووسرێ یان دەخوێندرێتەوە.

[103]- بەسەرردادان: پەلاماردان. هێرشکردنەسەر.

بەڵام خـۆ ئەو کەڕە نەبـوو. لێکەوتەکەشـی وەهـا دەکەوتەوە، لەپـڕ بەسـەرماندابدەن و کنەوپشـکنین دەکـرا و زۆر جـاری واش هەبـوو لە ئەنجامـدا ژووری زینـدانی تەنیـایی وەک سـزادانێک دەبـووە مەنزڵـی کەتنکەران.

وەنەبـێ ئـێمە لە ڕێـی ئەو تەلەفۆنچییـانەوە، هەر هەواڵـی بەرەکـانی شـەڕمان پێگەیشـتبا، بەڵکـو لەنێوخۆشـماندا زانیـاری و هەواڵمـان ئـاڵوگۆڕدەکرد. ڕێسـایەکی جێگیـر لە قاوشـەکەمان هەبـوو: هەر کـاتێ زینـدانییێکی نـوێ بهاتبـایە، تەلەفۆنچییەکـان دەسـتبەجێ هـاتنی ئەو کەسەیان بە قاوشی دراوسێیان ڕادەگەیاند، ئەوانیش بەهەی تەنیشتیان، بەم جـۆرە تـا هەمـوو زینـدانییەکان دەیـانزانی. نـوێنەری دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش لەسەر پرسیارەکانی خۆی بەردەوام بـوو: "کـێ بە (ئـا) دەسـت پێـدەکا؟ ئەدی کـێ بە (ز) دەسـت پێـدەکا؟" ئـێمەش بە دڵخۆشـییێکی لە بـنەوە وەڵاممـان دەدایەوە. ئەو نهێنیـیەی ئەوان دادیـان نەدان، ئێمە نـاوی هاوزیندانییەکانمان لە ئەلفەوە تـا یێ، هەمـووی دەزانـی. گومـانی تێدا نەبوو دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتیش دەیزانـی، کە ئـێمە دەزانـین، بەڵام وێـڕای ئەو هەمـوو گۆڕانکاریـانەی دەیکـرد، هیچـی پێنەدەکـرا. هۆشـدارییەکانی بەرپرسـی زیندانەکە دادی نەدەدا، هەڕەشەکانیش نەیدەترساندین؛ ژووری زیندانی تەنیـایش ئـێمەی نەدەگـۆڕی. هەنـدێ جـار برسـییەتی مـرۆ بـۆ هەواڵ، گەورەتـر بـوو لە برسـیەتی بۆ نـان، هەروەک هـۆگرێکی جگەرە، کە بە دوای قـونکە جـگەرەدا دەگەڕێ. حەزی هەواڵ زانـین بەهێزتـر بـوو لە ترسـی سزادان.

ڕۆژێکیـان هەر لە ڕێـی ئەو تەلەفۆنچییـانەوە زانـیم، کە «مـایەر شێشـکین»ی بـرادەرم هـاتۆتە قاوشـەکەی تەنیشـتمان. مـن هێشـتا هـونەری خـاڵ و داش فێرنەببـووم. «بێرنسـتاین»ـیش کە یەکـێ لە تەلەفـۆنچییە هەرەباشـەکان بـوو، هەواڵەکەی بـۆ هێنـام و منـیش

دەستخۆشیم لێکرد. «شیێشکین»ـیش لەڕێی شارەزایەکەوە، لێیپرسیم ئاخۆ «زیڤ ژابۆتنسکی» چۆنە. منیش یەکسەر وەڵامم نەدایەوە، ئاخر مەحاڵ بوو درۆ بکەی، زەحمەتیش بوو ڕاستیەکەی بڵێی. بەڵام «شیشکین» سەرلەنوێ بروسکەی لێدایەوە، لێی پرسیمەوە. "ئەرێ تێگەیشتی؟ پرسیم ئاخۆ ژابۆتنسکی چۆنە؟" منیش چارم نەما. داوام لە «بێرنستاین» کرد ڕاستییەکە بە برادەرەکەم بگەیەنێ، ئەوەندەشم بۆ زیادکرد، ئەگەر هاتوو ئێمە لە باشتربوونی خۆمان بێهیوا نەبین، دەبێ خواستەکانی «رۆش بێتار» هەڵبگرین. بۆ ماوەیەک هیچ وەڵام لە قاوشەکەی تەنیشتمەوە نەهاتەوە. دوای ئەوە، گوێمان لە زەنگی بروسکەکە بووەوە. ئاگاداریکردمەوە، دەیەوێ پێمبڵێ «کادیش»، نوێژ و درووود بۆ مردوو. ئەویش وشەی سەبووری و دڵنەوایی بۆ ناردمەوە، دیسان شەپۆلێکی خەمناکی باڵی بەسەردا کێشاینەوە.

ڕۆژێکیان سەبارەت بە بڕیارەکەم دەربارەی ژنەکەم بەر بێرنستاینم گوت. ئەویش لە لای خۆیەوە ئاشکرای کرد، کە خۆیشی بیری لێکردووەتەوە تەڵاقنامەیەکی وەها بۆ ژنەکەی بنێرێ، بەڵام هێشتا نەیناردووە، حەزیشی لێ نییە بینێرێ. ئەوەش یەکەم شت لەبەر کچەکەیان، دووەم شتیش پیاو نابێ دەستپێشخەر بێ لەوەی گومان بخاتە مێشکی ژنەکەی سەبارەت بە ڕۆژی گەڕانەوە و بەیەک گەیشتنەوە و کۆتاییهاتن بە لەیەکدابڕان. ئەو پێیگوتم کە هۆکاری دووەم، منیش دەگرێتەوە. هەر چۆنێک بێ، ئەو حیسابی ئەوەی کردبوو، باشتر وایە لە هەنگاوێکی وەها سەختگیرانەدا پەلە نەکرێ، خەم لەسەر خەم سەربار نەکرێ. ئەو زۆر بە قەناعەتەوە قسەی دەکرد، ئەویش بەنێو خۆخواردنەوەیەکی هاوشێوەی مندا ڕەتببوو. منیش بەدەر لە لێکدانەوە ئاوەزمەندیانەکەی، زیاتر هیچم نەبیست. بەڵێنمدا ڕەوشەکە هەڵسەنگێنم و جێبەجێکردنی بیرۆکەکە دوابخەم.

لەو نێوەشدا شایستەی ئەوە بووم حەفت ڕۆژی ڕەبەق بخرێمە چاوە زیندانێکی تەنیایی تاکەکەسی. من نوکتەیەکم بۆ هاوزیندانییەکم گێڕایەوە، پاسەوانەکەش، کە جوو بوو کاری بۆ دەزگەی ئاسایش دەکرد، پێیوابوو نوکتەکە لەسەر ئەوە، بۆیە لای بەرپرسی زیندان سکاڵای لێکردم و داوایکرد لەسەر سووکایەتییەکە سزابدرێم. ئینجا بەبێ ئەوەی سەبارەت بە پرسەکە قسەم لەگەڵ بکرێ، لێم بپرسێتەوە، یەکسەر سەرۆکی زیندانەکە وەک سزا حەفت ڕۆژی ڕەبەق، زیندانی تەنیایی تاکەکەسی بۆ بڕیمەوە. هیچ داوای تێهەڵچونەوەش بۆ ئەو بڕیارە نەبوو.

ئەو بڕیارە قورسەی سزادانە هەم من و هەم هاوزیندانییەکانی سامگرتی کرد، ئاخر خۆ لە نوکتەیەکی بێوەی زیاتر هیچم گوتبوو. ئەمە بووە مایەی تووڕەبوونێکی زۆر لە نێو هاوزیندانەکانم، کە زۆربەیان لە خولی هەمەچەشنەی نێو زیندانندا قوتابیم بوون. ئەوان ویستیان کاردانەوەیەک لە هەمبەر ئەو بڕیارە لە گۆترەیەی سەرۆکی زیندانندا بنوێنن، ئاخر ئەوان ئەو بڕیارەیان هەر بە سووکایەتیکردن بە زیندانییەک دانەنا بوو، بەڵکو بە خودی هەستی دادپەروەری خۆشیان. هەندێک لەوان پێشنیازی مانگرتن لە خواردنیان وەک نیشاندانی ناڕەزایەتی پێشنیازکرد. ئەم پشتگیرییە مەزنە سەرجەم بەرەکانی پێشەوەی زیندانەکەی گرتەوە. منیش بە جۆشەوە سوپاسی هەڵوێستەکەیانم کرد، داواشم لێکردن لەسەر من ئەو ئازارە ناپێویستە نەخۆن. "حەفت ڕۆژەکان هەر تێدەپەڕن،" من وەهام پێگوتن، "کاتێکیش دەگەڕێمەوە، لە خولەکان تێهەڵدەچینەوە. دەی گوێی پێمەدەن. پێموابێ مرۆ دەبێ زیندانی تەنیایی تاکەکەسیش تاقی بکاتەوە."

حەفت ڕۆژ و شەوەکە تێپەڕین. زیندانی تەنیایی تاکەکەسییەکە زۆر لاوازیکردم، بەڵام شتی زۆریشی فێرکردم. لەو گەرما تاقەتپڕوکێنەی بە ڕۆژ و ئەو سەرما تەزێنەی بەشەو، لەنێو ئەو کوڵێتە پیس و

بۆگەنەی بێ پەنجەرە، بەبێ ئەوەی هیچ شتێک هەبێ خۆت پێداپۆشی، لەسەر ئەو ناوکەوە چیمەنتۆ ساردە پیسەدا، کە هەر وەک دۆشەکێک وابوو بۆ من و بۆ تەڕاتێنی مشکان، ئینجا لەو هەموو شتانەی لەوێدا فێریبووم، ئەوەبوو کە شوێنی ناخۆشتریش لە زیندانی ئاسایی هەیە، پاشان ئەوەش فێربووم لەو زیندانە تەنیاییەی تاکەکەسییەش ناخۆشتر هەیە. خەیاڵی مرۆڤ نییە بەهەشتی داهێنا بێ. بەڵکو خەیاڵەکە دۆزەخی داهێناوە. ئاخر شادمانی شتێکی نادیارە، هەرچی ژانوناسۆرە پلەدارە. کاتێکیش گەڕامەوە، ئەو کاتەی چوومەوە قاوشەکەم، من دڵشادترین زیندانی سەر ڕووی زەوی بووم.

لەگەڵ ئەوەشدا، مانگرتن لە خواردن لە قاوەشەکەی ئێمە هەر جاڕدرا، بەڵام وەنەبێ لەسەر من، یان لەبەر زۆربوونی ژمارەمان لە نێو قاوشەکە و لەسەروەڕژانی[104] بێ، هەروەها وەنەبێ لەسەر ئەوەش بێ، کە هیچ پەیوەندیمان لەگەڵ کەسوکارمان نەمابوو تەواو دابڕابووین؛ لەبەر ئەوەش نەبوو بتوانین لە حەوشەی زیندانەکە کاتی زیاترمان بۆ پیاسەکردن هەبێ، کە هەر بە تەنیا ڕێگەی دە خولەکیان پێدابووین. هەروەها لەبەر برسێتیش نەبوو، کە مانگرتنمان لە خواردن ڕاگەیاند. ڕاستی پرسەکە ئەوەبوو، ئێمە بە هیچ شێوەیەک مانگرتنمان لە خواردن ڕانەگەیاند. شتەکە هەر بە خۆی لەنێو ئێمەدا سەری هەڵدا، هەر لەخۆیەوە لەبەردەم کەپوومان تەقییەوە!

کاتێک ئێمە ئەم بڕگەیەی لاپەڕەی کتێبی ژمارەکان[105] دەخوێنینەوە: " ... هەر لەبەر ئەوەیە پەروەردگار گۆشتت دەداتێ و تۆش دەبێ بیخۆی. ئینجا تۆ نابێ نە ڕۆژێک نە دووان نە پێنج، تەنانەت نە دە و نە

---

[104] لەسەروەڕژان، پڕبوون.

[105]– ژمارەکانی ١٨، ٢٠، ٦٠ ( کتێبی ژمارەکان چوارەمین و پێنجەمین کتێبی تەوراتی جووەکانە. کتێبەکە مێژوویکی دوورودرێژی ئاڵۆزی هەیە، بەڵام لەڕێی کەشیشێکی زیرەکەوە، لە سەردەمی هەرە زووی ئێرانییەکاندا (لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا) هەموارکراوەتەوە. ناوی کتێبەکەش لە ژمارەی نیشانەکانی ئیسرائیلییەکانەوە هاتووە).

بیست ڕۆژیش، بەڵکو یەک مانگی ڕەبەق هیچ بخۆی تا هەموویت لە تفنک[106] دەردێتەوە و ئەوەش بۆتۆ شەرمەزارییە ..." بە دڵنیاییەوە هەموومان پێمانوابوو، کە وشەکان "لە تفنکتان دەردێتەوە" هەر وتەیەکی مەجازی بێ. کەچی لە زیندانی لوکیشکی و لە قاوشەکەمان، بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا بۆم دەرکەوت، ئەوان، کاربەدەستانی زیندان، کتومت وەسفێکی جەستەیی وایان هەم ڕێکخستووە و هەم بەرجەستەشکردووە. بەڵێ ئەمە خوازە (مەجاز)ێک نییە، بەڵکو ڕاستییە.

دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی خۆ نە گەزۆ[107] و نە گۆشتی نە دەداینێ. ئەوان «کاشا[108]»یان دەرخوارد دەداین. لە ڕاستیدا، لەو کاتەی گیرام، لە بەندیخانەی لوکیشکیدا بەنێو قۆناغگەلێکی پارێزدا تێدەپەڕی. لە سەرەتاوە «کاشا» خواردنی سەرەکی بوو، بەڵام هەر بە تەنیاش نەبوو؛ "سووپ"یش دەگۆڕدرا. بەڵام لەو ڕۆژانەی لە بارەیەوە دەنووسم، سووپی گەنم (دانەوێڵە) بە تاکوتەنیایی لەو قازانانە بۆ زیندانییەکان تێدەکرا کە تەلەفۆنچییەکانمان لە پشت دەرگەوە بە هەناسەبڕکێوە چاوەڕێیان دەکرد و مژدەی هاتنیان دەدا ... کاشا و بەس، لە کاشا زیاتر هیچی دیکە نەبوو. هەموو ڕۆژێک هەر کاشا.

لە دەقەکەدا نووسراوە "مانگێکی ڕەبەق" ئێمە دەبێ بیخۆین. دەکرێ ئەوەشی بۆ زیادبکەین: "زیاتر لە مانگێک، زیاتر لە دوو مانگ، تۆ هەر دەبێ کاشا بخۆیت. هەر بەڕاستیش وەکو نووسرابوو، بە هەستە بەرجەستەکراوەکە و بە هەستی فیزیکی وشەکان، لە کونە لووتمان دەهاتەدەر. کاشا قێزەون بوو بۆ ئێمە. چیدی بەرگەمان نەگرت، بۆیە مانگرتنمان لە خواردنی ڕاگەیاند.

---

[106]– تفنک: کونی لووت. لێرەدا هەر وەک چۆن لە دەقە تەوراتییەکەدا هاتووە، ئاوهاش ئیدیۆمێکی کوردەواریەمان هەیە، دەڵێ: ... لە تفنک (کونە لووت)ی هاتەدەر.

[107]– نووسەر لێرەدا وشەی mannahی بەکارهێناوە، پێموابێ واتا تەوراتییەکەی (السلو و المن) دەگرێتەوە، منیش گەزۆم پڕبەپێست زانی.

[108]– کاشا: گەنم، سووپێکە لە دانەوێڵە دروست کرابێ. نووسەر.

له زیندانەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا، مانگرتن لە خواردن گاڵتە نەبوو. زیندانییەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە هەموو مەبەست و ئامانجێک، بە هەمو شێوەیەک لە چەکەکانیان دابڕێندرابوون، ئەوە لە زیندانەکانی دیکەی دنیا دەیخوارد و کاریگەری خۆی دەبوو. لەوانە ئەو برسیەتییە هەمیشەییەی کە کارێکی وەها دەکا، خواردن لە چاوی زیندانی ببێتە شتێکی لە نرخنەهاتوو، هەر ئەمیش وا دەکا هێزی ئیرادە بە بێ خواردن یان لەبەر ئەوەی خواردنەکە هیچی وەها نییە، لاوازبکا. گومانی تێدا نییە، دابڕان، یان ئەو گۆشەگیرکردنە دووسەرەیە، هۆکارێکی گردەبڕانەی پرسەکەیە. ئەو زیندانییانەی بڕیاریاندا بچنە بن باری ڕۆژوگرتنێکی دووردرێژ، ئەو گریمانەیە هەیە ئەگەر ڕاستەوخۆش باندۆری خۆی لەسەر کاربەدەستانی زیندان جێنەهێڵێ، ئەوا دەکرێ ڕای گشتی بجووڵێنێ، ئەوەش لەو کاتەی لە ڕێی ڕۆژنامەی ڕێپێدراوەوە یان لە ڕێی بڵاونامەی بە قاچاغەوە، ئەوەی لەنێو چوارچێوەی دیواری زینداندا ڕوودەدا، بگاتە بەرگوێ و دیدی خەڵک. گیراوەکانی زایۆن، لە کامپی گرتووخانەی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیل و لە ئەفریقیادا، زیاتر لە جارێک ئەم چەکەیان بۆ سووربوون لەسەر مافەکانی خۆیان وەک زیندانی، وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بەکارهێناوە. زیندانییە کۆمۆنیستەکانیش لە هەموو ئەو وڵاتانەی پارتەکەیان کاری ژێرزەمینی دەکرد، زۆر جار پەنایان بۆ ئەو چەکە بردووە. بەڵام ڕەوشەکە بۆ زیندانیانی بندەستی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە تەواوی جیاواز بوو. زۆر کەم وابوو خۆیان لە قەرەی ئەو شتە بدەن، گوایە خواستەکانیان دڵی کاربەدەستانی زیندان نەرم بکا. ئاخر سەد لە سەد دەیانزانی مانگرتنیان لە خواردن هەر بەنهێنی دەمێنێتەوە و دەنگەکەی ناگاتە دنیای دەرەوەی زیندان، ئەمەش هەر وەک هەموو شتێکی دیکە، سەداکەی هەر لەنێو دیوارەکانی زینداندا دەمێنێتەوە و ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ. برسیەتی چەکێکی دەستی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو لەدژی زیندانییەکان بەکاردەهات.

خۆی شتەکە چەکێک نەبوو لە دەستی زیندانییەکان دژی دەزگەی ئاسایش بێ.

هەر چۆنێک بێ، مانگرتنەکەمان لە خواردن سەرکەوتنی بە دەستهێنا. هەر ئەوە نەبوو ئەوان لەسەر ئەو یاخیبوونەمان بەوەی چیدی بە خواردنی کاشا قایل نابین، ئێمەیان سزا نەدا، بەڵکو دوای چەند ڕۆژێکی کەم هەمان شتیش بۆ نان و قاوەکە دووبارە بکەینەوە، مانگرتنەکە ئەو دوو شتەش بگرێتەوە، ئێمە - بۆ یەکەم جار و لە ماوەی دوو مانگدا - سەرکەوتین بەوەی لەباتی سووپی کاشا سووپی کەلەرممان بۆ بێنن. کاربەدەستانی زیندانی لوکیشکی بە ڕوونی ئەو ڕاستییەیان لەبەرچاو گرتبوو، ئێمە وەنەبێ خواردنی «کاشا»مان لەبەر داوایەکی دژەشۆڕشییانە یان وەک پێگەیشتنی ڕۆژنامە یان نامەی کەسوکار بووە، بەڵکو لەبەر خواستێکی سەرەتایی توانای جەستەیی زیندانەکان بووە.

دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی زۆر شارەزان لەوەی مرۆ بۆ بەختی خۆیان جێبهێڵن و پشتگوێی بخەن. مایەی سەرسوڕمان نییە. لە واتای وشەکە تێبگەی: تا ئەو کاتەی لە تفنکەکانت دێتەوە. ئەوان تەلمودیزم نین؛ ئەوان ڕاستیین. بۆنی ڕاستیی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی تەنانەت لە بۆن کەلەرمی بۆگەنیش خۆشترە، دەکرێ لەسەر دەفرێکدا تامی هەبێ و وەهای لێبێ "ئەوانەی پشتگوێخراون" بگەڕێنەوە بۆ سەر «کاشا».

دوای مانگرتنمان لە زیندانی لوکیشکیدا هەفتەی دوو ڕۆژ سووپی کەلەرم و پێنج ڕۆژیش سوپی کاشامان بۆ دابینکرا. ئێمە بردمانەوە!

١٢

# دادگەییەکە

ئیدی بەو شێوە دەژیاین، بەو شێوە لەگەڵ خواردنی کاشا و کەلەرەم، لەگەڵ "تەلەفۆنچیی" و برووسکەچییەکان"، لەگەڵ وتار و خولەکانی نێوخۆمان، لەگەڵ گفتوگۆ و مشتومڕ و بەڵگەوبەندەکانمان، لەگەڵ ئەو پریاسکە جلوبەرگانەی لە ماڵەوە سڵاویان بۆ دەهێناین، بەسەرمان برد، ئەم بارەش تا ڕۆژی یەکی ئەپریلی خایاند. هەینیێ دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئێمەی بە تایبەتمەندییێکی خۆی سەرسامکرد.

لە دوایین شەوی مانگی ئاداری ١٩٤١دا، برووسکەچییەکانمان زۆر سەرقاڵ بوون. هەر برووسکە بوو لە سەرەوە بە سەرماندا دەباری، برووسکەکان بەباری ئاسۆییشدا ڕەت دەبوون. لە نێو قاوشەکە مەراقبوون لەوپەڕی جۆشی خۆیدا بوو. "ئەوە چییە؟" "ئەرێ ئەمە چییە"؟ زۆر کەس هەر ئەوەیان دەپرسی. زۆریش هەبوون بڕوایان بە گوێکانی خۆیان نەدەکرد. بەڵام خۆ برووسکەباران هەر بەردەوام بوو، بەردەوام دەگەیشتن. ناوەڕۆکەکەشیان هەر دووبارەبوونەوە بوو. ئیدی هیچ گومان لە ڕاستی برووسکەکاندا نەما. برووسکەکان کورت بوون. ئەوان ناوی زیندانییەکانیان دەدا، لەگەڵیدا ناوی ئەو ساڵانەی کە حوکمیان بۆ بڕاوەتەوە. زۆرینەشیان هەشت ساڵ یان پێنج ساڵی

حوکمـدان بـوون. لە حـاڵەتی تاکوتەراشـدا هەبـوو سـێ سـاڵی بـۆ هاتبووەوە.

"تـۆ بڵێـی دادگەیـیەکە کەی بـێ؟" ئـێمەش لە ڕێـی لوولەکـانی ئـاوەوە، پرسـیاری وەهامـان بـۆ مەڵبەنـدی سـەرووی خۆمـان، بـۆ لای برووسکەچییەکانمان دەنارد، هەڵبەتە برووسکەکانیشمان لە ڕێی خاڵ و داشەکانەوە دەنارد.

ئەوانیش وەها وەڵامیان دایەوە؛ "هیچ دادگەییەک لە گۆڕێدا نییە، تەنیا بڕیاردان هەیە."

بۆ ماوەیەک پێماننەکرا لەسەر ئاڵوگۆڕی برووسکەکان بەردەوام بین. ئاخر هەواڵی بڕیادانەکان تەنیا بە شەو دەگەیشت. فیکەی خەوتنیش، بە شـێوەیەکی ئاسـایی هەمـوو جـووڵەیەکی ڕادەگـرت، بە کـردەی برووسکەچییەکانیشـەوە. ئـێمە لەسـەر نـوێنی خۆمـان ڕاکشـابووین، تێدەکۆشـاین شـتەکە ڕوون بکەینەوە، بەڵکو لە دوایین هەواڵ بگەیـن. هەریەکەشـمان بیرمـان لە بەڵێنـی لێکـۆڵەرەوەکە دەکـردەوە، گـوایە دادگەیی هەیە، ئەی کەواتە ئەو دادگەییەکە کەیە، بۆ نـاکرێ؟ هەندێک پێیوابـوو ئەوانەی بە بـێ دادگە بڕیاریـان لەسـەر دراوە، زینـدانیی هەڵاوێردکراو و ڕیزپەڕن. هەر ئەو کەسانە دەیانگوت: "بێگومان ئێمە دەچینە بەردەم دادگە، هەر چۆنێکیش بێ هەشت ساڵێکمان بە تەنگەدا دەدەن ..." هەر بەڕاستی زەحمەت بوو تەنانەت بە سرتەش لەسەر ئەو جۆرە دەمەتەقێیەدا بەردەوام بین. ئاخر هەر زوو پاسەوانەکە دەرکەی دەکردەوە و فەرمانی پێدەکردین، بێدەنگ بین. ئەمەش ڕێساکە بوو.

بۆ ڕۆژی پاشتر گومانەکان ڕەوانەوە.

"دەی هەمووتـان خـڕببنەوە، بە یەک ڕیـز بوەسـتن! ڕیـزەکە تێکنەدەن!" لەگەڵ گەردەگەردەی بەیـــانی ڕۆژی یەکـــی ئەپریلـــی ١٩٤١دا ئەم فەرمانەمان پێکرا.

ئـێمەش گـوێڕایەڵ بـووین. ئیـدی بەو ڕێـڕەوەدا چـووین کە پێـی بەڵەد بـووین؛ بـۆ ئەو شـوێنە بـراین، کە پێـی ئاشـنا بـووین؛ بـۆ لای ئەو دالانانەی بە شەوان بەوێدا تێپەڕ دەبووین؛ بۆ ژوورەکانی لێکۆڵینەوە. لەوێ دوو کەسی مەدەنی لە پاڵ مێزێکی بچکۆلە وەستابوون. کاتێک یەکێ لە زینـدانییەکان دەگەیشـتە بەردەمیـان، هەمـوو ئەوانـی دیـکە بە مەودایەک دەوەستێنران، گوێی لێنەدەبوو ئاخۆ ئەو دوو کەسـە چییـان بە زینـــدانییەکەی یەکەم دەگـــوت. هەر ئەوەنـــدەیان دەبینـــی، پـــارچە کاغەزێک ڕادەستی زیندانییەکە دەکرێ، ئەویش دەبوایە واژۆی بکا.

نۆرەی منیش هات.

ئەو کەســـەی لە ســـەر کورســـی پشـــتی مێـــزەکە دانیشـــتبوو، پرســـی: "ناوەکەت؟"

منیش کە لێڕاهاتبووم چۆن وەڵام بدەمەوە، وەڵامم دایەوە، ناوی باوکم خستە نێوان پێش ناو و پاشناوەکەی خۆمەوە.

ئەو پیـــاوەی لەو ســـەری مێـــزەکە دانیشـــتبوو، چـــاوی بەو بارســـتە کـاغەزانەی بەردەمـی خۆیـدا گێـڕا. ئەوەنـدە خێـراش بـوو هەر دەتگـوت پارەی کـاغەز دەژمێرێ. بێ هـیچ هەڵەکردنێک ئەو کـاغەزەی دۆزیەوە کە نـاوی منـی لەسـەر بـوو، ئینجـا دایە دەسـتی هـاوڕێکەی کە لە پشـت مێـزەکە دانیشـتبوو، ئەویـش دەقە نووسـراوەکەی بـۆ خوێنـدمەوە، ئەو دەقەی وشـە بە وشـەم لە یادەوەرییدا هەڵکەنراوە:

"کۆمســـیۆنی تـــایبەتی ڕاوێژکـــارانی کۆمســـیاری گەل، هـــی کاروبـــاری ناوەخۆ، بۆی دەرکەوت، مێناحیم وۆلفۆڤیچ بێگن تـوخمێکی دژوارە بـۆ

کۆمەڵگە، بۆیە فەرمانی بە هەشت ساڵ زیندان لە ئۆردوگای چاکسازی کار بۆ دەرکرد."

ئینجا نوێنەری کۆمسیۆنی تایبەتی ڕاوێژکاران بەڕێزەوە گوتی "فەرموو واژۆی بکە."

"بەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژی یەکی ئەپریل، ڕۆژێکی خۆشی ڕۆژی درۆیە". من وەهام گوت کاتێ قەڵەمم وەرگرت تا حوکمەکە واژۆ بکەم. کابرای دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی سەرنجێکی تیژی تێبڕیم، بەڵام هیچیشی نەگوت.

منیش واژۆمکرد و گەڕاندمیانەوە نێو قاوشەکەم.

زۆری نەبرد هەموو فەرمان بۆ دەرکراوان گەڕانەوە قاوشەکە. ئیدی هەرا و زەنا، دەنگەدەنگی نێو قاوشەکە گوێی مرۆی کەڕدەکرد. هەر یەکێک لە لای خۆیەوە هاواریدەکرد: "ئەرێ چەند؟ چەند؟" هەندێک دەستیان بڵنددەکرد و پەنجەکانیشیان لێکدەکردنەوە و گاسیان[109] دەکرد: "پێنج!" زیندانییە "گرنگەکان"یش، ئەوانەی هەشت ساڵیان بۆ بڕابووەوە، هیچ ئاماژەیەکی جەستەییان نەکرد، تەنها ژمارەی ساڵی حوکمدانەکەیان دا. هیچ کامێک لە سەرنشینانی قاوشەکەمان بڕیارێکی سووکایەتی پێکردنی (بە ڕووسی منداڵانە) پێنەکرا بەوەی بە تەنیا سێ ساڵی بۆ بڕدرابێتەوە. دزەکەش پێنج ساڵی بە تەنگەدا درا.

---

[109] گاس کردن، بانگکردن. ئەمە بۆچوونی مامۆستا مەسعوود محەمەدە لە کتێبی «زاراوەسازی پێوانە» لە لاپەڕە 418 دا دەربارەی ئەم وشەیە: [*تەنها لە گۆشەی زمانەوە سەیری «گاثا، گات» دەکەم کە ئێستا لە دزەییاتی «گاس» هەیە بە واتای بانگ کردن. لە حەفتاکاندا هەژار و زەبیحی و من لەو باوەڕەدا بووین کە گاس، گات، گاتا یەک شتن. لە گاتادا کە سروود «چڕین» هەبێ هەر خۆیەتی لە دەنگ هەڵبڕینی **گاس کردن**دا دەردەکەوێتەوە. گۆڕانی دەنگی «ث» بە «س» لە کوردیدا دەستوورێکی گشتی بنجییە. مەگەر لە هەورەمان دەنگی «ث» مابێت. هەندێک کە دەڵێن «گازی بکە» هەڵە دەکەن*].

ئێمە لە نێوخۆماندا هەر وەک چۆن خوێندکاران کاتێ کاری خۆیان وەردەگرنەوە، ئاوەها زانیاریمان لەگەڵ یەک گۆڕییەوە. کەس هیچ مەراقمانێکی پێوە دیار نەبوو. زۆریان بە تەوسەوە لێیانڕوانی. گوتیان: "ئەمەش دادپەروەریی سۆڤیەتە بۆ ئێوە! هیچ دادگەییەک لە ئارادا نەبوو، ئەوانەی بڕیاریان لەسەر ئێمە داوە، هەرگیز ئێمەیان نەبینیوە، هەرگیز گوێیان لێنەگرتووین ئاخۆ چیمان هەیە بیڵێین؛ بەڵام بڕیاریان بە جوملە دەرکردووە، هەشت ساڵ بۆ ئێمە، پێنج ساڵیش ..."

ئەو شەوە، ئەوەی لە قاوەشەکەمان ڕوویدا، سەربەهەشی دەهێنایە پێکەنین. هیچ کەس بەو ساڵانەی لە لایەن کۆمسیۆنی ڕاوێژکارییەوە بۆی بڕابووەوە، کارانگاز نەبوو. ئەوانەش "تەنیا" پێنج ساڵیان بە تەنگەدا درابوو، خۆشحاڵ نەبوون. بە پێچەوانەوە، هەستیان کرد لە پایەیان کەمکراوەتەوە، وەک ئەوەی خوێندکارێک بێ و نمرەی کەمی هێنابێ. ئەوان گوتیان: "پێنج ساڵ یان هەشت، لە ڕاستیدا هەر یەک شتە. بەڵکو هەموومان بیبینەدەر، یاخود هیچ کەسمان نەتوانێ تەنانەت ئەو چەند ساڵە کەمەش بەرگە بگرێ."جۆرە کۆکبوونێکی گشتی لە هەمبەر ئەو ڕامانە هەبوو. پیاوە حوکمدراوەکان دەیانزانی لە دەرەوەی دیوارەکانی زیندانی لوکیشکیدا جەنگ لە گەرمە دایە. کەسیش نەیدەزانی چۆن کار لە چارەنووسی دەکا، بەڵام لە قووڵایی ناخیاندا، هەموویان هیوایان وابوو بەڵکو قوفڵی ئەو دەرگە دەروازەییانە بشکێنێ، کە بەسەریاندا داخراوە. هەڵبەتە لە نێو قاوشەکەدا خەڵکانی ڕەشبینیش هەبوون، بەڵام ئەوان کەمینە بوون. دەنگیان خەریکبوو هەر نە بیسترێ. "برووسکەچییەکانیش بە بێوچان لە کاردا بوون. هەشت ساڵ، پێنج ساڵ، هەشت ساڵ ...

منیش بیرم لە وشەکانی ئەو کابرا چیکییە (پۆلیسە) مێجەرەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دەکردەوە، کاتێ گوتی: "دادگەیی! دەی سەکۆیەکی بدەرێ!" هەروەها لە وشەکانی

هاوڕێیەکەشی، لێکۆڵەرەوەکەم کە گوتی: "من پێتدەڵێم دادگەیی دەکرێی، کەواتە دادگەیی بۆ تۆ هەیە!"

هەردووکیان هەر ڕاستییان گوت، ڕاستییەکی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی.

ئا ئەمە دادگەییەکە بوو.

یەکێ لە دەستکەوتەکانی ئەو خەڵکەی کە لەسەر بەربەستەکان جەنگان و هەڵەو ناڕاستیان تەختکرد و ڕێسای دادپەروەرییان هێنایەکایەوە، بۆ ئەوەی تەختی ستەمکاری بڕوخێنن و ئازادی بێننەدی: کەڵەکەبوونی ئەو کاغەز و بارستە "بڕیارنامانە"ی کارخانەی ژێرزەمینی بوون کە کرانە کاغەزی حوکمدان. ئاخر لەوێدا نە دادوەر، نە تۆمەتبار؛ نە شاهید و نە پارێزەر؛ نە بەرگری و نە تێهەڵچوونەوەی دادگەیی نەبوو، هەر هیچ نەبوو. هەر پیاوبوو وندەکرا و هیچ بەرپرسیارێتی لە هەڵەو کەموکورتیشدا لە گۆڕێدا نەبوو. حوکمەکانی "کۆمسیۆنە"کە: هەشت ساڵ، پێنج ساڵ، سێ ساڵ، هەشت ساڵ ...

یەک دوو ڕۆژێک دوای واژۆکردنەکانمان لەسەر پێگەیشتنی حوکمەکان، پاسەوانەکانمان، وێڕای هەموو نارەزایەتییێکمان، تفدانەکانیان[110] لابرد، کە لە هەردوو گۆشەی قاوشەکە داندرابوون. لە دەرکەی تەنیشتیشمانەوە لە ڕێی برووسکەچییەکانەوە، ئەو زانیارییەمان پێگەیشت: تفدانەکانی ئێمەشیان هەڵگرتەوە و بردیان."

---

110– ئەو دەفرە، یان ئەو شتەی تفی تێدا دەکرێ.

## ١٣

# خواحافیزی

تــا دەهــات پــارچە جلــوبەرگی زیاترمــان دەگەیشــتێ و دڵگەرمــی دەکردینەوە. هەستم کرد، ژنەکەم ئەو پریاسکە جلانەی بۆ دەناردم، برادەرەکانم دەیاندایێ. ئاخر ژنەکەم پارەی نەبوو. برادەرەکانم چاویان لەو و لە من - وەک دواتر بۆم دەرکەوت لە دایک و باوکە پیرەکەشم - بــوو. شــایانی باســە لەو کــاتەی ئەو ڕووداوانە بــۆ شــتێکی تەوســدارانەی نەوەکەمــان تۆمــاردەکەم، ئەوەی بەســەر ئەو قســە ئاوەزمەندانەیەدا بازدەدا و هیچ ئەندێشەیەکی بۆ ناوەڕۆکی شتەکە نییە و دەپرســێ: "برادەرایەتــی؟ ئایــا شــتێکی وەک برادەرایەتییێکــی ڕاستەقینە لە گۆڕێدا هەیە؟"

لەو پریاســەکە دیــاریکراوانەی "لە دەرەوە" بە دەســتمان دەگەیشــتن، دیــاربوو ئەوان ئێمەیــان بــۆ گەشــتێک بەرەو شــوێنێکی ســارد ئامادەدەکرد. هەرچەندە لە شیشــی پەنجەرەکانەوە، بەهــار خــۆی بە قاوشەکەماندا دەکرد؛ کەچی لە دەرکەشەوە جلی گەرمی ژێرەوەمان بۆ دەهات: پاڵتۆی ئەستوور، جزمەی پاشپانی بەرز، دەستوانە. لەوێدا دڵخۆشی بەو هەبوونە هەبوو، بەڵام خەمناکیش بۆ ئەوانەی دەرێیە کە دەیانزانی ئامادەکاری بۆ چی دەکەن.

بە لای کەمییەوە و لە کۆتاییدا، لە نێو ئەو بوخچە جلانەی بۆم دەهاتن شتێکم دۆزییەوە! لە یەکێک لەو پارچە جلانەی بە دەست شتی لەسەر

هەڵکەنرا بوو، سێ پیتی لاتینی بوون. پیتەکان لار و نارێک بوون، بەڵام گومانی لەسەر نەبوو کە وەها دەخوێندرانەوە: O – L – A. منیش بە بینینیان گەشامەوە، بەڵام سەرسامیش بووم. باشە بۆچی ئۆلا O – L – A؟ بۆچی ژنەکەم یەکەمین پیتی کورتکراوەی ناوەکەی لە ئالا (Ala)ەوە کردۆتە ۆ "O"؟ تۆ بڵێی دژوار بێ پیتەکان لەسەر جلێک هەڵبکەنێ؟ باشە ئەگەر وابێ، خۆ ئۆلا Olaش هەر ناوەوە و بە دەرزی و داو چنراوە؟ لە هەڵهێنانی مەتەڵەکە سەرکەوتوو نەبووم؛ خۆشبەختانە «بێرنستاین» مەتەڵەکەی هەڵهێنا. ئەو ڕووی لە من کرد و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد "دۆزیمەوە! زانیم. تۆ دەبێ وەک `Ola بیخوێنیتەوە، نەوەک õla، ئینجا هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە. ئەو دەچێتە فەلەستین[111]."

ئیدی هەنووکە شتەکەم بۆ ڕوون بووەوە.

«بێرنستاین» ئەو پیاوە باشە، چەند ڕۆژ بوو مێشکی خۆی گوشیبوو تا مەتەڵەکەم بۆ هەڵبێنێ. ئینجا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی؛ "دەیبینی؟ شتێکی باش بوو پەلەت لە ناردنی تەڵاقنامەکە نەکرد. ئەو بە بڕوایەکەوە ڕۆیشتووە، کە هەردووکتان یەکدی ببیننەوە."

ئەو ڕۆژە باشترین و قورسترین ڕۆژی زیندانم بوو. زانیم ژنەکەم وڵاتەکەی بەرەو ئێرتز ئیسرائیل جێهێشتووە ...

ئەو ڕۆیشتبوو. ئەوەشم نەدەزانی ئاخۆ چ مشتومڕ و دەمەقاڵێیێک لە نێوان ژنەکەم و برادەرەکانم لە ئارادابووە، تا قەناعەتی پێبهێنن بەوەی هەر لە ڤیلنا مانەوە واتای ئەوەی نەدەبەخشی لە منەوە نزیک دەبێ؛ تەنیا بە چوونی بۆ ئێرتز ئیسرائیل دەیتوانێ یارمەتیم بدا، کەواتە ئەوە

---

[111] – OLA بە زمانی عیبری وشەیەکی «مێینانەیە» بۆ "ڕۆیشتن بۆ «جێگیربوون لە» خاکی ئیسرائیلە." نووسەر.

ئەرکێک بوو لەسەری، لەگەڵ ئەوانی دیکە ئەویش بەجێبێڵێ و بڕواتە ئێترز ئیسرائیل.

ئەوەش هەڵەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو، من ژنەکەم بە جێهێشت، هەر خەتای ئەوانیش بوو نەمتوانی نامەکەم بۆ ژنەکەم بنێرم. لە چاکەی برادەران و برادەرایەتییدا هەردووکمان ژیاین تا ئەو ڕۆژە ببینین، بەو تەڵاقنامەیە پێبکەنین، کە هەرگیز نەنووسرا، هەرگیز نەنێردرا و هەرگیز هەر ڕووی نەدا.

هەرچەند ڕۆژێکی کەم دوای هەڵهێنانی مەتەڵی ئەوەی بۆم نووسرابوو، پێکهاتەی قاوشەکەمان لە بەین برا. ژمارەیەکی زۆر لە زیندانیان "بە خۆیان و تفاقەکانیانەوە" براردان، ئیدی زۆری نەبرد لە ڕێی خزمەتگوزاری تەلەفۆنچییەکانمانەوە زانیمان، بۆ قاوشەیەکی دیکە گوازراونەتەوە. لەنێو ئەوانەی ڕۆیشتن «بێرنستاین» و «کیفشیتز» بوون. کاتێکیش بە بێدەنگی خواحافیزیمان لە یەکدی دەکرد، هەموو بەربەستێکی نێوانمان هەڵدەگیرا. لە چاوی هەر یەکەمان پرسیارەکە هەبوو: "ئایا ئەمە بۆ هەتا هەتایە؟ تۆ بڵێی جارێکی دیکە یەکدی ببینینەوە؟

شوێنی ئەو زیندانییانەی لەوێ گواسترانەوە، بە زیندانی دیکە پڕ کرایەوە. لەنێو نوێکاندا «مایەر شێسکین»ـی برادەرمی تێدا بوو. «شێسکین» و من جەژنی قیامەتمان لەنێو قاوشەکەدا کرد. تا ئەو ڕادەیەی بارودۆخەکە ڕێگەی پێدان ڕێتوێلی «سیدەر[112]»مان بە شێوەی خۆمان کرد. لە جیاتی چوار پێکی شەراب، کووپی قاوەی زیندانی دەزگەی ئاسایشمان دانا. بە وێردیشەوە گوتمان: "ئەمە نانی کوێرەوەریمانە." ئای چ کەساسییەک بوو! "دەی هەموو ئەوانەی

---

[112]- سیدەر Seder بۆنەیەکی خواردنی شێوانە لە یەکەمین یان دوو شەوی سەرەتای جەژنی قیامەتی جوو.

برسیین، بفەرموون وەرن و نان بخۆن." نا، نەخێر! بۆ خاتری ئاسمان، مەیەن بۆ لامان، مەیەن بۆ لامان، لەگەڵ ئێمە نان مەخۆن! ... ئێمە دەنگی درووەدەکانمان بەرزکردەوە و بە پاڕانەوە: "ئەم ساڵە ئێمە کۆیلەین، ساڵی دادێ دەکرێ ئازاد ببین. ئەمساڵ لێرەین، لەوانەیە ساڵی دادێ لە ئۆرشەلیم بین."

دوای فیستقاڵی جەژنی قیامەت، یەک وشە لە نێو هەموو "برووسکە"کاندا چەندبارە دەبووەوە: "کۆتلاس[113]." ئیدی بەندوباو سەبارەت بە واتای وشەکە لە قاوشێکەوە بۆ ئەوی دی دەڕۆیشت، کەسیش نەیدەزانی. بە گوێرەی بەندوباوەکان، ئێمە بۆ بەسەربردنی هەشت ساڵ، بۆ پێنج ساڵ، ئەو ماوەی بۆ پەروەردەکردنەوە و چاکسازی دانرابوو، دەگوازراینەوە شوێنێک بە ناوی «کۆتلاس». زیندانیانی سەردەمی من و پێش منیش، هیچ بیرۆکەیەکیان سەبارەت بەو شوێنە تەلیسماویە نەبوو، کە ناوی «کۆتلاس» بوو. تۆ بڵێی هەبێ گوێی لە ناوی «کۆتلاس» بووبێ؟ کۆلۆنێلە پیرەکە دەیزانی. "خۆ ئەگەر هیچ شتێکم لە بیر مابێ،" ئەو وەها بە شێوەی کە نمایشێکی توانج ئاسا، هاتە دەنگ؛ "کۆتلاس وێستگەیەکی قیتارە لە پشت «ڤیاتکا»وە."

یەکێ لە زیندانییەکانیش هەڵیدایێ: "ئێستا بە «ڤیاتکا» دەڵێن «کیرۆڤ»."

"من نازانم ئێستا چی پێدەڵێن." دوای ئەوەی گوێی لە قسەکە بوو، پیرە کۆلۆنێلەکە وەها تێهەڵچووەوە: "بەڵام لە بیرمە ئەوان وێستگەکەیان بۆ نەفیکردنی شۆڕشگێڕان بۆ «ڤیاتکا» بەکاردەهێنا. ئەوەش ئەو شوێنە بوو، کە شازادەکان ڕاویان لێدەکرد."

---

[113] -kotlas

له دەرەوەش بەهار بوو. نێو قاوشەکەش گەرم بوو. بەڵام بە بیستنی ئەو قسانە تەزوو ئێسقانی جەستەمانی تەزاند.

کەچی هەر زوو بۆچوونمان لەسەر «کۆتلاس» گۆڕی. خەریکبوو عەشقی ئەو شوێنە ببین، کە شازادەکان ڕاویان تێدادەکرد. ئێمەش دەمانەویست بۆ ئەوێ بڕۆین. ئیدی ڕۆژانە بە تکاوە ڕووی پرسیارمان لە پاسەوانەکان بوو: "دەی پێمان بڵێن تا کەی پێویستە لێرە بین؟ کەی دەچینە «کۆتلاس»؟"

پاسەوانەکانیش بە ئارامییەوە دەیان گوت: "دەڕۆن، زۆر ناخایەنێ ئێوە دەڕۆن."

لە بنەڕەتدا سەرتاشەکانی زیندان بوون، وایان لێکردین بۆچوونمان سەبارەت بە کۆتلاس و Til تیل بە شێوەیەکی دیکە بگۆڕین. (تیل Til کورتکراوەی ناوە ڕووسیەکە بوو بۆ ئۆردوگای کاری چاکسازی.)

لەوێدا دوو سەرتاش هەبوون، ناوەناوە لە ناوبڕی سەیرسەیردا دەهاتنە لامان. یەکێکیش لەوان جوو بوو. زیندانە کریستانەکانی قاوشەکە، هەروەک هاوزیندانیانی ژوورە بچکۆلەکەی پێشوو، باوەڕیان بە پشتگیری جوو هەبوو، هەر بۆیە داوایان لە هاوزیندانە جووەکانیان کرد، بەڵکو هەوڵبدەن ئەو سەرتاشە جووە بدوێنن. منیش هیچ هەوڵێکی لەو جۆرەم نەدا. ئاخر دەمزانی "پشتگیری" لەنێوان ئاژانی جووی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و زیندانە جووەکاندا هەیە. «بێرنستاین» هەوڵێکیدا، سەرتاشە جووەکە بدوێنێ. هەوڵیدا دەمی سەرتاشەکە بکاتەوە. بەڵام خۆ دەمی کابرا تەواو دروابوو. ئێمە شتێکی سەرسوڕهێنەری دیکەمان لە زیندانی لوکیشکی بینی، ئەویش سەرتاشی بێدەنگ بوو!

لێ گەلۆ، دوای جەژنی قیامەت، لە هیکەوە دەمی هەر دوو سەرتاشەکە کرایەوە. ئیدی زیندانییە کریستیانییەکان پێویستیان بە پشتگیری نەبوو تا سەرتاشە جووەکە بێتە دەنگ، ئەوان هەر لە خۆیانەوە، بەبێ ئەوەی پرسیاریشیان لێبکرێ، هاتنە قسە. بۆ هەر زیندانییەک بە درێژی و بە وردەکارییەوە دەربارەی ژیان لە ئۆردوگای کار (کاری بێگارییدا) دووان.

"بەڵێ لەوێ دەکرێ بڵێی ژیان هەیە،" ئەوان وەها کەوتنە قسە؛ "ئەوێ وەک ئێرە نییە، دەرکەی زیندانت لەسەر دابخرێ. دەکرێ لەوێ بڵێی تاڕادەیەک ئازادی کار؟ هەڵبەتە لەوێ کارکردن هەیە، بەڵام چ جۆرە کارێک؟ خۆی باشە هەندێک کار بکەی، وا نییە؟ ئەرێ لەوێ چەند سەعات کار هەیە؟ وەک هەموو شوێنێکی یەکێتیی سۆڤیەت: هەر هەشت سەعات لە ڕۆژێکدا. هەموو جۆرەکانی کار هەروەهان. بەڵام هەر یەکەتان لە سەریەتی بە گوێرەی پیشەکەی کاربکا. لەبری کارکردنیشدا مزەی[114] خۆت وەردەگری. ئایا لەوێ ڕۆژی پشوو هەیە؟ ئای لەو پرسیارە! لە هەر هەفتەیەکدا ڕۆژێکی پشوو هەیە. ئایا لەوێ ڕۆژنامە و کتێب هەن؟ هەر ئۆردوگایەک کتێبخانەی خۆی هەیە، لەوێ دەتوانی بە پێی داخواز کتێب، ڕۆژنامە، گۆڤارت دەستکەوێ. وێڕای کتێبخانە هەر ئۆردوگایەک سینەمای خۆیشی هەیە. ئایا سینەماکەیان نمایشی زۆری هەیە؟ ئێمە کتومت نازانین، بەڵام نمایشی زۆریشیان هەیە. دەکرێ لەوێ فیلمگەلی زۆر ببینی. هەندێ جار شانۆی گەڕۆکیشی بۆ دەچێ. ژیانی کلتووری ئەوێ لە پلەیەکی زۆر باڵا دایە. ئەدی خواردن چۆنە؟ ئەگەر لەوێ کار بکەی، خواردنێکی باشت دەدرێتێ. هەر ئۆردوگایەک کانتینەی خۆی هەیە، دەکرێ شتی لێ بکڕی."

[114]– مزە: کرێ، حەقدەست.

بەشـێک لە چیرۆکەکەیـان لەلایەن پاسـەوانەکانیش پشتڕاسـتکرایەوە، بەتایبەتی لەو کاتەی بۆ سەرئاو دەچوون، زیندانییەکان پرسیارییان لێدەکردن.

ئەفسەری بەرپرسیش کە بۆ زیندانییەکان دەدوا، هەندێ لەو باسانەی گەرمکردبـوو. لەو ڕۆژەی لەنێـو زینـدانییەکان دەسـووڕایەوە، لێیـان پرسی، ئاخۆ هەر بە ڕاستی کتێبخانە لە ئۆردوگاکان هەیە، ئەویش بە جۆشـێکی بێوەییانە گوتبـووی: "بێگومـان لەوێ کتێبخـانە هەیە! ئەدی لەوێ سینەماش نییە؟ بۆ ئێوە ئۆردوگا زۆر باشترە لێرە."

ئێمەش بڕوامان پێکرد!

ڕۆژێکـی خۆشـی ئایـار بـوو، پێیانڕاگەیانـدین، دەکـرێ کەسـوکارمان سەردانمان بکەن. "بەڵێ،" ئەفسەری بەرپرس ڕاشکاوانە گوتی: "ئەوەش سـەردانێکی ماڵئـاواییە بەر لەوەی بگـوازرێنەوە بـۆ ئۆردوگـای کـار و چاکسازی. لەو فۆرمەی پرسیارنامەدا ئەو برگەیە پڕبکەنەوە: ناوی ئەو خـزمەی بانگهێشـت دەکـرێ، لەگەڵ ناوونیشـان. بـۆت هەیە تەنیـا یەک خزم بانگهێشت بکەی تا سەردانت بکا."

منیش ژنەکەم بانگهێشتکرد. پێموابوو هێشتا ماوەوە و «ڤیلنا»ی بەجێ نەهێشتووە.

ڕۆژانـی زینـدانی لوکیشـکی، نەخاسـمە هـی قاوشـەکەمان، هەروەک ڕێساکان کورت بوون. ئاخر هەر لە بەیانییەوە تا شەو سەرقاڵ بووین. قسـەماندەکرد، دەمانخوێنـد و دەرسـماندەدایەوە، یاریمانـدەکرد، بیرمانـدەکردەوە، داڵغەمـان لێـدەدا، نوێژمـان دەکـرد و چاوەڕێشـمان دەکـرد. ئـێمە هەمیشـە هەر چـاوەڕێ بـووین، چـاوەڕێی شـتێک لە دەرەوەی بازنەی شتە ئاساییەکان بقەومێ؛ هەروەها چاوەڕێی هەندێ شـتی ڕۆژانەش، کە ڕۆژانە بـوون. لە زیندانـدا هەر ژەمێـک بـۆ خـۆی

ڕووداوێکە، بردنە دەرەوەی سەتڵی ئاو و زبڵیش هەر بەسەرهاتە. داخوازییەکانمان بەراییانە بوون، بەڵام لە جیاتی ئەوەی کەمببنەوە و نەمێنن، ڕوو لە هەڵکشان بوون، خووی چاوەڕوانییەکانیش بۆ تەلەفۆنچییەکان مەزنترینیان بوو.

ڕۆژەکانی زیندان وەک خەڵک لە خەیاڵی خۆی بۆی چووە درێژ نین. نیوەی ساڵی یەکەمی زیندانییەکەمان بڕی، هەر بە زەحمەت هەستمان بە تێپەڕینی کرد. بەڵام ئەو ڕۆژانەی، دوای پڕکردنەوەی کورتە فۆرمەکەی پرسیارنامە، ڕۆژانی بانگهێشتکردنی کەسوکار بۆ سەردانیکردنمان، درێژ بوون، زۆریش درێژ، هەر نەدەبڕانەوە. زۆر لە چاوەڕوانییەکانیان بەسەرچوون، بەڵام تاکە چاوەڕوانییێک بەرۆکی ئێمەی بەرنەدا. زۆر لە چاوەڕوانییەکان یارمەتی کاتکوشتنیان داین؛ یەکێکیان بێسنوور درێژ بوو. ئیدی هەر سەرە سەعاتمان دەژمارد.

لە کۆتاییدا وادەی سەردانەکە هات. من یەکێک بووم لەوانەی لە کۆتایی بانگی نووسینگە کران. من بانگ کرامە پشت شیشەبەندی ژوورێکی پێشوازی کە کرابووە دوو بەش. لە تەنیشت من ئەو پاسەوانە جووە وەستابوو، کە بەهۆی ئەوەوە حەفت ڕۆژی ڕەبەق زیندانی تەنیاییم خوارد. لە دیوەکەی دیکەی شیشەبەندەکە «پاولا دایشز» بە خەندەوە دانیشتبوو، سەیری دەکردم.

من ئەو کچەم لە کاتی کارکردنم لە ڕێکخراوی «بێتار» لە ڤیلناوە دەناسی. هەندێکیش بە ژنەکەم دەچوو. لەوانەیە هەر لەبەرئەوەبێ، کە لە پشت شیشەبەندەکە تەماشام دەکرد. هەر چۆنێک بوو، ئەو لەباتی ژنەکەم هاتبوو، بەپیر ئەو بانگهێشتنەوە هاتبوو، کە بۆ «ئالیسا بێگن»م ناردبوو.

پاسەوانەکە گوتی: "دەتوانن چ بە ڕووسی یان پۆلۆنی بدوێن. دەی دەستپێبکەن!"

ئێمەش بە پۆلۆنی کەوتینە قسە.

"هەموو شتێک باشە،" «پاولا» وەها دەستی پێکرد، بە خێراییش قسەیدەکردن. "پوورە «ئالا» لەگەڵ مام «شیمشۆن» دایە. نامەیەکی ئەوم بۆ هێناوی.

منیش هیچم نەگوت. تێگەیشتم. ئاخر "مام شیمشون" بەرپرسی «بێتار» بوو لە ئێرتز ئیسرائیل. دیاربوو ژنەکەم گەیشتبووە ئەوێندەرێ.

پاولا قسەکەی خۆی دووبارە کردەوە: "ئایا گوێت لێمە؟ پوورە «ئالا» لەگەڵ ..."

"بەڵێ، بەڵێ، تێگەیشتم. چیدیکە هەیە؟"

"نامەیەکیش لە دایک و باوکتەوە هەیە. ئەوان ساغ و سەلامەتن. خەمیان لێ مەخۆ. ئەوانیش یارمەتیدراون."

دیسان بێدەنگ بوومەوە.

"برایەکانیشت باشن. هەر هەموویان باشن. ئەوانیش لەگەڵ پوورە «ئالا»ن."

منیش تێگەیشتم. خۆ تەنیا یەک برام هەبوو. "برایەکانت" واتای "برادەرەکانتی دەگەیاند. ئەوانیش خۆیان گەیاندبووە ئێرتز ئیسرائیل.

"ئایا گوێت لێمە؟ برایەکانیشت لەگەڵ پوورە «ئالا»ن ... " «پاولا» دووبارەی کردەوە.

"سوپاس، سوپاس. چی دیکە؟"

"بەڵێ، منیش سەبارەت بە پوورم (تا ئێرە بە پۆلۆنی قسەی کرد) ئیگەرێت بێسابو iggert besabo (ئەو جووت وشەیەی بە عیبری دەردا). (بە زمانی عیبریش ئیگەر باسابۆن واتای ' تێبینییێک لەناو سابوونەکە دایە" دەگەیاند.)

منیش بە عیبری لەگەڵی کەوتمە قسە.

"کیژەکەم، چۆنی؟ ئەرێ «مام جۆزیف» و ئێوە چۆنن، باشن؟" قسەکەم ئاماژە بوو بۆ «جۆزێف گلازمان».

"هەموویان باشن. هەموو ساغن. هەموویان سڵاویان هەبوو. خەم مەخۆ." کیژەکە بە عیبری وەڵامی دایەوە.

"ئەدی پێم نەگوتن بۆتان هەیە تەنیا بە پۆلۆنی یان بە ڕووسی بدوێن؟" لە پڕیکەوە پاسەوانەکە قسەی پێ بڕین. "ئەوە بە چ زمانێک قسە دەکەن؟"

"مەسەلە چییە؟" منیش وەها پرسیم. "ئەرێ ناکرێ pa – yevreskye پا ییڤریسکی بئاخڤین؟"[115]

"خۆ ئەگەر ئەوە زمانی ییڤەرییسکا بوایە، لێی تێدەگەیشتم. ئێوە بە زمانێکی دیکە دەدوێن."

"ئێمە بە زمانی پاییڤەرسکا دەدوێین" من نەسەلمێنانە لەسەر قسەکەم سوور بووم. "ئەز یەڤیریم (عیبریم) و بۆشم هەیە بە زمانەکەی خۆم بدوێم."

---

[115]– بە ڕووسی هەروەها بە یدیشی و عیبریش هەر دەگوترێ pa –yevvreyske، تەنیا لە عیبریدا نەبێ کە دەگوترێ drevnye- yevreyskye، واتە زمانی عیبری دێرین. بەڵام من وشەی "دێرین"م نەگوت، نەبادا بەدحاڵیبوونێک دروست بکا. نووسەر.

"هەوڵمدە خۆت زیرەک بنوێنی. قسە بە ڕووسی یان بە پۆلۆنی بکە، دەنا گفتوگۆکەتان پێدەبڕم."

ئیدی گەڕاینەوە سەر زمانی پۆلۆنی. دیاربوو «پاولا» ترسابوو، نەبادا من لە ئاماژەی "سڵاوەکان" تێنەگەیشتبم، بۆیە دووبارەی کردەوە.

"من سڵاوی پوورم بۆت هێناوە (تا ئێرە بە پۆلۆنی دوا) پاشان ڕستەکەی بە عیبری تەواوکرد: ئیگارەێت باسابون (تێبینامەیەک لەناو سابوونەکە دایە)".

"بەڵێ. سوپاس. تێگەیشتم."

ڕوخساری کچەکە گەشایەوە.

پاسەوانەکەش پێیگوتین: "دەی دەبێ هەر ئێستا بوەستن."

منیش داوام لێکرد: "هەر یەک دوو وشەی دیکە. وا خەریکە تەواودەبین."

«پاولا»ش پرسی: "باشە من چی بۆ پوور «ئالا» بنووسم؟"

"بۆی بنووسە، من شانازی پێوەدەکەم. بنووسە من شانازی بە هەموویانەوە دەکەم. بۆیان بنووسە من بەهێزم و ساغیشم و هەر دەشگەڕێمەوە."

«پاولا»ش وەڵامی دامەوە: "باشە، وادەکەم.

پاسەوانەکەش لە شوێنی خۆی هاواری کرد: "بەسیەتی! بڕایەوە!"

پاسەوانەکە بەنێو شیشەبەندەکاندا بۆ ئەودیوی ژوورەکە ڕۆیشت و پریاسکەکەی لە کچەکە وەرگرت کە ژنەکەم وەک دیارییێک بۆ ڕێگەکەم بۆی ناردبووم. ئەو هەموو شتێکی ڕووکردە سەر مێزەکە. جلی

ژێرەوەی گەرم، هەندێک شت بۆ خواردن، دوو پارچە سابوونیش. پاسەوانەکە خواردنەکەی دایەوە «پاولا» تا بیباتەوە. ئاخر خواردن رێگەپێدراو نەبوو. منیش بەختم نەبوو. هاوزیندانەکانم، ئەوانەی پێش من دیداری کەسوکاریان کردبوو، بوخچەی خواردنیشیان وەرگرتبوو. کاتێک نۆرەی من هات، پێمراگەیەندرا دەردی تیفۆ لە دەرەوە بڵاوبۆتەوە، بۆیە هەموو جۆرە خواردنێک قەدەغە کرابوو بێتە نێو زیندانەکە.

پاولا شیرینی بە تامی دانابوو، لە برادەرەکانیشمەوە چوکلاتیشم بۆ هاتبوو، بەڵام هەموویان لەناو هەگبەی خۆیدا گەڕاندەوە. کاتێ کچەکە رۆیشت، فرمێسکی لە چاودا دیار بوون. ئەو کچە نازدارە بە باشی رۆڵی ژنەکەمی بینی کاتێ پەیامە قەدەغەکانی پێڕاگەیاندم، تەنانەت بە تێبینییەکەی نێو سابوونەکەشیەوە. ئەو لە بن دەستی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا بوو، لە نێو کەڵبەی شێردا بوو، مەترسییەکی دژواری لەسەر بوو، لەوانەبوو بە داوەوە ببێ. باشە چی دەبوو ئەگەر هاتبا تێبینینامەکەیان بدۆزیبایەوە؟ ئەو، هەموو ئەو شتانەی پێیگوترابوو گەیاندی، بێئەوەی هەستوسۆز و هەڵچوونێکیشی پێوە دیار بێ. بەڵام کاتێک وادەی گەڕانەوەی هات و ئەو شتە باشانەی هێنابووی لەگەڵ خۆی بباتەوە، سوک و ئاسان نەیتوانی بەرگەی بێئومێدبوونەکەی بگرێ و چاوی پڕبوون لە فرمێسک.

کیژەکە لە پاسەوانەکە پاڕایەوە: "دەی هەر بە لای کەمی لێگەڕێ با پارچە شەکرەکەی بۆ بەجێبێڵم."

"قەدەغەیە!" پاسەوانەکەش وەها وەڵامی دایەوە: "من گوتم قەدەغەیە و بڕایەوە."

پاسەوانەکە پریاسکەکەی پشکنی، سابوونەکەشی دوو لەتکرد. پاولا و منیش لە هەر دوودیوی شیشەبەندەکەوە چاومان لێبوو. پاسەوانەکە لە هەردوو نیوە سابوونەکانی ڕوانی، ئینجا لەگەڵ جلەکان دایە دەستم.

"پاولینکا، خواحافیز!"

"خواحافیز، ئاگات لە خۆت بێ!"

"هەر دەگەڕێمەوە."

"دەزانم. ئاگات لەخۆت بێ!"

بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خەونم بەوە دەبینی، بەڵکو جارێکی دیکە کیژەکە ببینمەوە، ئاخر لە سەربازێکی بەرەی پێشەوە ئازاتر بوو. بەڵکو ببیینمەوە و تۆقەی لەگەڵ بکەم و لەسەر ئەو سەرچڵییەی بە ژیانی خۆی کردی و ئەو خزمەتەی بە منی کرد، سوپاسی بکەم. بەڵام هەرگیز بۆم هەڵنەکەوت. پاولا، خوشکە بچکۆلانەکەی «شلۆمی» ئەوەی لە ئێرتز ئیسرائیلدا کوژرا، ئەویش وەنەبێ بە دەستی غەوارە بەڵکو بەدەستی کاین (قابیل) کە هەر وەک برای وابوو. کیژەکە شەڕڤان بوو. کاتێک ئاڵمان لە نزیک ڤیلنا بووەوە، ئەو چووە نێو سوپای ژێرزەمینی، کە لە گیتۆی «گلازمان» دروستببوو، لەوێ ببوە بەرپرسێکی فریادڕەسی هێزەکە. بەڵام پاولا، ئەو پاولا نازدارە، ئەو کیژە جووە ئازایە، بەرگەگری سەردەمی تاریکی، کەوتە بەردەستی بکوژە ئاڵمانەکان. کیژەکە وەک شەڕڤانێک ژیا و وەک شەڕڤانێکیش سەری نایەوە.

١٤

# تفدانەکان

کاتێک لە چاوپێکەوتنەکە گەڕامەوە، چوار نیوە سابوونم پێبوون. تێبینینامەکە لە یەکێکیاندا بوو. تۆ بڵێی لە کامەیاندا بێ؟ منیش هەرچی «پاولا» پێگوتم بۆ «شێسکین»م باسکرد. نهێنی تێبینینانمەکەشم بۆ یەکێ لە قوتابییەکانم درکاند، ئەویش چاوەشێک بوو لە سوپای پۆلۆنی، ببووە دۆستێکی نزیک و دڵسۆزی من. ئینجا هەر سێکمان چووینە لای پەنجەرەکە و بازنەیەکی بچووکمان پێکهێنا. چاوەشەکە کە لە هەموو شتێک شارەزا بوو، دەستی دایە پارچە سابوونەکان و لە هەموو گۆشەیەکەوە لێیڕوانین. بە تەمابوو بە شێوەیەک تێبینینامەکە بدۆزێتەوە، بێ ئەوەی هەر چوار نیوە سابونەکان وردبکا، چونکە لە زیندان سابوون شتێکی زۆر سەنگین و بە بەها بوو. بەڵام خۆ ئەویش هیچی لێهەڵنەکراند و نەیزانی شتەکە لە کامە پارچە دایە. چارەمان نەما؛ بڕیارماندا دەست بەکاربین و پارچە سابوونەکان دوولەت و چەند لەت بکەین. چاوەشەکە کەوچکێکی کانزایی هەبوو، دەسکەکەی هەروەک چەقۆ تیژ بوو. کەوچکەکەی لەسەر ڕەفەکە هێنایە خوارەوە و بە دەسکە تیژەکەی خەریکی بڕینی پارچە سابوونەکە بوو. تێبینینامەکە نە لە پارچە سابوونی یەکەم و نە لە هی دووهەمیشدا بوو. لەو کاتەی خەریکی بڕینی پارچەی سێیەم بوو، تویژاڵ تویژاڵ سەرەکەی هەڵدەگرت و سابوونەکەی دەڕنی، لە کۆتاییدا شتێک دەرکەوت. ڕووخساری لە خۆشیان گەشایەوە، خۆشی سەرکەوتن،

ئیدی چاوەشەکە پارچە کاغەزە لوولدراوەکەی دایە دەستم. ئەوەبوو تێبینینامەکە گەیشت! برادەرەکانم لە قووڵایی سابوونەکەیان نەڕوانی، بەڵکو لە توێژاڵی سەرەوەی. تەنانەت ئەوانەی هەموو شتێکیش دەزانن، بە دەسەڵاتەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤییەتیش هەموو شتێکیان هەر بۆ مەیسەر نابێ، لە هەستی هاوبەش تێپەڕ ناکەن!

تێبینینامەکەی نێو پارچە سابوونەکە لە «جۆسیف گلازمان»ی هاوڕێمەوە بوو. سەلمێنەری هەواڵی باش بوو، هەموو شتێک خۆش بوو، دڵنەوایی مژدەکانی «پاولینکا»ی بۆ من تێدا بوو، هەروەها زانیارییێکی دیکەشی تێدا بوو. برادەرەکانمان لە ئێرتز ئیسرائیل و ئەمریکا، هەروەک کورتەنامەکە پێیڕاگەیاندم، کاریان بۆ ئازادکردنمان دەکرد. ڕامانێکی باشیش لە کاریگەری هەوڵ و تێکۆشانیان لەئارادا هەبوو.

ئێمەش باوەڕمان کرد.

دیسان پێکهاتەی زیندانەکەمان لەبارییەک ترازا. زیندانییان لێ گواستنەوە و بردنە شوێنێکی دیکە و هی دیکەیان بۆ هێنان. لەوانەی گواسترانەوە «شێسکین»ـی برادەرم بوو؛ لەنێو نوێکانیشدا «داڤید کرۆل»ی بە کەیف بوو.

«کرۆل» تەمەنێکی مام ناوەندی هەبوو. زۆر لەو کوریشکانەی دەموچاوی داگرتبوو، لە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆی گەورەتر نیشاندەدا. هەموویان بە ناوە نازانەدییەکەی «کۆتکا» بانگیاندەکرد. هەر بە ڕاستیش لە گیان و ورەدا خورت بوو، لە زیندانیشدا هەروەک منداڵێکی کەیفخۆش پێدەکەنی. بەڵام خۆ ئەو پیاوە دڵباشەش خەمی خۆی هەبوون. ئەو دوو ژنی لە دوای خۆی بەجێهێشتبوون؛ پیرەدایکی کە چەندین ساڵ بوو بە بێوەژنی مابووەوە، کە پشتی هەر بە «کۆتکا» قایم بوو، دەبوایە بیژیاندابایە وەک چۆن پێشتر ئەو پشتی بە دایکی

دەبەست و دەیژیاند، کەسەکەی دووهەمیش ژنە گەنجەکەی بوو، هەر چەند مانگێک بوو بەر لە گرتنی گواستبوویەوە.

«کرۆل»یش یەکێ بوو لەوانەی هەمیشە هەر داوای دەکرد "ئێمە «کۆتلاس»مان دەوێ!"

لە کۆتایی ئاداردا بە شێوەیەکی بەرچاو لوکیشکی کەوتە جموجۆڵ. تا دەهات ژوور و قاوشەکانی زیندان تەژیتر و پڕتر دەبوون، هەر جمەیان دەهات. شتێکیش لە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نەبوو بڵێ، جێمان نییە، ژوورمان نییە! ئەوان هەمیشە لەو باوەڕەدابوون، ژوور بۆ زیندانی هەر هەیە، یا هەر پەیدا دەبێ. دەفر بەشی هەموو زیندانییەکانی نەدەکرد. بۆیە هیربارمان[116] لەگەڵ زیندانییە نوێیەکان بەشدەکرد. خۆی ئەمە شتێکی خۆش نەبوو، بەڵام هەر کردیشمان. لە زیندانا هەر ئەو شتە دەکرێ. هەر چۆنێک بێ ئێمە دڵنەواییمان بە «کۆتلاس»ی بەرچاومان بوو. لەوێ لەسەر مێزەکان دەمانخوارد و دەشژمێردراین. لەوێ کارمان دەکرد، هەر لەوێش هەوای تەڕوتازەمان هەڵدەمژی. لەوێدا ژیان جیاواز بوو ...

کاربەدەستانی زیندان، لە نێویاندا ئەفسەرانی دەزگەی ئاسایش، لە جاران زیاتر سەردانیان دەکردین. پیاوێک دەهات و شتێکی دەنووسی دەڕۆیشتەوە. بە دوای ئەودا یەکێکی دیکە خۆی بە ژووردا دەکرد، ئەویش هەندێ سەرنج و تێبینی دەنووسین. ئێمەش لێمان دەپرسین، ئەرێ کەی ئێمە لێرە دەڕۆین. وەڵامیان دەدایەوە: "هیچ ساستاڤ sastav یێک لە گۆڕێدا نییە، بەڵام زۆریشی پێناچێ لێرە دەڕۆن." ئێمەش پێمان سەیر بوو، تۆ بڵێی «ساستاڤ» چی بێ. ئەوانەی زمانی ڕووسیان دەزانی بە شێوازی لە یەکجیاواز وشەکەیان لێکدەدایەوە. هەندێک دەیانگوت لەوانەیە واتای ئەوەبێ، ستافی تەواویان بۆ

[116] هیربار: دەفر و کەوچک، قاپوقاچاغی ناوماڵ.

بارکردن نەبێ. ئەوانی دیکە دەیانگوت «ساستاف» ئاماژەیە بۆ فارگۆنەکانی قیتار. هەمووان سەریان سوڕمابوو. باشە چۆن دەبێ، نە ستاف بایی پێویست، نە فارگۆنەکانی قیتاریش بایی پێویست هەبن؟

لە کۆتایدا، ڕۆژەکە هات.

ئەفسەرانی دەزگەی ئاسایش لە ڕاڕەوەکە وەستان و ناوەکانیان خوێندنەوە. ئەوانەی ناویان خوێندرایەوە، هەروەک سەرباز وەڵامیان دایەوە: "لێرەیە!"

"هەر یەک لە ئێوە تفاقەکانی لەیەک بوخچەدا تێکبنێ. دەفر، کووپ و کەوچکەکان لێرە بەجێبێڵن. کاتێک ئامادەبوون، بە دواتاندا دێینەوە."

یەکێ لە زیندانییەکان پرسی: "باشە «ساستاڤ» هات؟"

"بەڵێ. ئێوە ئێرە بەرەو ئۆردوگای کار بەجێدێڵن."

"ئەی کەی دەڕۆین؟"

"ئەمەیان نازانم. ئەو پیاوەی لە گواستنەوەتان بەرپرسە، ئەو دەزانێ."

دەرکە داخرایەوە. قاوشەکە هەروەک وێستگەی هێڵی ئاسنین وابوو. هەر جرتوفرت بوو. زیندانییەکان ورەیان بەرز بوو. "ئێمە دەڕۆین، ئەو شوێنە بۆگەنە جێدەهێڵین!" چاوەشەکە یارمەتی دام کەلوپەلەکانم، دیاری برادەرەکانم بپێچمەوە. بە هەردووکیشمان یارمەتی پیرە کۆلۆنێلەکەمان دا. ئەویش هەر منگەمنگی بوو: "ئێمە دەچینە ڕاوێ! ڕاو!"

دوای کەمێک پاسەوانەکە هاتەوە و پرسی: "ئامادەن؟"

ئێمەش هەمومان بە یەکەوە: "حازر و ئامادەین!"

ئیدی بوخچەکانمان لە کۆڵ هەڵدا بەنێو ڕاڕەو و حەوشەی زیندانەکەدا بڕۆ. لەوێدا گەیشتینە گرووپی دیکەش. فەرمانیان پێکردین دابنیشین و چاوەڕێ بین. ئێمەش بە حەوسەڵەوە چاوەڕێ بووین. کاتیش دەڕۆیشت، کاتی ژەمی نیوەڕۆ هات. کاربەدەستانی زیندانەکەش بە نەرمەغار دەهاتن و دەچوون. ئیدی هاوارمان لێهەڵسا: "ئەرێ تا چەندی دی چاوەڕێ بکەین؟"

بۆ بولێڵی[117] ئێوارە درەنگ ئەفسەرێکی دەزگەی ئاسایش پەیدابوو، ڕایگەیاند؛ گۆڕانکارییەک لە کاتی ڕۆیشتنمان ڕوویداوە، بۆیە ئێمە دەبێ بگەڕێینەوە، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر نا، بگەڕێینەوە لابالّی زیندان. پێیڕاگەیاندین ئێمە ناگەڕێینەوە قاوشەکانمان، بەڵکو بۆ قاوشێکی کاتی. ئێمەش برسی بووین. هەر نەفرینمان لێدەباری. بە نەفرینەوە ئێمەیان بردە قاوشێکی کاتی.

هەر بەڕاستیش قاوشێکی کاتی بوو، لەژێر زەمین هەڵکەوتبوو. هەر تەنیا بە سەرنجێکی بچکۆلە، بە پەنجەرەی بچکۆلە جیاوازتر بوو لە ژوورە زیندانی تاکەکەسی، پەنجەرەکان کەمێک لەسەر زەوی بەرزتر بون. قاوشەکە نە نوێنی لێبوو نە چارپایەش. چواردیوار و ناوکەوێکی کۆنکرێتی ڕەقوتەق، دەی بڕۆ لێیوەرکەوە. شوێنەکە هەر بە هەمان قەبارەی ئەو ژوورەبوو کە لەکاتی لێکۆڵینەوەکەدا تێیدا بووم. بەڵام گرووپەکەی ئێمە بیست کەس بووین. هەموومان وەک یەک بووین، هەرچۆنێک بێ خۆمان لەپاڵ یەک پەستی و جێی خۆمان کردەوە.

سپێدە هات. دەرکەکە کرایەوە. دوو پاسەوان، زیندانییەکانیان لەو تەنگەبەرەدا بە وەستاوی، بە دانیشتووی بەنیوە ڕاکشاوی ژماردن. پاسەوانەکان هیچ سەرنجیان نەبوو. لە ژوورەکە کە ئەستەم بوو ڕابکشێی، ڕێیانپێدابوو وەها بکەین، لەکاتی فیکەی ئاگادارکردنەوە بە

[117] بولێڵ، تاریکوڕوون

ڕۆژیش. ئەوان لە ژماردندا هەڵەیان کرد. ئەوەش شتێکی سەیر نەبوو. ئاخر لەو شوێنەدا، کردەی ژماردن تەنانەت بۆ مامۆستایانی بیرکاریش سەخت بوو؛ چ جای پاسەوانێکی سۆڤیەتی. لە کۆتاییدا ژمارە دەقاودەقەکە سەلمێندرا. پاسەوانەکە ژمارەی تۆمار کرد، ئینجا گوتیان: "پاش کەمێکی دیکە نانتان پێدەگا." ئەوەش شت بوو نەوەک گاڵتە!

لە شیشەبەندی دەرکەوە نانیان بۆ درێژکردین. ئێمەش بە کۆرس پرسیمان: "ئەرێ قاوەشمان نادەنێ؟ ئەوان بە ئێمەیان گوت کە قاپ و کووپەکانمان لەسەرەوە بەجێبێڵین. باشە ئەدی لە چیدا بخۆینەوە؟"

"بادی[118] دیکەتان دەدەینێ." پاسەوانەکە وەهای گوت و پەنجەرەکەشی داخستەوە.

پاش کەمێکی دیکە، شیشەی پەنجەرەکە دیسان کرایەوە.

پاسەوانەکە هاواریکرد: "دەی بیگرن!"

ئەو زیندانییانەی لەبەردەم دەرکە شیشەبەندەکەدا وەستابوون، پرسیان: "ئەمە چییە؟"

"بادی بۆ کۆفی و بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ."

"چی؟"

خۆ بادییەکان ئەو دەفرانە بوون کە تفیان تێدا ڕۆدەکرا.

بە تەقە تەق ئەو مەنجەڵەیان لە شیشەی پەنجەرەکە نزیککردەوە.

---

[118]– بادی: دەفرێکی ناوچاڵ، ناوێکی کۆنە و بۆ خواردنەوە تەنانەت بۆ شلەش بەکار هاتووە لێرەدا وشەکەم پڕ بە پێستی ئەو وشەیەی نووسەر utensil زانی، بۆیە بەکارمهێنا.

"قاوه!" پاسەوانەکە ئاوها لەودیو پەنجەرەکەوە هاواری کرد "قاوە! ئێمەش ڕەتمان کردەوە.

هەموو بە یەکەوە گوتمان: "ئێمە لە تفدانەکان ناخۆینەوە."

پاسەوانەکەش گوتیەوە: "ئاخر لەوە زیاتر هیچ بادی دیکەمان نییە."

"ئێمە نامانەوێ لە بادی تفڕوکردندا قاوە بخۆینەوە. خۆ ئێمەش ئادەمیزادین. دەی بانگی ئەفسەری بەرپرس بکە. ئێمە وەها نایخۆینەوە."

پەنجەرەکە داخرایەوە. مەنجەڵەکان گوازرانەوە قاوشێکی دیکە.

سەموونە ڕەقەکەمان بە وشکی خوارد. کاتی نانی بەیانی بەسەر چوو. خەریک بوو وادەی نانی نیوەڕۆ دەهات. دیسان شیشەی پەنجەرەکە کرایەوە.

ئەمجارەیان ئەفسەری بەرپرس بوو پرسی: "ئەوە چ لە گۆڕێیە؟"

ئێمەش هاوارمان کرد: "ئەوان تفدانیان بۆ هێناوین. ئاخر چۆن دەبێ لە بادی تفڕوکردندا قاوە بخۆینەوە؟"

"دەی مەیکەنە «هەرکەس بۆ خۆی!»[119]،" ئەفسەرەکە وەها هاتە وەڵام، "با یەکێکتان قسە بکا."

[119] مەبەست لێرەدا چەلەحانێیە، هەریەک لە ئاست خۆیەوە دەنگهەڵبڕێ و ببێتە پاشاگەرانی و کەس لەکەس نەکا. لەم دواییانەدا بەهەڵە بۆ بارێکی ئاوەهایی وشەی «گەڕەلاوژێ»ی بۆ ڕۆیشتووە، لە کاتێکدا ئەم وشەیە تایبەتە بە گۆرانی گوتنی بەکۆمەڵ و بە نۆرە دەگەڕێ، «لاوژە»یش جۆرە گۆرانییەکی تایبەتە. بڕوانە فەرهەنگی خاڵ بۆ زیاتر شارەزابوون لەم وشەیە.

"جەنابی ئەفسەری مەدەنی،" قسەکەرەکەمان وەها کەوتە قسە: "سەیری ئەو بادییانە بکە، کە بۆیان هێناوین تا تێیدا بخۆینەوە. ئەمانە بۆ تف تێداڕوکردنن. ئەوانە لە ژوورەکان کۆکراونەتەوە. هەر بەخۆشمان تفمان تێدا ڕووکردووە، ئێستاش چۆن دەبێ شتیان تێدا بخۆین و بخۆینەوە؟ هەر کە چاومان پێکەوتن، زگمان هێڵنجی دا، ڕشانەوەمان هات. ئاخر چۆن دەکرێ لەوەدا بخۆینەوە؟ بۆچی، خۆ ئێمەش مرۆڤین!"

"ئێمە پاکمان کردوونەتەوە،" ئەفسەری بەرپرس بە هێواشی وەها هاتە وەڵام؛ "ئەوان پاک شووراونەتەوە، هیچیان پێوە نەماوە."

"سەیرکە جەنابی ئەفسەری مەدەنی،" یەکێکی دیکە لە زیندانییەکان هەڵیدایێ؛ "سەیری ئەو تفدانانە بکە. مینای بنیان بە تەواوی شکاوە. تەماشاکە، هەمووی کونوکەلەبەرە، ئاخر ئەمە چۆن پاکدەکرێتەوە؟"

"ئەمانە باش شوراون، هیچ میکرۆبیان پێوەنەماوە،" ئەفسەرەکە لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو: " ئێستا خاوێن و بژونن[120]."

"ئێمە لەو تفدانانە ناخۆینەوە،" ئەم قسەیە بە کۆرس لە دەمی زیندانییەکان بەرز بووەوە. "ئێمە داوادەکەین سەرپەرشتیاری زیندان بێتە ئێرە. ئێمە نان ناخۆین!"

"گوێبگرن،" ئەفسەرە مەدەنییەکە وەها تێهەڵچووەوە؛ "سەرپەرشتیاری زیندانیش پێیناکرێ بە هاناتانەوە بێ. ئێمە نامانەوێ شتەکانتان لێ ئاڵۆزتر بکەین. من دەزانم هەلومەرجی ئێرە سەختە، بەڵام خۆ هەر بۆ ڕۆژێک و دووانە. خۆتان دەزانن ئێوە بەرەو ئۆردوگاکانی کار دەڕۆن. بارودۆخیش لەوێ جیاوازە. باشە ئێمە چی بکەین؟ لێرەدا زۆر زیندانی هەن و بادییەکانیش بەشناکەن."

120– خاوێنوبژوون: زۆر خاوێن، وەک ئیدیۆمیش بەکاردێ. پێچەوانەشی 'دژوون'ە واتە زۆر پیس.

"کەواتە ئەدی بۆ ئەوەندە خەڵکەتان گرتووە؟" یەکێ لە زیندانییەکان کە بۆ ساتێک خۆی لەبیرکردبوو، وەها وەڵامی ئەفسەرەکەی دایەوە.

ئەفسەرەکە بە بێ هیچ وەڵامدانەوەیەک یەکسەر ژوورەکەی بەجێهێشت. ئێمەش بە خەم و تفدانەکان ماینەوە.

کاتی نانی نیوەڕۆ هات. مەنجەڵەکان هێندرانە بەردەم شیشی پەنجەرەی ژوورەکەمان.

پاسەوانەکە لەودیو پەنجەرەکە هاواری کرد: "چێشت!"

"نامانەوێ لە بادی تفداندا چێشتەکەمان بخۆین."

پەنجەرەکە داخرایەوە.

لە دوای نیوەڕۆدا. پاسەوانەکان فەرمانیان پێکردین بادیەکانمان کۆ بکەینەوە و لە پەنجەرەکەدا بیاندەینەوە. کەمێک پاش ئەوە، ئەفسەری بەرپرس پەیدا بووەوە. ئەو بە خۆی تفدانی نوێی هێنا.

"وەک دەبینن،" وەها کەوتە قسە؛ "ئەمانە نوێ نوێن. ڕاستەوخۆ لە کۆگاوە هێندراون. هێشتا بەکارنەهێندراون. زۆر خاوێنن. هەنوکە دەکرێ نانی تێدا بخۆن."

ئێمە نەمانتوانی نانی تێدا بخۆین. ئاخر کۆن نوێ، تفدان هەر تفدانە. مرۆڤ ناتوانێ لە شتێک نان بخوا، کە خۆی پاشماوەی تێدا دەکا، یان تفی تێدا ڕوودەکا. هەر زۆر سادە نەماندەتوانی نان لەو شتەدا بخۆین. ئیدی ئەو شەویش بە بێ نانی شێوان سەرماننایەوە و نووستین.

تەنیا بۆ ڕۆژی پاشتر، پاسەوانەکان ژمارەیەک قاپ و کووپیان بۆ هێنان.

ئینجا پاسەوانەکە گوتی؛ "ئێوە دەبێ بۆ خواردن ڕیزببەستن. لەنێو خۆتاندا ڕێکبکەون."

مەنجەڵەکە بە ڕاڕەوەکەدا هێنرا، لە قاوشەیەک بۆ قاوشەیەک دەبردرا، ڕینگەی دەهات، تا هەموو زیندانیەک بەشی خۆی بەرکەوت. ئێمەش دەفر و کووپەکانمان پاکنەکردنەوە، ئاخر لەو ژووورە کاتییەدا نە ئاو نە هیچی لێنەبوو. ئەو چەند قاپ و کووپانە کە لەوێ بوون، دەستاودەستی پێدەکرا، لە دەستێکەوە بۆ دەستێکی دیکە، لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی دی، کاتێ سووپ و قاوەکەشمان دەخوارد، هێشتا هەندێ بەرماوی ئەوەی پێش خۆی هەر پێوە مابوو، چیبکەین، خواردمان. بەڵام ئێمە لە تفدانەکاندا نەماندەخوارد ئەگەر لە برسان بفەوتابایین.

ئیدی بەم جۆرە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لەگەڵ ئادەمیزاد دەجووڵایەوە. هەرچەندە مرۆڤ ئاژەڵ نییە، کەچی ... کەچی لە شوێنێکی وەک ئەوەی شازادەکان ڕاویان تێدادەکرد، زانیم کەسانێک هەن، دوای تەواوکردنی قۆناغی دیاریکراویش لە "خوێندن" هێشتا ئامادەن نان لە تفدانەکاندا بخۆن.

ڕۆژێکیان لە حوزەیراندا براینە گۆڕەپانێکی گەورە هەر لە نێو زیندانەکەدا. زیندانەکان بە گوێرەی مەزندەی من دوو هەزار کەس دەبوون، دابەشکرابوونە سەر چەند گرووپێک. لە بەردەم مێزێکی نێوەڕاستی گۆڕەپانەکەش، چەند ئەفسەرێکی پلەباڵای دەزگەی ئاسایش دانیشتبوون. بە سەدان سەربازی دەزگەی ئاسایش دەوروخولی زیندانییەکانیان دابوو. ئەوان پریاسکەی زیندانییەکانیان دەپشکنی، زۆر بە هوردە بوون، لە ژیانمدا جارێک کنەوپشکنینی وەها ببینم. تەنانەت لە گەڕان و پشکنینی زیندانییەکەشدا زۆر وردەکار بوون. ئێمەیان ڕووتکردەوە. ئێمەش لەوە ڕانەهاتبووین: هەموو شەوەکە ئەوان هەر دەگەڕان ئێمەش ڕووت و قووت. بەڵام لە گۆڕەپانەکەدا شتێکی نوێیان داهێنابوو: چەند جارێک فەرمانمان پێکرا لەسەر چیچکان دانیشین.

دەزگەی ئاسایشیش هەموو شوێنێک دەگەڕا. یەکێک لە زیندانییەکانی گرووپەکەی من زگئێشەیەکی بێزارکەری لێبوو. پشکنەرەکان کە گوێیان لە تڕی کابرا بوو، کەوتنە نەفرەتلێکردن. ئێمەش پێکەنین.

"دەی خێرا، بەپەلە، زوو بن!" بەم جۆرە لەم سەری گۆڕەپانەکەوە بۆ ئەوسەری هەر هاوار هاواریان بوو. دیمەنەکە یادێک بوو لە بازاڕی کۆیلەفرۆشان.

پازدە کەس بە خۆیان و پریاسکەکانیانەوە خرانە نێو ڤانێکەوە. یەکێ لە زیندانییەکان، کە بۆ یەکەمین جار بوو بیبینم، هاواری کرد، خەریکە دەخنکێ. دیاربوو زێدەڕۆیی کردبوو. ئاخر بنیادەم وەها بە ئاسانی ناخنکێ. ڤانەکە جووڵا، ئینجا لەبەردەم دەرگەی زیندانەکە وەستا. دەرگەکە کرایەوە. تڕومبێلەکە جووڵا بەخۆی و بارە بێدەنگەکەی کەوتە سەر شەقامێکی چۆڵوهۆڵ. ئێمە لەوێ دەرچووین! بەرەو کوێ؟ بەرەو «کۆتلاس».

لە ناخی خۆمدا گوێم لە دەنگی خۆم بووەوە: گەشتەکە بەرەو ئێرتز ئیسرائیل دەستی پێکرد!

## ١٥

# بەرەو شەوە سپییەکان

لەوێ لە لایەک قیتارێکی بارهەڵگری دوورودرێژ لەچاوەڕوانیماندا ڕاگیرابوو. فارگۆنەکانی بار، کرابوونە فارگۆنی زیندان. پەنجەرە بچووکەکانیشی شیشەبەند کرابوون. لە هەر فارگۆنێکیشدا تەختەبەندێکی دار دروستکرابوو، لە ناوەڕاستی هەر فارگۆنێکیش، لوولە (بۆری)ی بەرزببوونەوەوە، ئەمانەشیان کردبوونە سەتڵ. سەربازەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دەست بە چەک و سەگی پۆلیسیش بەدەستی هەندێکیان هەر مڕەمڕیان بوو. ئیدی ئێمەیان لەو زیندانە گەڕۆکە بارکرد.

کاتێک سواری قیتارەکە بووین، هەندێ لە کەسانی نێو سوپا لەنێو خۆماندا، گوتیان هەر ژوورێک لەسەر ئەو قیتارە جێگەی چل کەس یاخود هەشتا ئەسپی تێدا دەبێتەوە. ئێمەش پێمان سەیر بوو، چۆن بە زەحمەت بە قەڕاپەستانێ[121] بە خۆمان و بوخچەکانمان جێگەمان لە نێو فارگۆنەکەدا بووەوە، بەڵام لە دوای ژماردن، دەرکەوت حەفتا کەسی تێئاخنراوە. ئەو قەڕاپەستانەی لەسەر تەختەبەندی سەرەوە هەبوو، سامناک و ناقۆڵا بوو. ڕەوشی هەناسە تەنگیش لەسەر تەختەبەندی لای خوارەوە ترسناک بوو. من زۆر بەگومان بووم، چۆن بەو ڕەوشە، دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، توانیبووی چل

[121] قەڕاپەستانێ: تێکقژقژان، بە پاڵەپەستۆ خۆبردنەپێش.

ئەسپ لە فارگۆنێکی وەک ئەوەی ئێمە بار بکا. بەڵام خۆ زیندانییەکان وڵاخەبەرزە[122] نەبوون.

دەرکەی پێشەوەی فارگۆنەکەش ئاسن بوو، بە مەحکەمی داخرا بوو. ئێمەش هەر هاوارماندەکرد، لەبەر بێ هەوایی خنکاین. پاسەوانەکانیش قیژاندیانەوە و گوتیان هەوا بایی پێویست لە پەنجەرە شیشەبەندەکاندا دێتە ژوور. قەدەغە بوو دەرکە بکرێتەوە؛ قەدەغەیە، ئەوەش هەر ئەوەبوو کە پێیانگوتین و کەمێک دواتر ئەوانەی سەرەوە پێیانڕاگەیاندین، کە پاسەوانەکان ئەوێیان چۆڵکردووە. ئیدی کەسێک لەوێ نەمابووەوە هاوار و سکاڵای بۆ بەرین.

ڕۆژەکە خەریکبوو ئاوا دەبوو. ئێمە برسی و ماندوو. لەبەر هیلاکی و ئەو ڕەفتارە توندوتیژییەی نێو «لوکیشکی»، خەومان لێکەوت. منیش بێدار بووم، بینیم ئەو زیندانە گەڕۆکە بە ڕێگەی خۆیدا دەڕوا.

گەشتەکەی ئێمە بۆ چەندین ڕۆژ و شەو درێژەی کێشا. دوای چەند ڕۆژێک وەستا. هەموو بەیانی و ئێواران کەم تا زۆر پەیوەندیمان لەگەڵ پاسەوانانی شۆڕش بۆ پەیدادەبوو: ئەوان ڕۆژانە دوو جار دەیانژماردین، تا دەستیان لە یەکە بەیەکەمان نەدابایە و تەواو دڵنیانەبوونایەوە، دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە. ڕۆژی یەک جاریش نانیان دەداینێ. بەم جۆرە بۆمان هەڵکەوت ڕۆژێ سێ جاران هەوای زیاتر هەڵبمژین، بەتایبەتی ئەو کاتانەی دەرگە ئاسنینەکە دەکرایەوە.

خواردنەکەشمان هەر لە ڕێی زیندانییەکان کە شتێکی تایبەتیان لە قۆڵیان بەستبوو، بۆ دەهات. خواردنەکە پێکهاتبوو لە نان و ماسی خوێکراو. لە ماوەی هەموو گەشتەکەدا، کە چەندین هەفتەی خایاند، هیچ جۆرە خواردنێکی کوڵاویان نەداینێ. دەبوایە تێنوێتییشمان بە ئاوی نەکوڵاو بشکێنین.

---

[122]– وڵاخەبەرزە: ئەسپ و ئێستر دەگرێتەوە.

هەڵبەتە ئێمە لەوێ تووشی داوی تێنوێتی بووین، زۆرمان بە دەستیەوە ناڵاند. هاواری "ئاو، ئاو" بەردەوام دەگوترا، ڕێیە ڕۆژێک دەبیسترا، لەمسەر بۆ ئەوسەری قیتارەکە هەر هاواری ئاو، دەنگی دەدایەوە؛ وەنەبێ هەر لە وێستگەکان بەڵکو لە ماوەی گەشتەکەشدا هاوارەکە هەر نەدەبڕایەوە. لەوێدا تەنیا یەک بادی ئاو تێخواردنەوە هەبوو، دەبوایە لەنێو سەتڵەکە هەڵێندرابایە. پێویستبوو لەسەر ئاوخواردنەوە نۆرەمان بگرتبایە. لەم بارەدا دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، هەروەک وڵاخەبەرزە ڕەفتاری لەگەڵ مرۆڤەکان دەکرد.

ڕۆژێکیان، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر بەڕێوە بووین، تووشی هێدمەگرتنێکی زۆر ناخۆش و سەیر بووین. قیتارەکە لە ناوچەیەکی پڕ داروبار وەستا. لە دەرێ گۆماوێک هەبوو، بە قەوزەیەکی تەنک داپۆشرابوو. زۆریش لە قیتارەکە دوور نەبوو؛ ئێمە لە شوێنی خۆمان گوێمان لە قیڕەقیڕی بۆقان دەبوو، لە زۆنگاوەکە بە دوای نێچیری خۆیان دەگەڕان. هاوارمانکرد، بۆئەوەی دەقاودەقتر بم، قیژاندمان "ئاو، ئاو!" ئینجا لە شیشەبەندی پەنجەرەکە بینیمان، ئەو زیندانییانەی نیشانەیان لە سەر باسک هەبوو، بە سەتڵ بەرەو گۆماوەکە ڕۆیشتن. ئێمەش وەک نارەزایەتییێکی گەورە هاوارمان کرد: "ئەرێ ئێوە لەو ئاوە دەدەنە ئێمە؟" وەڵامی پیاوەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئارام و لەسەرخۆ و مەعقوولانە بوو: "وێستگەی وەستانی دادێ زۆر دوورە. ئێوەش ئاوتان دەوێ، ئەمەش ئەو ئاوەیە کە بتوانین بۆتان دابین بکەین. خۆ ئەگەر نەتانەوێ بیخۆنەوە، مەیخۆنەوە. بەڵام لەمڕۆوە تا بەیانی هیچ ئاوی دیکە نییە."

ئێمەش ملمان لێنا خواردمانەوە.

لە یەکێک لە وێستگەکاندا، قیتارەکەمان لە تەنیشت قیتارێکی دەستەخوشکیدا ڕاوەستا. ئەویش قیتارە زیندانێک بوو. لەو شوێنەی

مـن لێیدانیشـتبووم، لەسـەر قـاتی تەختەبەنـدی سـەرەوە، لە نزیـک پەنجەرە شیشەبەندەکە، جووتە چاوێکم بینین، چاوی ژنێک بە پرچێکی بۆزەوە. چـاوە گەورە و خەمگینەکـانی لە بۆشـایی شیشـەبەندەکانەوە کەوتە بەرچـاوم و تێکگیـراین. هەردووکمـان بە بێـدەنگی سـەیری یەکدیمان کرد. دیاربوو چاوەکانی دەیانپرسی: "بەرەو کوێ؟ بۆچی؟" ئیدی قیتارەکەی ئەو لە شوێنی خۆی جووڵا و ڕۆیشت، زۆری نەبرد، هـی ئێمەش کەوتە جووڵە. بۆ چەندین ڕۆژ و شـەو، دوای ئەو دەنگە ڕیتمئاسایەی لەسـەر هێڵی ئاسنینەکەوە دەهـات، دیاربوو هەر هەمـان پرسیار چەند بارە دەبووەوە: "بۆ کوێ؟ بۆچی؟ چما؟ کوێ؟ ..."

هەر قیتاری هاوشێوە بە پێش ئێمە دەکەوتەوە. تۆ بڵێی دەسـەڵاتداران چەنـد "ساسـتاڤ"یـان لەو جـۆرە هەبـێ، ئـای تـۆ بڵێـی چەنـد زینـدانی گەڕۆکی هەبێ، بە بەراورد لەگەڵ زیندانی جێگیر.

لە ڕابردوودا گواستنەوەی ئەو ئاپۆرایە لە خەڵک پێیدەگوترا "کۆڕەو" یـان گواسـتنەوەی کـۆیلە. لە ڕۆژانـی پێشکەوتنخوازیشـدا نـاوی لێنـدرا "گەشتی ڕێکخراو بۆ سەرلەنوێ پەروەردەکردنەوەی جڤاکی."

لە میـانەی گەشـتەکەمان، تووشـی قیتـاری دیـکەش هـاتین لە جـۆر و شێوەی جیاواز. هەر لەبەر ئەوانیش ناچار بووین بۆ چەندین سـەعات بوەسـتین؛ هەنـدێک جـار تەواوی ڕۆژەکە یـان شـەوەکە لە شـوێنی خۆمان دەوەستاین. ئاخر قیتـار بە دوای قیتـاردا دەڕۆیشـت و هاشـەی دەهات، هەمووشیان بە ئاراستەی پێچەوانەی ئێمەوە دەڕۆیشتن، ئەوان بەرەو ڕۆژئاوا گوزەریان دەکرد.

هەر کاتێـک قیتـاری لەو جـۆرەی پڕ لە قۆشـەنی سـوپا و کەرەسـتە و تفـاقی جەنگیمـان دەبینـین لە یەکمـان دەپرسـی: "تـۆبڵێێ چـی لە گۆڕێدا بێ؟" تۆ بڵێی جاڕی جۆشدانی سەرتاسـەری لە ڕووسیا درابێ؟ ئێمە چاوی زیندانیی بووین لەسەر نۆژەنبوونەوەی جەنگ. ئێمە هەموومـان

ئەو جارِدانەی ئاژانسی تیلگرامی سۆڤیەتیمان لەبیر مابوو، کە لە ڕێی دەزگەی برووسکەچییەکانی زیندانی لوکیشکییەوە بەرگوێمانکەوتبوو. لە جارِنامەکە هاتبوو؛ ئاژانسی دەنگوباسی تاس ڕێگەپێدراوە نکوولّی لە هەموو زانیارییێک بکا، کە لە ڕێی ڕۆژنامەوانی بیانییەوە سەبارەت بە هەواڵی هێزی چەکداری ئاڵمان لە بارەی بەرەکانی پێشەوەی جەنگ لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا بڵاویدەکاتەوە. ئەو جۆرە جووڵەی سەربازییە، وەک چۆن ڕاگەیانراوەکە لەسەری دەڕۆیشت، هیچ شتێک نەبوو لە مانۆرێکی سەربازی زیاتر، شتەکە لە ڕۆتینێکی خۆڕێکخستنەوەی سەربازی زیاتر نەبوو، ئەمەش بە پێی پێداویستی باری جەنگ بوو لە «گریک» و «کریتا». ئێمەش پێمان سەیر بوو چۆن کاربەدەستانی یەکێتیی سۆڤیەت حاشایی لەو بەڵگانەی بەردەستن دەکەن.

ڕۆژێکیان هەواڵەکە گەیشتە دەرگە داخراوەکەی سەر فارگۆنەکەمان. دەرگەکە بە ڕووی هێزی گەردەلوولدا کرایەوە. جەنگ! کەسیش نەیزانی چۆن هەواڵەکە دزەیکردە نێو قیتارە زیندانەکە. لەوانەیە یەکێک لەوانەی خواردنی بۆ قیتارەکە هێنابێ و شتێکی چرپاندبێتە بن گوێی ئەفسەری بەرپرس. لەوانەشە یەکێک لە کارمەندانی هێڵی ئاسنینی ڕووسی، بە کوتکە گەورەکەی لە هێڵی ئاسنینەکەی دابێ، شتێکی چرپاندبێتە گوێی یەکێک. ئێمە نەماندەتوانی سەرچاوەی هەواڵەکە پشتڕاستبکەینەوە. هەواڵەکە پێشتر بە چەند ڕۆژێک لە هێزەکانی ئاڵمانییەوە هاتبوو، تا دەهات بەرەو پێشەوە دەهاتن، تا دەهاتیش ئێمە لە شوێنی شەڕەکە دووردەکەوتینەوە، ئەم دۆخەش سەرباری هەبوونی پەیماننامەی خوێن، سەربارەی حاشالێکردنی دەزگەی هەواڵی «تاس»، هەر قەوما. هەواڵی پەلاماردانی ئاڵمان نەوەک هەر ڕادەی مەراقی ئێمەی بەرزکردەوە، بەڵکو بووە هۆی گەرمکردنی بەڵگەوبەندی باسوخواسەکانی سێ نەتەوە لەنێو فارگۆنەکەدا کە پۆلۆنی و لیتوانی و جوو بوون. تەنانەت زیندانییەک نەیتوانی

ڕقوکینەی خۆی لەبەرانبەر «ڤیلنا» لە نێوان پۆلۆنی و لیتوانییەکاندا بشارێتەوە. خۆی بەیەکدادان و دەمەقاڵەی بەردەوام لەنێو ئەواندا هەبوو، لە هەردوو شوێنەکەش، چ لە زیندانی لوکیشکی یان لە نێو قیتارەکەدا شتێکی نامۆ نەبوو. بەڵام هەردوولایان پۆلۆنی و لیتوانییەکان، پێیان وابوو ئەو برادەرانەیان کە لە زیندانی لوکیشکی مابوونەوە، بە بەخت بوون، چونکە لەو کاتەی ئەوان، واتە ئەوانەی لە نێو قیتارەکەدابوون و بەرەو «کۆتلاس» دەڕۆیشتن، لە سنووری ئازادکردن زیاتر و زیاتر دووردەکەوتنەوە. "خۆ ئەگەر تەنیا بۆ چەند هەفتەیەکی دیکە لە «ڤیلنا»دا بمابواینەوە، شتێکی دیکە دەبوو" هەمووان ئەم قسەیان بە هەناسەساردی و ئاخهەڵکێشانەوە دەگوت. بەڵام هەناسەساردی هەرەقورس لەلایەن لیتوانییەکانەوە بوو. ئەوان دژی ئاڵمانەکان نەجەنگان. ئەوان چاوەڕێیان دەکردن.

ئاڵمانەکان دژی بەریتانیا، هاوپەیمانی پۆلۆنیا وەستانەوە؛ شتێکی سروشتیش بوو، هەواڵی جەنگی نێوان ئاڵمان و ڕووسەکان ببێتە مایەی دنەدانی زیندانییە پۆلۆنییەکان. یەکێک لەوان (لە فارگۆنێکی دیکەدا) لەمە زیاتر شوڵیلێهەڵکێشا، لەبەر خۆباوەڕی پتەوەوە، شتێکی دیکەی دەربڕی بوو. لەبەر ئەو هۆیە بێ یان هۆیەکی دیکە، ئەویان بردبووە زیندانی تەنیایی لەنێو فارگۆنەکەدا، گوێمان لێیبوو هەر هاواری دەکرد:

"من ئەفسەرێکی پۆلۆنیم. ئەوە ئێوە کێ دەبەنە زیندانی تەنیایی؟"

کاردانەوەی سەربازی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش گەیشتە بەرگوێمان:

"هۆ ئەفسەری پۆلۆنی؟ ئێمە ئەفسەری پۆلۆنی دەخەینە ئاودەست!"

کەسـیش نەیـدەزانی کە پەیماننـامەی نـوێی سـۆڤیەتی - پۆلـۆنی لە ئارادابوو.

ڕۆژێکیـان خێرایـی قیتـارەکە ئەوەنـدە خـاوبووەوە، هەروەک ڕۆیشـتنی کیسەڵی لێبەسەرهات. لە هەردوو بەرەوە خەڵک جلێکی شڕووڕیان لە بەردا بوو، جۆگەیان لێدەدا. ئێمەش نەماندەزانی ئەوانە کێن، گوێمـان لە سرتەیەکی ئاشنا بوو: "لە پۆڵەنداوە؟"

"بەڵـێ، بەڵـێ،" هەنـدێ لە پۆلـۆنییە زینـدانکراوەکان وەڵامیانـدایەوە، وەڵامەکەشـیان هەر بە سـرتە لەگەڵ هەر کەسـێکی جیهـانی دەرەوەدا بدوێی. ئـاخر بە تەواوی قەدەغە بـوو. بێ سێو دوو سزای ئەو جۆرە کەسانەش زیندانی تەنهایی بوو.

"«ڤیلنـا» لەبـن دەسـتییانە. هەواڵەکە وەک چەقـۆ وابـوو بـۆ شـەقکردنی سـەرکە پەنیـر." یەکـێ لە پۆلۆنییەکـان هەر بە چـرپە تـوانی لەوبەری جۆگەوەوە بەر لەوەی قیتارەکەمان تێبپەڕێ، وەهامان پێڕابگەیەنێ.

ئیدی لەنێو لیتوانییەکاندا بووە کەیفخۆشی. لەنێو پۆلۆنییەکانیش خەم و ماتەم.

بە دڵخۆشی بەو ڕووداوە پەڕجووانەی لەو کاتەی لە ئێمە «ڤیلنـا»مـان بەجێهێشـت، بەڵام بە بـارێکی برسـیتر لە زینـدانی لوکیشـکی، تێنـوتر و پـیس و دژوونتـر لەوەی لە ژیانمانـدا بەسـەرمان هـاتبێ، ئیـدی بەم دۆخەوە گەیشـتینە «کـۆتلاس». لە مـاوەی ئەو هەمـوو هەفتـانەی بە ڕێگەوە بـووین، لە دەمـی ئەو هەمـوو پاسـەوانانە کە نـان و ئاویـان بـۆ دەهێنـاین، لەو هەمـوو وێسـتگانەی کە دەوەسـتاین، هـیچ نـاوی ئەو وێستگە و شـوێنانەی قیتـارەکەی لێدەوەسـتا پێنەدەگوتین. بەڵام ئەوان ئەو ڕاسـتییەیان لێنەشـاردینەوە، کەوا گەیشـتینە «کـۆتلاس»، ئەو شـوێنەی لە زینـدانی لوکیشـکیەوە باسوخواسـەکەی گەرمبـوو. ئـێمە

هزرێکـی دیکەمـان سـەربار بـوو، بەوەی گەیشـتووینەتە دوامەنزڵـی زیندانیمان و ئینجا لەوێوە ژیانێکی نوێ دەستپێدەکەینەوە.

کەچی ئێمە هەڵە بووین. تاکە کەسێک کە لە کۆتلاس دابەزی، کۆلۆنێلە پیرەکە بوو. ئەو لەوێ مرد.

ئـێمە لەسـەر برینـی ڕەوتـی ڕێگەکەمـان بەردەوام بـووین. قیتـارەکە هەروەک ئەوەی پاپۆڕێک بێ ئێمەی بەناو زەریایەکی هەڵچوودا دەبرد. هەرگیز وەک ئەوێ دەمێ نەهەژاین. زۆربەمان تووشی نەخۆشی قیتار بـووین و بەردەوام هەر دەڕشـاینەوە. هێـزو گوڕمـان لە کورتیـدا، تـا دەهـات کزتـر دەبـوو. سـەرمان گێژی خـوارد. ئیـدی هـیچ کەس قسـەی نەدەکـرد. تەنیـا یەک تـاکە پرسـیار لەسـەر سـەرمان بەنێو هەوایەکەدا دەفـڕی و دەسـووڕایەوە: "بەرەو کـوێ؟ ئەرێ ئەوان بەرەو کوێمـان دەبەن؟"

کاتێـک ڕۆژێـک لە ڕۆژەکـانی گەشـتەکەمان کۆتـایی دەهـات - بەڵام کامەیـان بـوو، نـاتوانم بیڵێم چونکە ژماردنەکەمـان لە دەست دابـوو - ئیدی هەر وەک جاران، شەوان ویستمان بڕازێین. هەڵبەتە نەماندەزانی کات چەندە، بەڵام لە خـوونەریتی بەسەرداسـەپێندراو دەمـانزانی، کـاتی خەوە. بەڵام خـۆ شـەو هەر دانەدەهـات. هەرگیـز لە نێـو فـارگۆنە داخـراوەکە، ڕووناکـاییێکی پـڕ و تەواو نەبـوو، ئەوانەی کەوتبـوونە لای پەنجەرە شیشەبەندەکان، ڕووناکایی ڕۆژیان لە دەرەوە دەبینی، هێشـتا تاریکوڕوونیان نەبینیبوو. ئیدی بەم شـێوەیە سـەرمان گێژی دەخـوارد، بەبێ ئەوەی شەوباشـیش لەیەک بکەیـن وەنەوزمـان دەدا و دەنوسـتین. دوای کەمێـک لەچـاوگەرمکردن، هەڵسـامەوە لە کـونی پەنـجەرە شیشەبەندەکەوە سەیرێکی دەرەوەم کرد. هێشتا هەر ڕۆژ بوو. پەککو چ ڕۆژێکی درێژ بـوو! دیسـان سـەرم گێژبـووەوە و خەوم لـێکەوتەوە. کـاتێکیش ئەمجارەیـان هەڵسـامەوە، هێشـتا هەر بێـدەنگی بـوو، هـیچ ئاماژەیەکیش بۆ شەو لە گۆڕێدا نەبوو. ئای لەو ڕۆژە درێژە!

هەر ئەو ڕۆژەیان (یان تۆ بڵێی ڕۆژی پاشتر بێ؟) مەتەڵەکە هەڵهێنرا. یەکێک لەوانەی خواردنیان دەگێڕا، سووک و ئاسان پێیگوتین: "ئێمە گەیشتینە نێو شەوە سپییەکان."

ئێمەش بە تێکەڵەیەک لە حەپەسان و مەراقەوە پرسیمان: "ئەوەندە دوور بەرەو باکوور؟"

کابراش بە لەسەرخۆیی وەڵامی داینەوە: "بەڵێ. ئێمە لە باکوورین."

باکوورەکە! لەو کاتەی هاوین دادێ هەر ڕۆژ بە دەرەوەیە و لە زستانانیشدا ڕۆژ نییە و هەر شەوە. ئای لەو دیاردە پەڕجووئاسایە! ئای چ جوانییێکی سەیروسەمەرەیە! ئای ئێمەش چەند بەو جوانییە دڵڕفێنەی سەرنجگیر بووین!

بە شێوەیەکی خۆزاییانە یەکێ لە زیندانییەکان پڕ بەدەنگ هاواریکرد: "ئای چ جۆرە دژبەرییێکە! ڕۆژەکانمان ڕەش و شەوەکانیشمان سپی!"

لە کۆتاییدا و دوای ڕۆیشتنێکی دیکەی ئەو "دەبڵ ڕۆژانە" لە قیتارە زیندانییەکە دابەزێندراین. لەسەر مەزرایەکی کراوە وەستاین. تا چاو بڕیدەکرد لە دەوروخولمان هەر زۆنگاومان دەبینی. لێرەو لەوێ، پڕچک و دەوەن دەبیندران. ئێمە لە «تایگا» یان لە پانتاییەکەی باکوور بووین. ناوی وێستگەی قیتارەکەش کە لێیدابەزین «کۆشڤا» بوو. لە کۆڵێتێکی دارین، کە بەکردەوە وێستگەی قیتارەکە بوو، تابلۆیەک هەبوو؛ "وەزارەتی خەڵک بۆ کاروباری ناوخۆیی" لەسەر هەڵکەنرابوو. دیاربوو هێڵی ئاسنین لە «کۆتلاس»ـەوە بەرەو باکوور سەر بە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتییەوە بووبێ، نەوەک بە دەستی وەزارەتی کاروباری پەیوەندی و گواستنەوە.

بە بوخچە بەکۆڵەوە بە دەورەدراوی بە سەرباز کە تفەنگەکانیان لە گۆڵمەدابوون و بە سەگی پۆلیسی دڕی چەنگ و کەڵبە کوشندەوە، لە

هێڵی قیتارەکەوە کەمێک بە پێ ڕۆیشتین، ئینجا فەرمانیان پێکردین لە شوێنی خۆمان دانیشتین و پشوویێک بدەین. دەستبەجێ هەر یەکێک لە ئێمە بە دوای ئەو کەسەدا گەڕا، کە دەیناسی. ئیدی ئەو ناوە هەر جۆش و خرۆشی سڵاو لەیەکدی کردن بوو. منیش چاوم بە دوای برادەرەکانم، «شیستەر» و «شێسکین» و «کرۆل»دا گێڕا. هەرچەندە ئاگاداریانکردبووینە شوێنەکانی خۆمان نەگۆڕین، بەڵام بە قونەخشکێ یەک بەرەو ئەویدی کشا، بە شوێنپێی زیندانییەکانی دیکەدا گەڕاین. لە ڕەوشێکی تایبەتدا، کە ناتوانم باشتر لەوە و وێنایبکەم، گفتوگۆیەکی خێرا و ڕاگوزەرم لەگەڵ «د، شێستەر»دا کرد. یەکێ لە سەربازانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئێمەی لە قاف گرت و بە دەنگێکی هەڕەشەئامێزەوە فەرمانی پێکردین هەر یەکەمان بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. بەڵام بەر لەوەی ئەو لەیەکمان جیابکاتەوە، - نەمدەزانی ئەو لەیەکجیاکردنەوە بۆ نۆ ساڵی ڕەبەق دەبێ - توانیم ناوەڕۆکی ئەو تێبینینامەی نێو پارچە سابوونەکەی پێڕابگەیەنم و دڵنیاشم کردەوە، لە ئێرتز ئیسرائیل یەکدی دەبینینەوە.

ئینجا لەپڕەوە دەنگی فیکەیەک دڕی بە هەوای دانیشتنەکەماندا. فەرمانمان پێکرا هەڵسین و بە چوار ڕیز بوەستین. یەکێ لە ئەفسەرانی دەزگەی ئاسایشی سۆڤیەتی پێیڕاگەیاندین: "ئێوە بەرەو ئۆردوگایەکی گواستنەوە دەڕۆن. ڕیزەکانتان تێک مەدەن. یەک هەنگاو بەرەو لای دەستەڕاست یان دەستەچەپ وەک هەوڵێکی ڕاکردن دادەنرێ، سەرباز و پاسەوانەکانیش فەرمانیان پێکراوە بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەک تەقەبکەن."

ئێمەش بوخچەکانمان بە پشتدا دا و کەوتینە ڕێ. کاروانەکە زۆر دووردرێژ بوو. بە ڕێگەیەکی قوڕاویدا ڕێگەمان تەیکرد، هەندێک جار بەسەر پردێکدا دەپەڕینەوە، کە هەر هێندەی قەدی دارێک بەرین بوو. هی ئەوە نەبوو هەمیشە لەسەر ئەو پردانەدا بەڕیز بڕۆی. ئەوانەی لە

دەرەوەی ڕێــڕەوەکە بــوون بەدبەخــت بــوون. ئەوان هۆشــداریی ئەفسەرەکەیان بەبیر دەهێنایەوە، هەر کاتێک ڕیزەکە بەهۆی درێژی پێچاوپێچەکەی بشکێنرابا ئەوا دەبوو بۆ سەربازی ڕێنوێن هاواربکەن: "من دەبێ بەرەو دەستەڕاست بایدەمەوە ... من دەبێ بەرەو دەستە چەپ بایدەمەوە ..."

نـاو بە نـاویش ئـاوڕێکم لە دوای خـۆم دەدایەوە. ڕیـز لە دوای ڕیـز، بەربژێرانــی تێهەڵچــوونەوە بــۆ دووبــارە پەروەردەکــردنەوە بەرەو پێشــەوە تەکانیــان دەدا. گــوڕدەمێکی مەزن. هەر هەموویــان لەبــن بوخچەکانیـان چەمــابوونەوە، لەبەر ڕێــگە ســەختەکە قاچەکانیــان بە شلۆقی هەنگاوی درێژیان هەڵدەهێنا. هەموو ئەوانەی دەوروبەریش، کەسانی چەکدار بوون، دەستیان لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگ بوو. سەگە دڕەکانیش هەر دەیانمڕاند. یەک شەقاو بە دەستەڕاست ... یەک شەقاو بە دەســتەچەپ! ... لەنێـو ڕەوتــی کاروانەکەشــدا، پزیشــک، ئەنـدازیار، پــارێزەر، مامۆســتا، کرێکــار، دادوەر، ئەفســەر هەبــوون ... ئــای لەو کاروانە لە سەدەی بیستەم! کاروانێک لە کۆیلە.

یەکێ لە سەربازانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی دەرکەی گفتوگۆی لەسەر من کردەوە و لێیپرسیم:

"بڕیاڕی چەند ساڵت هەیە؟"

"هەشت ساڵ."

"بۆچی؟"

"ماددەی ٥٨."

"ئەوە خراپە."

"ئەوان لە «ڤیلنـا» پێیـانگوتین، ئەگەر ئـێمە کـاربکەین زووتـر ئـازاد دەکرێین."

"خەڵک لێرە دەربازی نابێ."

"مەبەستت چییە؟ دادوەری لێکۆڵەرەوە پێیگوتین ئەگەر ئێمە بێینە ئێرە و کاربکەین، زووتر، بەر لە هاتنی وادەی خۆمان ئازاد دەکرێین."

سەربازەکە لە قاقای پێکەنینی دا.

"دادوەری لێکۆڵینەوەکـان،" ئەو وەهـا لەسـەر قسـەکەی ڕۆیشـت؛ "ئەو هەر لە «ڤیلنـا» مـاوەتەوە، تـۆ و ئەو خەڵـکەکەش لێـرە دەمێنـنەوە. گوێبگرە چیت پێدەڵێم: لێرە خەڵک دەربازی نابێ."

"قسەی لەگەڵ مەکە،" برادەرەکەم، کۆنە چاوەشـەکە، کە لەدوای منەوە دەڕۆیشت و یارمەتیدام لە هەڵگرتنی بوخچەکەم گوتی؛ "دەیبینین، ئاخۆ ئێمە لێرە دەمێنینەوە یان دەردەچین."

منیش بە گوێی ئامۆژگارییەکەی ئەوم کرد، بەڵام بە بێدەنگی نەفرەتم لە "بێدەنگی" سەرتاشەکانی «لوکیشکی» کرد.

دوای ئەوەی بۆ مـاوەی چەنـد سـەعاتێک بە پێ ڕۆیشـتین، لە کۆتاییـدا گەیشـتینە ئۆردوگـای گواسـتنەوە. شـوورەیەکی تێلبەنـد دەوری هەمـوو ئەو نـاوەی دابـوو. قـوللەی چـاودێریش بـاڵی بەسـەر ئەوێدا کێشـابوو. ئۆردوگـاکە زۆر گەورە بـوو. زینـدانییەکان دابەشـکرانە سـەر چەنـد گرووپی سەد کەسی. «شێسکین» و «کرۆل» کەوتنە گرووپەکەی من. «شێسـتەر»یـش بەر گرووپێکـی دیـکە کەوت. ئێمەیـان بـردە کـۆڵیتی دارینـــــی گەورۆنە گەورۆنە، تەختەبەنـــــدەکانی لە لەوحەدار دروسـتکرابوون. بـۆ یەکەمـین جـار دوای چەنـدین هەفـتە، سـووپێکی گەرمیان دەرخوارد داین. ئینجا بردراینە بن شاوەرێک و سەتڵە ئاوێکی

شلّتێن بەسەردا کردین. گرووپ لە دوای گرووپ بردرایەنە بەردەم نووسینگەکە.

ستافی نووسینگەکەش هەر لە زیندانیان بوون. ئەوان وردەکاری تایبەت بە هەر زیندانییەکی نوێیان یاداشتکرد.

نووسەرە زیندانییەکە لێیپرسیم: "کەی گیرای؟"

"لە ٢٠ی سێپتێمبەری ١٩٤٠."

"بڕیاری چەندیان بۆ داوی؟"

"هەشت ساڵ."

ئەویش شتەکانی نووسی، لەگەڵ نووسینەکەشدا منگەیەکی لێوەهات: "ڕۆژی گرتنت: ٢٠ی سێپتێمبەری ١٩٤٠؛ ڕۆژی ئازادبوونیشت: ٢٠ی سێپتێمبەری ١٩٤٨."

"ئەوەش واتای ئەوەیە، وادەی سەرلەنوێ پەروەردەکردنەوەکەت لە لای دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لە ڕۆژی گرتنتەوە دەستپێدەکا، نەوەک لە ڕۆژی بڕیاردانی حوکمەکەت. ڕوون و ئاشکرا لێکۆڵینەوەکەش بەشێکە لە سەرلەنوێ پەروەردەکردنەوە." من وەها بیرم لێکردەوە. بەڵام لەوێ کاتی ئەوە نەبوو لە بەخشندەیی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی قوولّببینەوە. دووەمین ڕۆژی دەستنیشانکراو لە گوێمدا دەزرینگێتەوە، ڕۆژەکە دزەیکردە نێو ناخ و ویژدانمەوە. ٢٠ی سێپتێمبەری ١٩٤٨! ڕۆژی ئازادبوون، ٢٠ی سێپتێمبەری ١٩٤٨! ...

کابرا لەسەر پرسیارەکانی ڕۆیشت: "بە چی تاوانبارکراوی؟"

"دەق نــازانم. دادوەری لێکــۆڵەرەوە پێیڕاگەیانــدم، کەوتــوومەتە بــن ماددەی ٥٨."

"کاتێک بڕیارەکەیان دەرکرد، چییان گوت؟"

"گوتیـان: Soziano - opasni element تـوخمێکی دژوار بـۆ کۆمەڵگە."

کـابرا پیتەکـانی S.O.E ی نووسـین، ئینجـا کـارتێکی بـۆ واژۆکـردن دایەدەستم و بە چرپەیەکیشەوە گوتی: "هەرگیز مەڵێ مـاددەی ٥٨. بڵێ S.O.E توخمێکی دژوار بۆ کۆمەڵگە، ئەوەی لە بڕیاری حوکمدانەکەتدا هاتووە."

ئەوەش ئامۆژگــاری زینــدانییەکی دەزگەی ئاسایشــی کۆمۆنیســتی سۆڤیەتی بـوو بۆ زیندانییەکی تـازە، زیندانییە دێرینەکە" دەیزانی چی دەڵێ.

شـەوەکان لەسـەر سـپییەتی خۆیـان بەردەوام بـوون. بـاقی شـتەکانی دیـکەی ئۆردوگـای گواسـتنەوە کـورت بـوون. یەک دوو ڕۆژ دواتـر، دیســان ڕیزکــراینەوە، دیســان ئاگــادارکراینەوە، یەک هەنگــاو بــۆ دەستەڕاست، یەک هەنگاویش بۆ دەستەچەپ نەهاوێژین، ئیدی ئێمەیان هـاژۆت. بۆ چەندین سـەعات بە نێو زۆنگـاودا ڕۆیشـتین تـا گەیشـتینە سەر لێواری ڕووبارێکی گەورە.

ژمـارەیەک لە زینـدانیان لەسـەر لێـواری ڕووبـارەکە بە جۆشـەوە بە ڕستە جوێن و نەفرینێکی ڕووسی پێشـوازییان لێکردین، بەڵام لە تۆنی دەنگیاندا دیاربوو، بە کردەوە سڵاومان لێدەکەن.

ئێمەش هاوارمان کرد: "ئەو ڕووبارە ناوی چییە؟"

"چـی؟ چییـه نـایزانن؟"  زینـدانییەکانیش بە نەفرینـی زیـاتر هاواریـان کـردەوە. "ئەمـە ڕووبـاری «پێچـۆرا[123]»یە، ئێـوەش دەچـنە ئۆردوگـای «پێچۆرا»."

بەیەکەوە بە ڕێڕەوێکـی ئاسـنیی درێـژ سـواری قەیاغێـک کـراین، کە بە بزوێنەرێکی هەڵمین ڕادەکێشرا.

"ئەو قەیاغە کۆنە، هـی سـەردەمی قەڕاڵە، هێشـتاش هەر کاردەکا." ئەمە قسـەی یەکـێ لە زینـدانییە ڕووسـەکان بـوو، ئامـاژەی بە ڕاکێشـەرەکە کرد؛ "بەڵام ئەو شتە خۆ هێشتاش هەر گڕەی دێ______."

"ئێوە هیچتان دەستناکەوێ،" زیندانییەکی پۆلـۆنی بە لاقرتێوە هەڵیدایێ؛ "لە ڕووســیا گەورەتــرین بەڕێــوەبەر، خــۆراک و پۆشــاکی لە هــی دەرکەوانێکی پۆلۆنی بەر لە جەنگ خراپترە."

ئێـدی ڕووسـەکان کۆڵێـک جـوێن و نەفرینـی پـیس پیسـیان هەڵڕشـت، جوێنەکـان وەک هـیچ نەبـوون، هەرگیـز گـوێم لێنەببـوون. زۆربەشـیان داهێنـانی کفرئاسـابوون بە جـوێن و نەفرینـی "نەریتییـانە"ی سـەردەمی هەڵبەستنی ئەو ڕاکێشـەرە هەڵمینەی قەیاغی سـەر ڕوبـارەکە، لە جیـاتی دایکی خواوەند، هەر بەتەنیا دەگوترا دایک.

مـێجەرە پیـرەکە بە هێـدمەگرتنێکی تەواوە گـوتی: "بە کـوێ گەیشـتین. ئەوەش دەستکەوتێکی دیکەی شۆڕشە."

منیش وەڵاممدایەوە: "خـۆ شـتێکی تایبەتمەنـدتر لە تووڕەبـوونی ئەوانـدا هەیە. پیـاوەکە بە خۆشـی زینـدانییە، قوربـانی دەسـتی ڕژێـمەکەیە، سەیرکە بە چ جۆشێکەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەی بیانییێک دەبێتەوە."

---

123 -Pechora

بەر لە وەی شەو دابێ ئێمە لە ڕێی خۆمان بووین. من لە لای سوکانی بەلەمەکە دانیشتبووم. چوار سەعات ئێمە بەسەر ڕووبارە کەسکە پانوپۆڕەکەدا ڕۆیشتین. شەوە سپییەکان بە هەموو دلڕفێنی خۆییانەوە، خۆیان نیشانداین. ساتێک گوژمە تیشکێک لە دەم کەلەوە، ڕۆژ بەسەر «پێچۆرا»وە؛ ساتێکی دیکە خۆر لە ئاسمانەوە، تیشکی بەسەر ڕووی ڕووبارەکەدا پەخشدەکرد. ئەویش ڕووناکایی شەو بوو.

لە لای من سەربازێکی پاسەوان دانیشتبوو. سەیرێکی کردم، نیگای پەڕیە سەر بوخچەکەم و گوتی: "ئەم شتە چی تێدایە؟"

"جلوبەرگ، جلی ژێرەوە، جزمەی پانیبەرز."

"جزمەی پانیبەرزی چەرمین؟"

"بەڵێ چەرمین."

"ئەوان ئەم شتانەت لێدەستێنن." بە خەندەیەکەوە ئەم قسەیەی پێگوتم.

"لێمدەستێنن؟" منیش بەسەرسوڕمانەوە لێمپرسی.

"دەیبینی. ئەوان هەر هەمووی دەبەن."

"ئەوان هەمووی دەبەن؟" منیش قسەکەی ئەوم دووبارەکردەوە. "بۆچی، خۆ ئەم شتانە هی منن! لەوە تێدەگەم، کە هەندێک شت ببەن و لەگەڵ زیندانییەکانی بەش بکەن، بەڵام بۆچی هەموو شتێک ببەن؟"

یەکێک لە زیندانییە پۆلۆنییەکان خۆی تێهەڵقورتاند و بە لاقرتێیەوە گوتی: "چی؟ ئایا تۆ ئامادەی دەستبەرداری بەشێک لە کەلوپەلەکانت ببی؟"

سەربازەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە خەندەوە گوتی: "زۆری لەسەر مەڕۆ. ئەوان هەمووی دەبەن، ئەوان هەموو شتێک لە کەسەکانت دەبەن. دەیبینی."

تا ئەوکاتەی نەگەیشتینە ئۆردوگاکە، تێنەگەیشتین مەبەستی چی بوو، کە گوتی "ئەوان".

بەڵام بەر لەوەی ببرێمە ئۆردوگای کار (بێگاری)، لە ئۆردوگایەکی دیکەی گواستنەوە، دیسان چاوم بە «شێشکین» و «کرۆل» کەوتەوە. ئێمە بە یەکەوە بۆ یەکەمین پشکنینی پزیشکی براین. «شێشکین» یان «کرۆل»، یاخود هەردووکیان قسەیان لەگەڵ یەکێک لە ستافی نووسینگەکە کردبوو. کابرا لێیپرسی بوون ئاخۆ هیچ کراسێکی بەیەخەیان پێیە. ئەوانیش بە بەڵێ وەڵامیاندابووەوە، ئەویش پێیگوتبوونەوە لە بری نیو دەرزەن لە کراسی بە یەخە، دەکرێ بۆ پشکنینێکی دیکە ڕەوانەی نەخۆشخانەیان بکا و ئەویش بۆیان باشترە. برادەرەکانیشم بە کابرایان گوتبوو، ئەوان سێ کەسن، نەوەک دوو. لە بەرانبەر سێ کراسی دیکەی یەخەدار، کاربەدەستەکە ڕازی بوو بمانگوازێتەوە نەخۆشخانەکە.

خۆ من نەخۆشیش نەبووم، نەشم دەویست بچمە نەخۆشخانە. هەرچەندە منەتباری برادەرەکانیشم بووم، کە منیان لەگەڵ خۆیان برد، نەشمدەویست لەوان جیا ببمەوە مەگەر دەزگەی ئاسایش ناچارمان بکا. بۆیە منیش کراسەکەم دانا و ئیدی هەر سێکمان بە یەکەوە لەگەڵ گرووپێکی زیندانیانی دیکەدا، هەندێک نەخۆش، هەندێک خاوەن کراسی یەخەدار براینە نەخۆشخانە.

کاتێک گەیشتمە ئەوێ، هەر بەڕاستی نەخۆش کەوتم. هەرچەندە پلەی گەرمیشم زۆر بەرز نەبووەوە. زووش چاک بوومەوە. بە لای کەمییەوە بۆ ماوەی دوو هەفتە لە نەخۆشخانە مامەوە. بەڵام لەو ماوە

کورتەدا شتی زۆر لە بارەی یەکێتیی سۆڤیەتەوە فێربووم، لەوەی لە کتێبە ئەستوورەکان فێری نەدەبووم. نەمدەزانی جیهانێک بۆ من کراوەتەوە. هەر ئەوەندەم زانی، چوومەتە ناخی و باش ناسیم ...

## ١٦

# سەربردەی زیندانییەکانی سۆڤیەت

نەخۆشخانە کۆڵیتە دارینەکان، تا ڕادەیەک لەگەڵ زەوی نغرۆ ببوون. تەنیا بەشێکی کەمی دیوارەکە بە دەرەوە بوو. ئەم جۆرە لە تەلارسازی لەگەڵ کەشووهەوای ناوچەی پێچۆرا، نزیک لێوارەکانی دەریای «بارێنس[124]» دەگونجا. ئاکنجییە دێرینەکانی ناوچەکە بە بزەیەکی تاڵی سەرلێوەوە پێیانگوتین: "ئەریٚ ئێوە دەتانەویٚ لە بارەی کەشوهەواکە شت بزانن؟ شتێکی نموونەییە! زستان تەنیا نۆ مانگ دەخایەنیٚ، دوای ئەوە دەبێتە هاوین، ئیدی دڵت ئاسوودە بکە." سەرمای زستانیش "تەنیا" هەر نۆ مانگی پێدەچیٚ، پلەی سەرماش دەگاتە حەفتا و شەش پلەی فەهرەنهایتی[125] ژێر سفر.

هەمووی هەر وەک یەکە، ئەندازیارانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی شێوازی سەیریان بۆ تەلارسازی بەکارهێنابوو. ئەوەش ڕاست بوو باروودۆخی ئاووهەوای باکووریان لەبەرچاو گرتبوو. ئەوەش ڕاستی بوو، لە دروستکردنی کۆڵیتە پانوپۆڕەکەی نەخۆشخانەکە، ڕەوشی سەقایان لەبەرچاو گرتبوو، هەموو بەدەنەی زیندانەکە لەنێو خاکدا ڕۆچوو بوو، نێوانی دارەکانیشیان بە ئاردەدار

---

[124]– دەریای بارێنتس Barens sea دەریایەکی لاوەکی سەر ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوورە، دەکەوێتە باکووری کەنارەکانی نەرویج و ڕووسیا، دەریاکە ڕووسیا و نەرویج لێکدەکاتەوە.

[125]– دەکاتە ٢٤ پلەی سیلسیزی (ئاسایی) ژێر سفر.

پڕکرابووەوە، بۆ ئەوەی لە ترسی سەرما و زوقمەکە ناوبڕێک لەگەڵ دیوارەکان پەیدابکا. گەرماوی نەخۆشەکان لە دووری یەک کیلۆمەتر لە نەخۆشخانەکە لەسەر گردێکی بچووک دروستکرابوو! نەخۆشەکان بە زستانیش تەنیا بە جلی ژێرەوەیان، بە تێوەرپێچانی پەتۆیەکی تەنک دەبررانە ئەوێ. نوێهاتووەکان مەراقبوون بزانن، ئاخۆ نەخۆشەکان بە زستانیش ویستبێتیان بچنە گەرماوەکە. ئاخر بۆ ئەوان شتەکە خەیاڵکردەش نەبوو، مەگەر کەسانی نەساغ ئەو ماوەیە بە ڕاکردن بێنەوە، هەر بەو نیوەڕووتیە و بەو زوقمە ترسناکەش دوای ئەوەی لە گەرماوەکە ئاوی گەرمیان بەخۆداکردووە. مەگەر هەر بە پەڕجوو لە دەست بەڵای هەوکردنی ڕیخۆڵە دەربازیان بێ.

ئەو وەڵامەی نوێیەکان وەریانگرتەوە، وەڵامێک بوو بۆ هەموو پرسیار و کێشەکان لە نێو ئۆردوگای چاکسازی کاردا: "تۆ دەبێ لێیڕابێی، دەنا دەمری."

کاتیشی دەویست تا مرۆڤ لێیڕادەهات. یەکەمین شەو لە نەخۆشخانەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بۆ من مۆتەکەیەک بوو. شەوەکە لە شەوە سپییەکان نەبوو، هەروەها تاریکیش نەبوو" بەڵکو شەوێکی سوور بوو. لە لایەن شڵخە مێش و مەگەزێکەوە، کە لەنێو ئاردەدارەکەی جیاکەرەوەی دیوار و سەربان بوون، هاتنەدەر و پەلاماریان دام، تۆپەڵ لە دوای تۆپەڵ بۆم هاتن. بە بێ وچان بەسەریاندا دام. هیچ دژەکردەوەیەکیش دادی نەدا. ئەوان دوژمنێکی سەرسەخت بوون، دوژمنی خوێنم بوون، تا دەهاتیش ژمارەکەیان زیاددەبوو. هەوڵمدا بە جۆرە تاکتیکێک خۆیان لێبدزمەوە، بە جۆرێکی دیکە خۆم لە نێو پێخەفەکەم لوولبدەم، بەڵام ئەو مانۆرەشم باش نەبوو. دوژمن لە هی خۆی دانەنا و منیان کەوتە بەردەست. ئەوێ شەوێ چاوم لەسەر یەک دانەنان. هەمان شتم بەسەرهات، کە بەسەر هەموو کەسێکی نوێ دەهات. بەڵام ئەوانەی

کـۆنتر لەوێ بـوون، حاڵیـان وەهـا نەبـوو. ئەوان لێـی کەوتـنە خەوێ. ئەوان خۆیان لێڕاهێنا بوو.

بە تێپەڕبوونی کات، ئێمەش لێیڕاهاتین. لەگەڵ ئەوەشدا، لەوانەی کۆنتر لە خۆمـان پرسـی، تـۆ بڵێـی ڕێگەیەکـی خۆڕزگـارکردن لە پێشـکە و مێشـوولە نەبـێ. "بە دڵنیـاییەوە،' ئەوانـیش بە هێـورییەکی فەلسـەفیانە بەرسڤیان داینەوە؛ "بە ئاسانی لە دەستیان قوتاردەبی، مەگەر کۆڵیتەکە بسـووتێنی." لە سـایەی سـەری نەخۆشـخانەی زینـدانیانی سـۆڤیەت ژمـارەی ئەو مێشـومەگەزانە هەر لە زیـادبوون بـوو، ئـاخر قانوونێـک دژی وێرانکردنی موڵکوماڵی دەوڵەت، ئەوانی دەپاراست.

لە نەخۆشـخانەکەدا، ژمـارەیەکی باشـم لە زینـدانییە نەساغەکان ناسـی. یەکێکیان بە پرسیارێک سەرسامیکردم: "ئەرێ تۆ سـەرۆکی «بێتـار»ی پۆلۆنیا نیت؟"

"بەڵێ. باشە چۆنت ناسیمەوە؟"

"منیش ئەندامی «بێتـار»م." ئەو بە جۆرێک لە هەژانەوە وەهـای گـوت؛ "نـاوم «مارمێلسـتاین»ـە. مـن نـاوی تـۆم لەسـەر کۆڵەپشـتەکەت بینـی، بەڵام دڵنیانەبووم خۆتی. بەداخەوە، ئێستا خاترجەم بووم، کە هەوی."

فرمێســـک لە چاوەکـــانی دەبریســـکایەوە؛ بەبینینـــی مـــن بەو دۆخە خەمبـاربوو، بەڵام کاتێک هـاتەوە سـەرخۆی، بە دیتـنم خۆشـحاڵ بـوو. لەو ڕۆژە بە دواوە بە یەکەوەبـــووین لە زینـــدانە هەمەجۆرەکـــانی ڕووسیادا. ئەو کۆمەکبەخشتر بوو بۆ من، لەوەی من بۆ ئەو.

زیندانییەکانی دیکە، کە پێیانەوە ئاشنابووم، هـاووڵاتی سـۆڤیەتی بـوون. بەڵام چەند ڕۆژێکی خایاند تـا لەگەڵ یەکێکی دیکەیـان ببمە دۆسـتێکی نزیک (ئەوەش هەمووی لە چاکەی چارەنووسەکەمانەوە بوو)، تـا ئەو کـــاتەی دەردەدڵـــی خـــۆی هەڵڕشـــت و چیـــرۆک و بەســـەرهاتی بە

شـێوەیەک گێـڕایەوە، لە نـاخی دڵـیەوە هەڵقـوڵاو، نمـوونەی شـێوازی ڕووسی بوو.

لەوێـدا پزیشـکێکی گیـان ژەهـراوی، ژنە شـۆڤارێک، تێکـدەرێکی پیشەسـازی، وێرانکەرێکـی کشـتوکاڵ و یاریـدەدەری سەرنووسـەری «پراڤدا»م بینین و ئەمانەش ئەو چیرۆکانەن، کە بۆیان گێڕامەوە:

سێکوچکەکەی پزیشکانی سۆڤیەت

"من پیاوێکی دڵشاد بووم،" پزیشکەکە بەم جۆرە دەستی بە قسان کرد؛ "ئەوەی لەو دوایەش بەسـەرمدا هـات، بـۆم هەروەک خەونـێکە. مـن لە مۆسـکۆ دەژیـام. پزیشـکی نەشـتەگەر بـووم. لە پیشـەکەمدا تـا دەهـات باشـتر دەبـووم. کارەکەشـم خـۆش دەویسـت. لەو کـاتەی هێشـتا خوێنـدکاری زانکـۆ بـووم، ئەو ژنەی خـۆمم ناسـی. دوو منـداڵمان هەن. ژیـانی خێـزانەکەم شـادمان بـوو. هەمـوو ڕۆژێ شـوکرانەبژێری خـوا بووم، لەسەر ئەو خێروبێرەی بەسـەر منی ڕژاندبوو، چ لەبارەی ماڵ، چ لەبـارەی کاروپیشـەکەم. بەڵام لە هـیکەوە شـیرازەی ژیـانم پچـڕا. ژنەکەم کەوتە داوی عەشـقی پیـاوێکی دیـکە. ئەویـش ئەفسـەرێکی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی بـوو. ژنەکەم لەسـەر ڕێککەوتنـی دوولایەنە داوای جیـابوونەوەی کـرد. منـیش ئەمەم نەدەویست. من ئەوم خۆشدەویست. لەبەر منداڵەکانیش نیگەران بووم. هیوادار‌بووم شێتوشەیدابوونەکەی بەسەربچێ. ئاخر خۆ دوای هەموو شتێک، ئێمە هەر لەو کاتەی کچ و کوڕ بووین، هۆگری یەکدی بووین و یەکدیمان خۆشدەویست. بەڵام ژنەکەم پێی لەسەر داوای جیابوونەدا چەقانـد. لە ڕابـردوودا دەکـرا ئەو مـن بەجێبێڵـێ و لەگەڵ خۆشەویسـتەکەی خـۆی بـژی. بەڵام لەم ڕۆژانە، ئەو جـۆرە شـتانە قەدەغە بـوون. تەڵاقـدان و جیـابوونە شـتێکی زەحـمەت بـوو. ئـاخر بە گوێرەی ڕێنمایی پرێزیدیۆم (کارگێڕی) سۆڤیەتی باڵا، دەستبەردابوون لە خـاووخێزان بە کـارێکی دژەشـۆڕش دادەنـرا. دەسـەڵاتداران وا

سـەیری ئەو خێزانانەیـان دەکـرد، کە خێزانەکـانی خۆیـان جێـدەهێڵن، لەسـەر ڕێنمـایی دژەشۆڕشـەکان نـاڕۆن و مەبەسـتیان تێکدانی بـاری کــۆمەڵایەتییە، ئەمەش بــۆ ئەوە بــوو ڕێ لەیەکترازانــی شــیرازەی کــۆمەڵگەی یەکێتیــی ســۆڤیەت بگیــرێ، بەم جــۆرە ژنەکەم مــاڵی بەجێنەهێشت، کەچی لەسـەر داوای جیابوونەوە بەردەوام بـوو. منیش هیــوام بەوە هەبــوو، بەڵکــو ڕۆژێ لە کەلــی شــەیتان بێتەخــوار و باردودۆخەکە بگۆڕێ.

"ڕۆژێکیـان، ڕۆژێکـی خـۆش مـن گیـرام. لێکـۆڵەرەوەکە پێیڕاگەیانـدم، تۆمەتێکی گەورەی کـاری تاوانکـاری دژی سـۆڤیەتم دراوتە پـاڵ، ئیدی داوایلێکردم دانیپێدابنێم. 'خۆ ئەگەر دانیپێدابنێی کـابرا وەهـای پێگـوتم؛ ئەوا لەگەڵــت نەرم دەبــین'. منــیش هەڕەم لە مەڕێ دەرنەدەکــرد. پێمڕاگەیانـد مـن بەدەر لە زانسـتی داودەرمـان لە سـەرلەبەری ژیانمـدا مەیلـی هـیچ شـتێکی دیـکەم نەبـووە، هەر هـیچ بە لای سیاسـەتەوە نەچـووم و دڵـم هـیچ بـۆی لێنـادا. لێکـۆڵەرەوەکەش داوایلێکـردم، بەس خۆم بە گەمژە نیشانبدە. هەرچۆنێک بێ، وەک ئەو پێیگوتم، گوایە ئەو بە هەموو شتێکم دەزانێ. گوایە ئەو دەیزانـی مـن سـوودم لە پیشـەکەم وەرگرتــووە، کــارەکەم وەک پزیشــک بــۆ ئەوە قۆســتۆتەوە بەوەی بیروبـاوەڕی دینـی لە مێشـکی نەخۆشـەکانم بئـاخنم. هەروەهـا ئەو، ئەوەشــــی دەزانــــی؛ هەروەک گــــوتی، گــــوایە بەر لەوەی هــــیچ نەشـتەرگەرییێک بـۆ هەر نەخۆشـێک بـکەم، نیشـانەی خـاچم لەسـەر کێشـاوە. 'ئێسـتاش،' وەک وەهـا لەسـەری ڕۆیشـت؛ "ئایـا ئامـادەی دانـی پێدابنێی؟' منیش وەڵامـم دایەوە، هیچ شـتێکی لەو جۆرەم نەکـردووە. ئینجـا لێکـۆڵەرەوەکە خـراپ لەگەڵـم جـووڵایەوە، بەدڕەفتـاری نوانـد و هاواری بەسـەرمدا کـرد: 'تـۆ نـاتوانی فشـەمان بەسـەردابکەی! تـۆ خـۆت ئەو هەموو شتانەت بە ژنەکەت گوتووە، ئیدی دێیت و لێرە حاشای لـێ دەکەی!'

"لێکۆڵەرەوەکە ژنەکەمی ڕووبەڕوو کردمەوە. لەبەر دەممدا پێداگیربوو گوایە من نیشانەی خاچم لەسەر نەخۆشەکانم کێشاوە و هەموو ئەو شتانەشم بە دەمی خۆم پێگوتووە. بەم جۆرە بڕیاری ١٠ ساڵ زیندان بە تاوانی چالاکی دژەشۆڕشیان بە تەنگەدا دام. هەڵبەتە دوای ئەوەی گیرام و حوکمدرام، ژنەکەم دەیتوانی بە بێ هیچ بەربەستێک جیاببێتەوە. ڕاستییەکەی ئەوە ئەرکێکی نیشتمانپەروەرانەی ئەوبوو، دەستبەرداری دوژمنێکی گەل بێ، قسەشی لەسەر نەبوو، لەسەر ئەم کارە دڵسۆزانەی بۆ دایکی نیشتمان، بۆ سۆڤیەت پەسنرا. ئێستاش من لێرەم، ئەویش لەوێیە – لەگەڵ ئەوە. ناشزانم چی بەسەر منداڵەکانمدا هاتووە. لەوانەیە ژنەکەم لەگەڵ خۆی بردبن، ئیدی خۆی و مێردە نوێیەکەی بە منداڵەکانیان گوتبێ باوکتان ناپاک و تاوانبار بووە. منیش لێرە نوێژ و دوعا بۆ سەلامەتی منداڵەکان دەکەم، هەروەها بە نیەتێکی پاک نوێژ و دوعای لێخۆشبوون بۆ ژنەکەشم دەکەم. ڕاستییەکەشی ئەوەیە، من بڕوام بە یەزدان هەیە، کەسیش ناتوانێ ئەو بڕوایەم لێبستێنێ. بەڵام من نیشانەی خاچم لەسەر نەخۆشەکانم نەدەکێشا. ژنەکەم درۆی کرد، خوایە لێی ببوورە ..."

گ.س

"مێردەکەم بەڕێوبەری کارخانەیەکی گەورەبوو لە مۆسکۆ." ژنە بە سەروسیمایەکی جوانی گریکیانە وەها دوا. "ئەو زۆر لە من بە تەمەنتر بوو. من ژنی دووەمی بووم. منی زۆر خۆشدەویست، هەمو شتێکی دەکرد تا ژیانم شادبکا. ئایا ئەم فەرووە دەبینی؟ دیارە شڕوو بووە. مایەی سەرسامی نییە. من لە زیندان و لە نێو قیتار لە مۆسکۆوە بۆ ئێرە وەهام لێکردووە. بەڵام کاتێ ئەم پاڵتۆ فەرووەم وەرگرت، نوێ نوێ بوو، نەکرابووەوە. لە ڕووسیا شتێکی ئاسان نییە، فەرووێکی وەها بەدەستبهێنی، بەڵام مێردەکەم یەکێکی بۆ پەیداکردم. ئەو مووچەیەکی بەرزی وەردەگرت، لە زۆر بۆنەشدا پاداشت و بەخشیشی

سەبارەت بە سەرکەوتنی بەرهەمەکانی کارخانەکەی وەردەگرت. ئەو زۆر کێشەی بەسەرهات تا لە ڕۆژی زەماوەندەکەدا ئەو فەرووەی بۆ پەیداکردم. بڕیاروابوو وەک شتێکی کتوپڕ و سەرسامکەر بێ، هەر بەڕاستیش شتێکی زۆر خۆش بوو! ئای کە چەند کەیفم پێهات!

بەڵام لەپڕێک هەموو شت گۆڕا. مێردەکەم گیرا. منیش نەمدەزانی بۆ. نەشمدەتوانی بزانم بۆ گیراوە. مێردەکەم هەروەک منداڵ ڕەفتاری لەگەڵ دەکردم، هەرگیز دەربارەی نیگەرانییەکانی خۆی قسەی بۆ نەدەکردم. بۆ سەروسۆراغ لە نووسینگەیەکەوە بۆ نووسینگەیەکی دیکە دەڕۆیشتم. لە هەر شوێنێک بۆی دەچووم دەمپرسی: 'ئەرێ بۆچی گرتووتانە؟' کەسیش نەیدەویست هۆکارەکەم پێبڵێ. هەموویان هەر یەک وەڵامیان هەبوو: 'ئەو گیراوە: ئەمەش واتای ئەوەیە، شتێکی کردووە. خۆ ئەگەر بێتاوان دەربچێ، ئەوا ئازاددەکرێ. ئێمە لێرە کەس بە بێ هۆ ناگرین.'

"ڕۆژێکیان بانگکرامە نووسینگەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی. پێموابوو بۆ ئەوە بانگکراوم، تا هۆکاری گرتنەکەی مێردەکەم پێبڵێن. هەروەهاش بوو، بەڵام چۆن! دادوەری لێکۆڵەرەوە گوتی؛ 'بۆمان دەرکەوتووە، مێردەکەت سەر بە دەزگەی نهێنی بەریتانی بووە، ئێمەش دەمانەوێ هەموو شتێکمان سەبارەت بە چالاکییە سیخوڕییەکانی پێبڵێی.' منیش نەمتوانی بەسەر خۆمدا زاڵبم و هاوارمکرد: 'چۆن دەوێری شتێکی وەها سەبارەت بە مێردەکەم بڵێی؟ ئەو بەرپرسی یەکێک لە گەورەترین کارخانەکانی مۆسکۆ بوو، ئەو هەموو شتێکی بۆ وڵاتەکەمان کردووە. لەسەر کارەکەی پاداشتی تایبەت کراوە. ئەو چی داوە لە کاری سیخوڕیتی؟' لێکۆڵەرەوەکش لە وەڵامدا گوتی: 'هێور بەرەوە. ئێمە هەموو شتێک دەربارەی مێردەکەت دەزانین. ئەو وای لەخۆ کردبوو بۆ چەندین ساڵ لە بن دەمامکی بەرپرسی کارخانەکەدا خۆی بشارێتەوە، بەڵام ئێمە هەموو شتێک

دەزانـین. ئـێمە ڕووپۆشـمان لەسـەر کاروچـالاکییە تاوانکارییەکـانی هەڵداوەتەوە. تۆ ژنـی ئەوی. ئەویش تۆی خۆشویستووە. هەردەبێ وردەکـارییەکەی پێگـوتبی. وەک هـاووڵاتییێکی دڵسـۆزی سـۆڤیەت، لەسەرت پێویستە ڕاستییەکەمان پێبڵێی.'

"'بەڵام من دڵنیـام، کە مێردەکەم بێ تـاوانە،" منیش وەهـام پێگوتەوە. ئینجا لێکۆڵەرەوەکە هەڵیدایێ؛ 'من چی دیکەت پێ بڵێم. کەواتە بۆم ڕوونبـووەوە، تـۆش هاوکـاری تـاوانی مێردەکەتـی. لە زینداندا کـاتی تەواوت لەبەردەسـتدا دەبێ تـا بەخۆتـدا بچیـتەوە بەوەی باشـتر وایە ڕاستییەکەمان پێبڵێی، هەموو ڕاستییەکە.'

"منـیش گیـرام. بـۆ چەنـدین هەفـتە خـرامە بەنـدیخانە و کەسـیش لێینەپرسیمەوە. داوامکرد بەڵکو بمبەنە بەردەم دادوەری لێکۆڵەرەوە. ئەوانـیش منیـان گواسـتەوە بەشـێکی دیـکەی بەنـدیخانە و منیـان خستەژوورە زیندانێکی دیکە. دیسان چەند هەفتەی دیکە بەسەرچوون. لە کۆتاییـدا بـۆ لێکـۆڵینەوە بـانگکرام. کاتێـک لە ژوورەکەی تەنیشـتدا ڕەتبـووم، هەسـتم کـرد لە لایەکـی دیـکەی دەرکەوە گـوێم لە دەنگـی مێردەکەمم بووبێ. شتێکی زۆر ناخۆش بوو. لێکۆڵەرەوەکە پێیگوتم، ئاخۆ ئامادەم ڕاسـتییەکانی بۆ هەڵڕێژم. دیسـان پێمگوتەوە، مێردەکەم بێ تـاوانە و هـیچ شـتێکی هەڵەی نەکردووە، داوام لێکرد هەردووکمـان ئازاد بکا و لێبگەڕێت بە سەلامەتی بژین. 'مێردەکەت دانی پێدا ناوە،' لێکـۆڵەرەوەکە وەهـای پێگـوتم و لەسـەر قسـەکەی خۆیشـی ڕۆیشـت؛ 'مێردەکەت دانی بە تاوانەکەیدا ناوە، کەچی تۆ هەر نایسەلمێنی؟' منیش بە ترسـەوە لێمپرسـی؛ "دانی بە چیدا نـاوە؟' لەوەلامدا گوتی؛ "دانـی بە زۆر تاواندا ناوە، بەڵام هێشتاش دانی بە هەموویاندا نەناوە. من دەزانم تۆ هەموو شتێک دەزانی، بەڵام ناتەوێ بیاندرکێنی. باشـە بۆچی بۆی دەپۆشی؟ ئەدی کوا دڵسۆزیت بۆ وڵات، کە ئەو هەمـوو شـتەی بە تۆ بەخشـیوە؟ دەی، دەی قسـە بکە و هەمـوو شـتێکمان پێ بڵـێ.' منـیش

پرسـیم؛ "ئەو چـی گوتـووە؟ ئینجـا ئەو پرسـی؛ "ئایـا ڕاسـتە تـۆ لەو دواییانەدا دەرسی فێربوونی زمانی ئینگلیزییت وەرگرتووە؟' لە وەڵامدا گـــوتم؛ 'بەڵـــێ. ئەمە ڕاســـتە. بەڵام چ شاشـــییەک لە مەدا هەیە؟' لێکۆڵەرەوەکەش لە شوێنی خۆی هاواریکرد؛ 'چ هەڵەیەک لە مەدا هەیە! خۆت دەزانی مامۆستاکەت سیخوڕێکی پیشەمەندی[126] بەریتانی بوو. هەڵبەتە ئەوەی ویستی بۆی مەیسەربوو. تۆش بۆیە فێرە ئینگلیزی بووی تا ببیتە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان مێردەکەت و باڵوێزخانەی بەریتانی. ئێوە هەموو لە یەک بازنەی سیخوڕییدا بوون، بەڵام ئێمە هەمووی دەسرِینەوە. ئێمە هەموو شتێک دەسڕینەوە.'

"هەستمکرد وەک ئەوەی، زەوی لە بن پێم برِێ. سەرمسووڕا. لەخۆمم پرسییەوە؛ 'ئەوە باسی چی دەکا؟ چ بازنەیەکی سیخوڕێتی؟ چ جۆرە ئەڵقەیەکی پەیوەندی لەگەڵ باڵوێزخانەی بەریتانی؟ چ ژنە سیخوڕێک؟' ئینجا بە لێکۆڵەرەوەکەم گوت؛ 'جەنابی لێکۆڵەرەوەی مەدەنی هەمووی سەرچیخچوونە[127]، سەرچیخچوونێکی کوشندە. مامۆستاکەم، من دڵنیام هیچ شتێکی بەدینەدەکرد. مامۆستاکەم ژنێکی بە تەمەن بوو. ڕاستە هەندێک کۆنباو بوو، بەڵام ئەو زۆر دڵسۆز بوو. ئەو ڕاهاتبوو دەرسی زمانی ئینگلیزی بە کاربەدەستە باڵاکانی سۆڤیەت بڵێتەوە. مێردەکەم دەیناسی. هەندێک جار سەردانیشی دەکردین، لە یەکێک لەو بۆنانەدا، مێردەکەم بە گاڵتە و نوکتەوە پێیگوت ئەگەر فێرە ئینگلیزیم بکا، ئەوا کەمتر هەراسان دەبم تا لە کارخانە دێتەوە و هەر چاوەڕێی بکەم. بەم جۆرە بیرۆکەی فێربوونی زمانی ئینگلیزیمان لە لا پەیدابوو. تەنها توانیم چەند دەرسێکی کەمی لە لا بخوێنم. دوای ئەوە مێردەکەم گیرا، ئیدی من پیرەژنە مامۆستاکەم نەبینییەوە. سوێند دەخۆم، هەی جەنابی لێکۆڵەرەوەی مەدەنی، کە هیچی دیکە لە دەرسەکانی زمانی ئینگلیزییدا نەبوو.'

---

[126] – پیشەمەند: پرۆفیشیۆنال.

[127] سەرچیخچوون: هەڵە، شاشی

"لێکۆڵەرەوەکە فشەی بە من و بە سوێندەکەم هات. هەر قسەی خۆی دووپاتکردەوە؛ ئێمە هەموو شتێک دەزانین. دەی ئێستا برۆ ژوورەکەت و هەندێک بیری لێبکەوە. هێشتا دەکرێ ڕاستییەکەم پێ بڵێی.' کاتێک بە بەردەم ئەو ژوورەی تەنیشتمدا تێپەڕیم، دیسان پێموابوو گوێم لە دەنگی مێردەکەم بووەوە. ئیدی چاوم نەچووە خەو. گوێم لە مێردەکەم بوو ناوی منی دەهێنا، دەینالآند و داوای یارمەتی دەکرد. ئەو زۆر لە من بە تەمنتر بوو، لە ڕاستیدا لەوە نزیکبوو بە پیرەمێرد حیساببکرێ. ئەو وەک باوک بوو بۆ من، لێرەش داوای یارمەتی لێدەکردم. باشە، چۆن بتوانم بە هانایەوە بچم؟ تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ، نازانم ئاخۆ هەر بە ڕاستی ئەو بوو لە دیوەکەی دیکەی دیوارەکە، یان هەر ئەوە بوو پێموابێ گوێم لە ناڵەو هاوار هاواری بووە.

"ڕۆژێکیان لێکۆڵەرەوەکە بانگیکردمەوە و پێیڕاگەیاندم، مێردەکەم مردووە. منیش وەک کۆرپەلەیەکی ساوا گریام. زۆر بۆ پیرەمێردەکەم تازیەبار بووم، ئاخ و داخ بۆ ئەو پیاوە چاکە. لێکۆڵەرەوەکە لێمگەڕا بۆ ماوەیەک بگریم، بەڵام ماوەیەکی زۆری نەدامێ تا ماتەم بۆ مێردەکەم بگێڕم. پێیگوتم؛ "دەی کڕبەرەوە. مێردەکەت سیخوڕێک و دوژمنی گەل بوو. هەرچۆنێک بوایە، ئەو حوکمی مردنی هەر وەردەگرت. هەنووکەش دەی هەموو شتێکم پێ بڵێ. ئەرکەکانی تۆ لەنێو بازنەی سیخوڕییدا چی بوو."

"لێکۆڵینەوەکە زۆری خایاند. منیش بە لێکۆڵەرەوەکەم گوت داوادەکەم بمبەنە بەردەم دادگەیەک، لەوێدا بێ سووچی خۆم دەسەلمێنم. 'بڕوام پێ هەیە،' من وەها کەوتمە قسە؛ 'بڕوام بە دادوەری سۆڤیەت هەیە!' لێکۆڵەرەوەکەش پێیگوتمەوە؛ 'بۆ کەسێکی وەک تۆ دادگە لە گۆڕێدا نییە. بەڵگەکان زۆر ئاشکراو ڕوونن. کۆمسیۆنی ڕاوێژکاری دادوەریت بەسەردا دەکا.'

کۆمسیۆنەکەش هەر وەهای کرد. لەسەر بەهێزی ئەو بەڵگانەی کە چەند دەرسێکی کەمی زمانی ئینگلیزیم وەرگرتبوو، هەروەها لەبەرئەوەی ژنی ئەو پیاوە بووم، کە بە تاوانی سیخوڕێتی گیرابوو، لە زیندانیشدا مردبوو، حوکم درام. پێنج ساڵیان بۆ بڕیمەوە. خۆ ئەگەر بە ڕاستی سیخوڕ بوومایە، ئەوا دڵشاد دەبووم. ئاخر پێنج ساڵ بۆ سیخوڕێتی سزایەکی زۆر کەمە. من «گ.س»یم."

«کرۆل» و من لێمان پرسی: "«گ.س» چییە؟"

"باشە پێش ئێستا گوێتان لێی نەبووە؟ ئەویش بەندێکە، ماددەیەکە بۆ؛ 'گومان لە سیخوڕێتی'. لەگەڵ ئەوەشدا دادپەروەرییێک لە حوکمی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا هەیە. ئەوان بڕیاریان لەسەر نەدام وەک سیخوڕێک، بەڵکو وەک گومانلێکراوێکی سیخوڕی. لەوانەیە حیسابی ئەو ڕاستییەیان کردبێ، هێشتا فێرە ئینگلیزی نەبووبم ..."

بەختی «لاگەرێک»

"بە پیشە من ئەندازیاری میکانیکیم،" تێکدەرەکەش (کابرای تاوانبار بە تێکدان) بەم جۆرە دەمی کردەوە؛ "من لە کارخانەیەک کارم دەکرد، چەندین پلەی لاوەکیشم هەبوون. لە پلەکەمدا سەرکەوتم تا گەیشتمە پلەی بەڕێوبەر. بوومە ئەندامی پارتیش. هەموو ئەو شتەی پیاو دەیخواست، من هەمبوو. لە هیچم کەم نەبوو. لەسەر کارەکەشم پەسن درام و چەندین جاریش خەڵاتکراوم. لە ساڵی ١٩٣٧یشدا گیرام. ئەوان منیان بە تاوانی وێرانکردن و تێکدانی کارخانەکە تاوانبارکرد. ئەوەش ڕاستبوو، کە ئێمە نەمانتوانی پلانی ساڵەکە بگەیەنینەسەر. بەڵام بۆ خەتای من بوو؟ من کەرەستە خاوەکانم لە کاتی خۆیدا بە دەستنەگەیشت. چەندین دەزگەش (ماشێن) ئەوکات شکابوون، منیش

سەربارەی ئەو هەموو داواکارییەم، پارچە یەدەگەکانم بۆ نەهاتن. هەموو ڕونکردنەوەکانیشم لەو بارەیەوە بێ سوود بوو. ئەندازیارێکی دیکە، کە لەگەڵ مـن کاریدەکرد، لەبەر چاوی مـن ئەوەی گـوت، لە ئەگەری تێکشکانی دەزگەکان ئاگاداری کردوومەتەوە و گوایە منیش گوتبم ئەو شتانە هـی خەملێخواردن نـین و نـیگەران مەبە ... ئەمەش واتای ئەوەی دەگەیاند، گوایە بە ئەنقەستەوە ویستوومە ئەو دەزگەیانە پەکبخەم. سەبارەت ئەو نامـانەی بەر لە پەککەوتنـی دەزگەکـانیش نووسیبووم، لە هەموویاندا داوای هێنانی پارچەی یەدەگی ماشێنەکانم کردبـوو، ئەوانەی - لێکـۆڵەرەوەکەش نـاوی هێنـابوون - هیچـی نەیخوارد. هەموویان بەوە لێکدایەوە، گوایە بۆیە نووسیومن تا کارە تێکدەرانەکەی خۆمی پێ پەردەپۆشبکەم. ئیدی دە ساڵ زیندانییان بۆ بڕیمەوە. ئەمەیان چوارەمین ساڵە لە باکوور و لەم ئۆردوگایە دام.

"ئـاخ! ئەرێ نوێیەکـان چـی لەبـارەی بـاکوورەوە دەزانـن؟ تـۆ چـی دەربارەی لاگەر lager دەزانی؟ لێرە، لە نەخۆشخانەکە هێشتا دۆخت خراپ نییە. هەر هیچ نەبێ پێخەفێک و پەردەیەکیش هەیە، پەتۆیەکت هەیە بە خۆتدا بدەی. هەڵبەتە تەپۆ و مێشوولە هەن: دەبێ لێیانڕابێی. بەڵام ئایا لەم ڕۆژدا دەتوانی پاڵبدەیتەوە؟ تۆ دەتوانی وابکەی! ئایا ئەوان سووپەکەت بۆ دێننە شوێنی خەوتن؟ ئەوان وەها دەکەن! ئایا مرۆ چی دیکە داوابکا؟ بەڵام کاتێک تۆ دێیتە نێو ئۆردوگا، کاتێک لەگەڵ زەردەی بەیان دەچیتەسەر مەیدانی کاری بێگار، ئەوسا دەزانی پیاوی ئۆردوگا لاگەرنی Lagerni چییە.

"ئێستا هاوینە. هەواکە خۆشە، وەها نییە؟ بەڵام کاتێک دەچیە سەر کار، ئەوسا بـۆت دەردەکەوێ، تەنـانەت لە هاوینشـدا، کـارکردن لە بـاکور گـاڵتە نیـیە. لێـرە مـێش و مەگەزی کەممـان لە بـاکوور هەن، ئەوانە مێشـولە نـین، ئەوانە تەپـۆن، تەپـۆی زۆر وردن، بەچـاو نـابینرێن. ئەو شـتە نەفرەتییـانە حەزیـان لە «لاگەر» نیـیە؛ ئەوان زۆریـان ئەو

بەستەزمانە سەربەهەششەیان زۆر خۆشدەوێ! ئەو تەپۆیانە دێنە سەر دەموچاوت، دێنە سەر دەستەکانت، دێنە نێو گوێچکەکانت، نێو کونە لووتت، دەچنە بن پێستت. تۆش هەوڵدەدەی لە کۆڵ خۆتیان بکەیتەوە. بە هەموو شێوەیەک هەوڵدەدەی! ئاخر ئەوان بە ملیۆنانن، ملیاریان تێپیەڕاندووە. ئەو بەڵایانە پێوەدەدەن. ئۆف! ئەوان چۆن پێوە دەدەن! نەخێر، ئەوان مێشووولە نین. مێشووولە دەعبای خۆشمەحشەرەن. ئەمانە گەزەندەی باکوورن، ئەوان باشتر لە یاساوڵەکان زیندانی دەپارێزن. باشترن لە هەموو پاسەوان و چەکەکانی دەستیان. چۆن؟ جارێکیان زیندانییەک لە ئۆردوگاکە هەڵات؟ یاساوڵەکانیش تەقەیان بەدواداکرد، ڕاویاننا، بە سەگی دڕەوە بە دوایکەوتن، بێ ئەنجام بوو. زیندانییەکە سۆراغی نەما. ئەو یاساوڵەی پاسەوانی لێدەکرد، خۆی ئامادەکردبوو بچێتە جێی زیندانییەکە. پاش سێ ڕۆژان زیندانییە ڕاکردووەکە بە پێی خۆی گەڕایەوە ئۆردوگاکە. کە هاتەوە نەدەناسرایەوە. کارگێرانی ئۆردوگاکەش خستیانە زیندانی 'تەنیایی". بەڵام ئەو سوێند و تەڵاقی خوارد، جارێکی دیکە هەوڵنادا هەڵبێ. ئاخر تەپۆکانی باکوور دەرسیان پێدابوو، ئەمما دەرس! منیش برادەرەکانت ئاگاداردەکەمەوە، ئاگاتان لەو دەعبایانە بێ. ئەوەتان لەبیربێ، بەرلەوەی بچنە سەرکار، دەست و دەموچاوی خۆتان باش باش داپۆشن. بە هەرچییەک دەکەوێتە بەردەستان، شوێنی ڕووتتان داپۆشن، با هیچی بە دەرەوە نەبێ، دەنا خراپتان بەسەردێ. هەوڵیش مەدەن هەڵبێن. شتەکە ئەوە ناهێنێ، چونکە هەر بە ویست و پێی خۆتان دەگەڕێنەوە.

"بەڵام ڕاستییەکەی،" زیندانییە دێرینەکە لەسەر قسەکەی ڕۆیشت، مەبەستیشی ئاگادارکردنەوەی زیندانییە نوێیەکان بوون لە تەلیسمی ژیانی ناوەخۆی ئۆردوگاکە ئاگاداریان بکاتەوە؛ "ئێوە هاتوونەتە

شوێنێکی حازروبازر[128]. نەخۆشخانەیەکتان لەبەردەمدایە. لە هەموو لایەکی ئەو نەخۆشخانەیە هەر ئۆردوگایە. هەر دەبێ لە یەکێ لە ئۆردوگاکانی بێگار کاربکەن. ئەوانیش کۆڵێتێک بۆ ئێوە هەر پەیدادەکەن، تەختەبەندێکیشتان دەدەنێ تا لەسەری بخەون. ئەوەش دەزانم هەر کاتێ بگەنە ئەوێ، خۆزگە بە زیندانەکەتان دەخوازن، حەزتان لێیە بگەڕێنەوە ئەو نەخۆشخانەیە، وەک چۆن من حەزم لێیە یەک دوو ددانی دیکەم شینببنەوە. بەڵام خۆ هێشتاش هەنوانێکیان هەر هەیە. کاتێکیش من هاتمە ئێرە، ڕووتوڕەجاڵ بوو، نە ئۆردوگا هەبوو نە کۆڵێت و نە هیچ. زستانیش بوو کە هاتین. ڕۆژانی وا هەبوون، پلەی سەرما دەگەیشتە حەفتاو دوو پلەی ژێر سفر و تەنانەت لەوەش بەرەوخوارتر. لە زستانیشدا خۆ ڕۆژ ڕۆژ نین، هەروەک چۆن لە هاویندا شەو شەو نیین. لە زستاندا تەنیا چەند سەعاتێکی کەم ڕووناکایی ڕۆژ هەیە، بەشی هەرە زۆری تاریکییە. بەڵام جا چی بوو؟ خۆ لە شەویشدا دەبێ کار بکەی. هەر هیچ نەبێ بەفری سپیی بەرچاوت ڕووناک دەکاتەوە.

"ئێمە ڕاهاتبووین لەنێو بەفردا بخەوین. پاسەوانەکان چادرێکیان هەبوو، هەر تەنیا ئەو چادرەشی لێبوو. سەرەتا دەبوایە ئێمە چواردەوری ناوچەکە تێلبەندبکەین. پاشان چوار قوللەی چاودێری بۆ دروستبکەین. ئینجا دوای ئەوەی خۆمان لە نێو چوارچێوەیەکی تەلبەندکراوی چاودێر بە قوللەکان زیندانیکرد، دوای ئەوەی سەرپەرشتیاران دڵنیابوون لە هەڵنەهاتنمان، ڕێگەیان پێداین کۆڵێت بۆ خۆمان دروستبکەین. خۆی ئۆرودگاکە بە شەو و ڕۆژێک دروستنەکراوە. دوای دوازدە، یان چواردە، یاخود شازدە سەعاتی کار،

[128] لەم دەربڕینەدا بە هەڵە دەگوترێت «حازر و بزر» لە ڕاستیدا «بزر» بەواتای ونبوون دێت و هیچ پەیوەندی بە باسەکەوە نییە. «بازر» دەکاتە خێرا دەرچوونی شتێک. لە «فەرهەنگی خاڵ»دا وشەی «بازرقە» وەها لێکدراوەتەوە، لەپڕ دەرچوونی گیاندار بە چالاکی: مارەکە «بازرەقە»ی بەست.

ئێمە دەبوایە زەوییەکە هەڵکەنین، بەفرەکە هەڵککەنین تا بتوانین بچینە نێوی لێیڕابکشێین بەڵکو خەومان لێبکەوێ. بەڵێ ئێمە پێخەفێکی زۆر سپییمان هەبوو. بەڵام هەمووو کەسێک نەیدەتوانی لەسەری هەڵبستێتەوە. هەموو ڕۆژێک هەندێک لە زیندانییان دەیانبینی ئەوەی تەنیشتیان هەڵناستێتەوە، خەوی لێکەوتووە، خەوێکی هەتا هەتایی. یاساوڵەکانیش بەسەر زیندانییەکان دەیانقیڕاند و هاواریاندەکرد: 'دەی هەڵسن، کاتی کارکردنە!' ئەوان دەیانبزواندن، نەفرەتیان بە سەردا دەباراندن، پێلەقەیان تێهەڵدەدان، بەڵام خۆ هیچ لەم کارانە سوودی نەبوو. لەو ماوەیەدا و لە کاتی کاردا ژمارەیەک لە زیندانییان خەوی هەمیشەییان لێدەکەوت و لەنێو بەفردا دەشاردرانەوە، ژمارەی ئەوانەی بەم شێوە فەوتان زیاتر بوون لەوانەی لە ئۆردوگاکە کاریاندەکرد. بەڵام خۆ کار ڕانەوەستا. لە جیاتی ئەوانەی خەوی هەتاهەتاییان لێکەوت، زیندانی نوێیان دەهێنا و جێگەیان پێ پڕدەکردنەوە.

"ئێمە چیمان دروستکرد؟ ئەو هێڵە ئاسنینەمان دروستکرد، کە ئێوەی لە «کۆشڤا»وە گەیاندە ئێرە، کاتێکیش ئێوە دەچنە ئۆردوگایەکی نزیک لێرەوە، ئێوەش دروستیدەکەن و درێژە بە هێڵەکە دەدەن. ئایا کاتێک بەنێو ئۆردوگادا تێدەپەڕی، ناحەپەسێی؟ هەرچەندە ئەو هێڵە نەفرەتییە، هەندێک پێچ و گەوەی تێدایە ... بەڵام ئاخ ئەگەر دەزانی چۆن دروستکراوە. ئەوان لە دروستکردنیدا پەلەیان بوو، لەگەڵ ئەوەدا بەگوێرەی نەخشە دارێژراوەکە نەهاتەوە.

"بۆ ماوەیەک من یەکێک بووم لە سەرپەرشتیارانی ئۆردوگاکەمان. ڕۆژێکیان سەرئەستوورێک لە مۆسکۆوە هات و هاواری کرد: 'پارتی و حکوومەت ئەرکێکیان لە پێش داناوین، دەبێ لە کاتی خۆیدا تەواوی بکەین. قیتارەکە دەبێ بکەوێتە گەڕ و بجوولێ، تەنانەت ئەگەر لەبن هەر مەترێکی هێڵە ئاسنینەکەشدا پیاوێک ژێرخاک بکەوێ!' ئەو باسی هێڵێکی ئاسنینی دەکرد، سەد کیلۆمەتر درێژ بوو. دەی هەنووکە، ئەوە

مەزندەبکەن، ئاخۆ چەند کەس تا کارەکە بە گوێرەی پلانی حیزب و حکوومەت جێبەجێ بووە، سەریان تێداچووە و چونەتە ژێرخاکی هێڵەکە. بەڵێ، من نازانم ئەگەر حەفتسەد هەزار کەس کەوتبێتە بن ئەو هێڵەوە، بەڵام بە خاترجەمییەوە گۆڕی هەزارانیان لێرە هەن. لەڕاستیدا ئێمە لە تەواوکردنی هێڵەکەدا دواکەوتین، بەڵام قیتارەکان هەموویان وەک یەک کەوتنە جوڵە. بەڵێ هێڵەکە هەندێ پێچ و گەوەی تێکەوتوون ...

"ئەرێ گوێتان لە tsinga تسینگ (ئەسکەرپووت[129]) بووە؟ ئەندازیارەکە دەمی کردەوە و پووکە سپییە بۆرەکەی نیشان داین. تەنیا دوو ددانی لەنێو دەمدا مابوونەوە. "بەڵێ، ئەوانەش زۆر ناخایەنێ دەکەون. ددانەکانی ئێوەش دەکەون، بەڵام بیر لەوە مەکەنەوە کە ئەسکەرپووت هەر بە ئەوەندە وازتان لێبێنێ. بەڵکو پووک دەکاتە کێم و خوێن، هەموو جەستەت دادەڕزێنی و هەر کێم و خوێنی لێ دەتکێ. سەیرکەن!" ئەو دەرپێیەکەی هەندێ داکەند و بۆقژ و پۆرگی ڕەش و گەورەی سەر ڕانی نیشاندان. "ئەمانە،" ئەو وەها لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛ "ئەوانە تەنیا جێماوەکانن. هەندێکی چاک بۆتەوە. بەڵام کاتێک دەگەڕێمەوە ئۆردوگاکە، هەمووی دەکولێتەوە و جەستەم یەک پارچە دەبێتە کێم و خوێناو. ئەسکەرپووت نەخۆشییێکی باوە لە باکوور. هیچ زیندانییەک لە دەستی قوتار نابێ، بۆیە بە نەخۆشی دانانرێ. خەڵک بە دەردی ئەسکەرپووتیشەوە هەر دەبێ بە شێوەیەکی ئاسایی کاربکەن.

"شتێکی دیکە کە تووشتان دەبێ، پانۆس Panosـە (سکچوونێکە تا ڕادەیەک ڕانەوەستە). بەڵام دەبێ ئەوەش بزانن، ئەو جۆرە سکچوونە ئاساییەش بە نەخۆشی دانانرێ. تەنیا پانۆسی (سکچوونی) تیژ، ئەوەی

[129]– ئەسکەرپووت: نەخۆشییەکە لە ئەنجامی کەمی ڤیتامین سییەوە تووشی پووک دەبێت و دەم و ددان دەڕزێنێت. تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم نەخۆشییێکی کوشندە بووە.

خوێنی لەگەڵدایە وا دەکا لە کارکردن هەڵبوێردرێی و ئەگەر بەختیش یارت بوو، دەگوازرێیتەوە نەخۆشخانە. ئەگەر بڵێی سکچوونم هەیە، ئەوا یەکێک لەگەڵت دێت و دەیپشکنێ ئاخۆ چەند جار دەچیتە ئاودەست. خۆ ئەگەر بشڵێی خوێنی لەگەڵدایە، یەکێک لەگەڵت دێ تا بزانێ ئاخۆ وایە. ئاخ! لێرە ئێمە "ڕێسا"مان هەیە، تەنانەت بۆ سکچوونیش، ئینجا ئەگەر پێوەرەکانی «پانۆس»ی بەسەردا پەیڕەو نەبێ، بە ساغ دادەنرێی و دەبێ شان بدەیتەوە بەر کارکردن.

"ئەرێ باشە شتتان دەربارەی ئیتاپ Etap (قۆناغ، هەنگاو) بیستووە؟ کاتێک تۆ کارەکەت لە ئۆردوگاکە تەواودەکەی، دەتگوازنەوە شوێنێکی دیکە. لەوانەشە بەر لە تەواوکردنی کارەکەش، بتگوازنەوە. ئەمە پێی دەڵێن ئیتاپ (قۆناغ، هەنگاو). لە شوێنە نوێیەکە، لەوانەیە ئۆردوگاکە دروستکرابێ، یان لەوانەیە هیچ نەبێ، هەر مەزرایەکی کراوەیە و بەس، هەر وەک ئەوەی من بینیم، کاتێ هاتمە ئێرە. هەمووی هەر پەیوەندی بە بەختەوە هەیە. بەڵام بیر لەوە مەکەوە، ئەو شوێنەی بۆی دەچی، مایەی گرفت و سەرئێشە بێ؛ شتێکە سەبارەت بە گەشتەکە، بەچوون بۆ ئەوێ بگووترێ. قۆناغی گواستنەوەکان (ئیتاپ) هەم لە هاوین و هەم لە زستانیشدا ڕوو دەدەن. ئەوسا بەسەر وشکانی، بەنێو ئاو یاخود بە پێ دەبێ بۆی بڕۆی. خۆ ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان پێبنێیتە سەر بەلەمێکی ئیتاپ، ئەوسا دەزانی چ جۆرە بەلەمێکە. من ئیتاپێکم لەبیرە، لە ئۆردوگاکەی ئێمەوە دەستی پێکرد. زیندانییەکان خرانە نێو لۆرییەک (بزوێنەرێک کە شت ڕابکێشێ). ڕوباری بەستووش ڕێگە بوو، ڕێگەیەکی نایاب. ئەوەندە ساردە دەیبەستی. لۆریەکە تێکشکا، دیاربوو لەبەر لێڕەوار وایلێهات. شوفێرە زیندانییەکان هەوڵیاندا لۆرییەکە چاکبکەنەوە، بەڵام بێهودە بوو. دەستە بەستووەکانیان کاریان نەدەکرد، یان لەوە زیاتر کێشەکە سەختتر بوو، هی چارەکردن نەبوو. ئیدی لە ئیتاپەکەوە، دەبوایە بە پێ بێینەوە ئۆردوگاکە. بەڵام خۆ تەنیا یاساوڵەکان گەڕانەوە. کەسە بەرپرسەکەش لەسەر ئەوەی، گوایە

هێزی دەستی کاری بەفیڕۆ داوە، سزا درا، بەڵام خۆ سزادانەکە گیانی ئەوانەی لەوێ لەسەر ڕوباری پێچۆرای بەستەڵەکدا مانەوە، زیندوو نەکردەوە.

"ئەدی گوێتان لە پەلوپۆ پەلدەر (chleno – rubi) بووە؟ بەڵێ، ئەوانە کەسانێکن لە خۆیانەوە دەستبەکارن، ئەوانە پەنجەیەک، یان چەندین پەنجە، تەنانەت قاچیش پەل دەدەن و دەبڕنەوە. ئەرێ ئەوان چۆن ئەو کارە دەکەن؟ بە چەندین شێوە دەیکەن. پەل پەلدەر لەپی دەست لەسەر قەدەدارێک دادەنێ، ئینجا بیورەکەی بەرز دەکاتەوە و و هاوار دەکا "ها" - ئیدی پەنجەکان لەو گۆڕە دەکەونە سەر زەوی! ئەوانەش بە تەور و تەمشوو[130] کار ناکەن، یان بەرگەی خوێن بینین ناگرن، شێوازێکی دیکە بەکار دەهێنن. سەرما بیورەکەیانە. ئەوان پەنجەکە بە میز تەڕدەکەن، بۆ چەندین چرکە لەبەر هەوا ڕایدەگرن، کە پلەکەی لە دە بەسەر سفرەوەیە. ئیدی بە چاوتروکانێک پەنجەکە بە تەواوی سپیپاتە دەبێتەوە. پلەی سێیەمی بەستن. نەخۆشخانە. نەشتەرگەری. کەم ئەندامی.

"دەکرێ بپرسن ئەوان بۆ وادەکەن؟ باشە پیاو چۆن خۆی پەل پەل دەکا، بەشێک لە جەستەی خۆی دەبڕێتەوە؟ کاتێک دەچنە ئۆردوگاکە لێتێدەگەن. هەموو سپێدەکەی لەگەڵ زەردەی بەیانی، گوێتان لە زەنگەکە دەبێ. دەبێ هەڵبستنەوە، بە جلەکانتان، جلە شڕۆڵەکان، بەوانەی پێیەوە خەوتوون، دەبێ لە کونەکانتان بێنەدەر. لەوێ لە مەیدانەکە دەوەستن. ئەوانیش دەتانژمێرن. جارێک، دووان سێیان ... نیو سەعات و نیوێک ... سەعاتێک بەم بەزمە ... پاشان نانتان دەدەنێ. ئێوەش نانەکە دەخۆن، هەڵبەتە هەمووی بە یەکجار حەپەلووش دەکەن. دوای ئەوە بۆ کارکردن دەبردرێن. شەویش دەگەڕێنرێنەوە

---

[130]– تەور ئامێرێکی تایبەتە بەدار بڕینەوە و وردکردن، تەمشوو یان تەپشوو هەر بیورە بەڵام بە بچووکی. لە هەندێ ناوچە «تەشوێ»یشی پێدەڵێن.

کۆڵیتەکانیـــان، کە گەیشـــتنەوە یەکســـەر خۆتـــان فڕێـــدەدەنە ســـەر تەختەبەنـــدەکانتان. ئـــاخ و داخ لە ئێســـکەکانتان! ئەو ئێســـکە بە ژان و سوێیانە! ئیدی کێم و خوێناو لە شوێنە هەوکردووەکانی ئەسکەرپووت ڕادەمـالّی. پاڵـدەکەویّ، دەخەوی، هەروەک مـردووان خەوت لێدەکەوێ. لە بەیانیش، لە سەعات چواری بەیانییدا، دیسان زەنگەکە لێدەدرێتەوە، دیســـان دەبـــێ قیتببـــیەوە! دەی ئەوجـــار هەڵســـەوە!. ئیـــدی بەم جـــۆرە هەموو ڕۆژێ، هەموو بەیانییێک، هەمـوو شـەوێک، هەر هەمـان قەوان ... کاتێ دەچیتە ئۆردوگا، ئەوسا دەزانی پیاو چۆن نەخۆشـدەکەوێ. بەڵـێ نەخۆشـکەوتن، نەوەک بچێـتە دەرەوە بـۆ کـار، نەوەک لە جێـی خـۆی ڕاستببێتەوە، بەڵکو هەندێکی دیکە پاڵکەوێ، هەر هەندێکی دیکە. کاتێ لە ئۆردوگـا دەمێنیـتەوە، ئەوسـا تێـدەگەی ئـای چەنـد خۆشـە بتنێـرنە نەخۆشخانە. بەڵێ بەم جۆرە «ئـاگرنی»یەکـان خۆیان کەچوکرۆم[131] دەکەن. بەڵێ، لەوێ کەسانێک دەبینی بە بێ پەنجەی دەست، یان بە بێ پەنجەی پێ، بەبێ گوێ، تەنـانەت هەن بە بێ کەپووش دەسووڕێنەوە. ئەوان ئەو ئەنـدامانەیان لە کـاتی کـاردا سـڕ و گـۆد بـوونە. یەکێک لە ڕووداوە باوەکـانی سـەر کـار. هەڵـبەتە ئەوانە بەدبەخـت و کەساسـن، بەڵام هەست بە کەساسیی و مەلوولی خۆیان ناکەن، کاتێ دەگەیەنرێنە نەخۆشـخانە تـا نەشـتەرگەرییەکەیان بـۆ بکـرێ. بە پێچەوانەوە، ئەوان دڵخۆشـن! دڵخۆشـی «ئـاگرنی»ییەکـان بـۆ ئەوەی نەخۆشـبکەون و لە نەخۆشخانە بخەوێندرێن.

"بڕواشـــنەکەن ئەوانەی ئەنـــدامەکانی جەســـتەی خۆیـــان پەلبـــدەن، وا دابنـــرێن کە بە ڕەزامەنـــدییەوە خۆیـــان ســـزادەدەن. دەســـەڵاتدارانیش سزایان دەدەن. بەم کارەیان مانگێکی دیکە ماوەی زیندانییان بۆ درێژ دەکـردنەوە. لە کۆتـایی هەمـوو شتێکیشـدا، ئەوەی ئەوان کردوویـانە و دەیـکەن تێکـدانی سەروسـامانی دەوڵەتە. بەڵام چمـا ئەوان باکیـان پـێ

[131]– خۆ کەچوکرۆم کردن: مەبەست جەستە شێواندن، بە بڕینەوەی پەنجە، دەست یان پێ، یان هەر ئەندامێکی دیکە بێ.

هەیە؟ باشـــە ئەوان هــیچ هیوایەکیــان مــاوە ئــاخۆ لەو «ئــاگرنی»یە دەربازیان ببێ؟

ئەنــدازیارەکە پرســی: "بەڵــێ، ئەمە بەختــی ئاگرنییەکــانە. باشــە لە هەستەکەیان تێدەگەن؟"

منیش خەریکبوو تێبگەم. دیسان نەفرەتم لە سەرتاشـەکانی لوکیشکی کردەوە.

ئاگرنییە قایلەکان

"تۆ لێت پرسیم ئاخۆ لەسەر چی گیراوم؟" ئەو جووتیارەی لە تەنیشتم لە ڕیـزی سـەرەوەی تەختەبەنـدەکە دانیشـتبوو، وەهـا ڕووی تێکـرم و قسەی بۆ کردم. "لەبەر کاری تێکدان و وێرانکاری منیان گرت. هەڵبەتە من لە کۆلخۆز بووم. بەڵام ئەوان گوتیان گوایە من کاری زیاترم بۆ خـۆم کـردووە و کـاری هەرەوەزیـم پشتگوێخسـتووە. باشـە، خـۆ تـۆ دەزانـــی، دەســـەڵاتدارانی ســـۆڤیەت پـــارچە زەوییێکیـــان دەدایە کۆلخۆزییەکـان تـا کـاری خۆیـان لەسـەر ڕاییـبکەن. ئەو بەرهەمەی لە کۆلخـۆزییەکە دەسـتیدەکەوێ، لە بـازاڕی کـراوەدا دەیفرۆشـێ. هەڵبەتە ئەمەش کارێکی باش بوو. بەڵام ئەوان گوتیـان، گـوایە کـاری زیـاترم لە پارچە زەویەکەی خـۆم کـردووە، لەوانەیە زوو ببمە کۆلاک[132]. ئەرێ من چ جۆرە کۆلاکێکم؟ دەی تکـایە، پێم بڵێن؟ مـن چ جـۆرە کۆلاکێکم، ئەگەر لە ماڵەکەمدا کلکی مشک بە ئارد نەبێ. هیچ شتێک نەبێ بیخۆین. بەڵام ئەوان گوتیـان تـۆ کـاری هەرەوەزیـت تێکـداوە، بـۆیە دە سـاڵ زیندانییان بۆ بڕیمەوە. هەنووکەش من لێرەم. وەهاش تێمەگەن، گلەیـیم لە ڕژێمـی سـۆڤیەتی هەیە، خـوا دەسـت بە بـاڵییەوە بگـرێ! مـن سـکاڵا

[132]– جوتیارێکی دەوڵەمەند لە ڕووسیا.

ناکەم، من لێی نەبوومەتەوە. لە ماڵیشمدا هەرگیز پێخەفێکی خاوێنی وەک ئێرەم نەبووە! ئەوان نانم بۆ دێننە لای پێخەفەکەم. لەوە باشتر! من لێرە باشم، باشترم لەوەی لە ماڵی خۆم بم. من دەردەدڵ لە دژی ڕژێمی سۆڤیەت ناکەم، خوا بیانپارێزێ! با تەنیا ئەوان لێمبگەڕێن من هەر لێرە بمێنمەوە. من لێرە زۆر باشم."

چیرۆکی یاریدەدەری سەرنووسەری پراڤدا[133]

سەرەتا «گارین» ڕەفتاری نادۆستانە بوو. سەبارەت بە خۆی هیچی نەدەگوت. چەقی بازنەی گفتوگۆکانمان زیاتر لەسەر جەنگ، دژەسامیزم، زایۆنیزم و کۆمۆنیزم بوو. کاتێک گوێم، لە دەنگی ناوبراو بوو، گوێم لە دەنگدانەوەی سەدای لێکۆڵەرەوەکەم لە لوکیشکی بوو. وەک «گارین» ڕوونیکردەوە، زایۆنیزم و دژەسامیزم دووڕووی یەک دراو بوون. دژەسامیزم دەربڕی زێدەمافی ڕەگەزی و ناسیونالیستانەیە؛ زایۆنیزمیش بە هەمان شێوەیە. ڕاستییەکەی «گارین» گوتی زایۆنیزم کتومت هەر هەمان شت دەڵێ، کە دژەسامیزم دەیڵێ: "جوو بۆ فەلەستین" ق - دەستی بەسەردابگرن. ئەو پرسەش کەوا زایۆنیزم دەسکەلای دەستی ئیمپریالیزم بوو، بەڕای «گارین» شتێکی بەڵگەنەویست بوو. دەمەتەقێکەمان پەڕیەوە بۆ هێنانەوەی بەڵگەوبەند، بەڵگەوبەندێکی گەرموگوڕ و زۆر توندیش.

جارێکیان وەها دابەزیە سەرم، گوایە من لە بەرانبەر دژەسامیزم شەرمنۆکێکی خۆدەرنەخەرم. ئەو گوێی لە من بوو کاتێ لەگەڵ زیندانییە پۆلۆنییەکان دەدوام، چ ئەوان و چ منیش وشەی ژید Zhid مان بۆ وشەی جوو بەکارهێنا بوو. گارین گوتی؛ "وشەی ژهید ناوێکی سووکایەتیپێکردنی باوی دژەسامییەکانە و لە یەکیتی سۆڤیەتیدا

---

[133]– پراڤدا: ڕۆژنامەی فەرمی زمانحاڵی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەت، لە ساڵی ١٩١٢ دەرچووە تا ١٩٩١. پراڤدا وەک وشە واتای ڕاستی دەگەیەنێ.

قەدەغەیە ئەم وشـــەیە بەکـــاربهێنرێ." منـــیش وەک زایۆنیســـتێک، کە شـانازی بە جـوولەیەتی خـۆمەوە دەکەم هەر ئەوە نـیـە تێبینـیم لەسـەر وشـەی ژید zhid و ژیداڤسکی Zhidavksi ـیەوە نییە، بەڵکو هەمان ئەو وشـە دژەسـامییە بـۆ حەیـاچوونی خـۆم بێشـەرمانە بەکـاردەهێنم. «گارین» بە توورەییەوە لێیپرسیم؛ "ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسـەر ئەوەی دژەسامیزم و زایۆنیزم هاوپەیمان بن؟

منیش هەوڵمدا بۆی ڕوونبکەمەوە، کە ڕێگەکانی دژەسامیزم جیاوازن. ئەوەش ڕاســتە لە ڕووســیا وشــەی پەســەندکراو بــۆ جــوو، یەڤــری Yevrei( е в р е и)ـییە، لەکاتێکـدا وشـەی ژهیـد zhid واتـای ڕق و قێزەونی لەخۆدەگرێ. لە پۆلۆنیا و لەسەرێکی دیکەوە، وشـەی ئاسـایی بۆ جوو zhid ژهیدە و کـاتێکیش دژەسـامیزم بیانەوێ سـووکایەتی بە جـووێکی قێـزەون بکەن، بـانگی دەکەن "یەڤری yevrei". گـارین گـوێی لێگـــرتم بەڵام ڕوانـــگەی منـــی پـــێ هەرســـنەکرا. ئەو گـــوتی "ئەمە تەلمـودیزمە. وشــەی ژهیـد Zhid وشــەیەکی دژەسـامیزمە لە هەمـوو زمانەکاندا، تۆش بۆیە بە کاری دەهێنی و ڕێگە دەدەی بەکاربێ، چونکە تۆش هاوکاری نێوان دژەسامیزم و زایۆنیزمی.

«گـــارین» مشـــتومڕی بەڵگەوبەنـــدێکی توندیشـــی لەگەڵ یـــارۆی ئەندازیاری تێکدەر کرد، هەرچەندە لەسـەر پاشـخانی جیـاوازەوە بـوو. کابرای «ئاگرنی» گوتی باکی بەوە نییە ئـاخۆ ئاڵمانەکان ئەوەندە بێنە ناو یەکێتیی سـۆڤیەتەوە تـا دەگەنە نـاوچەی پێچۆراش. لە هەر بارێکدا ئەو هیچی نەبوو لە دەستی بدا. گارینیش بە توندی بەسـەریدا تەقیەوە و پێیگوت: "سـەیرکە، منـیش زینـدانیم، منیش ئـازار دەچێژم، بەڵام ئەو کـــوێرەوەرییەی تێیکەوتـــووم ئـــاوەزی لە دەســـت نەداوم! حەزدەکەم یەکێتیی سـۆڤیەت لە جەنـگەکەدا ببیـاتەوە. ئـاخر فاشـیزم مەترسـییەکی کوشندەیە لەسەر مرۆڤایەتی. خۆ ئەگەر یەکێتیی سۆڤیەت بکەوێ، ئەوا هەمـــوو دەســـتکەوتەکانی شـــۆڕش هەڵدەوەشـــێنرێنەوە. دیـــارە ئەوەت

لەبیرچووە، کە وڵاتی دایک چەندی بە تۆ بەخشیوە. ئێستاش، کاتێ وڵاتەکەت لە مەترسیدایە، دەڕۆی ناپاکی لێدەکەی؟"

یارۆی ئەندازیار مەیلی لێنەبوو لەگەڵی بکەوێتە مشتومڕ و درێژە بە دەمەتەقێکەی بدا. دیاربوو لەوەی گوتبووی ترسابوو. هەرچەندە زیندانییەکان باکیان بەوە نەبوو ئاخۆ لە ئۆردوگاکەدا چی دەڵێن (ئاخر لەوە زیاتر چییان لێدەکەن؟)، لێرەدا هەندێک کات هەیە، تەنانەت بۆ«ئاگرنی»یەکانیش، بەتایبەتی بە قەولی ڕووسییەکان زۆرگرنگە کە دەگوترێ:" "زمانم دوژمنمە". ئەندازیارەکە لە کورتیدا بڕیەوە و گوتی، گوایە «گارین» لە قسەکەی نەگەیشتووە، ئەو وەسفانەی ئەو کردوونی شتی باون نەوەک هەر لەلای ئاگرنییەکان بەڵکو لە سەرتاسەری یەکێتیی سۆڤیەتیشدا.

ڕۆژێکیان کۆمسیۆنێکی پشکنین هاتە نەخۆشخانەکە. ئەندازیارەکە پێیڕاگەیاندین، هۆکاری سەردانە کتوپڕەکە بۆ ئەو سکالایەی لەسەر پزیشکەکە دەگەڕێتەوە، کە وادەی بۆ کۆڵێتەکەی ئێمە داناوە. پزیشکەکەی ئێمەش زیندانییەکی بە ڕەچەڵەک «ئیستۆنی» بوو، ژنێکی بەژندرێژی تەمەن مامناوەند و نازدار بوو. بەندوباو وەها بڵاوببوونەوە، گوایە دکتۆرەکە پێشنۆرەیی[134] زیاتر دەداتە زیندانییە «ئیستۆنییەکان»، ئەوانەی بە یەکەوە لەگەڵ ئێمە گەیشتوون و کارێکی وەهاش دەکا بۆ ماوەیەکی زۆر زیاتر لە نەخۆشخانە بیانهێڵێتەوە و تا پشکنینی زیاتریان بۆ بکرێ. تا ڕاددەیەک چیرۆکەکەی ئەندازیار ڕاستی تێدا بوو، بەڵام سەختیش بوو بسەلمێنرێ. هەرچۆنێک بێ «گارین» و منیش لەو کاتەی لە نەخۆشخانەکەدا بووین، نەمانتوانی بچینە بنجوبناوانی پرسەکە.

---

134– پێشنۆرەیی: سڕەبڕی، ڕەفتاری جیاوازتر، ئەفزەلییەت.

لەگەڵ کۆمسیۆنەکەشـــدا سەرپەرشـــتیارەکەی ئۆردوگـــای کـــاریش گەیشـــت. هـــات و پرســـیاری لە نەخۆشـــەکان کـــرد ئـــاخۆ ئامـــادەن بە خواسـتی خۆیـان بگەڕێـنەوە سـەر کـار، چـونکە کـاری پێویسـت و لە ناکاویــان هــاتۆتە پــێش، دەبــێ لە مــاوەیەکی کورتــدا جێبەجێبکــرێ. نەخۆشــەکانیش بە بێــدەنگی وەڵامیانــدایەوە. سەرپەرشــتیارەکە ئــێمەی بەجێهێشـت. ئـێمەش تـازە هاتووەکـان، حەپەسـاویەکەمان لە ئاسـت ئەو داوا ســەیرە خۆبەخشــانەیە لەنێــوان نەخۆشــەکاندا پێنەدەشــارایەوە. یارۆی ئەندازیاریش بە نەفرینەوە پێمـانپێکەنی. پێیگـوتین: "ئەنجـامەکەی دەبینن."

بـۆ ڕۆژی پاشـتر، «گـارین» ڕاشـکاوانە چیرۆکـی ژیـانی خـۆی تـا ئەو کاتەی هاتۆتە پێچۆرا بۆ گێڕامەوە.

"«مێنـاحیم وۆلفـۆڤیچ»، وامەزانە تـۆ یەکەمـین کەس بیـت، مشـتومڕت لەســەر زایـۆنیزم و سۆشـیالزم لەگەڵـدا بـکەم. تـۆ مـن دەخەیـتە سـەر کەڵــکەڵەی خەیــاڵی ڕۆژانــی گەنجێتــیم لە «ئۆدێســـیا[135]». ئـــای چ بەڵگەوبەندێکم لەگەڵ زایۆنیستەکاندا هەبوو! ئایا دەزانی، تەمەنـم چەنـد بـوو کـاتێ چـوومە ڕیـزی پـارتی کۆمۆنیسـتەوە؟ تەمەنـم نەگەیشـتبووە حەڤدە کاتێ بوومە بەلشـەفیک و کارم بۆ شۆڕش کرد.

"لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا، من لە نێو پاسەوانەکانی سـووردا بـووم، لە چەنــدین شەڕیشــدا دژی ســپییەکان وەســتاومەتەوە. بەدیلــیش گیــرام. ســپییەکان لێیانــدام و زۆر خــراپیش ئەشــکەنجەیاندام، بەڵام نەیــانتوانی هــیچ شــتێکم لێــدەربێنن. هەڕەشــەیان لێکــردم ئەگەر قســە نەکەم وەک سەگ دەمتۆپێنن. ئەوان دەیانکوشتم، ئەگەر هاتبا و هێرشـی پێچەوانەی پاسەوانانی سووریان نەکرابایە سـەر و سـەریان لێنەشـێوابا. کـاتێکیش شــەڕی نــاوخۆ کۆتــایی پێهــات، کــارێکی ڕاســتەقینەم لەنێــو پــارتی لە

[135] – ئۆدێسا odessa: بەندەرەشارێکە لەسەر کەناری باشووری ئۆکرانیا.

ئۆکراین پێدرا. ئای چ ڕۆژانێک بوون! من هەم لەنێو حیزبدا کارمدەکرد و هەم لە زانکۆشـــدا دەمخوێنـــد. کـــاتێکیش خوێنـــدنەکەم تەواو کـــرد، پلەیەکـــی بـــاڵاترم پێـــدرا. ئینجـــا بـــارمکردە «خـــارکۆڤ» و دواتـــریش «کییڤ». بۆ ماوەیەک لە سکرتارییەتی حیزب ئیشمکرد لە ئۆکراین. لە کۆتاییدا بوومە سکرتێری گشتی. ئیدی لەو پێگەیەوە گواسترامەوە بۆ پلەوپایەی باڵاتر. بانگکرامە مۆسکۆ و لەستافی دەستەی نووسەرانی «پراڤدا» داندرام. بوومە یاریدەدەری سەرنووسەری ڕۆژنامەی پارتی.

"لە ١٩٣٧، ئەو ســاڵەی ئەوان شــێت بــوون، ژنەکەم گیــرا. تــا ئێســتا دەربــارەی ژنەکەم باســم بــۆ نەکــردووی. لەو کــاتەی هەردووکمــان خوێنـدکاربووین، یەکـدیمان ناسـی. ژنەکەشـم ئەنـدامی حیـزب بـوو، ئەنـدامێکی زۆر چـالاکیش بـوو. ژنەکەم جـوو نەبـوو، ئەوسـا چیبـوو؟ خێزانەکەمــان بە خۆشــی دەژیــا. کــوڕو کچێکمــان هەبــوو. ژنەکەم لە کارەکەمـــــدا یارمەتیـــــدەدام، منـــــیش یـــــارمەتی ئەوم دەدا. مەیـــــلە هەرەسەرەکییەکەی ئەو زانست بوو. لە کارە زانستیانەکەی خۆیدا، لە ســەرکەوتنێکەوە بــۆ یەکێکــی دیــکە هەنگــاوی دەنــا. بــووە وانەبێــژ لە زانکــۆی ئــۆکراین، دوای ئەوە وانەبێــژ لە پەیمــانگەی مامۆســتایانی «کرانســی». پەککــو، خــۆ تــۆ نــازانی مامۆســتایەتی (پرۆفیســۆرایەتی) ســوور چــی دەگەیەنــێ؟ بــا بــۆت ڕوونــبکەمەوە. یەکێتیــی ســۆڤیەت لەو بارەیەوە لە وڵاتانی سەرمایەداری نـاچێ. ئێمە دامـودەزگەی تایبەتمـان هەیە، بۆ بوونە مامۆستا ئایندەی زانکۆکان لێیدەخوێنن و پێیدەگوترێ پەیمـانگەی پرۆفیسـۆرایەتی سـوور. ژنەکەم لە کـاری زانسـتیدا نایـاب بوو، پلەکەی بۆ پرۆفیسۆر لە پەیمـانگەکەدا بەرزبووەوە. بەڵام ١٩٣٧دا هەمووشتێک سەراوبن بووو. ئەوەبوو لە پڕێکدا، ژنەکەم گیرا.

"منـیش نەمـدەزانی چـی بـکەم. دڵنیـاش بـووم، زۆری پێنـاچی ژنەکەم ئازاددەکرێ. ئاخر ئەو ئەندامێکی دڵسۆزی حیزب بوو. ئەوان دەسـتیان لە من نەدا. منیش بەردەوامبووم لە کارەکەم لە پراڤدا. تـا ڕۆژێکیـان لە

وەزارەتی ناوخۆدا بانگکرام. وای بۆچووم، ئەوە واتای ئەوەیە، منیش بگرن، بەڵام لەو مەزندەکردنەدا شاش بووم. ئەفسەرێکی پلە باڵا پێیگوتم فەرمانی پێیە ڕاستەوخۆ بمباتە نەخۆشخانەی کرێملن، تا ژنەکەم ببینم.

"ژنەکەم زۆر بەڕەنگبزرکاوی بینی، بەڵام هێشتا بە شادمانییەوە خەندەی لەسەر لێو بوو. پێیگوتم لێکۆڵەرەوەکە بە ترۆتسکیزمی تاوانباری کردوە و داوایلێدەکا دانی پێدا بنێ. ئەویش دانیپێدانەنابوو. ئاخر ئەو هەرگیز ترۆتسکیزمی نەبووە. لێکۆڵەرەوەکە پێیگوتووە ئەگەر دانی پێدا نەنێ، لە زینداندا دەڕزێ. ئەو بێمراد ببوو، بڕیاریدابوو خۆی بکوژێ. بەڵام بەرلەوەی هەوڵ بۆ ئەم بدا، نامەیەکی تایبەتی بۆ ستالین نووسیبوو، داوایلێکردبوو ئازادی بکا و کارتی ئەندامێتی حیزبایەتیشی بداتەوە، چونکە ئەو هەمیشە ئەندامێکی دڵسۆزی حیزبی بووە و هەروەهاش دەمێنێتەوە.

"بە هەر پەرجوویێک بێ نامەکە دەگاتە دەستی ستالین. من دەزانم لەو نێوەدا زۆر خەڵک نامەیان بۆ «کالینین[136]»، «ستالین»، «مۆلۆتۆڤ»، «ئۆردزهۆنیکیدزە» یان «ڤۆرۆشیلۆڤ» نووسیوە، بەڵام هیچ لەو نامانە وەڵامیان نەهاتەوە. کەچی نامەی ژنەکەم گەیشتبوو، دەستبەجێش ئەنجامی هەبوو. ستالین فەرمانی دەرکردبوو لە نەخۆشخانەی زیندان دەریبێنن بیگوازنەوە بۆ نەخۆشخانەی «کرێملن». باشترین دکتۆر خەریکی چارەسەرکردنی بوون تا ژیانی ڕزگاربکەن. هەروەها ستالین فەرمانی دەرکردبوو دەمودەست کارتی ئەندامێتی پارتیشی پێبدەنەوە. چەند ڕۆژێک بەسەرچوون، کەچی کارتەکەیان هەر نەگەیشت. ئەویش بە ئارامییەوە چاوەڕێبوو.

[136]– میخائیل ئیڤانۆڤیچ کالینین: (١٨٧٥–١٩٤٦) شۆڕشگێڕێکی بەلشەفی سیاسەتمەدارێکی سۆڤیەتی بوو. سەرۆکی دەوڵەتی کۆماری سۆسیالیستی فیدرالی ڕووسیای سۆڤیەتی بوو دواتر بووە یەکێتیی سۆڤیەت. ئەندامی مەکتەب سیاسی پارتی کۆمۆنیست بوو.

سکرتاریەتی گشتیش داوایکرد ئاخۆ کارتەکەی پێگەیشتۆتەوە. وەڵامی ژنەکەشم نەرێیانە بوو. بۆ ڕۆژی پاشتر، سکرتاریەتی ڕێکخراوەکە کارتەکەی لەگەڵ پۆزشێک بەم شێوەیە 'بەگوێرەی ڕێنمایی تایبەتی هاوڕێ ستالین' بۆ گەڕاندەوە.

"مەگەر نازانی چەند خۆش بوو! بێنە بەرچاوی خۆت! ڕۆژانی دوایی چەند بەختیار بووین. ئاخر ژنەکەم گیرابوو، بە ترۆتسکیزم تاوانبار کرابوو، هەموو ژیانمان لەسەر لێواری خەرەندا بوو، هەر هەڵدێرێ هەڵدێرێ، کەچی لە پڕێکەوە ڕۆژمان لێهەڵاتەوە و لە جاران پڕشنگدارتر. ستالین بە خۆی ژنەکەمی ئازاد کردبوو، دەستەبەری ئەوەشی کردبوو چارەسەرییێکی تەواوی لە نەخۆشخانەکە بدرێتێ. من بە خاترجەمییەوە پێتدەڵێم و هیچ زیادەڕۆیش ناکەم، کە بڵێم ئەو ڕۆژانەم پێ شادمانترین ڕۆژانی ژیانمان بوون.

"یەک دوو هەفتە دواتر، ژنەکەم چاک بووەوە، لە خەستەخانە دەرچوو، هاتەوە ماڵ و لەوێشەوە چووەوە سەر کارەکەی خۆی لە پەیمانگەکە. منیش لە کاری ڕۆژنامەکە بەردەوامبووم. پێدەچوو ئایندەمان هەم سەلامەت بێ و هەم بشگەشێتەوە. کێ دەیوێرا دوای ئەوەی ڕوویدا، ژنەکەم هەراسانبکاتەوە؟ بەڵام دوای یەک دوو مانگی دیکە، دیسان ژنەکەم، بۆ جاری دووەم لە لایەن دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی گیرایەوە. زۆر زەحمەتە باوەڕبکرێ، وەها نییە؟ کەچی گیرانەکە ڕاستی بوو. ژنەکەم دیسان گیرایەوە، وێڕای ئەو ڕاستییەی، کە فەرمانی گیرانی یەکەمی ڕاستەوخۆ لە لایەن ستالینەوە هەڵوەشێنرابووەوە. ئەمەش نیشانیدا، کە گۆڕانکارییێکی ڕیشەیی لە فەرمارەوایەتیی یەکێتیی سۆڤیەتدا ڕوویدا، گۆڕانکارییێک، هەر ئێمە شتمان لەبارەیەوە دەزانی. خەڵکێکی وەک تۆ لە دەرەوە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ، بەبێ سێودوولێکردن وادەزانن، دەسەڵات هەمووی هەر لە دەستی پارتی کۆمۆنیستی دایە. ئەمەش لە ماوەی ژیانی لینین و یەک

دوو ساڵیش دوای مەرگی ئەو وەها بوو. ئەوێ ڕۆژێ تەنیا ئەوکاتە کارتی ئەندامێتی لە کەسەکە دەستێنرایەوە، گەر هاتبا و حوکمی لەسەردرابا. تا ئەوکاتەی تاوانبارییەکەی نەسەلمێنرابا، مافەکانی لێنەدەستێنرانەوە، ئەگەرچی بشگیرابا. بەڵام ئەمڕۆ پێگەکان گۆڕاون. چەقی بازنەی دەسەڵاتگێڕی لەنێو حیزبەوە گواستراوەتەوە دەستی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی. ئەندامی حیزبی لەو کاتەوە کارتی ئەندامێتی لێدەستێندرێتەوە کە دەگیرێ و سەرجەم مافەکانیشی لە دەستدەدا. چیدی حیزب لە یەکێتیی سۆڤیەتدا فەرمانڕەوا نییە. تەنانەت دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی حوکم بەسەر پارتی کۆمۆنیستیشدا دەکا. خۆ دەبینی، دەزگەی ئاسایش دیسان ژنەکەمیان گرتەوە، هەڵبەتە مشووری ئەوەشیان خواردبوو، جارێکی دیکە بە هیچ شێوەیەک نامەی نەگاتەوە بەردەستی ستالین. منی بەستەزمان و بێدەسەڵاتیش، دەستەوەستان مامەوە.

"هەرکەمێک دوای ئەوەی ژنەکەم بۆ دووەمین جار گیرایەوە، منیشیان گرت. لێکۆڵەرەوەکە داوایلێکردم بەڵکو پەیوەندی هەبوونم بە بارەگای سەرەکی ترۆتسکییان بۆ ئاشکرابکەم. ئەمەش تۆمەتبارکردنێکی کوشندەی بێ بناغە بوو. منیش قسەم لەگەڵ لێکۆڵەرەوەکەم کرد و بەڵگەی بێتاوانی خۆم بۆ هێنایەوە. پێموابوو من بەڵگەی حاشاهەڵنەگرم هەن و تێیدا سەردەکەوم و ناوی خۆم پاکدەکەمەوە و بە سەلامەتی لێیدەردەچم. من بە لێکۆڵەرەوەکەم گوت، کە هەر چەند ڕۆژێک بەر لە گرتنم وتارێکم لە پراڤدا نووسیوە. وتارەکە بە ناوی پاشەکشەیەکی خێرای مەنشەفیزم، تێیدا ئەوەم نیشاندابوو، هەر بەڕاستی ترۆتسکیزم لە پاشەکشەدایە بۆ باوەشی مەنشەفییە ناپاکەکان دەگەڕێتەوە.

"بە دەرەنجام و بڕوابەخۆبوونەوە بە لێکۆڵەرەوەکەم گوت؛ دوای ئەوە تۆ ئێستا دێیت و بە ترۆتسکیزم تاوانبارم دەکەی. لێکۆڵەرەوەکەش بە تەوسەوە وەڵامی دامەوە: «گارین» نابێ خۆتمان بە زیرەک

نیشانبدەی؟ خەڵکی لەتۆ زیرەکتریش هەن. ئێمە هەموو شتێک دەزانین. بەڵێ، ئێمە هەموو شتێک دەربارەی وتارەکەت دەزانین کە لە پراڤدا دژی ترۆتسکیت نووسیوە. بەڵام تۆ فشە بەسەر کێدا دەکەی؟ ئەوە بارەگای سەرەکی ترۆتسکیی بووە تۆی ڕاسپاردبوو تا ئەو هەموو وتارانە بنووسی، بۆ ئەوەی باشتر خۆت پەردەپۆش بکەی و پێگەی بالاتر لەنێو حیزبدا وەربگری، تا بتوانی کاروچالاکی تاوانبارییانە بکەی.'

"ئەم تۆمەتبارکردنانە هەمووی چنینی دەستی خەیاڵ بوون و هیچ بنەمایەکی ڕاستییان نەبوو. منیش دەڵێم، ڕووی قسەکەشم لە تۆیە لێرە لە پێچۆرا و لەسەر ئەو تەختەبەندە، کاک «مێناحیم وۆلفۆڤیچ» نەوەک نوێنەرایەتیی دەسەڵاتی سۆڤیەتی. ئەگەر هاتبا و «ترۆتسکی» بام حاشام لێنەدەکرد. بەڵام من هەموو ڕاستییەکەت پێدەڵێم. هیچ پەیوەندییەکم بە مەڵبەندی ترۆتسکییەکانەوە نەبوو. بە پێچەوانەوە، لە وتارەکانم، لە دوانەکانم، کە لەبری کۆمیتەی ناوەندی دەمدان، دژیان وەستابوومەوە. بەڵێ ئەوەش ڕاست بوو، لە بیستەکان و بەر لە مردنی لینین، ئەو کاتەی خوێندکاری زانکۆ بووم، مەیلێکم بە لای شێوەی هزری ترۆتسکیی هەبوو. ئەوکات بەڵگەوبەندێکی گەورە لەنێوان لینین و ترۆتسکیدا هەبوو. هەموو شتێکیش ڕاگەیەنراو زانراو بوو، هەمووان لەبارەیانەوە دەزانی. لەبەر زمانی توندی وتارەکانی «ترۆتسکی»، جارێکیان لینین هەڕەشەی دەستلەکارکێشانەوەی لە حیزب و لە دەوڵەت کرد. ئەوکات هێشتا دیموکراسی لەنێوخۆدا مابوو. کەسیش لە دەربڕینی هزردا نەدەترسا، ئەوسا دەربڕینەکە بەلای ترۆتسکیدا یان بە لای لینیندا بشکابایەوە. هەموو تاکێکیش لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا ئەمەی دەزانی. زۆر کەس، کە ئێستا کار بۆ حکوومەت، بۆ کۆمیتەی ناوەندی، بۆ سۆڤیەتاتی ڕووسی، بۆ پارتی کۆمۆنیستی دەکەن، کاتی خۆی بە یەکەوە لە زانکۆ دەمانخوێند، ئەو کاتیش وەک باقی خوێندکاران پشتگیریمان لە هەندێ لە بۆچوونەکانی ترۆتسکی دەکرد. هەموو

شتەکەش ڕەوا و قانوونی بوو. هیچ کێشەیەک نەبوو. بەڵام لەو کاتەوە – لە ڕۆژانی خوێندنەکەمدا – من هیچم نە لەگەڵ ڕوانگەی ترۆتسکی و نە لەگەڵ لایەنگرانی ئەودا نەبووە. بە پێچەوانەوە، بە توندی دژیان وەستابوومەوە.

"کەچی سەلماندنەکە دادی نەدام. لێکۆڵەرەوەکان – ئاخر من چەندین لێکۆڵەرەوەم هەبوون – هەر لەسەر داواکەی خۆیان سوور بوون، کە دەبێ دان بە هەموو پەیوەستییێکم بە بارەگای ترۆتسکییەوە دابنێم، دان بە چەند شتێکدا بنێم، کە نەمکردوون. ئایا دەزانی لێکۆڵینەوەکەم چەندی خایاند؟ پێمگوتی، لە ١٩٣٧دا گیرام، هەر سێ مانگیش دەبێ «تۆمسک»م بەجێهێشتووە، ئەمەش دوای ئەوەی پێیانڕاگەیاندم، کۆمسیۆنی ڕاوێژکاران هەشت ساڵ سزای لە ئۆردوگای کاری بێگاریدا بۆ بڕیومەتەوە. لێکۆڵینەوەکەم چوار ساڵی خایاند. بەشی هەرە زۆری ئەو ماوەیە لە زیندانی «تۆمسک» بووم لە سیبیریا. لەوێ لەگەڵ هەندێ لە سەرکردەکانی حیزب، لەگەڵ باشترین لە ئەفسەرانی سوپای سووردا لە زیندان بووم؛ لەوێ لەگەڵ بەلشەفیکەکان بووم، ئەوانەی سەرکردایەتی پرۆلیتاریایان کرد شۆڕش بکەن و لە شەڕی ناوەخۆشدا سەرکەوتوو بوون. من شتی زۆر سامناکم بینیوە؛ زۆر شتی کوشندەم تاقیکردۆتەوە.

"کاک «مناحێم»، با ئەوەشت بەزەیندا نەیەت، کە لەنێو ئەوانەی ئەوێ ڕۆژێ گیرابوون، تێکدەری ڕاستەقینەیان لەنێواندا نەبووە. هەڵبەتە لەو جۆرە کەسانەش هەر هەبوون. بە خۆم هەندێکیانم بینین. ئەوان بێباکانە دەچوونە لێکۆڵینەوە، کە دەشگەڕانەوە بە ڕەزامەندی خودی خۆیان و لێکۆڵەرەوەکان دەگەڕانەوە. ئەوان ڕاهاتبوون بە ئاشکرا لە نێو زینداندا پڕوپاگەندە بکەن. 'بەڵێ، ئەوان ڕاهاتبوون لەسەر ئەوەی بڵێن' ئێمە ناوەکانمان داون. یەکێک ناوەکان بدا. دەی با ئەوانیش بچنە نێو زیندان. زۆر لە زیندانییەکان ئەندامی کارای حیزب بوون لەوەش

گەورەتر دانپێدانانەکانیان بوو. ئێمە ئیرادەی حیزب تێکدەشکێنین. چەند ناوی زیاتر بدەین، ئەوەندە بۆ ئێمە باشترە."

"مــن خــاترجەمم، لەبەر تێکــدەرە بەدنیازەکــان بە هەزاران کەس لە ئەنـدامە هەرە باشــەکانی حیـزب گیـران و لەنـاوبردران و خـرانە نێـو گەرداوەکەوە. لێکۆڵەرەوەکـــانیش تەنیـــا یەک شـــتیان دەویســـت: دانپێدابنێ، پەیوەندییەکانتم بۆ ڕوونبکەوە؛ کێی دیکە ترۆتسکی بوو؟ کێی دیکە دژی کۆمیتەی ناوەندی بوو؟

"لەوانەیە هەر لەبەر ئەو تێکـدەرە بەدنیـازانە، زۆر لە لێکۆڵەرەوەکـانی ئەوێ ڕۆژێ، لە کۆتاییـدا بە خۆشـیان لەنـاوبرابن. مـن پێتـدەڵێم، ئەوێ سـاڵێ، لە ١٩٣٧دا، ئەوان دیـن بـوون. ڕۆژێکیـان زینـدانییەکان لە لایەن لێکۆڵەرەوەیەکی دڵڕەق لێیان پێچرایەوە، ئەو دارکاری کردن، بەخراپ لەگەڵیان جوولایەوە، داوای دانپێدانانێکی تەواوعەیاری دەکرد، کەچی هەر چەند ڕۆژێکی کەم دوای ئەوە، هەمـان لێکـۆڵەرەوە هـاتە زینـدان، بەڵام ئەمجارەیـــان وەک زینـــدانییەک. ئینجـــا ئەو بە دەوری خـــۆی، چەرخی گەردوونی لێهەڵگەڕایەوە، دەبووایە دان بە هەموو شتێکدا بنێ، داوایلێکرا پەیوەندییەکانی لەگەڵ مەڵبەندی ترۆتسکییدا ئاشکرابکا، هەر شتێکیشـی دژی ترۆتسـکیزم کردبـوو بە بـا ڕۆیشـت. هەنـدێکجار بە لێکـــۆڵەرەوەکە دەگـــوترا، دانیپێـــدابنێ بەوەی ڕێنمـــایی لە بارەگـــای تێکـدەرانەوە بـۆ هـاتووە، تـا ئەنـدامە دڵسـۆزەکانی حیـزب و کـادرە باشەکانی لاواز بکا بۆ ئەوەی ڕیزەکانی حیزب تێکبشکێنێ. بەر لەچەند ڕۆژێـک خـودی لێکـۆڵەرەوەکەی کە گیرابـوو. ئەویـش گیـرا، ئینجـا داوایلێکرا دان بە هەموو تاوانێکدا بنێ، کە دەرهەق قوربانییەکەی پێش خۆی کردبوو. من وا پێت دەڵێم، ئەوکات وەک ئەوە وابوو، هەموومـان لە ماڵێکی گەورەی شێتیدا ژیابین. تۆبڵێ کەی کۆتـایی بەو شێتایەتییە بێ؟

"بۆ چوار دانە ساڵ من لە ژێر لێکۆڵینەوەدا بووم، لە لێکۆڵەرەوەیەک دەدرامە دەست یەکێکی دیکە. خراپترینیشیان لێکۆڵەرەوەی «تۆمسک» بوو. ئەو کەسێکی شووم بوو، لە هەموو زیندانەکە بە دڵڕەقی ناسرا بوو. ئەوان ڕاهاتبوون 'دۆزی تایبەتیان' دەدایە دەست. ئەویش لە ڕووخاندن و تێکشکاندنی کەسی سەرسەخت و نەسەلمێندا مەعلان[137] بوو، خۆشی بەوە هەڵدەدایەوە، گوایە تا ئێستا هیچ زیندانییەک لەژێر سیستمی لێپێچینەوەی ئەو دەرنەچووە، کە دانی پێدانەنابێ. ئەو کابرایەی لە هەموو هەستێکی مرۆڤایەتی بە دوور بوو، ناردیان لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکا. من تا گەیشتمە دەستی ئەو پیاوێکی نەخۆش بووم. دوو جاران هەوڵی خۆکوشتنم دا. هەوڵمدا دەمارەکانم ببڕم، چونکە سووک و ئاسان چیدی بەرگەم نەدەگرت. بەڵام خۆ لە ڕووسیادا لە زیندانی ناگەڕێن وەها بە ئاسانی و خێرا بمرێ. لە هەردوو حاڵەتەکەدا دیاربوو کە خوێنێکی زۆرم لەبەر ڕۆیشتبوو. لە بەرەنجامی هەموو ئەمانەشدا، حاڵم شڕ بووبوو، نەخۆشی دڵم لە خراپیدا قۆناغێک چووبووە پێش. ڕۆژانە پلەی گەرمیم بەرزدەبووەوە، هەروەک ئێستا، ئیدی لەو دۆخەدا بووم، منیان بردە بەردەستی ئەو شارەزایە لە تێکشکاندنی زیندانییەکان.

"ئەو وەک لێکۆڵەرەوەکانی دیکە قسەی لەگەڵ نەکردم. لێیپرسیم ئایا ئامادەم دانی پێدابنێم، منیش پێم گوت، هەموو شتێک کە دەیزانم، گوتوومە. ئینجا پێچکێکی لە کورسییەکە دەرهێنا - دەتگوت گایە ئەوەندە خورتە - ئینجا کەوتە سەرم، کوێت نایەشێ! کەللەم، شانەکانم، هەموو جەستەم، لەگەڵ لێدانیشدا هاواریدەکرد و دەیشیڕاند؛ 'دەی دانی پێدا دەنێی یان نا؟" جار لەسەر جار ئەمەی دووبارەدەکردەوە. خۆزاییانەش بە دەستەکانم سەرم، دەموچاوم دادەپۆشین، بەڵام هەستم بە ژانی دڵم کرد. دەستەکانم خستنە سەر

137– مەعلان: شارەزاو بە ئەزموون.

دڵـم و لێپـاڕامەوە تەنیـا لە سـەر دڵـم نەدا، بەڵام ئەو هەر گوێشـی لێنەبـوو. دوای شـەوەکە، چەنـد جارێـک هەوڵمـدایەوە خـۆم بفەوتێـنم، بەڵام تێیدا سەرنەکەوتم. ئێستاش کاک «مێناحیم وۆلفۆڤیچ» دەمبینی لێـرەم، لەسـەر ئەو تەختەبەنـدەی «پێچـۆرا»م. نە دادگەیـی هەبـوو نە هـیچ. دوای چـوار سـاڵ لە لێکـۆڵینەوە، پێیانڕاگەیانـدم، کەوا حـوکمی هەشـت سـاڵیان وەک سـزا لە ئۆردوگـای کـاری چاکسـازییدا بـۆ بڕیومەتەوە. بەیانیش بە یەکەوە دەچینە کار."

لەو ڕۆژەی گارین ئەو هەموو شتەی بۆ گێڕامەوە، دکتۆرەکە بڕیاری دابوو، ناوی چەندین کەسی خوێندبووە، کە بەیانی دەبێ نەخۆشخانە جێبهێڵن و بچنە ئۆردوگای کاری بێگاری. «گارین»یش یەکێک لەوان بـوو. دکتـۆرەکە بە «گـارین»ی گـوت، داوای لە کۆمسـیۆنی چـاودێری کـرد، بەڵکـو لێـبگەڕێن «گـارین» لە نەخۆشـخانە بمێنێـتەوە، چـونکە نەخۆشـی دڵـی هەیە و ڕۆژانەش پلەی گەرمـی دەگـاتە سـەد پلە. بەڵام کۆمسـیۆنەکە هەمـوو ئەو ڕوونکـردنەوانەی بەلاوە نـابوون، ئاگـاداری پزیشـکەکەیان کردبـووەوە، دەبـێ واز لەو جـۆرە کـارانە بێنـێ و زیندانییەکان بەرەو سەرکار بنێرێ، دەنا دواتر بەرپرسیار دەبێ.

لە دۆسـیەکەی «گـارین»دا چـوار پیتـی K.R.T.D. نووسـرابوون کە واتای «چالاکی ترۆتسکییانەی شۆڕشی چەواشە»ی دەگەیاند. ئەمەش یەکێک لە خراپترین ماددەی قانوونی بوو لە یەکێتیی سۆڤیەتدا.

ئەوێ ڕۆژێ، گـارین و مـن چـووینەدەر، چـووینە بەردەم چیمەنـی کۆلێتەکەمان. لەوێ زیندانییەکی «ئوکری» ڕووسی بەژندرێژمان بینی، بە نیوە بردەبـردێکەوە بە خـۆی دەگـوت: " ئـۆو، ژهیـدی، ژهیـدی (هـۆ جوولەکە) چیت بەسـەر دێ؟ هیتلەر لەوێ دەتانشێلی و لێرەش لەنێو ئەو زۆنگـاوەن. بە داخـم بـۆ جـووە بەسـتەزمانەکان. ئەوان لە هەر کوێیەک بن، تووشی بەڵای خۆیان هاتوون، ئەدی چی بەسەر ئێوە دێ، هەی جوولەکەینە؟

یاریدەدەری سەرنووسەری پراڤدا، کە دەرکرابوو، بە نەخۆشی لە نەخۆشخانە گوێی لە وشەی ژهیدی ڕووسی ببوو هەر لە خەیاڵی مابوو.

ئەمەش دوای ئەوەی، کە چیرۆکەکەی خۆی بۆ گێڕامەوە.

## ١٧

# یاوەریکردنی ئۆرکێسترا

سەرپەرشتیاری ئۆردوگاکە، کە پیاوێکی کورتەبنە و قەڵەو بوو، بە دەنگێکی پڕ لە جۆش و خرۆشەوە گوتی: "خەڵکینە، ئێستا ئێوە لە ئۆردوگاکەی ئێمەدان. ئێوە دەبێ بۆ یەکەم جار بچنە سەر ئیش. لە بیرتان بێ، ئێوە کار بۆ سۆڤیەتی نیشتمانی دایک دەکەن. لەوێ، زۆر دوور لە ئێمە، شەڕێکی ترسناک هەڵگیرساوە. خوێن لەگەڵ قوڕاو تێکەڵی یەک بووە. ئێوەش زۆر لە بەرەکانی پێشەوەی شەڕ دوورن، ئێوە دەبێ سوپاسگوزاری ئەوانە بن، کە لەبەرانبەر مرۆڤخۆرەکانی ئاڵمان ڕاوەستاون و بەرگرییتان لێدەکەن. هەر بۆیە ئەرکێکی مەزنە، لێرە چاکی مەردانەی بۆ کارەکە لێهەڵبکەن، بۆ ئەوەی ئێوەش بە ڕۆڵی خۆتان یارمەتی بەرەکانی جەنگ بدەن. ئەمڕۆ ئێوە دەست دەدەنە تەور و بێڵ، بەڵکو بەیانی بۆ چەکهەڵگرتن بانگ بکرێن. دەی بۆ سەرکار! بۆ پێشەوە! هورا!"

زیندانییەکانیش، کە گوێیان لەو دنەدانەی بەرپرسەکە بوو، لەسەر گردۆڵکەیەک وەستابوون، کە بۆ مەودایەکی دوور بەسەر لێوارەکانی ڕووباری پێچەوڕای دەڕوانی. لە خوارەوەش، لە لای دەستە چەپی قەراغی ڕووبارەکە، هێڵی ئاسنین و ژمارەیەکی زۆری کامیۆنی بار هەبوون. لە ڕووبارەکەش بەلەمی بار وەستابوون. سەرەتا بەرپرسەکە ئاماژەی بە بەلەمەکان کرد و پاشان قامکی بۆ کامیۆنەکان ڕاهێشت و

گوتی: "حیزب و حکوومەت کارێکیان بە ئێمە سپاردووە، باری سەر ئەو بەلەمانە دابگرین و لە کاتێکی دیاریکراویشدا لە کامیۆنەکانیان باربکەین."

زیندانییەکانیش پێکهاتەیەکی هەمەڕەنگی وڵاتان بوون. لەنێویاندا ڕووسی، پۆلۆنی، لیتوانی، ئیستۆنی ڕۆمانی (خەڵکی بێسارابیا) و جووم بەدیکردن. بە شێوەیەکی ئاسۆیی، زیندانییەکان بەگوێرەی زمان و ڕەچەڵەک پۆلینکرابوون، بەڵام بە شێوەیەکی ستوونیش، دابەشکرابوونە سەر تەنیا دوو گرووپ: زیندانی سیاسی و زیندانی تاوانکار. هەر دابەشکردنە ئاسۆییەکەش بوو، کە دەیخوارد.

ئەو گوتارە وڵاتپارێزییەی بەرپرسە خەپەکە بۆ هەموو زیندانییەکان بوو، بەڵام هەر بە تەنیا زیندانییە تاوانکارەکان بە هورا وەڵامیاندایەوە. ئیدی بەم وەڵامدانەوەیە بەرەو ڕووبارەکە لێژبوونەوە. زیندانییە سیاسییەکانش بە خێرایی گەیشتنە بەلەمەکان و ڕۆژی کارمان دەستپێکرد. ئێمە دەبوو هێڵی ئاسنینی کۆتلاس ڤارکوتا بە فەرمانی پارتی و حکوومەت دروستبکەین.

ئینجا لەوێ و لەپڕێکەوە دەنگی موزیکمان هاتەبەرگوێ، ئەوەش لەو کاتەی دابەزیم و ویستم بچمە سەر بەلەمەکە. من و زیندانییە نوێیەکانی دیکەش ئاوڕێکمان بۆ پشتەوە بۆ لای گردۆڵکەکە دایەوە: هەر بە ڕاستی سەرچیخ نەچووبووین. لەسەر بەرزاییەکەدا، ئامێری فوودار، دمبک و سیمبال[138] بۆ خۆشی ئێمە لەوێ بوون. ئاوازی گۆرانییێکیان لە پەسندانی ڕۆژی خەباتی ڕزگاری سۆڤیەتی دەژەنی.

ئێمەش هەموو ئەو شتانەمان کە بۆ دروستکردنی هێڵی ئاسنین بوو، دابەزاند. هێڵی ئاسنینی ڕووسی بە شێوەیەکی ناوازە بەرین بوون. بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوادا، زۆر درێژتریش بوون.

---

[138] –Symba

درێژی و قورسایی کەرەستەکانیش بۆ ڕانانی هێڵەئاسنینەکە لە قەدەر یەک بـــوون. ئەوپەڕی بـــاری هەر زینـــدانییەک لەهەر کەڕەتێکـــدا هەر شیشـــە ئاســـن بـــوون کە لە بەلەمەکە دابەزێنـــین و لە کۆمیۆنەکـــان باریـــانبکەین. هەرکەســـێک لەوە زیـــاتری هەڵگرتبـــا، دەبـــووە مـــایەی سەرنجدانی باش بۆ کارکردن.

ئێمە شیشـە ئاسـنەکانمان لە سـەر بەلەمەکە بەسـەر شـانی خۆمـان و بەسەر تەختەدارێکی باریکیشدا هەڵدەگرت و و بەرەو کەنارەکە بۆ لای لۆرییەکانی قیتارەکە دەهێنانەوە، مەودایەک سێ سـەد مەترێک دەبوو. دوای چەنـــد ســـەعاتێکی کەم، هەر جارێـــک شیشـــەیەکم هەڵـــدەگرت، هەستم بە ئازارێک دەکرد، کە لە تەختەی شانەکانمەوە دەهات. هەمـوو پێسـتی شانیشـمان ڕووشـا. هەمـان شـتیش بەسـەر زیندانە نوێیەکانـدا هـــات. زینـــدانییە تاوانکارەکـــانیش مۆڕەیـــان لێـــدەکردین و گاڵتەیـــان پێـــــدەکردین بە دەســـــت ناســـــک و نەرمونـــــۆڵ بانگیانـــــدەکردین. هاواریاندەکرد: "ئێوە نازانن چۆن کار بکەن، دەی سـەیری ئێمە بکەن." هەر بە ڕاستیش ئەوان دەیانزانی چی دەکەن. ئەوان پارچە پەڕۆیەکیان لەسەر ملیـان دادەنـا، تـا پێسـتی شـان و ملیـان لەبەر زەبری هەڵگرتنـی ئاسن و قەدەدارەکان زیاتر نەڕووشێ.

ئینجا لە هیکەوە یەکی لە زیندانییە تاوانکارەکـان هـاواریکرد: "زاکورکـا zakurka!" ئـێمەش هەر هێنـدەمان زانـی، هەمـووان دەسـتیان لە کـار هەڵگـرت. هەنـدێک لە زینـدانییەکان، پـارچە کاغەزێکیـان لەو پـارچە ڕۆژنـامەی بەرکیـان کـردەوە، هەنـدێک توتنیـان تێکـرد و لوولیانـدان، تفێکیان لێدا تا یەکدی بگرێ، بەڵام خۆ کاغەزەکە ئەسـتوور بـوو، ئیـدی جگەرەیەکـــی ئەســـتووری لێپێکهـــات، هەروەک چلودەکـــانی هاڤانـــا! بە تەماشـــاکردنی ڕووخســـاری جگەرەکێشـــەکان، دەتبینـــی ئەوانـــیش لە چرووت کێشەکان چێژیان کەمتر نەبوو، هەرچەندە جگەرەی ئەوان لە

دەمـێکەوە دەچـووە دەمێکـی دیـکە. سـێ تـا چـوار مژلێـدان لایەنـی هەرەزۆری جگەرەکە بوو.

"زاکورکـا بەسـەرچوو،" یەکـێ لە سەردەسـتەکانی تـیمەکە هـاواریکرد؛ "بگەڕێنەوە سەر کار!"

"______ هۆ فەرماندەی هێز، هەی ماری نەفرەتی،" یەکی لە زیندانییە تاوانکارەکان وەها بە دەنگ هاواریکرد، هەرچەندە نیوەی جوێنەکەشـی ئاراستەی سەردەستەی گرووپەکەی خۆی کرد.

سەردەسـتەی گـرووپەکەش بە جـوێنەکە تێکنەچـوو، پێـی سـووکایەتی نەبوو. کارەکە دەستپێکراوەیە.

کاپتنێکی پۆلۆنی، کە لە تەک من بوو، شیعرێکی «ئادام میزکیـویزیچی» لەبەر گوتەوە، شـیعرەکە سـەبارەت بە کەوتنـی قەڵای گرانـادا و تۆڵەی بەرگریکارەکـانی، «ئەلمـانزور»ی ئیسـپانیە داگیـرکەرەکە نووسـیبوو. ئەفسەرەکە ئەم کۆپلەیەی گوت:

"ئەوان شەوی مەغریبییەکانیان لەباربرد

لەوێ سۆز باری کردبوو، دڵڕەقی ئاسنیان نیشاندان،

بەڵام لەوێ، لە گرانادا، قەڵاکان هێشتا هاوپەیمان بوون،

هەرچەندە دەرد و ئافاتیش بەنێو شاردا گوزەریکرد ..."

کابرا ئەوەندەشـی بۆ زیـادکرد: "ئێمە ئاسـن ڕادەکێشـین؛ تووشـی بەڵا بووین، بەڵام ئێمە «ئەلمەنزوور»مان نییە!"

سەردەستەی گرووپەکەش لە شوێنی خۆی هاواریکرد: "بەڵام خۆ تۆ تازە جگەرەت کێشا. تۆ دەبێ بگەڕێیتەوە سەرکار."

"دەی وەک مار کیفەکیف[139] مەکە،" تاوانکارەکان بە کۆرس وەڵامی کابرایان دایەوە؛ "هەوڵدە بە خۆشت هەندێک کار بکەی! هەی مشەخۆر!" دوای ئەوە دەستەجوێنێکی بە کۆمەڵی بۆ چوو.

«زاکورکا» هەر دووکەڵێکی هەڵچوو نەبوو لە پەڕی کاغەزێکەوە دەربچێ، کە ڕۆژگارێک پراڤدا بوو؛ بەڵکو بەشێکی نەپچڕاوەی شەڕی مان و نەمانی ئەوانەبوو، کە حوکمیان بەسەردادرابوو، لەو ئۆردوگا بێگارییەدا ڕەنج بدەن.

سەرباری وچانی جگەرەکێشانەکە، سەرباری ئەو ساتانەی تایەی کامیۆنەکان کارەکەیان تێکدەدا و دەبوایە سەرلەنوێ تێهەڵچنەوە، کامیۆنەکە لە لەوحەدار و شیشە ئاسن بارکرا، ئەمەش لەکاتێکدا هێشتا دەستەی سەرگردەکە هەر لەسەر ژەنینی مارشی کرێکاران بەردەوامبوون.

لەسەر بەرزاییەکەوە قۆترێک[140] کە هەموو ئێسقانەکانی دیاربوون، عەرەبانەیەکی ڕادەکێشا و بە هێواشی لە نشێوەکە شۆڕ دەبووەوە. دیمەنەکە گالیسکەیەکی ئاوی گەرمی کۆنینەی هێنامەوە یاد. ئیدی خواردنی نیوەڕۆ گەیشت.

کەمێک لە زیندانییەکان پارچە سەموونەکەی بەیانییان بۆ مابووەوە. بەڵام زۆرینەیان ناچاربوون بڕیان بە سووپی ماسییە ناخۆشەکە

---

[139] – کیفەکیف: دەنگی مار. شایانی باسە لرفەلرفکردن دەنگی خواردنی مارە، سیکە سیک، یان چیکە چیکیش هەیە، دەنگی ڕۆیشتنیشی پێیدەڵێن خشە، خشەی مارو مێروو..

[140] – قۆترِ: ئەسپێکی پیر و لەڕولاواز کە کەڵکی پێوە نەمێنێ.

بشــکێنن. زینــدانییانی لوکیشــکی هەڵیاندەقۆڕانــد و بە خەنیبــوونەوە دەیانگوت: "ئۆخەی، خواردنمان گەیشتێ!"

دوای نیــوەڕۆ کۆرســـی موزیـــک ڕۆیشـــتن. بەڵام مـــێش و مەگەزە وردەکـان تـا دەهـات زیـاتر دەبـوون گـۆرانی نـوێی خۆیـان دەچڕی: بە خــوێنی زینــدانییان برســـین. ئەو دەعبایـــانە هەم پێوەیانــدەدا و هەم گۆرانیشـیان دەگـوت، دەیـانمژی و لە گیزەگیـزیش[141] نەدەکەوتـن. لە دەسـتیان قوتـار نەدەبـووین، ڕێـی هەڵاتنـیش نەبـوو. دیسـان زینـدانییە تاوانکارەکـان بە لاقرتێەوە بەسـەر ئێمەیـان هـاواردەکرد؛ "دەستسـپی و ناسک". ئەوان بە ئەزموون بوون. ئەوان دەمامکێکی تەوندار یان پارچە تەلیســیان بەســەر ســەری خۆیــان داهێنــابوو، کونکونیــان کردبــوو. دەســتەکانیان بە پــارچە گوشــێک کە وەک دەســتوانەیان لێکردبــوو، شـــاردبوونەوە. ئـــێمەی نوێیەکـــانیش بە تەواوی کەوتبـــووینە بەر ڕەحمەتـی بەڵای ئەو دەعبـا وردیـلانە. ئەرێ خـۆ پێشـتریش ئەندازیارە تێکــدەرەکە ئاگــاداریکردبووینەوە، بەڵام کەســمان هۆشــدراییەکەیمان بەهەنـد هەڵنەگـرت. ئـێمە وامـان دانـابوو بەرگەی مێشـوولەکان بگـرین! بەڵام خۆ مێشوولە نەبوون، بەڵای خوا بوون!

لەو کـاتەی لەسـەر تەختەبەنـدەکانی نێـو کـۆڵێتەکە هەڵسـاین، چـواردە سـەعات تێـپەڕی. دوازدە سـەعات لەو کـاتەی گوێمـان لە هاتوهـاواری تاوانبارەکـان بـوو بە "هـوورا" هاوئـاوازی سەرپەرشـتیاری ئۆردوگـاکە بـوو. ڕۆژە کـارەکە تەواو بـوو. ئێمەیـان کـردە پێـنج ڕیـز و ژماردنیـان. "ئاگادارتـان دەکەینەوە، یەک هەنگـاو بە دەسـتە چەپ، یەک هەنگـاویش بە دەستە ڕاست، واتای ڕاکردن و هەڵاتن دەگەیەنێ و ئێمەش تەقەتـان لێدەکەین."

---

[141]– گیزەگیز: دەنگی مێش، مێشوولە.

زیندانییە تاوانبارەکان بە منگەمنگ نەفرەتی خۆیان دەربڕی. مایەی سەرسوڕمان بوو پێچۆرا سوورهەڵنەگەڕا.

لە دەروازەی ئۆردوگاکەش یەکە بە یەکەی زیندانییەکانیان پشکنین.

تاوانبارەکان هاواریانکرد: "خۆ ئێمە هەموو ڕۆژەکەی هەر ئاسنمان بارکردووە. باشە ئەوە بۆچی دەمانپشکنن؟"

لە مەیدانەکەدا ڕیزیان کردین. لە ژماردنەکە هەڵەیان کرد. جارێکی دیکە ژماردیانەوە. هێشتاش ژمارەکە ڕێک نەهاتەوە. ئێمەش بە نیگەرانییەوە لەوێ وەستاین، برسی و پشت کووڕ. قاچ جەستەیان پێهەڵنەدەگیرا، ئازاری سەرشانەکانمان حەجمانی لەبەر بڕیبووین. کەچی هەر لە ڕیزدا وەستابووین. هەر دەبێ ژماردنەکەیان ڕاست دەربچێ.

لە کۆتاییدا وەها دەرچوو. ئێمەیان بەردا، بڵاوەیانپێکردین. چاوەڕێی خواردنی شێوان بووین، چاوەڕێی سووپی زیاتر، سووپێک کە تامەکەی نەخۆشی دەکردین، سەرباری ئەو شەکەتییەی کە ڕۆژێک وایلێکردین ڕاپەڕین.

لەپڕ هاوارێک بەرزبووەوە:

"هۆی، ئەرێ فەرماندە! هەی مشەخۆر! ئەوانەت نانداوە؟" ئەو وشەی ڕووسی "ناکۆرمیل nakormil"ی بەکارهێنا، کە واتای "نانی دڕندەکان"ی دەگەیاند.

چیدی ئێمە ئادەمی نەمابووین تا خواردنمان بدرێتێ. بە ڕۆژێک بووینە ئەو ئاژەڵانەی دەبووایە ئالیکیان پێبدرابایە؛ (راب سیلا Rab - sila) هێزی کاری (کۆیلەی) یەکێتیی سۆڤیەت.

یەکێتیی سۆڤیەتی خاڵی لاوازی سەبارەت بە پیتە کورتکراوەکان هەبوو - بەڵکو لەبەر مەیلی تەلموودیزم بێ؟ - (راب سیلا - Rab sila) کورتکراوەی دەستەواژەی rabotchia – sila یە، واتای هێزی کاری پیاو یان دەستی کار دەگەیەنێ. بەڵام پیتەکانی R - A - B هەر بە خۆی لە ڕووسیدا واتایەکی دیکە دەدا، واتای کۆیلە دەدا. گومانیشی تێدانەبوو زمانەوانانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی چاویان لێنوقاندبوو.

بەو بیرکردنەوانە خۆم فڕێدایە سەر تەختەبەندەکەم. تا خەوم لێکەوت هەر گوێم لە سەدای ئەو پرسیارە دەبووەوە، کە بە هەموو شۆڕشگێڕیەتییەکەی خۆی گوتی: "ئەرێ خواردنتان داوەتە دڕندەکان؟"

بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین کە چۆن راب سیلا (هێزی کار - کۆیلە) لە یەکێتیی سۆڤیەتدا دەژی، چۆنیش بەکاردەهێنرێ، مرۆ پێویستی بەوەیە کرۆکی دەسەتەواژەکە بنەمای ئەرکەکەی بزانێ کە بۆچی ئۆردوگای چاکسازی کارییان ڕۆناوە. ئەمانەی خوارەوە:

Brigade - دەستەی کاری زەحمەت کە ژمارەیان ٢٠ بۆ ٣٠ دەبێ، ئەمە گرووپێکە.

Brigadier - سەردەستە، بەرپرسە لە کاری گرووپەکە.

Pro - rab – proizvoditel rabot - بەرپرس یان سەرپەرشتیاری ژمارەیەک لە گرووپەکان.

Nariadschik - کاردابەشکەر لەنێو ئۆردوگادا.

Norm - نۆرم، بەشە ڕۆژانەی کاری هەر زیندانییەک.

Normerovishchik - ئەو نووسەرەی بەشەکاری زیندانییەکانی دەژمارد و تۆماردەکرد.

Katiol – Dixi – بەشە خۆراکی ڕۆژانەبوو. بەشە سەمون و هەموو ئەو شتانەی زیندانیی تایبەت بە بەشە کاری ڕۆژانەی دەگرتەوە. لە ئۆردوگاکەماندا چوار جۆرە dixi دیکسی هەبوون. ئەو زیندانییەی کەمتر لە ڕێژەی سی لە سەدی نۆرمی ڕۆژانەی وەربگرێ ئەوا لە دیکسی (ژەمە خواردنی ڕۆژانە)دا سزا دەدرا. تەنیا دووسەد گرام سەموون و ڕۆژانەش یەک جار سووپ. ئەو زیندانییەی ڕێژەی شەست لەسەدی تۆماردەکرد، دیکسی ژمارە یەکی دەدرایێ، کە دەیکردە: چوارسەد گرام لە سەموون، دووجار سووپیش لە ڕۆژێکدا. ڕێژەی شەست تا هەشتا لە سەدیش، بەشەکەی دیکسی نمرە دوو بوو، کە پێنسەد گرام سەموون و پڕ بە کەوچکیش دانەوێڵەی بۆ دەکرایە نێو سووپەکەیەوە. ئەوەی لە سەرووی ڕێژەی هەشتا لە سەدیش بوایە، حەفتسەد گرام سەموون و سووپی باشتر بە دانەوێڵەی دەدرایێ، هەندێک جاریش پەتاتەی وشک، بسکێتی وشک کە وەک بەرد ڕەق بوو بەڵام زۆر بەتام بوون. ئەوەی لەو ڕێژەیەشی تێبپەڕاندبا، لە ئۆردوگاکەماندا خۆراکی دیکسی نمرە ١٢ (!) دەدرایێ، ئەویش بریتی بوو لە هەشت تا نۆسەد گرام لە سەموون، سووپێکی باش کە هەموو شتێکی تێدا بوو، تامێکی زۆر خۆشی هەبوو،من هەرگیز لێیم تامنەکرد، چونکە هەرگیز بەشی من بەگوێرەی کارەکە ئەو بەشە خۆراکە دیکسییە نەبوو، کەسیشم نەبینی بیگەیەنێتە ئەو پلەیە. بەڵام بۆچی ئەوان لە دیکسی نمرە ٣وە بازیان دا بۆسەر دیکسی نمرە ١٢، کەس نەبوو بتوانێ شتەکەمان بۆ ڕوونبکاتەوە. شتەکە بەخۆی وەها بوو. پاسەوانانی شۆڕشیش لەمەدا زۆر کۆنەپارێز بوون.

Padiom – هەڵسان لەکاتی خۆی. قێزەونترین وشەی نێو ئۆردوگاکە بوو.

Element – لەوێدا .S.O.E تۆخمی دژوار بۆ کۆمەڵگە و S.V.E تۆخمی ئازاردەری کۆمەڵگە هەبوو. زیندانییە سیاسییەکان، ئەوانەی لە

لایەن کۆمسیۆنی ڕاویژکارییەوە حوکمدرابوون، سەر بە دەستەی یەکەم بوون. هەرچی ئەوانەی لە ڕێی دامودەزگەی کارگێڕییەوە سزادرابوون، سەر بەدەستەی دووەم بوون. بەڵام لە ئۆردوگادا بە هەردوولایان دەگوت Element "ئایا تۆ توخمەکەی (ئێلێمێنتەکەی)؟" هەر ئەمەش پرسیاری سەرەکی زیندانییە کۆنەکان بوو لە زیندانییە نوێیەکان، هەندێک جاریش، نەوەک زۆر جار، دەیانپرسی "کامەیان؟"

Urki یان Zhuliki ئەمیش ناوێکی گشتی بوو بۆ زیندانییە تاوانکارەکان.

Vospitatiel - ڕێنوێنییدەر. ئەو پیاوەی لەگەڵ سەرپەرشتیاری ئۆردوگا لە ڕۆژانی پشووی یەکێتیی سۆڤیەت و ڤیستیڤاڵەکاندا دووانی دەدا. کاری سەرەکی دنەدان و جۆشدانی زیندانییەکان بوو تا هەموو هێزوتوانای خۆیان بۆ کار بەکاربێنن. ئەو "کێبڕکێی سۆسیالیستیانەی" (!)ی لەنێوان دوو ئۆردوگای کاری بێگاریدا ڕێکدەخست.

Lek - pom—Larkarski pomoshnik - یاریدەرەی پزیشکی یان ڕێکخەر. هیچ دکتۆرێک لە ئۆردوگاکە نەبوو. ئەو پزیشکانەی لەنێو زیندانییەکاندا بوون، لەوێ دایان دەنان تا لە نەخۆشخانەکەدا کاربکەن. ئەگەر قایل بووبا کاری پیشەمەندانەی خۆیان بکردبایە. لە ئۆردوگاکەدا لێک پۆم lek - pom، واتە کەسی ئاسایی هەبوو، لە نەخۆشخانەکەدا کاری دەکرد، ئەو کەسە دەیزانی چۆن پلەی گەرمی نەخۆشێک بگرێ، چۆن حەبی ئەسپرینی بداتێ، چۆن سکچوونی بە خوێن لەگەڵ سکچوونی بێخوێن لەیەک جیا بکاتەوە. ئەم پیاوەی «لێک پۆمە» بۆ زیندانییەکان زۆر گرنگ بوو، ئەمەش وەنەبێ لەبەر مشوورخۆری کابرا، بێ بەوەی ئاگای لە تەندروستی زیندانییەکان دەبێ، بەڵکو لەبەر ڕاسپاردەکەی بوو، ئاخر دەیتوانی زیندانی نێو ئۆردوگاکە بنێرێتە نەخۆشخانەکە. لەوێدا کەسانی «لێک پۆم» هەبوون لە هەموو هەستێکی مرۆیی داشۆرابوون؛ لە ترسی ئەوانی دیکە وەها

بەرانبەر بێهەست و بێ هەڵوێست بوون. زۆر لە پیاوانی «لێک پۆم» سزای درێژکراوەیان لەسەر کاری تێکدەرانەیان دراوە، چونکە زۆر لە زیندانییەکانیان لە کارکردن مۆڵەتداوە، وایان بۆ تێگووشیوون، کە بەم کارەیان زیانیان لە ڕۆنانی کاری سۆشیالیستیانە داوە و ڕێگربوونە لە بەدیهێنانی پلانی دارێژراو.

Dochodiaga - زینـدانییەکی پشـتگوێخراو، ناتوانـا بـۆ کـارکردن. کۆتاییەکەی نزیکبۆتەوە.

Commandant - مشـوورخۆری کۆڵیتە کەسـەکییەکان، بەرپـرس لە پاکوخاوێنیان.

Punkt - "پنت"، ئۆردوگای کار. کورتکراوەی دەستەواژەی - camp lage.

Lag - لەسەر بنەمای داواکاری زۆری یەکەی کارگێڕی، کە پێکهاتبوو لە ژمارەیەک (هەندێک جار سەدان) پنت. لەمەودوا دەبێتە - Pechor Lag کە بـۆ ژمـارەیەکی زۆری ئۆردوگاکـانی نـاوچە بەرفـرەوانەکە درێژدەبێتەوە.

Blat, Pa - Blato, Blatoni– بەرتیـل، فەنـدوفێڵ، توانسـتی چاککردنەوەی شتەکان.

لە ئۆردوگـادا وشـەی جـوێن و نەفـرین هەر نەدەژمێـردران. لەوەتەی مرۆڤ دەمی خۆی کردۆتەوە، شتی وا سەیروسـەمەرەی بەسـەر زاردا نەهـاتووە. نەفرینەکـان هەمیشـە هەر دەربڕینێکی ڕقوکینە، تووڕەیی و دوژمنکـاری نەبـوون. هەنـدێ کـاتی وا هەبـوو، دەربـڕی سـڵاو و بەخێرهێنـان بوون، یـان دەربڕینێک بوو لە پاداشـتی چاکە و پیـاوەتی یاخود دۆستایەتی بوو. Urki ئورکییەکە دەیزانـی چۆن بدوێ؛ مـرۆڤ هەر بە ئاستەم دەیتوانی تێیبگا.

لەو هەمـوو دەسـتەواژانە، نەفرینەکانیـان لە هەموویـان سوودبەخشـتر بوون، بەڵام لە هەمووشیان گرنگتر: Norm, dixi و blat بوون.

جارێکیـان کتێبـی نۆرمەکـانم بینـی. وەک کـۆکەرەوەیەکی خشـتەی لۆگـاریتمی وابـوو. لە ئەستووریشـدا لە ئەنسـکلۆپیدیا دەچـوو. لەسـەر بنەمـای ئەم خشـتانە هەمـوو کـارێکی یەکێتیـی سـۆڤیەتی تێدابوو یـان دەبوو تێدا بێ، ئەوسا چ کارخـانەی دروسـتکردنی تانکەکان بێ یـاخود هەڵکەنـدنی زەوی بـێ لە کارخـانەیەک یـان لە کۆلخۆزێـک. نۆرمەکـانی ئۆردوگـای کـار لەسـەر بنچیـنەی دوازدە سـەعاتی کـاری ڕۆژانە ڕۆنرابوو.

بەشـی ڕۆژانەی دانـراوی ڕاب سـیلا (هێـزی کـار - کـۆیلە) نەدەکـرا مەیسـەر ببـێ، بە دڵنیاییشـەوە ڕۆژانە جێبەجـێ نەدەکـرا! تەنـانەت لای ئەو کەسـانەش، کە لە کـاری دەسـتیش ڕاهـاتبوون. ئەمەش داوای زیـاتری دەکـرد، بەم جـۆرە زینـدانییە سیاسییەکانیشـی گـرتەوە، کە بەشێکی زۆریش لەوان کەسانی ڕۆشنبیر بوون و بەکەڵک هیچ کارێکی جەستەیی نەدەهاتن. بەڵام خۆ نۆرم بە دیکسییەوە بەند بوو، دیکسـیش بڕیـاردەر بـوو ئـاخۆ پیـاو چـۆن خێـرا دەگـاتە ڕاددەی بـێ توانـایی بـێ ئەوەی هیچ هێز و گوڕی کاری تێدا مـابێ و لەو سێبەرەدا بکەوێ و چاوەڕێی کۆتایی مەرگی خۆی بکا. دەبـوایە تەنتالووسـی[142] سـۆڤیەتی دواین تەکـانی بدابایە بەرخـۆی بـۆ ئەوەی هەر هـیچ نەبـێ سـەد گـرام زیـادەی سـەموون و کەوچکێک لە «کاشـا» و هەنـدێک لە «ماخۆرکـا» بـۆ خـۆی حەڵاڵ بکـا. ئەمەش پاداشـتی تەکـانی هێـزی جەسـتەیی خـۆی بـوو، کە خـۆی لەخۆیـدا شـتێکی دژوار بـوو بـۆی. لەوە زیـاتر پاداشـتی دیـکە لە ئـارادا نەبـوو. تەنـانەت پاداشـتەکە بـۆ ئەوانەش نەبـوو، کە

[142]- تەنتالوس Tantalus بیچمێکی ئەفسانەیی گریکی بوو، بە سزادانی ناوخۆیی لە تارتاروس بەناوبانگە. سزاکەشی ئەوەبوو؛ لە چاڵێک دانراوە کە داری میوەی بە سەر سەرەوەیە، بەڵام نەدەمی دەگاتە بەری دارەکە و نە ئاویشی پێدەخورێتەوە.

بەگوێرەی ڕێساکە دەجووڵانەوە، ئەو ڕێسایەی بە نیشانەی بەرز و بە بەردەوامی لەسەر تەختە ڕەشەکەی ئۆردوگاکەمان هەڵواسرابوو: "هەر دوو کرێکارێک دەکرێ دەستکەوتی ڕێژەی سێسەد بەدەستبێنن."

پاداشـــتی تەواوکردنـــی بەشـــە ڕۆژانەی کـــار یـــان تەنـــانەت ڕادەی سەرسامبوونەکەشی، مایەی پەسندنامە نەبوو، هەر ئەوەندە بوو کە کەمتر برسی دەبوو، برسیەتیش لە ئۆردوگاکەدا بە هیچ شتێکی دیکەی نێو زیندان بەراورد نەدەکرا، برسیەتی خۆی دارِسانێک بوو بەتەنیا. لە لوکیشکیدا ئێمە لە ژوور یان لە قاوشی داخراودا دادەنیشتین؛ کەچی لە ئۆردوگاکەدا ئێمە دەچووینەدەر و بۆ شانزە کاتژمێر کارمان دەکرد. کارەکەش پشتشکێن بوو. جەستە لێی داوا دەکردی خۆراکی لە دەمەوە بـــۆ بخەیـــتە ژوور، بەڵام قەرەبـــووکردنەوەکە کەمتـــر بـــوو لەوەی لە زیندانی داخراودا وەرمان دەگرت. ئێمە لە زیندانی لوکیشکیدا بینیمان، برسیەتی چی بە خەڵکی کرد. زەحمەتیش نەبوو بە خەیاڵ بێنینە بەرچاوی، هەرچەندە مەزندەکردنێکی سەختیش بوو، کە برسیەتی چی بەسەر ژیانی ئەو کەسانەدا هێنا، کە لە ئۆردوگاکەدا بە کولەمەرگی دەژیان. لە زیندانی لوکیشکیدا، "تەلەفۆنچیم" بینین، لە سەر کەناری ڕووباری پێچۆرۆشدا ئاژەڵم بینین لەسەر دوو قاچ دەڕۆیشتن. ئای لە برسیەتی ....

پیـاوێکی برسـی لەپێنـاو ئەوەی خـواردنێکی شایسـتەی دەسـتکەوێ ئامادەیی زۆر زیاتری تێدایە لەوەی لە پیاوێک لەپێناو دەوڵەمەندی خۆی ماندوو بکا. لە پێناوی ئەوەی پیاو، کەمتر برسی بێ، ئامادەیی زیاتری تێدایە لەو پیاوەی لەپێناو حاڵخۆشی خۆی هەوڵدەدەدا. ئاخر ئەمە حەز و ئـارەزووی ژیـانە، کە بڕیـار لەسـەر پـلەی هەوڵ و ماندووبوون دەدا. حەزی ژیانیش لە ئۆردوگای کاری چاکسازدا زۆر بەهێز بوو. بەردەوامیش لە پەرەسەندن دابوو. هەرگیز لە کەمی نەدا. بە ڕێـــژەی ئەوەی کە ئەو لەبـــاری شارســـتانەتی دابماڵـــدرێ، ئەو

تەنتالووسـە زینـدانییە ئامـادەیە هەمـوو شـتێک بکـا تـا لە دیکسـی نمـرە یەک بەرەو دیکسی نمرە دوو بڕوا، نەوەک لە نمـرە دووی دیکسـییەوە بەرەو یەکەمیـان پاشـەکشـێ بکـا. بەڵام خـۆ هەمـوو زینـدانییەکیش بە خــۆی ڕانەدەپەرمــوو، ئەو ئەرکە جەســتەییە ئەنجــام بــدا. گوتــارە نیشتمانپەروەرییەکانی سەرپەرشتیاری ئۆردوگا و ڕێنماییدەرەکە هـیچ زینـدانیی نەدەجووڵانـد. ئەوان هەمووﯾـان دەزانـی، هەر نـۆرمە هێـزەی پشـت تێکـڕای تەکانـدانی پیاوەکـان. ئەنجـامەکەش بـلات Blat (بەرتیـل، فەندوفێڵ و چاککردنەوەی شتەکان) بوو.

تیپەکەی ئێمە لە گرووپە نایابەکان نەبوو. تێکڕای دیکسـییەکانمان نمـرە دوو بـوو. کـاری قورسـمان کـرد. خـۆ ئەگەر ئەو پەیوەنـدییە کـاردانەوە ڕۆمانتیکییەشمان بەلاوە نابا، کە دەربڕی ئەوەبوو، هەمـوو زینـدانییەک بـۆی هەیە نـان بخـوا ئەگەر هەر هـیچ کـاریش نەکـا؛ ئەگەر ئـێمە بـۆ سـاتێکیش بـوایە ئەوەمـان لەبەر خـاتری بەڵگەوبەنـدی ئەو دروشـمە شۆڕشگێڕییەی کە دەیگوت ئەوەی کار نەکا نان ناخوا، ئەوا لەگەڵ ئەو ڕەنـجەی بە شـان و بـازووی خۆمـان دەمانـدەدا، شایسـتەی دیکسـی (بەشـە خـۆراکی) خۆمـان بـووین. کەچـی تـا ئەو ڕادەیەی پەیوەنـدی بە نۆرمەوە هەبووبێ، ئێمە خەمـی ئەوەمـان بـوو لە نێو بەرداشـی سـزای دیکسی و دیکسی نمرە یەکدا بهاڕدرێین. هەرچەندە ئێمە بەرەو دیکسـی نمرە ٢ ڕۆیشتین، لە هەندێ بۆنەشدا بەرەو دیکسی نمرە ٣ بە پێوەری پەیژەداری بلات blat.

ئەم پەیـژە هەنگـاوی زۆری هەبـوون. زینـدانیش هەوڵـی دەدا بە باشـی لەگەڵ فەرماندەی تیپەکەی بمێنێتەوە، فەرماندەکەش دەیەویست لەبەر چـاوی سەرپەرشـتیارەکە باشـترینیان بـێ. هەردووکیشـیان هەمـوو شتێکیان دەکرد تـا بەشـەکاری تۆمـار پڕبکەنەوە. کراسـی یەخەداریش لەم دەست بۆ ئەو دەسـت دەڕۆیشـت، لە کاربەدەسـتێکەوە بـۆ یەکێکـی دیکە. هەندێک جاریش پارچە ماخۆرکا (جگەرەیەک) دەربەسـت دەبـوو،

هەنـدێک جـاریش دزینـی وتـارێکی ڕۆژنـامە بە فـیڵەکە ڕادەگەیشـت. هەندێ جاریش ترسی دوولایەنە جیاوازییە نێوان ئەو نۆرمەی حیزب و حکـــوومەت دایاننـــابوو لەگەڵ ئەو کـــارەی ئەنجامـــدرابوو ڕاســـتدەکرایەوە. ئـــاخر لەنێـــو گـــرووپەکەدا کەســـانێک هەبـــوون، سەردەســـتەی گـــرووپەکەش لێیـــان دەترســـا؛ ســـەرتیپ (بریگـــادێر)ی وەهـــاش هەبـــوو لە پـــرۆ ڕاب rab - pro دەترســـا؛ تۆمـــارکەری بەشـــەکاریش کە هەر بە خـۆی زینـدانی بـوو، لە چەنـد کەسـێکی نێـو ئۆردوگاکە دەترسا، کە بە پلە لەخوار خۆیشی بوون. سـەرەنجامەکەش بـلات (بەرتیـل، فەنـدوفێڵ)ـێکی بەردەوامبـوو. ئامارەکـانی سـۆڤیەتیش ڕێژەی دەرچووی ڕاب سیلا Rab - sila ی لەگەڵ سەرەنجامی بلات blat تۆماردەکرد.

ئایـا حکـوومەتی سـۆڤیەتی لە باریـدا نەبـوو ئەو پیلانگێـڕییە گشـتییە نەهێڵـێ؟ نەخێـر، لە توانـادا نەبـوو. لە ڕاسـتیدا، بـلات blat لە کۆتاییـدا دۆزرایەوە، ئەوانـیش حیســـابی هەر مەترێـک خـاک هەڵکەنـدن، هەر لەوحەدار و شیشە ئاسنێکی ڕاکێشراو یاخود هێڵی ئاسنینیان لەسـەر کاغەز دەکرد. ئینجـا بەرپرسـی کرێکـاران دەیاننـاردە ئۆردوگـای کـار و پرۆ ڕاب pro –rab ـەکانیش حوکمی درێژکراوی خۆیـان وەردەگرت. بەڵام خـــۆ «بـــلات - فەنـــدوفێڵ» هەر بەردەوام بـــوو، تـــا کۆتـــایی نەدۆزرایەوە، تـــا ئەوکـــاتیش لەگەڵـــی دەژیـــان. ئەمەش دژبەرییەکـــی ناوخۆیی سیستمی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو. پلەی مرۆڤـی بـۆ ڕادەی لاگەرنـی lagernui، بـۆ ئاسـتی ئـاژەڵێکی بەرگەگـر دابەزاند، بەڵام بە هۆیەوە ئارەزوویێکی گەورەتری بۆ ژیان پێبەخشـی، بەوەی نەخشـــە و حیســـاباتی نووســـەرەکانی پلانـــی بینـــاکردنەوەی دەوڵەت تێکبدا.

دەزگەی ئاسایشـــی کۆمۆنیســـتی ســـۆڤیەتی ڕاســـتەوخۆ بـــڕوای بە سەرپەرشتیاری ئۆتۆنۆمی ڕاب سیلا rab - sila بۆ زیندانییەکان و

بۆ هەموو خەڵکی هەبوو، کە هەموو پلەوپایەکی لاوەکییان لە نێو ئۆردوگادا دەدانێ. ئەنجامەکەشی ئەوە بوو، زیندانییە سیاسییەکان ئەوانەی کراسی یەخەداریان نەبوو، یان نەیان مابوو، بە تەواوی کەوتبوونە بەر ڕەحمەتی زیندانییە تاوانکارەکان، کە خویان بەوە گرتبوو ڕقیان لە ڕۆشنبیران ببێتەوە و ئیدی کوڵی دڵی خۆیان پێدەڕشتن و چێژییان لە سووکایەتیپێکردنیان وەردەگرت. لە جیهانی کۆمۆنیستیدا خەبات بۆ ئەوە دەکرا، زیندانییە سیاسییەکان مافێکی تایبەتمەندانەیان پێبدرێ. کەچی لە یەکێتی سۆڤیەتیدا مافی زیندانی سیاسی پێشێلدەکرا، لەبەیندەبرا، بەڵام شتێک لەوێدا هەبوو، جیاوازی لە نێوان چین و توێژە جیاوازەکانی زیندانی نەکرا. زیندانی سیاسی لە وڵاتی کۆمۆنیستیدا تەنیا ئەم مافەی هەبوو: لە برسیەتی برسیتر بێ، ئاستەکەی بۆ بنی بنەوە داببەزێ.

"ئەرێ فەرماندە، کەسێک شتەکانی لێدزیوم؟"

"کێیە؟"

"نازانم، شتەکانم دیار نەماون."

"کەواتە چیت لە من دەوێ؟ باشە بۆ ئاگات لە شتەکانی خۆت نابێ؟"

"من نوستبووم. ئاگام لەهیچ نەبووە."

"کەواتە خەتا لە کێیە؟ دەبوایە ئاگات لە کەلوپەلەکانی خۆت بوایە."

"ئاخر خۆ تۆ مشوورخۆری، ئەرکی تۆیە خەمی ئەو شتانە بخۆی."

"من هیچ شتێکم نەبینوە، وازم لێبێنە."

ئەم قسە گۆڕینەوەیە لە نێوان من و فەرماندەکەمان ڕوویدا، ئەمەش ڕۆژێک دوای ئەوەی لە ئۆردوگای بێگارییدا چووینە سەر کار. بۆ

بەیانییەکەی گویێم لە زەنگەکە نەبوو. بە هاتوهاواری "دەی هەڵسەوە! هەڵسە وڵسات[143]!" بێدار بوومەوە. چاوەکانم هەڵێنان و سەیرێکی بوخچەکەم کرد، دیاربوو هەندێک بۆ سەریەک خڕببووەوە. هەستمپێکرد، یەکسەر کردمەوە. هیچ گومان نەما، بەشی هەرەزۆری کەلوپەلەکانم نەمابوون.

پێشتر ئەو پاسەوانەی منی گەیاندە لای بەلەمەکەی سەر ڕووباری پێچۆرا ئاگادریکردبوومەوە، کە "ئەوان" هەموو شتێکت دەبەن. بەڵام وەها دەرنەچوو. ئەوان هەر هەموو شتیان نەبردبوو. هێشتا نا ...

ئێمە لەسەر کاری ڕاکێشان و بارکردنی ئاسن بەردەوام بووین. لە دابەزاندنی بارەکە خەریک بوو تەواوببین، دەستمانکرد بە ڕاکێشانی هێڵی قیتار. ئەم کارەشیان سەختتر بوو، بەڵام کارێک بوو بە هەرەوەزی بوو. جۆرە ریتم، تەنانەت جۆرە گاڵتەوگەپێکیش لە کارکردنەکەدا هەبوو.

ئێمە پردێکی ئاسنیمان لە ناو ئاوەکەوە بۆ سەر کەناراوەکە هەڵبەست و دوو کێبڵی پۆڵامان بەیەک بەستەوە. لەگەڵ ئاماژە بۆکردندا، شەش کەس لە هەر دیوێکدا دەبوایە کێبڵەکە بگرن و بەرەو پێشەوە، بەرەو لای کامیونەکە بڕۆن. سەرپەرشتیارەکەش هاواریکرد: "بە یەکەوە". ئێمەش هاوارمانکردەوە "بە یەکەوە!" بەڵام لەگەڵ بەرزکردنەوەی یەکەم، نەفرین و جوێنی ڕووسی دابارین. یەکێک هاواریکرد "بەرزیکەنەوە." "ئەرێ باشە هەی مشەخۆر بۆ ڕایناکێشی؟" یەکێکی دیکەش لەولاوە هەڵیدایێ: "خۆ تۆ ڕایناکێشی، هەی مشەخۆر، هەی کۆرەمار!" یەکێک کێبڵەکە کشتدەکاتەوە، ئەوانی دیکەش پێپێدەکەنن هەروەک باقی بنیادەمەکانی دیکەی سەرجیهان. بە یەکەوە

---

[143]– وڵسات: وڵاخ ئاژەڵ.

بەرزیدەکەینەوە؛ ویڕای ئەو "تێکدانە ناوخۆییەش" هێڵەکە لەسەر زەوی ڕاچێنرا. لەویٚ ئاسنی کەڕوولاڵیش کەوتە بەر تووک و نەفرین.

لەنێو ئەوانەی کێبڵەکەیان بەرزدەکردەوە، یاریدەدەری سەرنووسەری پراڤداشی تێدا بوو. ئەو پیاوە دڵکزە، کە بەردەوام پلەی گەرمی هەر بەرز بوو، لێدانی دڵیشی هەر سوار بوو. ئەمەش لەچاو کارگێڕانی ئەویٚ هیچ مایەی چاوخشاندنەوە بە ڕەوشی کابرا نەبوو. چونکە ڕێسای ئەوان وەها بوو: "ئەوەی کار نەکا، نان ناخوا." «گارین» ئاسنەکەی ڕادەکێشا، خەریکبوو لە بنی بنووشتێتەوە. «ئورکی»یەکش لێی پرسی: "ئەریٚ بەر لەوەی تۆ بێیتە ئێرە، چەندین کەست بەرەو مەرگ نارد؟ ئەوانیش بایی خۆیان بەهێز بوون، بەڵام نەوەک بۆ ئێرە." «گارین»یش نەدەبوایە هیچ بڵیٚ. «ئورکی»یەکە لەسەر بەدقۆستنەوەی ڕەوشەکە بەردەوام بوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، لەسەر خاکی یەکێتیی سۆڤیەتدا، یاریدەدەری سەرنووسەری ڕۆژنامەی پراڤدا هەر وشەی ژهید Zhidی بەگوێدا دەدرا، ئەوسا نەوەک هەر بە پۆلۆنی بەڵکو بە ڕووسیش.

هەر دە ڕۆژێک، هیچ ڕۆژێکی پشوویان نەدەداینی، بەڵام دە شەوی کار! کاری شەو ئێمەی زیاتر دادەهێزراند. لە ماوەی وچانی جگەرەکێشاندا، زۆر لە زیندانییەکان خەویان لێدەکەوت، بە سەرە نێزە و قۆنداغە تفەنگ بێداردەکرانەوە و دەگەڕێنرانەوە سەر کار. لەماوەی شەوەکانی کار - بە شەوە سپییەکانیشەوە - بلات blat لە ڕۆژان زیاتر بوو.

شەوێکیان هەستمکرد لە شوێنی خۆمدا بە نۆرە گەرم دادێم و ساردەبمەوە. بۆ ڕۆژی پاشتر براینە لایpon lek (یاریدەدەری پزیشک)، گارینیشم لەگەڵ بوو. هەردووکمان لە بن سەرپەرشتی پیاوەکەی ئەویٚ پلەی گەرمیمان پێوا. پلەی گەرمیەکەی من خەریک بوو بگاتە ١٠٣. "بگەڕێوە کۆڵیتەکەت" یاریدەدەرەی پزیشکی وەهای

پێگوتم. "ئەمڕۆ مەچۆ بۆ سەر کار." منیش بە حەپەسانەوە پێمگوت؛ "ئەمڕۆ؟ هەر ئەمڕۆ؟". ئەویش وەڵامی دامەوە: "بۆ پێتوایە چەندی دیکە؟"

"ئەوەی دیکە، ئەی ڕەوانەی نەخۆشخانەم نەکردبووی؟ بەیانی وەرەوە دووبارە پلەی گەرمییەکەت دەگرینەوە."

یاریدەدەرەکەی بەسەر گاریندا هاواریکرد؛ "ئەرێ تۆ، ئەوە لەوێ لە لای تێرمۆمەترەکە چی دەکەی لەوێ؟ ئەرێ تۆ ئەوە چییە فێڵم لێدەکەی؟ خۆت شێت مەکە –، هەی ___!"

گارینیش تێرمۆمەترەکەی لە بازندی کردەوە.

"خلیسکا،" گارینیش وەها پێیگوتەوە؛ "من هیچ فێڵت لێناکەم. دەکرێ ئەوە شاهێدی بدا." ئاماژەشی بۆ من کرد، "هەمیشە لە نەخۆشخانە پلەی گەرمیم بەرزبووە، لەوێوە بەو پلە گەرمییە هاتوومەتەوە."

گارین پێویستی بەوە نەبوو، هیچ فێڵێک بکا تا گەرمیپێوەکە پلەی ١٠٠ نیشانبدا. تەنانەت کەسێکی ئاسایش سەیری ڕووناکایی چاوی بکردبایە، دەیزانی نەخۆشە. بەڵام هەروەک ئەوەی حوکمێکی "منداڵانە" (سێ ساڵ)، کەواتە لەوێش پلەی گەرمی "منداڵان" هەبوو؛ کە هەر یەک دوو پلە لەسەرە یان لەژێر سەدەوە بوو. ئەرێ ئەوە چ جۆرە گەرمیپێوێک بوو!

یاریدەرەی داودەرمان بە گارینی گوت؛ "تۆ دەبێ بگەڕێیتەوە سەر کار."

بۆ سێ ڕۆژان من لەبەر شوێنەواری هەوکردنی کێچی قەراغ دەریا، دەسووتام و دەکرووزامەوە. بۆ یەکەم جار لەوەتەی گیرابووم، هەستم بە هەراسانی کرد، بەوەی لە خۆم بێزار ببووم. ئاخر خۆ کەسیش

نەیـدەزانی لە کـوێ بـن خـاک دەکـرێم، ئەم هەسـتە زۆر ئازاریـدام، کەساســی کــردم. لە ڕۆژی چوارەمــدا گەڕامەوە لای یاریــدەدەری پزیشکەکە. هەستم کرد باشتر بوومە. پلەی گەرمی دابەزیبوو، ٩٨ پلەی نیشاندا.

کابراش فەرمانی دا: "ئەمشەو دەچییەوە سەر کار."

"ئەمشەو؟" ئاخر بۆچی، خۆ سێ ڕۆژە پلەی گەرمیم بەرزە! من زۆر بێهێـزم. ڕێـگەم بـدە هەر هـیچ نەبـێ ڕۆژێکـی دیـکەدا لە نێـو جـێگەدا بکەوم؟"

"ناکرێ. دەبێ بگەڕێیتەوە سەر کار."

منیش لەسەر دەردەدڵ بەردەوامبووم. ئینجا یاریدەدەرە پزیشکەکە بە سـەرمدا تەقییەوە (هەرچەنـدە بەبـێ نەفـرەت و سـوکایەتیپێکردن بـوو): "ئەرێ چییـە، پێتـوایە حەزدەکەم بتگەڕێـنمەوە سـەر کـار. خـۆ دەزانـم لاواز و بێهێزی، بەڵام منیش چوار ساڵە زیندانیم و هێشـتا چـوار سـاڵی دیکەشم ماوە. نامەوێ هەشـت سـاڵی دیـکەش بە هـۆی تـۆوە ڕابکێشـم. سەرپەرشتیاری ئۆردوگاکە تێبینی ئەوەی کردووە، مۆڵەتی زۆر کەسـم داوە. ئایا دەزانی ئەمە واتای چی دەگەیەنێ؟ بەیانی بە تـۆمەتی تێکدان تاوانبـارم دەکەن. تـۆ نـامری، منـیش نـامەوێ ڕۆژی بەربـوونەکەم بە هۆی تۆوە بۆ دێژ بکرێتەوە."

چیـبکەم! ئیـدی گەڕامەوە سـەر کـار. سـەرم سـوڕما ئـاخۆ جەسـتەی ئـادەمیزاد چەنـد بەرگەی ئەو ڕەفتـارە پزیشـکییە بگـرێ. بەڵام کـابرای یاریدەدەری پزیشـک (lek pom)ـەکەش لاگێرنـی Lagerni بـوو، پلە نزم بوو، یەکێک بوو لەوانەی دەیزانی چۆن هەستی پێدەکا.

## ١٨

# پەروەردەکردنەوە

**"ئاودەست"**

"هۆی! هۆی ئاودەست! لەوێ بڕۆ!"

ئەوە یەکەمین جارم بوو گوێم لێبێ شتێکی وەها بە یەکێک لە کەسەکانی نێو گرووپەکەم بگوترێ، بە ڕاستی حەپەسام. هەمیشە ئورکییەکان ناو و ناتۆرەیان لە خەڵکی دەنا، زۆربەشیان ناوی سیمای بە دەرەوەی سێکسییان پێوە بوو. ناویان لە من نابوو "ئەچکی Otchki"[144] لەبەرئەوەی چاویلکەم لە چاو بوون. ئەوانی دیکەش لەبەر جزمەی پانی بەرز پێیان دەگوتم "سپراگی spragi". بەڵام "ئاودەست"! کە بیستم زۆرم پێ سەیر بوو، دەرکەوت ناولێنانەکە بە ڕێکەوت نەبووە.

ماخۆی ئەو نازناوە پیاوێکی تەمەن بیست ساڵانە بوو، بۆ ماوەی چوار ساڵ مامۆستا بووە. کاتێکیش کوڕوکاڵ بووە، لە وێستگەیەکی هێڵی ئاسنیندا کاریکردووە. لە تەمەنی شازدەساڵیشدا بە تاوانی تێکدان و وێرانکاری گیراوە.

کاتێک چیرۆکەکەی خۆی بۆ گێرامەوە، لێمپرسی: "ئایا دانت پێدانا؟"

---

[144]- ئەچکی otchki بە ڕووسی واتە چاویلکە.

ئەویش بە ئەوقماوی وەڵامیدامەوە: " ئاخر چۆن دەتوانی دانیپێدانەنێی؟"

ماوەی پەروەردەکردنەوەی لە زینداندا وایلێکرد جۆرە نەخۆشییێک بگرێ، میز بەخۆیدا بکات و ئاگاشی لێنەبێ. ئەوانیش هیچ خۆیان پێوە ماندوونەکرد تا چارەسەری بکەن. هیچ پلەی گەرمیشی نەبوو. ڕاستییەکەی پێویستی بە ئاودەست نەمابوو، تخوونی کاری بێگاریش نەدەکەوت.

خەڵک خۆی لەو بەستەزمانە دەپاراست. هەمووان بێزیان لێدەبووەوە. هەر بەڕاستیش سەخت بوو لە تەکیدا بوەستی. ئەو بوزگوڕەی[145] لەبەریبوو، کە وەک دوولنگە[146] لەپێیدەکردن، تەنانەت ئەو پارچە گوشانەی[147] لەجیاتی پێڵاو، لە پێیدەکردن، هەمیشە تەڕبوون و بۆنێکی زۆر پیسیشی لێدەهات. لەبیرمە بە خەندەوە هەموو ئەو ناووناتۆرە و جوێنانەی پەسنددەکردن. هەر بە ڕاستیش خەندەکەی بە بزەی سەرلێوی گەمژان دەچوو.

من زۆرم دواند. ڕاهاتبوون ئەو قونکە جگەرەی خۆمی بدەمێ، من جگەرەم نەدەکێشا. ئەویش باسوخواسی خۆی بۆ گێڕامەوە. چیرۆکی ئەو نەداری و برسییەتە جەرگبڕەی زێدەکەی لە ئۆکراین، هەی سەردەمی بەکۆمەڵبوونی خۆیانی بۆ کردم. ئەو خۆی شێت نەبوو، سووک و ئاسان لەگەڵ ڕەوشی ژیانی خۆی و لەگەڵ چارەنووسی ڕاهاتبوو.

لە بەرچاوی منیش هێمایەکی "پەروەردەکردنەوە" وەستابوو: پیاوێک ببووە ئاودەست.

---

145– بزگوڕ، جلێکی زۆرشڕووڕ، پینەکراو و دڕاو.

146– دوولنگە: شرواڵ، پانتلۆن.

147– گوش: تەلیس، گونییە.

هاوتەختەبەندەکەم لێیپرسییم: "شتێکی وەهات بینیوە؟"

ئەویش قاچی تا لای ڕەمانەی[148] هەڵکرد. منیش خێرا تەماشایەکم کرد و بە پەلەش ڕووم وەرگێرا. هەر بە ڕاستی پەڵەی سەر ڕانی کابرا شتێکی سادە و سروشتی و بێوەی نەبوو. قەتماغەی پۆرگەکان بە سوورێکی زەردباو هەڵگەڕابوون.

لێمپرسی: "باشە ئەوان سەبارەت بە چارەسەرکردن هیچیان بۆ نەکردی؟"

"ئەمە تسینگا tsingaیە، جێی پێوەدانە." کابرا وەها وەڵامی دامەوە؛ "یاریدەدەرەکەی نەخۆشخانە هەندێ هەتوانی دامێ، بەڵام بێسوود بوو. هەر لەبەر ئەوەشە نامنێرنە نەخۆشخانە."

بەڵێ، پیاوێکم بینی، بەر لەوەی مەرگ چاوەکانی لێکبنێ و بینێنە ژێر خاک، لە جێی خۆی بۆگەنی دەکرد و دەڕزی.

ئەو پیرانەگەیشت بمرێ!

لە کۆلێتەکەمدا کاپتنێکی سوپای سوور هەبوو، گەنجێکی خۆشمەحشەر. بەر لە شۆڕشی حوزەیران لە یەکێک لە یەکەکانی سۆڤیەتی کە لە «لیتوانا» دامەزرابوو، خزمەتیکردبوو.

بەم جۆرە دڵی خۆی بۆ کردمەوە: "ئەوان پێنج ساڵ زیندانییان بۆ بڕیمەوە. ئەوەش هەر لەبەر ئەوەی ماوەی ڕۆیشتنەکەم درێژکردبووەوە، هەر بەڕاستی ڕۆیشتنەکەم بۆ ماوەی بیست و چوار سەعات درێژکردبووەوە. ئاخر ئەوکات لەگەڵ برادەرەکانم بووم.

---

[148] ڕەمانە، ڕان

هەمـوو ئەنگـۆرەیەک دەچـووینە چێشـتخانە جیاجیاکـانی «کۆنڤـۆ» و «ڤیلنـا». کاتەکەمـان بە خۆشـی بەسـەردەبرد. هەمـوو چێشـتخانەکانی ئەوێ خـاوێن و سـەرنجڕاکێش بـوون! پێشـخزمەتەکان بە ڕێـز و بە خۆشییەوە خزمەتیان دەکردین. بەڵێ، هەندێکمان خواردەوە ... من لە گەڕانەوەم هەنـدێ دواکەوتـم، وەریشـم گـرتەوە! لەوێ ئەوان لەوە تێنەگەیشـتن کە پیاوی سۆڤیەتی چەنـدی پێویسـت بە ژیـانێکی تـایبەت هەیە. ئـێمە هەرگیـز تەنیـا نەبـووین. خـواردن؟ ئـێمە لە سـتۆلڤۆکا stolvoka نانمـان دەخـوارد، خواردنیشـی لـێ زۆر بـوو هەروەک کارخـانە بێ وابـوو. لەوێـدا سـەد کەس لە هـۆڵەکەدا بـوون. لە بەردەم مێزەکانـدا دادەنیشـتن، هەمیشـەش هەر پەلەیـان بـوو ..."تەواوت کـرد؟ دەی جێگەت بۆ ئەوانی دیکە چۆڵ بکە." نوستن؟ نوستن لە بەشێکی ناوخۆیی گەورەدا بوو، هەمیشـە پڕ لە کەسانی لایدە بوو. تەنانەت لە ژیانی خێزانیی خۆشماندا شوێنی تایبەتمەندی کەسیی نەمابوو. ئاخر خەیاڵ بۆ ئەوە نەدەچوو، چۆن پیاوێکی سۆڤیەتی بە تەنیابێ، ئەوسا چ لەگەڵ خۆ بێ یان لەگەڵ ماڵباتەکەی بێ. بەڵام چۆن یەکێک دەچێتە نێویەوە؟ بڕوام پێ بکە، ئەو ڕۆژانەی «کۆنڤۆ» و «ڤیلنـا»م باشترین ڕۆژانـی ژیـانم بـوون. ئامـادەم ڕێکەوتنێک لەگەڵ دەسـەڵاتداران بکەم: کاتێک پێنج سـاڵی زیندانییەکەم تەواودەکەم، با لێمگەڕێن لەوێ بژیم، کە زیاتر لە پێنج مانگ لەگەڵ ئەوانـم بەسـەر بـرد، بۆ هەر مانگێک کە لەگەڵ ئەوان بەسەر بەرم، ئامادەم لەباتی ئەو سـاڵێک بچمە زیندانەوە. بەڵێ پێنج ساڵی دیکە تەنیا بۆ پێنج مانگ ژیان لەوێ!"

لە میانەی ئەو گفتوگۆ زۆرانەی نێوانمان لێم پرسی: "ئەرێ چی بەسـەر خێزانەکەتدا هات؟"

"بەر لەوەی بچمە بەرەکـانی جەنـگ لەگەڵ فینلەنـد، ژنـم هێنـابوو. هـیچ منداڵمان نەبوون. هیچیشی بۆ پەرۆش نیم. هەڵبەت ژنەکەم کاتی خۆی

له دەستت نەدا و بە دیار منەوە دانەنیشت. ئەو مێردی کردۆتەوە. ئافرەتەکانیی لای ئێمە لەسەر مێردەکانیان سەری خۆیان سپی ناکەن."

له بۆنه و دانیشتنێکی دیکەدا، دەربارەی جەنگی سۆڤیەت دژی فینلەندییەکان دواین.

کاپتنەکە شتەکانی بەم جۆرەی خوارەوە بۆ ڕوونکردمەوە: "ئەوان بە ئێمەیان گوت، کەوا ئێمە بە بازنەیەک دەوری فینلەندییەکان دەگرین و ئابلۆقەیان دەدەین، کەچی شتەکە وەها نەهاتەوە، ئەوەندە ئاسان نەبوو. ڕابەری سیاسیی سەربازی گوتی؛ شەڕەکە لە نێوان هێزێکی سەربازی کەرتی لینینگرادە لەگەڵ دەوڵەتی فینلەندی، بەڵام خۆ باندۆری شەڕەکە هەموو یەکێتیی سۆڤیەتی گرتەوە. هەر بە هۆی شەڕەکە بەشە ئازووقەی سەرتاسەری وڵاتیش کەمکرایەوە. فینلەندییەکان دەیانزانی چۆن شەڕبکەن. ئەو دێوەزمە سپییانە وا ڕاهاتبوون، لە پڕ لە هێڵەکانی بەرەی جەنگ دەربکەون، لە هەموو لایەکەوە ئاگربارانیان دەکردین، بە سپیپۆشیی خۆیان پیاوەکانی ئێمەیان ترساند. زۆریان لێ بەدیلگرتین. شەڕێکی ئاسان نەبوو، هیچ ئاسان نەبوو. بەڵام دڵنیابووم لە کۆتاییدا ئێمە، فینلەندییەکان تێکدەشکێنین. ئاخر ئێمە بەهێز بووین ... ئەرێ دەزانی چی بەسەر دیلەکانی ئێمە هات؟ فینلەندییەکان ئازادیانکردن، بەڵام ئێمە هەموومان گرتنەوە و لە ژوورێمان ئاخنین. ڕاستە هەر هەمووشیان لە زینداندا نەمانەوە، بەڵام لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەموویاندا کرا، ئاخۆ بۆچی کەوتوونەتە دەستی فینلەندییەکان. ژمارەیەکی زۆریان لەبەر ناپاکی ماوەیەکی زۆر لە زینداندا مانەوە، هەرچەندە هەموو قۆشەنە لەشکرەکە لەبەرەی پێشەوەی جەنگ، خۆی بەدەستەوەدابوو. دواتر سەربازێک لە «لیتوانیا» کە لەوێ خزمەتیدەکرد، ئەو شتانەی بۆ باسکردم. دوای ڕێککەوتنەکە لەگەڵ فینلەندا، کاتێکیش لە دیلیەتی

گەڕابووەوە، سەربازەکە برابووە بەردەم لێکۆڵەرەوە و داوایلێکرابوو چۆنیەتی بەدیلگیرانەکەیان بۆ ڕوونبکاتەوە.

سەربازەکەش وەڵامیدابوونەوە: "جەنابی دادوەری مەدەنی، زۆر ئاسانە. فینلەندییەکان بە تەواوی لە هەموو لایەوەکە گەمارۆیان داین و هەڕەشەیان لێکردین، ئەگەر خۆمان بە دەستەوە نەدەین، ئەوان هەموومان دەکوژن. ئەفسەری فەرماندەیی ئێمەش فەرمانی دا چەک دابنێین. ئێمەش دەستەکانمان بەرزکردنەوە و خۆمان بەدەستەوە دا!"

لێکۆڵەرەوەکەش بەسەریدا نەڕاندی: "تۆ بەم شێوەیە خۆت بەدەستەوە دا، دەبوایە سەری خۆت لە پێناو وڵاتەکەدا دابنابایە!"

سەربازەکەش وەڵامی دابووەوە: "گەورەم، پێڕانەگەیشتم."

گرەوی پێشوەختە

ئەوان پێیاندەگوت ڕدێنسوور. بەهۆی بکوژییەوە زیندانکرابوو. ئەو سەرۆکی «ئورکی» بوو، لەنێو زیندانییە تاوانبارەکان ڕێز و شکۆیەکی بێوێنەی هەبوو. ئەو لووتێکی هەستیاری هەبوو، بۆنی ئەوەی دەکرد ئاخۆ شتە باشەکان لە کامە باول دانراون، ئەو شتانەی لە بارداگرتن و بارکردنەکان لەلایەن ئەفسەر و کاربەدەستانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بۆمان دەهات. کاتێکیش ڕدێنسوورەکە بۆنی شتێکی خۆشی کردبا، ڕێک بەگوێرەی ئەو گوتە ناودارەی کۆمۆنیزمیەی جارانی دەکرد، کە لە حاڵەتی وەهادا چی بکرێ باشە، ئەمەش لە ڕۆژە بەراییەکانی شۆڕشی کۆمۆنیزمی بوو؛ قسەکە وەها بوو: کەمێک لەو شتە ببە، کە زۆرە، بیدەرە زۆر لەوانەی کە کەمیان هەیە یان هەر هیچیان نییە. لەگەڵ ئەوەشدا دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لەم ڕۆژانەی دەسەڵاتی خۆی لە وڵات لەگەڵ

ئەم جـــۆرە دابەشـــکردنە دژەشۆڕشـــییە کـــۆک نەبـــوو. بەڵام خـــۆ ڕدێنسوورەکە سەرباری قانوونەکانی سۆڤیەتی بۆ پرسی دابەشکردن، دەیزانـــی چـــۆن بجـــووڵێتەوە و خـــۆی لـــێ دەربازبکـــا. تەنـــانەت زیندانکەرانیش لێی دەترسان.

شـــەوێکیان ڕدێنســـوورەکە تـــوانی ژمـــارەیەک ســـندووق بشـــکێنی کە قـاورمەی گۆشـتبەرازیان تێدابوو. ئەمیش بـووە مـایەی خۆشـحاڵییێکی زۆر لای ئۆردوگای ئورکییەکان. وێڕای هەموو هەڕەشـە و گوڕەشـە و پاڕانەوەکانی چاودێری ئۆردوگاکە، ئەو دەسـتکەوتە بـووە ئـاهەنگێکی خـۆش لە دەوری ئـاگر. ئەوێ شـەوێ ئورکییەکـان گۆشـتبەرازیان لە سەموون زیاتر هەبوو. تۆ بڵێی ئەو شەوە چەند گۆشـتبەرازییان بۆ بالۆرە نانێک دانابێ! پێشتر ئەوان بۆ ماوەیەکی زۆر سەموونیان بە بێ گۆشت دەخوارد، بۆیە هیچ نەبوو ئەگەر گۆشتبەراز بە بێ نان بخۆن. بێگومـــان هەر ئوکرییەکـــان خۆشـــییان لەو بەتـــاڵانبردنە بینـــی. هـــیچ میواندارییەک لە نێو ئۆردوگاکە لە ئارادا نەبوو.

کاتێـک ئورکییەکـان تێریـان خـوارد و زگیـان پڕکـرد، ڕدێنسـوورەکە چیرۆکێکـی سـەبارەت بە یەکـێ لە سەرپەرشـتیاری ئۆردوگـایەک بـۆ گێڕانەوە:

"ئەو بیژمۆتێک بوو بۆ خۆی،" بەم جۆرە سـەری قسـەی داهێنـا: "ئەو لووتی لە هەموو شتێک دەژەنی. ئەو پیاوی حیزب بوو، خۆتان دەزانن، بـۆ سـۆڤیەتی دایکـی نیشـتمان زۆر دڵسـۆز بـوو. هەمیشـە ئەوەی بەبیردەهێنـاینەوە، کە چەند گەورەییە سوپاسگوزاری حکوومەت بین. پێیگـوتین، ئـێمە دەبـوایە لەسـەری هەمـووان بـدرابایە، بەڵام سـۆز و بەزەیی میریی، خـواردن و خۆراکی بۆ دابین کردین، هەر بۆیە دەبێ ئـێمە منەتبـاری بـین. دەی بـا هەنـدێ باسـی کابراتـان بـۆ بـکەم، کەس نەیدەتوانی بەرتیلی بداتێ و هەڵیبخەڵەتێنێ. لەسـەر بچووکترین شـت دەینـاردییە زیندانی تاکەکەسی، یـان بـۆ ڕەوانەی دادگەی دەکـردین. لە

هاویندا بە ڕووتــی لە دارســتان لە دارێکــی دەبەســتییەوە. ئیـدی بێـنە خەیـاڵی خـۆت مێشـوولە و دەعبـا وردیلەکـان چیـت بەســەردێنن. بەم جـۆرە لەگەڵ کەسـێکی بەدڕەفتـار هەڵمـاننەدەکرد، ئـێمەش بڕیارمانـدا، سەرزەمینی ڕووسیا پێویستی بەو جۆرە کێچە زیانبەخشە نییە. کەواتە چیمان کرد؟ شتێکی زۆر ئاسانمان کرد. کارت کارتانێمان کرد، بەوەش قـایلبووین ئەوەی بـدۆڕێنی، کـارەکە بکـا. بەڵـێ، یەکێـک لە ئـێمە کـارت کارتـانێی دۆڕانـد و ئیدی سەرپەرشـتیارە عەنتـیکەکەش ئاووئـاو چـوو. سووک و ئاسان ون بوو. چۆن یان لە کوێ، ئەوە پرسەکە نەبوو. شتە گـرنگەکە ئەوەبـوو، ئەو نەمـا. ئەوانـیش هەمـوو کـون و قـوژبنێکی بـۆ گەڕان. هەڵبەتە زۆریشی بۆ ماتەمبار بوون. هەڕەشەی ئەوەیان کرد لە دە کەس کە بۆ ئۆردوگای سزادان دەیگوازنەوە، دەیەمەکەی بەر گوللە بـدەن و بکـوژن، بەڵام خـۆ سەرپەرشـتیارەکە لە هـیچ شـوێنێک دیـار نەمـاو نەدۆزرایەوە." (گێـڕانەوەکەی کـابرا زۆر ئـازادانە و جـوولێنەرانە بوو، پڕ لە جوێن و نەفرین بوو).

ژمـارەیەک لە زینـدانییە سیاسـییەکان، لەنێویشـیاندا «گـارین» و خـۆم، خۆمــان لەبەر ئــاگرەکە گەرمــدەکردەوە و گوێمــان لە گەمەی کــارت کارتانێ بوو، کە بۆ بردنەوە نەبوو، بەڵکو بۆ دۆڕاندن بوو؛ بۆ پارە نەبوو، بەڵکو بۆ سەری کابرا بوو.

## ١٩

# ئیتاپ

ڕۆژێکیان پاسەوانەکە کە منی دەبردە سەر ئیش، پێیگوتم: "ئەری تۆ «پۆلاک»ی؟"

"ئەز جووم، بەڵام هاووڵاتییەکی پۆلۆنییم."

"من تێناگەم. هاووڵاتی پۆلۆنی واتا پۆلاک!

"کەواتە چی لەوەدایە پۆلاک بم؟" من وەهام لێپرسی و خۆشم لەوە بە دوور گرت جیاوازی نێوان چەمکی ڕەگەزنامە و هاووڵاتیبوونی بۆ ڕوونبکەمەوە.

"گشت پۆلاکەکان ئازاددەکرێن."

"کێ گوتی"؟ وەهام لێپرسی و لە هیکەوەش ئەژنۆکانم شلبوون.

"من وادەڵێم، ئەگەر منیش بڵێم کەواتە ڕاستە."

"بەڵام کێ پێیگوتی؟" من جەختملێکردەوە.

"واو، دیارە تۆ بڕوا ناکەی؟ زۆر چاکە. ئەوا پێت دەڵێم، لە ڕادیۆ گوێم لێبووە. بەڵێ ڕادیۆکەمان بڵاویکردەوە، هەموو پۆلۆنییەکان بەخشراون

و دەبینی و ئەوان لە جەنگی دژی ئاڵماندا هاوکاریماندەکەن .... چاکە، هەنووکە باوەڕت کرد؟ ڕادیۆی سۆڤیەتی هەر ڕاستی بڵاودەکاتەوە."

بەندوباوی نزیکبوونەوەی ئازادکردنمان وەک ئاگرێکی شێت و هار بەناو ئۆردوگاکەدا بڵاوبووەوە. ئێمەش حەزمان لێبوو بڕوای پێبکەن؛ لەوە زیاتر گومانمان لەسەر نەبوو. دەشترساین لە سەرپەرشتیاری ئۆردوگاکە بپرسین. خۆمان لەوە بەدوورگرت شادمانیی خۆمان بە دەرچوونمان لە ئۆردوگاکە نیشانبدەین. وەها بیرماندەکردەوە، نەبادا ئەو بەندوباوە تەڵە بێ. ئاخر مۆسکۆ زۆر دوور بوو، پێچۆراش نزیک و چارەنووسی ئێمەش بۆ ماوەیەک کەوتبووە بن دەستی سەرپەرشتیار و کارگێڕانی ئۆردوگاکەی ناوچەی پێچۆرا. ئێمە لەسەر ئاسن کێشانەوە بەردەوام بووین. بەشداریشمان لە "کێبڕکێی سۆسیالیزمیانەی" نێوان ئۆردوگاکەمان و ئۆردوگایەکی زیندانی دراوسێدا کرد، کە ڕاهێنەرەکە بە ئامادەبوونی سەرپەرشتیاری ئۆردوگاکە بە جۆشەوە قسەی دەکرد. یەکمان بە ئەوی دیکەمان دەگوتەوە "تۆ بڵێی دیمۆستێنس"[149] هونەری وتاردان لە ڕاهێنەرەکەی ئێمە فێربووبێ، بەڵام بەڕای من دەبوایە ئێمە فێربین هەروەک «هیلۆتس[150]» کاربکەین."

ڕۆژێکیان ڕاهێنەرەکە بە شێوەیەک پێیڕاگەیاندین، کە جۆشوخرۆشی پێوەدیار نەبوو، بەوەی گردبوونەوەیەک بۆ هاوولاتیە پۆلۆنییەکان سازدەکرێ، پۆلۆنییەکانی هەموو ئۆردوگا نزیکەکانیش تێدا بەشداردەبن.

[149] – دیمۆستێنس Demosthenes: (٣٤٨-٣٢٢) پێش زاین، وتاربێژ و دەوڵەتمەداری ئەسینایی. ئەو بە دوانی سیاسی ئاگرین ناسراوبوو.

[150] – هیلۆتس Helots ئەندامی چینی خزمەتگوزاری سپارتای کۆنینە بوو، لەنێوان کۆیلەکان و هاوولاتییەکان نێوەندگیر بوو.

"تۆبڵێی چی لە ئارادابێ؟ چی قەوماوە؟" ئێمەش وەها لە ڕاهێنەرەکەمان پرسی، لە ڕاستیدا ئەویش هەر وەک خۆمان زیندانی بوو. لە وەڵامدا بە ڕووخسارێکی مژدەدەرانە گوتی: "لە دەسەڵاتمدا نییە هیچ زانیارییێکتان بدەمێ. یەکێ لە نوێنەرە هەرە باڵاکان لە کۆبوونەوەکە ئامادە دەبێ و هەموو شتێکتان پێدەڵێ."

لەنێو ئەوانەی لە ئۆردوگا دراوسێکان هاتنە گردبوونەوەکە، ئافرەتێکی تێدابوو. سەرپەرشتیاری ئۆردوگاکەش بە لایدا تێپەڕی و لە پڕێک وەستا و گوتی: "ئایا تۆش پۆلۆنی؟"

ژنەش وەڵامیدایەوە: "بێگومان هەوم. من لە پۆلۆنیا لەدایکبووم. هاونیشتمانی پۆلۆنییم."

سەرپەرشتیارەکەش پێیگوتەوە: "دەیبینین. بەڵام پێدەچێ تۆ بۆ ئەو گردبوونەوەیە نەشێی."

ئافرەتەکە هاوخوێندنم بوو لە زانکۆ. من بەشێوەیەکی تایبەتی نەمدەناسی، بەڵام شتم لە بارەیەوە بیستبوو. ئەو کیژی بازرگانێکی دەوڵەمەندی وارشۆ بوو. کۆمۆنیستێکی بەجۆش بوو، بە توانایەکی ناوازەی هەم جوانی و هەم قسەکردن ناسراو بوو. ئیدی ئەو گوڵەم لەسەر قەراغی ڕووباری پێچۆرادا بینییەوە.

بەر لەوەی کۆبوونەوەکە دەستپێبکا، بە کورتی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕامەوە. بەڵێ ئەو لە وارشۆ هەڵاتبوو، پۆلۆنیای بەجێهێشتبوو. لە ڕێی «دانزیگ»ـەوە توانیبووی خۆی بگەیەنێتە ڕووسیا. ئەرێ ئەو شادمان بوو؟ باشە مرۆ چۆن بتوانێ پرسیارێکی وەها بکا! چما من دەزانم شادمانی چییە؟ تەنیا ئەو ئافرەتە دەیزانی، ئەو دەیزانی شادمانی ڕاستەقینە چییە. ئەو لە مۆسکۆ گیرسابووەوە و نیشتەجێ ببوو. لەوێ هەم خوێندبووی هەم کاریشی کردبوو. مێردی بە

ئەنـــدازیارێکی لاو کردبـــوو. نەخێـــر، مێـــردەکەی جـــوو نەبـــوو، بەڵام پێویست بوو بزانم، کە ژنەکە ئەوکاتەی نەبوو خۆی بە شتگەلێکەوە هەڵواســـێ کە دایکوباوکمـــان هەوڵیانـــدابوو لە مێشـــکمان بیچەقێـــنن. مێـردەکەی خـانم ڕووسـی بـوو. پیـاوێکی نایـاب، زۆر خۆشەویسـت و ژنەکەی خۆی دڵشاد کردبوو. ژیان زۆر خۆش بوو. زانکۆی سۆڤیەتی، ژینگەی سۆڤیەتی، خاکی سۆڤیەت، ئاسمانی سۆڤیەت، هەموو شتێکی سۆڤیەت. ئای چەند خۆش بوو هەوای سۆڤیەت هەڵبمژی!

ئەدی چی ڕوویدا؟ چۆن ئەو ژنە گەیشتە ئۆردوگای زۆرەملێی کاری ئێرە؟ بۆچی گیرا و زیندانی کرا؟ باشتر وایە هەر نەپرسی. ئاخر چی لە پرسەکە دەگۆڕێ؟ خانمەکە لە ١٩٣٧دا گیرابوو. نەشیدەزانی ئاخۆ چـی بەسـەر مێردەکەیـدا هـاتووە. لەوانەیە ئەویـش گیرابـێ. ئەوەش هزرێکی سامناک بوو بۆ ژنەکە. شتەکە واتای ئەوەی دەگەیاند، لەبەر ژنەکە گیرابێ. بەڵام کێ دەیزانی؟ بەڵکو نەشگیرابێ. ژنەکە وەک بڵێی لە پاش بەردی کەڕە بێ، هیچ هەواڵی لێ نەدەزانی. نەخێر، لەو کاتەی گیرابوو، لە هەموو دەنگوباسێکی دابڕابوو. تۆ بڵێی کێ بزانێ ئاخۆ مێـردەکەی لە کـوێ بـوو! ئەرێ هـاوڕێ، تـۆ بڵێـی هێشـتاش پیـاوەکە خۆشی بوێ؟ ....

ئەرێ ئەوە «نائۆمی»ـیە؟ ئەم پرسیارە لێوەکانی بزووانـدم. ئەوە ئەو ژنە بە تەمەنەیە، کە پرچی سپی بووە، چاوەکانی کزبوون. ئەرێ ئەوە ئەو کچە خوێندکارە نازدارە بوو، ئەوەی کاتی خۆی بە لاوی زۆرم لە بارەوە بیستبوو؟

هەڵـــبەتە، ئەو جـــۆرە پرســـیارانەم لێنەکـــردن. لێمپرســـی ئـــاخۆ لە ئۆردووگاکەدا چۆن دەژی، چ کارێک دەکا. لە سەرەتاوە گوتی ژیـان سـەخت بـوو، بەڵام ڕەوشـەکە ئێسـتا زۆر باشـتر بـووە. ئەو ئێسـتا لە ناندین کاردەکا و بە کاروبارەکانی خۆی ڕادەگا ... بەڵام دەیەوێ لێرە دەرچـێ، بە تـــایبەتیش کە ئێســـتا هیـــوایەک پەیـــدابووە. ئـــافرەتەکە

هاووڵاتییێکی پۆلۆنی بوو، هەرواش مابووەوە، هەمووانیش دەیانگوت لێبووردنێکی گشتی بۆ هاووڵاتییە پۆلۆنییەکان دەرچووە.

لە ماوەی ئەو یەک دوو ڕۆژانەی دوایی، لە یەکێ لە زیندانییە دێرینەکانی ئۆردوگاکەم بیست، کە ئافرەتەکە چۆن بە کاروبارەکانی خۆی ڕادەپەڕموو ...

لە گردبوونەوەکەی پۆلۆنییەکان، هاوزیندانییێکی بەدبەخت لە تەنیشتم وەستا بوو، نوێنەری ناوچەی پێچۆرا گوتی، ئەوە ڕاستە، کە پەیماننامەیەک لەنێوان سۆڤیەت و حکوومەتی پۆلۆنیا مۆرکراوە، حکوومەتی ڕووسیاش بڕیاریداوە لێبووردنێکی گشتی بۆ هەموو زیندانییە پۆلۆنییەکان دەربکا. ئەو خۆی پەیماننامەکەی لە ڕۆژنامەی پراڤدا خوێندبووەوە، بەڵام بەڕێوبەری ناوچەی پێچۆرا، هێشتا لێبوردنەکە و ڕێنماییەکانی تایبەت بە ئازادکردنی هاولاتییە پۆلۆنییە زیندانکراوەکان پێنەگەیشتووە. تا ئەو کاتەی ئەو جۆرە ڕێنماییە دەگا، دەبێ زیندانییە پۆلۆنییەکان شان بەشانی زیندانییەکانی دیکەی نێو ئۆردوگاکە کاربکەن. ئەو بۆیە بەتایبەت ئێمەی بانگکردووە تا شتەکەمان بۆ ڕوونبکاتەوە. ئەو خوازیار بوو هیچ بەدحاڵیبوونێک نەیەتەگۆڕێ. ئەو متمانەی بەوە هەبوو، لەو نێوەدا ئێمە بە هەموو تواناmanەوە کاربکەین، کار بۆ یەکێتیی سۆڤیەت و پۆلۆنیا بکەین، کە ئێستا بوونەتە هاوپەیمان و هەردووکیان دژی دوژمنی هاوبەش، دژی ئاڵمانە مرۆڤخۆرەکان لەیەک بەرەی جەنگدان. کاربەدەستە نێردراوەکە گەیشتە ئەو بەرەنجامە بڵێ: "ئیدی کارمان لێرە بەشدارییێکە بۆ سەرکەوتن لە بەرەی جەنگ."

دوای قسەکانی کابرای نوێنەر، سەرپەرشتیاری ئۆردوگا وتارێکی نیشتمانپەروەرانەی دا، لە دوای ئەویش، ڕاهێنەرەکە دووانێکی دیکەی نیشتمانپەروەرانەتری دا، داوایلێکردین لە کێبڕکێی سۆسیالیستانەی

نێوان ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێی پەروەردەکردنەوەدا نموونەیەکی گەشاوە بین بۆ هەموو زیندانییە پۆلۆنییەکان.

لە کۆتاییشدا سەرپەرشتیارەکە پرسی: "هیچ پرسیارێکتان هەیە؟"

ئافرەتەکە دەستی بڵندکرد و لە شوێنی خۆی هەڵسا، ئەوەی پرسی، ئاخۆ لێبوردننامەکە هەر هەموو زیندانیە پۆلۆنییەکان دەگرێتەوە، یان بە تەنیا ئەوانە دەگرێتەوە، کە لە دوای ۱۹۳۹دا گیراون.

سەرپەرشتیارەکەش لە کورتیدا بڕیەوە: "تۆ پۆلۆنی نیت. سەرلەبەری شتەکە هیچ پەیوەندییێکی بە تۆوە نییە."

ژنە بەستەزمانەکەش بێدەنگبوو. کەس نەیدەویست هیچ پرسیارێک بکا. گردبـــوونەکەوەکە کۆتاییهـــات. ئـــێمەش گوێمـــان لە دوانـــی ســـێ « دیمۆستێنس» بوو، سەربارى لێبوردنامەکە گەڕاینەوە سەر کاری زۆرەملێیی ئۆردوگاکە.

دوای یەک دوو هەفتە، دەنگۆیەکی دیکە بەنێو ئۆردوگاکە بڵاوبووەوە. گوتیان گوایە هەندێ لە زیندانییەکان بە «ئیتاپ» دەگوازرێنەوە بۆ ئۆردوگایەکی دیکە. ئەم دەنگۆیە ترسی لە دڵی هەموو زیندانییەک چاند. ئورکییەکانیش هەر بە خووی خۆیان کەوتنە جوێن و نەفرین بارانـدن. بەم جـۆرە نـووزانەوە: "ئەوان ئـێمە بەرەو مەرگ دەبەن." لە بێمرادییـــان لەگەڵ ســـێبەری خۆیـــان بە شـــەڕ دەهـــاتن و یەخەی پاسەوانەکانیان دەگـرت و دەیانپرسـی: "ئەرێ باشـە ئێـوە بـۆ نـاچنە بەرەی پێشـەوەی شـەڕ؟ هـۆی، ئەوە لێرە پاڵەوانێک هەیە؟ ئێوە هەر ئەوەنـدە دەزانـن ئەشـکەنجەی خەڵـک بـدەن، بەڵام خـۆ بەرەی شـەڕ شـــتێکی دیـــکەیە، وەهـــا نیـــیە؟" یاســـاوڵەکانیش بە خـــۆڕکێفکردنەوە وەڵامیانـــدەدانەوە: "هێـــواش، هێـــورببنەوە!" ئورکییەکـــانیش بە تونـــدی شەڕەقســـەیان لەگەڵ دەکـــردن. هەرگیـــز بەم جـــۆرە بە پەشـــێوی و

دەمارگرژییەوە نەمبینیبوون. تەنانەت ڕدێنسوورەکەش جڵەوی خۆی لە دەستدابوو، شێت و هاربوو. وشەی "ئیتاپ" وەک سێبەرێک باڵی خۆی بەسەر ئۆردوگاکەدا کێشابوو.

پشکنینێکی پزیشکییانە بۆ ئەو کەسانەی گواستنەوە بە کۆمەڵەکە دەیانگرتەوە، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە کورتخایەن بوو. سەرسوڕمانەکە لەوەدا بوو، ژمارەیەکی زۆر لە پشکێنراوەکان، سەلامەت دەرچوون و بۆ مەبەستی گواستنەوەکە (ئیتاپەکە) فیت و لەبار بوون. «گارین»یش لە پشکنینەکە بە کابرایەکی ساغوسەلیم دەرچوو. بابای ئاودەستیش بە هەمان شێوە. ئەو پیاوەی ڕانەکانی ئاوسابوون و کێم و خوێنیان لێدەهات و بۆگەنی کردبوو، ئەویش بڕوانامەیەکی ساغ وەک گوێزیان دایە و ڕەگەڵ ئیتاپەکەیان خست.

لەنێو ئەوانەی پشکنینیان بۆ کرا، زیندانییە پۆلۆنییەکانیش بوون. یەکێک لە ئێمە لە سەرپەرشتیارەکەی پرسی، ئاخۆ بۆچی ئێمە خراوینەتە لیستی ئیتاپەکەوە. ئەفسەرەکەش وەڵامیدایەوە، کە لە دەستی ئەوان نەبووە. ئەو ڕێنمایی بۆ هاتووە، ئامادەکاری بۆ کردەی ئیتاپەکە بکا و هیچ ڕێنماییەکی بۆ نەهاتبوو پۆلۆنییەکان لێهەڵببوێرێ، لە ئیتاپەکە ئایەریان بکاتەوە[151]. خۆ ئەگەر بمانەوێ سکاڵا لەو بارەیەوە بکەین، ئەوا ئامادەیە نێردەیەکمان بگەیەنێتە لای دەسەڵات کە تازە نوێنەرێکیان لە مۆسکۆوە گەیشتۆتە ئۆردوگاکە. بە هەموو شێوەیەک، وەک خۆی گوتەنی ئەو شادمانە کە ئێمە ئازاد بکرێین.

هاوڵاتییە پۆلۆنییەکان داوایانکرد من لەگەڵ یەکێ لە ئەفسەرانی سوپا بچمە لای نوێنەرەکەی دەسەڵات. منیش سەرەتا ڕەتمکردەوە. خۆپاراستن و شکۆی نەتەوەیی یەک شتە: ئەویش ئەوەبوو، لەبەردەم دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا وەک قسەکەرێک خۆت

---

151– ئایەرکردنەوە: جیاوازکردنەوە.

بەکەم بزانی، ئەوەیان شتێکی دیکەیە. بەڵام زیندانییە پۆلۆنییەکان هەر سووربوون لەسەر ئەوەی من یەکێک بم لەوانەی دەچنە لای دەسەڵات. ئەوان ڕایانگەیاند: ئاخر لەوانەیە پرسەکە سەبارەت بە ئێمە پرسی ژیان و مردن بێ. دەنا ئەوانی دیکە ئازاددەکرێن و ئێمەش تا مردن لێرەدا دەمێنینەوە." منیش بۆم سەلماندن، لەگەڵ ئەفسەرێکی پۆلۆنی چووینە بەردەم نوێنەری دەسەڵات.

کابرا لە کۆڵێتێکی بچکۆلانەی سەر گردۆڵکەیەک دانیشتبوو، لەو شوێنەی ئۆرکێسترا مارشی کاری بۆ دەژەنین. لە تەنیشتیشی ئافرەتێکی تەمەن مام ناوەندی دانیشتبوو.

دوای ئەوەی سەرپەرشتیاری ئۆردوگاکە ئێمەی پێناساندین، لێیپرسیین: "چییە ئەو هەموو خۆتێکدانەتان لە پای چییەوەیە؟"

منیش پێمگوت، ئێمە هاووڵاتی پۆلۆنیین، داوات لێدەکەین بەڵکو ئیتاپەکە نەمانگرێتەوە. چونکە لێبوردننامەکەمان شتێکی ڕاستییە. زۆری پێناچێ ئازاددەکرێن و دەچین دەجەنگین. باشە لەو حاڵەتدا ئاوەزمەندی چی تێدایە کە بۆ ئیتاپێک بنێردرێینە باکوور، لەو کاتەی لە ئایندەیەکی نزیکدا دەبێ بەرەو باشوور بگەڕێینەوە؟

ئەویش پرسی: "باشە چۆنتان زانی بەرەو باکوور دەڕۆن؟"

"من نازانم؛ لە ئۆردوگاکە ئەو قسەیە دەکەن."

ژنەکەی تەنیشت کابرا کەوتە قسەکردن. دەربارەی پێویستی کاری بیناسازی دووا، باسی ئەوەی کرد چۆن ئەو کارە بنیادنەرانەیەی سۆڤیەتی لە هەموو لایەکەوە هەر سوودی گەیاندووە. ژنەکە وەک «دیمۆستێنس» دەدوا. لە پڕێکەوە هاوکارەکەی قسەی پێبڕی و ئەم وشانەی هەڵڕشتن.

"من له بری حیزبمان دەسەڵاتم پێدراوه، خۆتی تێهەڵمەقورتێنه و زۆریش قسه مەکه."

ئینجا ڕووی له ئێمه کرد و گوتی:

"ئیتاپەکه چارەنووسسازه. لەم ئۆردوگایەدا کاری گونجاو بۆ هەموو زیندانییەک نییه. بەڵام خواست لەسەر کاری بنیادنەرانەی یەکێتیی سۆڤیەت شتێکه دەبێ بەهەند هەڵبگیرێ. ئێمه له شوێنەکانی دیکه پێویستمان به خەڵکی زیاتر هەیه. منیش ئاگام له ڕێککەوتننامەکەی نێوان یەکێتیی سۆڤیەت و حکوومەتی پۆلۆنی هەیه. بەڵێ، حکوومەتی سۆڤیەتی لێبوردننامەی دەرکردووه. بەڵام تا ئێستا هیچ ڕێنوێنییم لەو بارەیەوه به دەست نەگەیشتووه - ئەرێ ئێوه تێدەگەن، ڕێنوێنی فەرمی دەقاودەقم بۆ نەهاتووه - تا هاونیشتمانییه پۆلۆنییەکان ئازادبکەین. هەر بۆیه دەبێ به هەمان چاوی زیندانییەکانی دیکه، ڕەفتارتان لەگەڵ بکەم. لەسەرتانه بۆ کارکردن بچنه شوێنێکی دیکه. بەڵام خەم مەخۆن. ئەگەر فەرمانی ئازادکردنتان گەیشت، به بەلەم دەتانگەڕێنینەوه و دەتان گەیەنینه شوێنی مەبەست، هەموو ئەمەش به گوێرەی ڕێنمایی و ڕاسپاردەکانی حکوومەتی سۆڤیەتی دەبێ."

کاربەدەستەکه داوای ناوی منی کرد، به وەڵامدانەوەشم، دیدارەکەمان کۆتایی پێهات. ڕوون و ئاشکرا بوو، دەبوو خۆمان بۆ ئیتاپەکه ئامادەبکەین.

بەڵام «کرۆل»ی برادەرم هەر دەستەوەستان ڕانەوەستا. ئەو له نەخۆشخانەکەوه هاتبووه ئۆردوگای کار، ئەمەش هەر یەک دوو هەفته دوای ئێمه چووبووینه سەرکار. هەر زوو ببووه سەردەستەی گرووپێک. بۆ ماوەیەک سەردەستەی گرووپەکەی بوو. ئەو "پەیوەندییەکی پیشەییانە"ی لەگەڵ پرۆ ڕاب (چاودێر) و لەگەڵ نووسەری تۆمارنامەی بەشەکار و ئەفسەره ئێشککگرەکانی نێو

ئۆردوگاکەدا پەیداکردبوو. بە هۆی ئەو پەیوەندییانەوە، نەخرابووە نێو لیستی ئەوانەی دەگوازرانەوە، تێکۆشابوو منیش لە لیستەکە دەربهێنێ. مــن هێشــتا کراســێکی یەخەدارم مــابوو، بەڵام ئەمەشــیان دادی نەدا. هەنــدێ لە دۆســـتانی «کــرۆل» پێیــان گوتبــوو، سەرپەرشــتیارەکە پێیراگەیاندبوون، کە بە دڵنیاییەوە «مناحیێم» لە نێو لیستی ئەوانەدایە، کە ئیتــاپەکە دەیــانگرێتەوە. «کــرۆل» حیســابی ئەوەی کردبــوو، بە ئامـادەبوونم لە بەردەم کـابرای بەرپـرس، لەو کـاتەی بە نـوێنەرایەتیی زیندانییە پۆلۆنییەکان قسـەم کردووە، قورِم بۆ خۆم گرتۆتەوە. بەڵام خۆ شـتەکە هـی ئەوە نەبـوو شـینی بۆ بکەی. لە دوو چـوان نەدەبـوو بچـی. منـیش تـا پـێم کـرا دڵـی «کـرۆل»م دایەوە. شـادمانی ئەو بە مـانەوەی لە کەمـپەکە بەهـۆی دەرچـوونی مـن لەگەڵ ئیتـاپەکە شـێوا. منـیش غەمگـین بـووم بەوەی لەو دووردەکەومەوە و بـۆ ئیتــاپەکەش دەنێردرێم.

ئێمە نەماندەزانی وای لێدێ، خۆشبەختییەکەی «کرۆل» وەردەگەڕێ و وەک زۆر جـاران ڕوویـداوە، دەبێـتە بەدبەختـی. ئەو ڕەگەڵ ئیتــاپەکە نەکەوت. هەر لە ئۆردوگــایەکەدا مــــایەوە، بەڵام بـــۆ هەمیشـــە لەوێ مایەوە. گەر هاتبا و زانیارییەکانی فریای بکەوتایە، سواری بەلەمێکی ئیتاپ دەبوو، لەوانەبوو ئێستاش بمابایە ... ئای لەو برادەرە خۆشڕووە دلۆڤان و چاکە. هێشتاش غەمناکی لە چاوەکانی دەبینم، ئەو کاتەی کە سواری بەلەمی ئیتاپ بووم و لە ئۆردوگاکە دووردەکەوتینەوە.

لەوێ لە شـوێنێکی بەسـتەڵکی بـاکووردا، ئێسقانەکانی شـاردراونەتەوە. دەکرێ گەل ناوی «داڤید کرۆل» لەنێو شەهیدەکان، ئەوانەی لە پێناوی زایۆن و ئۆرشەلیمدا سەریان دانا، یاد بکاتەوە.

ئەوان ئێمەیــان چەنــد جارێــک لەســـەر یەک ژمــارد و ژمـــاردەوە. لە کۆتاییدا کراینە پۆل پۆلی کرێکار بۆ ئەنجامدانی داخوازی نەخشـەی دروســـتکارییەکانی ســـۆڤیەت لە شـــوێنێکی دیـــکە. بەڵام نـــۆرمی

ئامادەکاری بۆ ئیتاپ زیاتر گفتار بوو نەوەک کردار. دوای ئەوەی ئێمە لە ئۆردوگـاکە دەرهێنـراین، دەرکەوت ئەو بەلەمەی، کە دانرابـوو ئـێمە باربکـا و بەنێـو پێچـۆرادا بەرەو بـاکوور هەڵبکشـێ، هێشـتا بـۆ سـواربوونی سەرنشـینەکانی ئامـادەنەبوو. بۆ مـاوەی سـێ ڕۆژ و سـێ شـەو ئـێمە لەو گۆڕە، لەسـەر زەوییێکی ڕەقـوتەق مـاینەوە، هەمـوو ئەو خۆراکەی پێشیاندەداین کەمی کرد و مـایەوە سـەموون و ئـاوی سـارد، بەڵام خۆ هەرچۆنێک بێ ئێمە کارمان نەدەکرد. ئێمە وەک تێهەڵدراوێک بـووین. "مـاڵە" نوێکەمـان وەری نەگـرتین، مـاڵە کـۆنەکەش چیـدی نەیدەویستینەوە. شێداری سەرما، تاریکی شەو ڕۆچووبووە نێو مـۆخی ئێسقانەکانمان، لەسەر سەریشمان زەردەی باکوور هەڵدەهات، شتێک، پەرجوویێکی گەردوونی و ڕووناکاییێکی دۆزەخ ئاسا لەسەر زەوی.

دوایین شەو بەر لەوەی ئەوێ جێبێڵـین، هەنـدێ بەزەییـان پێداهاتینەوە، ئێمەیان گەڕانـدەوە ئۆردوگـاکە و ئێمەیـان فڕێدایە نێو کۆڵیتەکـان، هەر هیچـی تێـدا نەبـوو. ئـێمەش خۆمـان لەسـەر تەختەبەنـدەکان درێژکـرد، وەک ئەوەی پێخەفێکی نەرمونـۆڵ و خـۆش بـێ. بـۆنی نـاخۆش کاسـی کـردین؛ پـلەی گەرمییەکەی لە ڕادە بەدەر بـوو. لە ئەزمـوونم دەرسـم وەرگرتبوو، هەرچـی جلوبەرگم بـوو، هەمـوویم لە کەمەرم بەست. بەم جۆرە ئەوەی بۆم مابووەوە پاراستم، ئینجا لێیکەوتمە خەوێ.

سـپێدە داهـات. خۆرسـکانە یەکەمـین نیگـام پەڕییە سـەر پریاسکەکەم، بەڵام خـۆ نەمـابوو! تەنیـا ئەو پەتەی پێـیەوە لە کەمەرم بەسـتبوو، مابووەوە. دیارییەکی دەستی کاری ئورکی. خۆ هیچم بۆ نەمابووەوە، ئیـدی خەمـی چـیم بـوو. یاسـاوڵی بەلەمەکە کـاتی خـۆی کە قسـەی بۆکردم، دەیزانی چی دەڵێ: " دەیبینی، ئەوان هەموو شتێکت بۆ خۆیـان دەبەن." ئەو دەیزانـی. ئەوەش ڕاسـت بـوو ئەوان بە دووجـار بردیـان؛ بەڵام گەسـکیان لێـدا، هەر هەمـوو شـتێکیان بـرد. پاسـەوانی سـۆڤیەتی قانوونپارێز هەموو شتێکی سەبارەت بەو تاڵانوبڕۆیە دەزانی، کە لەنێو

ئۆردوگاکەدا باو بوو. ئەوان هەموو شتێکیان برد، هیچ شتێک بۆ پارێزگاریلێکردن و شاردنەوە نەمابووەوە.

ئەو ڕۆژەی ئورکییەکان منیان لە کەلوپەلەکەم حەساندەوە و هیچیان نەهێشت، برداینە سەر پشتی بەلەمەکە، کە لەنگەرەکەی بە ئاراستەی تەوژمی پێچۆرا دانابوو. ئێمە نزیکەی هەشتسەد پیاو دەبووین، هەندێکیان هی ئۆردوگاکەی ئێمە بوون، ئەوانی دیکەش هی ئۆردوگاکانی دەوروبەر. زۆرینەی سەرنشینەکانیش ئورکی بوون. لەنێو زیندانییە سیاسییەکانیشدا، پۆلۆنی، لیتوانی و ئیستیۆنیش هەبوون. بە «گارین»ینیشەوە ئێمە شەش جوو بووین لەنێو بەلەمەکە. ئەوەش پێکهاتەیەکی مرۆییانەی کارسەر[152] بوو، بە بەراوردیش لەگەڵ زیندانی تەنیایی لوکیشکی سەیران بوو.

ئاخر ئەوان چۆن جێگەی هەشتسەد کەسییان لە ڕووبەرێکی بچکۆلەدا کردەوە، هەر دەبێ زاناکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئەو پرسە ڕوونبکەنەوە. سێ قات تەختەبەند لە پاڵ دیوارە دارینە شێدارەکانیان بۆ هێزی کاری کۆیلەکانی یەکێتیی سۆڤیەت دروستکرابوو. ئەستەم بوو بە پێ بوەستی، ئەستەم بوو بجووڵێی، ئەستەمیش بوو دابنیشی. ئێمە دەبوایە شەو و ڕۆژ هەر ڕابکشێین. بەڵام کێ هەبوو جیاوازی نێوان شەو و ڕۆژانی نێو ئەو تاریکستانەی نێو کەشتییەکەمان پێ بڵێ؟ کەواتە بەم جۆرە بۆ ماوەی سێ هەفتە بەنێو پێچۆرادا ڕۆیشتین. بەرەو باکوور هەڵکشاین تا دنیایەکی نوێ ڕۆبنێین.

ئێمە ئاوی ساردی ڕووبارەکەمان دەخواردەوە. زۆرینەی زیندانییان تووشی پانۆس (سکچوون) هاتن. بەڵام ئەندازیارانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی تەنیا دوو ئاودەستیان بۆ پێویستی هەشتسەد

152– کارسەر carcer : وشەیەکی ڕووسیە بۆ چاوە زیندانی تاکەکەسی. (نووسەر)

کەس لە نێــو بەلەمەکەدا دروســـت کردبـــوو. ئاودەســـتەکانیش دوو تەختەدار بوون لە گۆشـەیەکی تەسکی پشتەوەی سـەر بەلەمەکە. بۆ گەیشـــتنە ئەوێ دەبـــوایە دووکەس دووکەس بە نـــۆرە بە پەیـــژەیەک سەربکەوتباین. ئیدی بە ڕۆژ و شـەو ڕیزی ئاودەست بەتاڵ نەدەبوو. هەندێ لە زیندانییان کە تازە لە ئاودەست دەهاتنە خوارەوە، یەکسـەر دەچوونەوە لە ڕیزی دوواوە ڕیزیاندەگرتەوە، ئاخر پێڕانەدەگەیشتن. پاســەوانەکانی ســەر پشــتی بەلەمەکەش، پلیــان لەســەر پەلاپیــتکەی تفەنگەکانیــان بــوو، فەرمانیــان بە ڕیزبەســتووەکان دەکــرد بجــووڵێن. هاوارییاندەکرد: "دەی خێرا، پەلە بکەن، ببزوون!، دەنا دەبێ ....."

بەڵام خراپترین شت ئەوەبوو، ئوکرییەکان لەنێو زیندانە بە کۆمەڵەکەدا باڵادەســـت بـــوون. لە ئۆردوگاکەشـــدا هەر ئەوان زاڵ بـــوون. ئەوان دەســتیان لە نـۆرم، لە کاروبارەکــان، لە کۆگــا، لە شــوێنی خەوتــن، لە هەموو شتێکدا هەبوو. بەڵام لە خوارەوەی بەلەمی ئیتاپەکەدا دوایین بەربەســتی ئورکییەکــان وەک خــۆی نەمـــابوو. چیــدی ئۆتۆنــۆمی ئورکییەکان لە گۆڕێدا نەبوو، بەڵکو سەربەخۆیی ئورکی هەبوو: حوکم حوکمی تاوانبارەکان بوو بە بێ هیچ جڵەوگرتنێک، حوکمێکی ڕەها.

چەکدارەکەی سـەر پشـتی بەلەمەکە دەسـتی لەسـەر تفەنگەکەی بوو. ئەرکەکەی پاســەوانیکردنی هێــزی کــاری کۆیلەکــان (ڕاب ســیلا) بــوو لەوەی ڕێگر بێ کەس بازبدا و هەڵبێ یان کەسێک بە نیازی خۆکوشتن بازبــداتە نێــو ئــاوە کەســکەکەی پێچــۆرا. پاســەوانەکە خــۆی مانــدوو نەدەکــرد بێــتە نێــو زینــدانییەکان، هەرگیــز نەدەهـــاتەخوار، ئـــاخر بە خۆیشــیان لەو شــتە دەترســان، ئێمەیــان بــۆ ڕەحمەتــی ئورکییەکــان بەجێهێشــتبوو. لە نێــو قــووڵایی هەنــاوی بەلەمەکەدا، بــۆ پیاوەکــانی ڕدێنسـوورەکە زەحـمەت نەبـوو دەوری پاسـەوانەکان بـدەن، زەبرێکـی کوشندەیان لە تەپڵی سەر بدەن و تفەنگەکانیان لێبستێنن و هەر لەوێ ســاردیان بــکەنەوە. هەر بــۆیە هەر ســکاڵایەک بــۆ لای پاســەوانەکان

سەبارەت بە لێدان و شت لێسەندن و زەوتکردن بێ سوود بوو، یاخود بەوەی ئاخۆ بەشە خواردنەکەت دزراوە یان دەستی بەسەرداگیراوە یان بەدڕەفتاریت لەگەڵدا دەکرێ. خۆت و بەختت و ڕەحمەتی ئورکییەکان. ئاخر پاسەوانەکە خۆی لە شتەکان هەڵنەدەقورتاند، لەسەر کەسی هەڵنەدایێ. ئەو نە دەیتوانی و نە حەزیشی لێبوو ئەم کارە بکا. ئەو بۆ خۆی لەسەرەوە بوو، لەسەر پشتی کەشتییەکە و ئورکییەکانیش لە ژێرەوە. خۆ ئەگەر سکالات لە دەست ئورکییەکان کردبایە، ئەوا کێشەت بۆ خۆت پتر دەکرد. لە گەمییەکەی ئیتاپدا لە دەسەڵاتی یاسا و ڕێساکانی سۆڤیەتی هەر تا دووەمین پەیژەی ناو کەشتییەکە دەیخوارد، لەولا بە دواوە قەڵەمڕەوی سەربەخۆی ئورکییەکان بوو.

لە ئیتاپەکەدا کاری زۆرەملێ نەبوو، بۆیە کاتی زۆرمان بەدەستەوە بوو. لەو کاتەدا ئیتاپستەکان کاتیان بە یاریکردن بەسەر دەبرد. سەرەکیترین یاریش یەکێک لەو یاریانە بوو، بەگوێرەی قانوونی سۆڤیەتی قەدەغەبوو، کەچی بەگوێرەی قانوونی بالای ئورکی ڕێگەپێدراو بوو: ئەویش یاری کارت کارتانێ بوو. ئورکییەکان گەمەیان لەسەر هەموو شتێکی بەر ڕۆژدا دەکرد؛ یاریەکەیان لەسەر پارە دەکرد (هەمیشەش پارەیان هەبوو)؛ یاریان لەسەر کەلوپەلی دزراو دەکرد (جارێکیان کە چوومە سەرپشتی بەلەمەکە، دەستوانە فەرووەکەمم لەسەر مێزی یاریەکە بینین، دیاربوو قوماریان لەسەر دەکرد؛ من شتەکەی خۆم بینی و بێدەنگیشم لێکرد)؛ قوماریان لەسەر پێڵاویش دەکرد (بەڵام نەوەک لەسەر کەوشی ئورکییە یاریچییەکان، بەڵکو لەسەر پێڵاوی بەدبەختێکی دیکە ("ڕۆشنبیرێک")؛ جاری وا هەبووە قوماریان لەسەر بەشە خواردنی زیندانییەکانی دیکەش دەکرد.

بەڵام ئەو گەمەی کارت کارتێنە هەمیشە هەر بە خۆشی نەدەهاتەوە. هەندێک جار فرتوفێڵیشی تێدا دەکرا. یەکێک بەوە تاوانباردەکرا کە

فێڵدەکا. یەکێک لێیدەدرا. ئیدی ئورکی دژی ئورکی. تاقم دژی تاقم. جوێن، نەفرین، مشتەکۆڵە، زەبری کوشندە لەچاوی یەکدی شتێکی باو بوو. بەڵام دوای هەموو شتێکیش، ئەوان دەبوونەوە برادەری یەکدی. یەکدیان لە باوەشدەگرت، تۆقەیان لەگەڵ یەک دەکرد و دەستی یەکدییان دەگوشی. سڵاوی نەفرەتی و دۆستایەتی نەفرەتی. ناکۆکییەکەشیان فەرامۆشدەکرد. دەمەقاڵی و ناحەزایەتییان بەسەردەچوو، لە بەین نەدەما. ئامادەکارییەکان بۆ شتێکی نوێ دەکران، بۆ دەستبەسەرداگرتن و تاڵانکاری زیندانییەکانی دیکە.

«ئورکی» گەمەی سەیرسەیریشیان هەبوو. لە هەموویان عەنتیکەتر یاریکردن بوو بە ئەسپێ. ئێمە لە ئۆردوگاکەدا پرسی خاوێنی کراسەکانمان فەرامۆش کردبوو، هەمیشە ئەسپێ لە نێو جلەکانمان ڕێچکەیان دەبەست. پرسەکە هەر پرسی لێڕاهاتن بوو. ئەوان دەیانگوت: "هەر دەبێ لێیڕابێی!" ئەم قسەیە وەک ڕاسپاردەیەک لە زیندانەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا لە زیندانیەک بۆ زیندانێکی دیکە دەگواسترایەوە، قسەکەش نەزۆک نەبوو. ئاخر هەوڵی دەستپێوەگرتن بە خووەکانی شارستانی چ سوودی هەبوو. لەکاتێک تۆ نە فڵچەی ددانت هەبوو - ( ئورکی دەیدزی و هەڵبەتە بۆ خۆیشی بەکاری نەدەهێنا، بەڵکو کارتکارتانێی پێدەکرد) -، دەبوایە لەسەر ئەوە ڕابێی دانەکانت پاکنەکەیتەوە. خۆ ئەگەر لەوێدا نە سابوون تەنانەت ئاویش نەبێ کە بەکاری بهێنی و دەبووایە بە دەستەکانیشت نان بخۆی، ئیدی ڕۆژ بەڕۆژ دەستەکانت چڵکن و پیس دەبوون. کە ئەسپێش دەکەوتنە جل و جەستەت، چیت دەکرد، هەر سەرەتا هەندێک سەخڵەت دەبووی، پاشان لێیڕادەهاتی و دەبووە هێمای دەستەوەستانی خۆت. تەنیا یەکەمین ئەسپێ دەیورووژاندی و بە ترسەوە لە خۆت دەپرسی: "حاڵم بەچی گەیشت؟" پاشان لێی بێباک دەبووی. کاتێکیش ژمارەکەیان پتر دەبوو، چونکە لەو تەختەبەند بۆ ئەویدیکە دەڕۆیشتن، لەو نوێن بۆ ئەوی دیکە، ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان زیاددەبوو، چیدی نەدەبوونە مایەی

بیرلێکردنەوە و سەرپێوەهێشاندن. خۆ ئەگەر شەڕت لەگەڵ کردبان و بەرگریت کردبا، ئەوان دەیانبردەوە. چار نەبوو، هەر دەبوو لێیانڕابێی. ئەوانیش لە تۆ ڕادەهاتن. تۆ دەبوایە لەگەڵیاندا بژی، ئاخر خۆ تۆ دەتەویست بژی، تەنانەت لەگەڵ ئەوانیش بێ.

بەڵام خۆ تەنانەت بۆ کەسێک کە ئەسپێشی تێدا بن، کەسێک لەو کرێگرتە و گۆشتخۆرانەی جەستەی خۆیشی ڕاهاتبێ، بیرۆکەی یاخیبوونی لە هەمبەر ئەسپێی خەڵکی دیکە، ئەسپێی غەوارە هەر لا پەیدادەبێ. ئەرێ ئەوە قێزلێبوونەوەیەکی هەراسانکەرە؟ لەوانەیە. ڕەنگە هەموو شتێک لە دەرەوەی تێگەیشتنی مرۆڤەوە بێ. لە دەرەوەی تێگەیشتنی ئورکییەکەوەیە. ئەوانیش بەو قێزلێبوونەیەوە ڕایاندەبوارد. ئەوان ڕاهاتبوون ئەسپێکان کۆبکەنەوە، هەندێکجار پڕ بە لەپی دەست و لەنێوان کەلێنی نێوان جەستە، دەست و سەروچاوەکانی ئێمەیان دادەنا. ئینجا لە قاتی سەرەوە و خوارەوەی تەختەبەندەکە بە قاقای پێکەنین و هاتوهاوارەوە: "ئەرێ دیارییەکە بە دەست گەیشت؟" تەنانەت قاقایان دەگەیشتە سەری سەرەوەش، کاتێک یەکێ لە ئورکییەکان لەوەدا سەردەکەوت، کە مشتێ ئەسپێ بخاتە نێو جلی یەکێک لە زیندانییە سیاسییەکان کاتێ بۆ ئاودەست بە پەیژەکان بۆ خۆ خاڵیکردنەوە دەچووە سەرەوە.. "دەی لێگەڕێ، با ئەو دەعبا بەستەزمانانە لە سینگی ئەو ڕۆشنبیرە قێزەونانە، هەندێ گەرمبینەوە."

...

لەو کەشوهەوا بۆگەن و تاریکەدا، لەو ژانوناسۆر و بەدرەفتارییەدا، لەو ترسوبیمە سامناکەدا، کێشە و ئاریشەی یاریدەدەری سەرنووسەری «پراڤدا»، کە لە دەست ڕێسا و قانوونی بالاوە کەوتبووە بەردەستی قەڵەمڕەوی ئورکییەکان، ئیدی زگی برسی، نەخۆشی و سووکایەتیپێکردن، وەک کۆیلەیەکی هیچوپووچ گەیشتبووە ئەوپەڕی خۆی. «گارین» هێشتا هەر لە بن ژانوناسۆری شەوانی

لێکۆڵینەوەی زیندانی «تۆمسک» دەینالاند، لەبەر زەبری لێدانەکانی ئەو کابرا شارەزایەی دەیەویست قەفەزی سینگی بشکێنێ، لە هەوڵ و تەکانی خودی ژیان دەینالاند. ئازاریشی لەو دەمەی لە نەخۆشخانەکە دەرکرا، پتر بوو، هەرچەندە پلەی گەرمی دانەدەبەزی و سەربازی دڵکزییەکەشی کەچی هەر ڕایان نەگرت. هێشتا و هێشتا، بە بیستنی وشەی ژهید Zhid (هەی جوولەکە) لە بن ئاسمانی سۆڤیەتی، بەو شێوە کراوە و ڕاشکاوە، بەو شێوە لاقرتێ و ڕقاوییە، زیاتر و زیاتر ئازاری دەکێشا؛ ئەو قسە ڕەقانەیان پێدەگوت، بێئەوەی سزابدرێن، بێ ئەوەی لە هیچ سزایەکیش بترسن. ئەم ئەشکەنجەدانە زیاتر لە پێویست کاری تێکرتبوو، بەرگەی نەهێشتبوو، هی ئەوە نەبوو بەرگەی تاقیکردنەوەیەکی نوێ، بەرگەی تاقیکردنەوەی ئیتاپەکە بگرێ.

ڕۆژێکیان، «گارین» کە هەندێ دوور لە جووە زیندانیەکان کەوتبوو، داوایلێکردم بەڵکو هەندێک لێمنزیکبێتەوە. ئیدی ئەوەی لە تەنیشتم بوو هەندێ جوولا. جێگەی ئەومان کردەوە. «گارین» هات و لەتەنیشتم ڕاکشا.

لە هیکەوە بە سرتەیەکەوە پێیگوتم: "ئەوان دەیانەوێ بمکوژن."

منیش بە حەپەسانەوە لێمپرسییەوە: "کێ دەیەوێ بتکوژێ؟ ئەوە باسی چی دەکەی؟"

"ئەوان دەیانەوێ بمکوژن. من کۆتاییم هات. ئورکی دەیەوێ فتمبکا. تۆ نازانی چی ڕوویدا. دەی با پێت بڵێم. دوێنێ بۆ ئاودەست چوومە سەرەوە. لەوێ پێش بچمە ژوور، ئورکییەکە منی ڕاگرت. پێموایە سەر بە تاقمی ڕدێنسوورەکە بوو. منی بردە قوژبنێک، داوایلێکردم پارەی بدەمێ. پێمگوت هیچ پارەم نییە، ئینجا منی پشکنی. هیچیان نەدۆزییەوە. لێیان دام، تێیان هەڵدام، پڕ شەق و پێلاقەیان کردم. گوتیان هەر دەبێ پارەت هەبێ، دیارە شاردووتەوە. هەر بە ڕاستیش

سێسەد ڕۆبڵ پارەم هەیە. لە سەردەمی زیندانی «تۆمسک»ـەوە هەر لە لامە، خۆ پێم گوتی، لە بیرتە؟ من هەموو ڕۆژەکە هەر پاڵ کەوتووم، لە شوێنی خۆم هەڵنەستاوم. بەڵام بۆ ئێوارە درەنگ، دەبوایە ببزووم. ئاخر لە تەنگاویان لەوە زیاتر خۆم پێڕانەدەگیرا. دەترسام، لەوێ لە دەروازەکەی ئەوێ تێبپەڕم. نەمدەزانی لەوێ لە بۆسە بۆم وەستابوون. بەڵام خۆ چارەشم نەبوو. جانتا بچکۆلەکەی پارەکەشم پێبوو. وەک هەمیشە لە ملم قایمکردبوو. پێموابوو وازیان لێهێناوم، هەقیان بەسەر مندا نەماوە. بەڵام وا نەبوو، منیان پشکنی، خۆ باشتریشە بە بێ پارە بم. ئاخر بەرگەی لێدان و تێهەڵدان ناگرم. نامەوێ ئەوان بمکوژن. ئەوان لەوێ چاوەڕێمدەکەن. ئەوان پرسییان؛ "ئەرێ هێنات؟" منیش جانتا بچکۆلەکەم کردەوە پارەکەم بۆ دەرهێنان. ئەوانیش پڕیاندایە جانتاکە، بە هەموو شتێکەوە بردیان، خەریکبوو ئێسکی ملیشم بشکێ. ئێستاش زۆر ئازاری هەیە. ئینجا لەنێو جانتاکە گەڕان. جانتاکە بەتاڵ بوو. تەنیا تاکە ڕۆبڵێکیشم بۆ خۆم گل نەدایەوە. لێیانپرسیم: "ئەوە هەموویەتی؟ هیچی دیکەت نەماوە؟" منیش پێمگوتنەوە هیچم نەماوە، خۆ ئەگەر باوەڕم پێنەکەن، دێن و شوێنەکەم دەپشکنن. ئەوسا پێم پێکەنین و ڕێگەیاندام بۆ ئاودەستەکە بچمە سەرەوە. بە زەحمەت دەتوانم بچمەوە ئەوێ.

«گارین» بە سرتە و بە هەڵچوونێکی تادارەوە درێژەی بە قسەکانی خۆی دا: "کاتێک لە ئاودەستەکە تەواوبووم و لە پەیژەکان هاتمەخوار، بینیم یاری کارتکارتانێیان دەکرد. یەکێک لەوان هاواری کردمێ، هۆی، خۆ بە پاسەوانەکەت نەگوت؟ هەی کۆمۆنیستی مشەخۆر، هەی کۆرەمار! تۆ خەبەرت لێداین، وایە؟ ئەرێ تۆ تا ئێستا چەند کەست بە گرتن داون، چەندت ڕەوانەی زیندانەکان کردوون؟ ئایا پێتوایە دەتوانی کێشەش بۆ ئەوانەی ئێرە دروستبکەی؟ ئێمە چارت دەکەین ..." بە هەموو جوێنە پیسەکانیانەوە، خۆت دەیزانی ... پێمگوتن کە خەبەرم لێنەداون، بە پاسەوانەکانم نەگوتووە، سوێندم بۆ خواردن وەهام

نەکـــردووە. بەڵام خــۆ ئەوان باوەڕیـــان پێنەکـــردم. پێیـــانگوتم؛ "ئەگەر خەبەرت دابێ، خۆمـان دەزانین چی دەکەیـن." ئینجا وازیـان لێهێنـام و گەڕانەوە سەر بەزمـوڕەزمی یارییەکەی خۆیـان. «مناحیێم وۆلفۆڤیچ»، دڵنیـام ئەوان گــرەو لەســەر کەللەســەری مــن دەکەن. ئایــا چیرۆکــی ڕدێنسوورەکەت لە بیر ماوە؟ ئەوان قومار لەسەر سەری من دەکەن، لەوە خاترجەمم. تەواو، من فەوتام. ئەوان دەمکوژن."

منیش هەوڵمدا ئارامی بکەمەوە.

بە لۆمەکردنەوە پێمگوت: "قسەی وەهـا بێسەروبەر مەکە. ئەوان گرەو لەسـەر سـەری تـۆ نـاکەن، ئەوان قومـار لەسـەر پارەکانت دەکەن. هەر دەیـــانەوێ بتترســـێنن و بەس. نایـــانەوێ خەبەریـــان لێبـــدەی و بە پاسەوانەکان بڵێی. دەی مەترسێ، ئەوان نایانەوێ ئازارت بدەن."

ئەویش هەر بە چرپەوە: "نـا، نەخێر، ئەوان قومـار لەسـەر کەللەسـەری مـــن دەکەن. مـــن لە تـــۆ باشـــتر دەیانناســـم. ئەوان دێـــن و ســـاردم دەکەنەوە[153]!"

دیسـان تێهەڵچوومەوە هێوریبکەمەوە: "ئایا دەزانـی، مـن قسـەم لەگەڵ ڕیشســـوورەکەیان کـــردووە. ئایـــا دەزانـــی ســـەبارەت بەو شـــتانەی لێمدزران، قسەم لەگەڵی کرد، ئەویش گوتی بە دوای پرسەکەدا دەڕوا. لە ڕاستیشدا، لەوە دڵنیام، ئەو بە خۆشی پارچەیەک لەو شتانەی منی لە لایە، بەڵام هەر چۆنێک بێ، ڕەفتاری لە بەرانبەرم خراپ نەبوو. ئەو چەنـدین جـار پێیگوتـووم کە "کوڕەکـانی" پێیـان گوتـووە چەنـدین جـار یـارمەتیم داون، بەتـایبەتی "ئاودەسـتەکە". ئایـا لە بیـرتە ئەو چـۆن لە هەمـبەر ئـورکییە لایـدەکە بەرگـری لێکـردم؟ بەڵێـنت پێـدەدەم، قسـەی لەگەڵ بکەم و بۆی ڕووندەکەمەوە، کە تۆ هیچ شتێکت بە پاسـەوانەکان نەگوتووە."

---

[153]– ساردکردنەوە: ئیدیۆمێکە واتای کوشتن دەدا.

«گارین» وەڵامیدامەوە؛ "نەخێر، ئەوە شتێکی باش نییە. باشتر وایە قسەی لەگەڵ نەکەیت. ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەی، وەها دەزانێ سەبارەت بە پارەکان بۆم باسکردووی، ئەگەر وەهاش بێ ئەوا پێویستە بە پاسەوانەکانیش بڵێم. نەخێر، قسەی لەگەڵ مەکە. من یارمەتیم ناوێ. هەر ئەوەندەم دەوێ ڕەوشەکە پۆلکتر نەبێ."

"سەیرکە!" لە پڕێکەوە «گارین» دەستی گرتم و بەخۆیەوە نووساند، وەک منداڵێکیش دەترسا. "سەیرکە، وا هات، بە خۆی و چەقۆکەی وا بۆم دێ."

منیش تەماشامکرد. لە لای قاتی سەرەوەی تەختەبەندەکە ئورکییەک بە هێواشی دەهاتەخوار. جەستەکەی سێبەرێکی نیمچەتاریکی کەوتبوە سەر. شتێکی لە دەست بوو. لە دوورەوە، لەو تارییکییەدا زەحمەت بزانرێ چییە. دەکرا چەقۆش بێ.

ئورکییەکە لە ئێمە نزیک بووەوە. تەنانەت نیگایەکیشی لە «گارین» نەبڕی. ئەو شتەی دەستی کەوچکێک بوو. بەڵام لەو کاتەدا «گارین» بە تەواوی تۆقیبوو. هەموو هەوڵێکم دا تا ئارامی بکەمەوە. من شاشبوونی ئەوم کردە دەرفەت و وەک بەڵگەوبەندێک بەکارمهێنا، گوایە ئەو سەرچیخچووە، هەڵەیە، بەڵکو بتوانم ترسوبیمەکەی بڕەوێنمەوە. ئینجا ڕووی بابەتەکەم وەرگێرا. دەربارەی وێژەو ئەدەبیات دواین. لەو کاتەوە ئەو منی بەرنەدا. پریاسکە بچکۆلانەکەی هێنایە لای من، لە تەک من لێی ڕاکشا. بە ڕۆژ و شەو هەر لای من مایەوە. ڕاهات لەگەڵ هەڵستان و دانیشتنی من هەڵبستێتەوە و لە هەمان کات بۆ سەرەوە لەگەڵم بێ، یان داوای لێدەکردم لەگەڵی بچم. ئورکییەکە هیچی لەگەڵ ئەودا نەبوو، بەڵام ئەوان لەسەر هەراسانکردنی، لەسەر جوێن و نەفرینەکان و تیروتوانج و هەڕەشەکانیان نەکەوتن. ئەویش هاتبووە سەر ئەو بڕوایە، کە ڕۆژە ڕەشەکەی نزیکبۆتەوە.

ڕۆژێکیان – لەوانەشە شەو بووبێ – بە دەنگی «گارین» لە حاڵەتێکی وەنەوزدانی نیوە نوستوودا بێدار بوومەوە، ئاخر خۆ بەردەوام ئەوێ تاریک و بۆگەن، ئێمەش برسی و کەنەفت و زەبوون بووین.

ئەو بە سرتەوە بانگیکردم: "مناحێم! مناحێم!"

ئەوە یەکەمین جاری بوو بە ناوی ڕاستەوخۆی خۆمەوە، بە بێ ناوهێنانی باوک و پاشناوم بانگم بکا. بۆ یەکەمین جاری بوو بە زمانی یدیشی قسە بکا: "ئەرێ گۆرانی لۆشوڤ Loshuvت لەبیرماوە؟"

منیش هەر بە یدیشی لێمپرسییەوە: "کامە گۆرانی؟"

ئەویش گوتی: "لۆ – شوڤ Lo - Shuv." سەرەتا لێی تێنەگەیشتم، لەوانەیە لەبەر گۆکردنەکەی بووبێ، یان لەبەر ئەوەی بێ هێشتا هەر خەواڵوو بووبم.

لەسەر یەک لێیپرسیمەوە: "چۆن دەبێ نەیزانی؟ ئەو گۆرانییەی زایۆنیستەکان دەیڵێنەوە، ئەوەی زایۆنیستەکان لە «ئۆدیسا» دەیانگوتەوە، ئەو کاتەی هێشتا من هەر منداڵ بووم. لۆ شوڤ، لۆ شەڤ، گۆرانییەکە نازانی؟"

منیش هەر بە شێوە گۆکردنەکەی ئەوەوە گوتم: "ئاها! دیارە مەبەستت هاتیکڤا Hatikva یە."

"لەوانەیە هاتیکڤا بووبێ. ئەوەی لەبیرمە وشەی لۆ – شوڤە."

"بەڵێ، هاتیکڤایە. تۆ مەبەستت گۆرانییەکەی لاشەڤ لێ ئێرتز ئاڤۆتێنو Lashuv le'Eretz Avotenuـە (گۆرانی هیوای گەڕانەوەیە بۆ خاکی باب و باپیران). بێگومان لە بیرمە."

"زۆر باشـە، دەی گـۆرانییەکەم بـۆ بڵـێ. منـاحیێم، دەبینـی، مـن لێـرە بە زیندووی دەرناچم. هەستدەکەی ... " بە دەم ئەم قسانەوە دەستی گرتم و لەسەر سینگی خۆی دانا. دڵی زۆر بە خێرایی لێیدەدا.

"دەبینـــی،" وەهـــا درێـــژەی بە قســـەکەی دا؛ "مـــن پیـــاوێکی فەوتـــاوم. ئورکییەکان گرەو لەسەر سەری من دەکەن، ئەوان دەمکوژن. من لەوە دڵنیـام. بەڵام خـۆ ئەگەر تـۆش ڕاسـت بیـت، خـۆ ئەگەر ڕاسـتیش بـێ، ئەوان نیازیـان هەر ترسـاندنی مـن بـێ، باشــە بە دڵێکـی لەم جـۆرە، چەنـدی دیـکە بەرگەدەگـرم. بە زینـدوویی لێـرە دەرنـاچم. تـۆ پیـاوێکی لەشسـاغی. تـۆ لەگەڵ جووەکـانی دیـکە دای. ئەوان لێبوردننامەیـان بـۆ ئێـوە دەرکـردووە. بەڵکـو لێـرە دەربازتـان بـێ. بەڵکـو ڕۆژێـک تووشـی منداڵەکانی من ببییەوە. کێ دەیزانێ؟ پێیان بڵێ، باسی باوکیان بۆ بکە، هەمـوو شـتێکیان پێبڵـێ. پێیـانبڵێ، مـن هەمیشـە هەر بیـرم لێدەکردنەوە. بەڵام ئێسـتا، لە تـۆم دەوێ، تکـات لێدەکەم لۆشـەڤم بـۆ بڵێـی، گـۆرانی لۆشەڤم بۆ بڵێ."

ئینجـا بە یەکەوە لەگەڵ «مارمێلسـتاین» گـۆرانی هاتیکڤامـان گـوتەوە. سـێ جـوو، لە نزیـک مـن ڕاکشـابوون، ئەوانـیش هـاتنە لامـان. ئێمە بە گـۆکردنێکی ئەشـکەنازییانە، ئەو دەقە بـاوەی بەردەسـتمان بە گـۆرانی گوتەوە. «گـارین»یش بە بێدەنگی گـوێی لێڕاگرتبـوو: "بـۆ گەڕانەوە بـۆ نیشتمانەکە، نیشتمانەکەی باپیرانمان ..."

ئورکییەکە هەڵسایەوە.

"ئەوە جووەکان لەوێ گۆرانی دەڵێن."

ئـورکییێکی چەقاوەسـوو بە پێکەنیـنەوە: "ئەوان نـوێژدەکەن، نـوێژ بـۆ خوداکەیان دەکەن تا یارمەتییان بدا.

ئێمە لەسەر گۆرانییەکەمان بەردەوامبووین: "گوێ لە براکانم بگرە، ئەوانەی لە نیشتمانی پەرچوو دان ... بۆ گەڕانەوە بۆ نیشتمان، نیشتمانی باب و باپیران ..."

بەڵێ ئورکییەکە ڕاستی گوت. ئەوە نوێژ بوو، نەوەک گۆرانی.

کاتێک ئەو نوێژە دانپێدانانەم دەگوتەوە هەستمکرد، گۆرانیەکە لەگەڵ جوویێک دەڵێمەوە، کە وەک منداڵێکی ڕفێندراو بوو، منداڵێک بەرخەکانی لە لەوەڕگایەکی بێگانە دەلەوەڕاند، ونببوو، لەسەر ڕێی هات و نەهات بوو، دوای هەوڵێکی زۆر و دوای کێشەوبێشەیەکی ئاڵۆز، گەڕابووەوە باوەشی خەڵک و دینەکەی خۆی. هەر بە ڕاستیش وایە، ژیان دۆخی وەها دەخوڵقێنێ، کە خەیاڵ هەر پەی پێنەبا. ئێمە لەوێ، لە دۆڵەکەی سێبەری مەرگ، لە نێو ئورکییان، کە هەر نیوە مرۆڤ و نیوەش ئاژەڵ بوون، ڕاکشابووین. «گارین»یشمان لەگەڵدا بوو، کە پێشتر یاریدەدەری سەرنووسەری پراڤدا بوو، کۆمۆنیستێک هەر لە تافی گەنجێتییەوە، کەسێکی نامۆ بە گەلەکەی، دوژمنی زایۆنیزم، ڕاوەدوونەری زایۆنیستەکانیشمان لەگەڵدا بوو. تۆ بڵێی کەی لە ئۆدیسا بۆ دواجار گوێی لە ئاوازی سروودی هاتیکڤا بووبێ؟ کەی بێ بۆ دواجار گاڵتەی بە لۆ شەڤ Lo - shuv کردبێ؟ تۆ بڵێی چی نەکردبێ بۆ ئەوەی "هیوای گەڕانەوە"ی نێو سروودەکە تێکبشکێنێ؟ چی مابوو نەیکردبێ، ئامادەی چی نەبوو نەیکا، بەوەی بگاتە هیواکەی دیکە! نزیکەی بیست و پێنجساڵ بەسەر سەرکەوتنی شۆڕش، بەسەر ئەوەی خەریکبوو خەونەکانی بێنەدی تێپەڕی، بەسەر ئەو شتانە تێپەڕی، کە لەپێناویدا ئازاری زۆری چەشتبوو، بۆ شتێک کە ئامادەبوو گیانی خۆی لەسەر دابنێ، بۆ ئەو شتەی لە پێناویدا خەباتیکرد و ڕەنجیدا. بیست و پێنج ساڵ ... کەچی لێرەش شۆڕش ئاوەها پاداشتی دایەوە، پاداشتی کەسێکی دایەوە، کە بۆی دڵسۆز بوو، پاداشتی یەکێ لە شەڕڤانانی، یەکێ لە سەرکردەکانی خۆی دایەوە: پاداشتەکەش:

ناپـاكیی - دوژمنـی مرۆڤـایەتی - سـیخوڕ - زینـدانیی لە تۆمسـک - دەركـردن لە نەخۆشـخانە - ژهیـدی - كێشـانەوەی ئاسـن، ژهیـدی - ئیتـاپ - ژهیـد - لێـدان و تێهەڵـدان - شــەقخواردن - تـاڵانكردن - هەڕەشەی ئوركی - مەزەی تاڵانچییان - كارت كارتانێ لەسەر سـەری ئەو - یـاری ئەسـپێ - مشـەخۆریی - كۆرەمـاری - تـرس - ژهیـد! كە كـاتی خۆیشـی هـات، پـاش دوایـین دادگەییكـردن و كـوێرەوەی، چـی بەسـەر هـات. باشـە یاریـدەدەری سەرنووسـەری ڕۆژنـامەی پراڤـدا، سكرتێری گشتی پارتی كۆمۆنیستی ئۆكراین چی بۆ خۆی مایەوە؟ چی لەبیرما؟ ئەو تەنیا لۆشەڤی لەبیرمـابوو. "گەڕانەوە بۆ نیشتمانی بـاب و باپیران"، ئەمەش سەبووری دڵنەوایی بوو.

لەوانەشە هەر بۆ یەكەمین جار بێ، لەو كاتەی خەڵكیان بەرەو باكوور دەبرد، پێچۆرا گوێی لە دروودێكی دانپێدانانی سوپاسگوزاری بێ. "ئێمە لە قووڵایی ناخمانەوە هاوار بەرەو خواوەند دەبەین: لاشـوڤ لـێ ئێرتـز ئاڤۆتنیو (گەڕانەوە بەرەو خاكی سۆز)."

بەلەمەكەمـــان بـــۆ چەنـــدین ڕۆژ لە بەنـــدەرێک لەنـــگەری گـــرت. لە دەوروبەریشمان چەندین گەمی دیكە لەنگەریـان گرتبوو. كەشـتیگەلی كۆیلە. هێشتا ماوەیەكی زۆر درێژمـان لە پێش مـابوو، هێشـتا زۆرمـان مـــابوو بگەیـــن، ئاراستەشـــمان هەمیشـــە هەر ڕووەو بـــاكوور بـــوو. كرێكارانی بەندەرەكەش هەروەک ئێمە زیندانی بوون. ئامادەكارییان بۆ بەگەڕخستنی بەلەمەكە دەكرد.

ڕۆژێكیان، پاسەوانێک لە سەرەوە بانگیكرد:

"بێـــــــــــــــــــگن!"

ئەو ئوركییەی لە نزیک دەروازەكە وەستابوو، بانگەكەی لێسـەندەوە و هاواریكرد: "بێـــــــــــگن!"

منیش بانگمکردەوە: "ئەوە منم، لێرەم."

"ناوی خۆت و باوکت؟"

"مناحێم وۆلفۆڤیچ."

"ڕاستە! تەواوە!"

پاسەوانەکە لەسەر خوێندنەوەی ناوەکان، یەک لە دوای یەک بەگوێرەی ئەلفبێیەکەی بەردەوام بوو. کاتێکیش لێبووەوە گوتی: "هەموو ئەو ناوانەی خوێندمەوە، کەلوپەلەکانی خۆتان کۆکەنەوە. فەرمان هاتووە پۆلۆنییەکان بەربدرێن. ئێوە ئازاددەکرێن."

منیش خواحافیزیم لە «گارین» کرد و بەرەو دەروازەکە چووم تا بۆ سەر پشتی بەلەمەکە هەڵبکشێم. من هیچ کەلوپەلێکم نەمابوو. کاتێک ڕۆیشتم، هەوڵمدا باسکم لە چاکەتەکەم هەڵبکێشمەوە. لەو کات یەکێ لە ئورکییە لایەکان سەردەستەی چاکەتەکەی گرتم، دەیویست چاکەتەکەم لەبەر دابکەنێ، یان دەیویست بمگەڕێنێتەوە دواوە. منیش خۆم لە دەست ڕاپسکاند خەریکبوو بە سەر پەیژەکان سەردەکەوتم.

یەکێ لە ئورکییەکان هاواریکرد: "بەڵام خۆ ئەو (ژهیدی) جوولەکەیە، ئەو پۆلۆنی نییە!" منیش نەمدەتوانی جیاوازی نێوان ڕەگەزنامە و هاووڵاتینامەی بۆ ڕوونبکەمەوە. بەڵام دەمتوانی هەستکردنی بخەملێنم. ئاخر هیچ ئیرەییێک وەک ئیرەیی زیندانیی نەبوو، کە دەیبینی ئەو کەسەی تەنیشت خۆی ئازاددەکرێ. ئینجا چوومە سەر پشتی بەلەمەکە. هەر ئەوەندەم زانی، «مارمێلستاین» و باقی جووەکانی دیکە هاتنەسەر و لەتەنیشتم وەستان. ژمارەیەک لە پۆلۆنییەکان بەیەکەوە خڕبووینەوە. ئەو گرووپە زیندانییەی کە ئازاددەکران زۆر قەبە نەبوو.

بەلەمێک لە کەناراوەکە نزیکبووەوە.

"ئامـــادەن؟" یەکــێ لە پیاوەکـــانی بەلەمەکە بـــانگیکرد: "پۆلۆنییەکـــان ئامادەن؟"

پاسـەوانەکەش بـانگیکردەوە: "ئامـادەین، ئامـادەین!"، ئـێمەش لەگەڵیـان هاوارمانکرد "ئامادەین!"

ئیدی هەروەک جاری یەکەم لە دەریاچەی پێچۆرا فەرمانیان پێکردین سواربین، وەهاش لە بەلەمەکە دابەزین. ئێمە لە بەلەمەکە چووینە سـەر بەلەمێکی دیکە تا کەنارەکە، لەوێشـەوە سـواری بەلەمێکی گواسـتنەوە بووین. ئینجا لەوێوە بەرەو باشوور باژۆ.

من بە سووکی سوار بووم، چونکە هیچ پریاسکەم پێنەبوو.

هەسـتمکرد زۆر سـووکم و باڵـدەگرم. ئـاخر گـوێم لە دەنگـی شـەققەی باڵی ئازادی بوو.

## ٢٠

# ئامانج و ئامراز

بەر لەوەی چیرۆکـــی ئەوە بگێـــڕمەوە، چـــۆن ڕووســـیام جێهێشـــت، پـــوختەی ئەو شـــتانە باســـدەکەم، کە لەوێ فێریـــانبووم، ئەوەی لە ئەزمـــوونی کەســـەکی خـــۆم و ئەوانـــی دیـــکەوە فێربـــووم، ئەوەی بە ئۆردوگاکـــانی کـــاری چاکســـازی؛ ئۆردوگـــا زۆرەملێکـــانی ســـۆڤیەتی پەیوەستە.

نووســـەرە سیاســـیەکانی ســـۆڤیەتی بە تـــایبەتی بە شـــانوباڵی دوو تایبەمەندی ئەو ئۆردوگایانە هەڵدەدەن. ئەوان دەنووسـن: "زیندانییەکان لە ڕووسـیا هەروەک زینـدانییەکانی وڵاتە سـەرمایەدارەکان لە بێکاریـدا نـاڕزێنەوە. لێـرە زینـدانی کاردەکـا و بنیـاددەنێ و کـاری بیناسـازیش کەســـایەتییەکەی ڕاســـتدەکاتەوە. خـــاڵی دووهەمـــیش" هەروەک ئەو پروپاگەنـدەچییانە باسـی دەکەن؛ "زینـدانییەکان لە یەکێتیـی سـۆڤیەتیدا ئۆتۆنـۆمییێکی ناوەخۆییـان پێـدەدرێ. ئەوان بە خۆیـان کاروبارەکـانی خۆیـــان ڕێکـــدەخەن. دەســـەڵاتداران تەنیـــا سەرپەرشـــتی پرۆســـەی پەروەردەکـــردن و ئاراســـتەکردنەوەی ژیانیـــان بە کـــارکردنێکی ڕاســـتەقینەوە دەکەن." بەڵام ئەوە کـارێکی نەکـردەیە بـۆ نووسـەرانی سۆڤیەتی تا پەردە لە ڕەوشی کارکردن لە ئۆردوگا زۆرەملێکانیان بۆ جیهـــانی دەرەوە هەڵبـــدەنەوە، ئەوان ئەوە ئاشـــکراناکەن چ جـــۆرە

کەشوهەوایەکی کاریان خوڵقاندووە، چ جۆرە نیشتاک[154]، خۆراک و پۆشاکێکیان دەدەنێ. هەروەها گوتەبێژەکەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیش ئەوەی نەدرکاندووە، ئەو ئۆتۆنۆمییەی ئەوان لە ئۆردوگا زۆرەملێکان باسیدەکەن، لە ڕاستیدا لە ئۆتۆنۆمی ئورکییەکان (زیندانییە تاوانکارەکان) بەلاوەتر هیچ شتێکی دیکە نییە؛ جڵەوبەردانی زیندانییە تاوانکارەکان کە خراپترین نموونەن لە جیهان، بەردەوام یەکیان بەدرەفتاری لەگەڵ ئەوی دیکە دەکا، هەمیشەش بەدرەفتاری لەگەڵ قوربانی هاوبەشی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی خۆیان دەکەن، کە زیندانییە سیاسییەکانن. هەقە نووسەرانی ئەو وەسفنامەی "کار و ئۆتۆنۆمی" لە ئۆردوگاکانی سۆڤیەتیدا بخرێنە ئەو شوێنانەی کە ئێمە لە پێچۆرا بینیمان و لێی بووین، هەقە بخرێنە بەردەستی سەرتاشەکانی زیندانی لوکیشکییەوە.

نووسەرە سیاسییەکانی دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەت وایان دانابوو، هیچ جیاوازییەک لە نێوان ئۆردوگای زۆرەملێی کار و ئۆردوگای زۆرەملێی نازی و ئۆردوگاکانی لەناوبردن نییە. ئەم بەراوردکارییەش دەراوەکەی بۆ مەیلێکی سادەکاری دەگەڕێتەوە، بەڵام ڕاستیش نییە. لەپێناو ڕاستییدا، مرۆ دەبێ جیاوازی لە نێوان ئۆردوگای زۆرەملێی نازی، کە لە ١٩٣٩دا دروستکرا بکا لەگەڵ ئۆردوگاکانی مەرگ، کە لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا دروستکرابوون.

ئۆردوگا زۆرەملێکان لە ئاڵمان، نەمسا، بۆهیمیا، مۆراڤیا و سلۆڤاکیا تا هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهان لە ئۆردوگاکانی کاری سۆڤیەتی خۆشتر بوون. ئەوەشم لە دکتۆرێکی جوو بیست، کە لەسەر لێواری ڕووباری پێچۆرا بینیم، کاتی خۆی بۆ چەندین ساڵ لە «داچاو Dachau» بووە. ئەم دکتۆرە لە چنگی ئۆردوگا زۆرەملێی شوومەکەی ئاڵمان دەربازی ببوو، بڕیاریدابوو بەهەر نرخێک بێ، لە

[154] نیشتاک، جێیوڕێ، شیلتەر، ئەنوا، هەنوان، نشیمەن.

ئاڵمانیای نازی باربکا. دوای هەڵگیرسانی جەنگەکە و ڕووخان و دابەشکردنی پۆلۆنیا، دکتۆرەکە هێڵی سنووری نێوان ئاڵمان و ڕووسیا دەبڕێ و خۆی دەگەیەنێتە بن قەڵەمڕەوی یەکێتیی سۆڤیەت، وەک کەسێکی ڕاوەدوونراو کە هەڵوەدای هەنوانێکە داوای خۆی پێشکەش بە کاربەدەستانی سۆڤیەتی دەکا. بەڵام هەروەک هەزاران جووی چەوسێنراو و ڕاوەدوونراو کە بە دزییەوە سنوورەکەیان بەزاندبوو، لە دیوەکەی دیکە هەر هەموویان دەگیرێن، ئینجا لە زیندان پێیدەڵێن دەبێ دانی پێدابنێ، بەوەی کاری بۆ دەزگەی نهێنی ئاڵمان کردووە و هەر ئەوانیش بە کاری سیخوڕێتی ناردوویانەتە یەکێتیی سۆڤیەت، لەسەر ئەمەش حوکمی پێنج ساڵ زیندانییان بۆ بڕیبووەوە. کەواتە چارەنووس یان دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئێمەی گەیاندە هەر هەمان ئۆردوگای زۆرەملێی کار. ئەمەی خوارەوەش، ئەو سەربردەیە کە دکتۆرە جووەکە بۆی گێڕامەوە:

"من لە «داچاو» بووم. ئێمە لە چاککردنی ڕێگەوبان کارماندەکرد. کارەکە قورسبوو، بەڵام هەر هەشت سەعات لە ڕۆژێکدا کارماندەکرد. بەڵێ هەندێ جار چاودێرەکە ڕاهاتبوو زللەیەک لە دەموچاوم بداو دەیگوت: بەرازەجوو. ئەمەش شتێکی سامناک بوو. بەڵام ئەدی ڕۆژانە ئورکییەکان لەم ئۆردوگایەدا ناڵێن؛ 'جووە کێچ، جووە ئەسپێ'؟ ئەدی ئەوان تێمهەڵنادەن؟ ئایا پێتوانییە جیاوازییەکی زۆر هەیە ئەگەر هاتوو زیندانیکەر لێت بدا یان بەدڕەفتاریت لەگەڵدا بکا یان زیندانییەکی تاوانکار ئەوە بکا؟ لەوێ من پێخەفێکی خاوێنم هەبوو. سابوونم بۆ شوشتن هەبوو، فلچەی ددانم هەبوو، جلی ژێرەوەم پاک بوون، جلی گەرمم بۆ زستان هەبوون. هەموو کاتێک پەیوەندییم لەگەڵ خاوخێزانم هەبوو. من نامەم دەناردن. لەوێ برسی نەبووم. پێویستیش ناکا پێتبڵێم چەند ڕقم لەو ئاڵمانە نەفرەتییانە بوو. بەڵام کە هاتمە ئێرە، هاتمە نێو ئەو زۆنگاوە بۆگەنە، کاتێک جەستەم دەپشکنم، کاتێک حەزم دەچێتە پارچە نانی زیاتر، هەندێ جار هزری سەیر و سامناک لە

کەلـــلەم دەدا. پێیلێــدەنێم کە بیــرۆکەی ســـاماناکن، بەڵام ناشـــتوانم لە بەردەم تۆدا پەردەپۆشیان بکەم. ئەگەر بژاردەی ئەوەم بدەنە دەست، ئاخۆ کامەیان هەڵبژێرم، ئۆردوگای زۆرەملێی کاری دەریاچەی پێچۆرا یان هی داچاو، ئەوا هی داچاو لێدەگرم."

هەر بەڕاســتیش هزرێکــی نــاخۆش و ســاماناک بــوو؛ بەڵام خــۆ ئەو دانپێدانانەی کەمتر نەبوو لە ڕیسواکردنێکی یەکێتیی سۆڤیەت.

لە ســییەکاندا، ئەڵمانەکــان تەنیــا چرنــووکی خۆیــان نمایشــکرد. لە چلەکانیشـــدا، کەڵبەکانیــان بە جەســـتەی خەڵکــی جــوو تیژکــردنەوە. ئاڵمانەکـان بە وردەکـاری تەواوەوە، ژووری گـاز، فرنـی سـووتاندن و توونی مەرگییان دامەزراند. بە ملیۆنان لە ژنان و پیاوانیان فڕێدانە نێو تــوونی مەرگەوە، لە نێویشــیاندا یەک ملیــۆن و نیــو منــداڵ هەبــوون. کارخــانەی Sons & Trpf لە شــاری ئێرفــورت بە خۆشــییەوە بــۆ ڕۆژنامەوانـانی ئاڵمـانی و حکوومەتەکەی ڕایگەیانـد؛ ئـامێرێکی نوێیـان داهێنـاوە، بە هـۆیەوە جەسـتەکان بە شـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی خێراتـر دەخەنە نێـو فرنییەکـانی تـونی مەرگەوە. کارخـانەیەکی دیکەی ئاڵمـان، دەزگەیەکــی دیــکەی خســتەڕوو کە ئێســقانەکانی مرۆڤــی دەهــاڕن و دەیکـردە ئـارد و مەزنـدەی ئەوەی کـرد بەو وردەکـارییە ئەڵمانیـانەی خۆیـان، دەزگەکە دەتـوانێ لە سـەعاتێکدا چـوار مەتـر سـێجا ئێسـقانی بنیادەم بهاڕێ. ئاڵمانەکان لە ئێسکوپروسکی جوو ئاردیان دروستکرد، لە جەستەی جووەکان سابوون و بە دیاریشـیان بۆ ژنەکانیـان دەنـارد؛ پێچکەی کورسییەکان بە پرچی دایک و کیژە جووەکان پڕدەکردنەوە. بەم شێوەیە شەش ملیۆن جوو فەوتـان. هەرگیـز پێشـتر لەو ڕۆژەوەی ئـادەمیزاد پێینـاوەتە سـەر ئەم جیهـانە، ئەم جـۆرە قڕکـردنە زانسـتییە نەبیندرابوو؛ کێفەرات و دڕندایەتی لەم جۆرە وەک هیچ نەبووە و نییە، لە «کــالیگۆلاوە» بگــرە تــا «تەیمورلەنــگ» و «جەنگیزخــان»، تــا «تۆرکیومــادا» و «دژیرینکســی» وێــنەی نەبــوو. هەر لە بەر خــاتری

ڕاستیشدا و لە یادەوەری شەش ملیۆن مردووەکانمان، ئۆردوگای زۆرەملێی قڕکردنی ئاڵمان، نابێ بەهیچ جۆرە ئۆردوگایەکی دیکە بەراوردبکرێ، بە ئۆردوگای زۆرەملێی کاری سۆڤیەتییشەوە[155].

ئۆردوگاکانی قڕکردنی ئاڵمان و ئۆردوگا زۆرەملێکانی کاری ڕووسی، یەکیان لەوی دی بەدتر بوو، کاری دەستی ئەهریمەن بوون. بەڵام خۆ ئەهریمەنیش لە کارکردندا هەمەچەشنەیە. جیاوازی لە نێوان ئۆردوگاکانی مەرگ لە ئاڵمان و ئۆردوگاکانی زۆرەملێی کاری سۆڤیەتی لە یەک وشەی بچوک دابوو، هەموو جیاوازی جیهانیشی دەگرتەوە، ئەویش: هیوا بوو. ئۆردوگاکانی قڕکردنی ئاڵمان هیچ ڕوانگە و دەرەتانێکی ژیانیان بۆ قوربانییەکان نەدەهێشتەوە؛ زیندانییەکانی ئۆردوگا زۆرەملێکانی کاری سۆڤیەتیش ئەو جۆرە دەرفەتەی تێدا مابوو. لە زۆر دۆزیشدا دەرفەتەکە زۆر بچووک بوو، بەڵام خۆ سووکە تروسکاییەک بۆ دەرفەتەکە هەر هەبوو.

لە هەموو ئەو چیرۆکانەی هاوزیندانییەکەم، کۆنە ئەفسەرەکە، لە چاوە زیندانە تەسکەکەی «لوکیشکی» بۆی گێڕامەوە، یەکێکیان باسی "قانوونی دەرفەت"ی دەکرد، کە بەسەر هەموو ڕاوکەرەکاندا پەیڕەودەبێ، زۆر سەرنجی ڕاکێشام. ڕاوکەرەکە دەکرێ بۆ ماوەی چەندین مایل بەنێو لێڕەکەدا بڕوا؛ دەکرێ تا سەر چۆکان بکەوێتە نێو قوڕاو و سیان، سینگی هەمووی بە قوڕ بێ؛ دەکرێ لە بن باران هەموو جەستەی تەڕ ببێ، هیچ شوێنێکی وشکی نەمێنێ، و لە سەرماش هەڵبلەرزێ - خەڵکی واش هەیە حەز لەو جۆرە یارییە دەکا - تا ئەو کاتەی دەگاتە شوێنێک، باڵندەیەک بەری سێرەی تفەنگەکەی لە نێچیرەکەی گرتووە. ئینجا ڕاوکەرەکە سێرەی لێدەگرێ. ئەو هێشتا

[155]- ئەمە بۆ دۆخی ئێمەش هەر ڕاستە، بەو پێودانگە ئەنفال و هەڵەبجە نموونەی حاشاهەڵنەگرن. دەکرا لەعێراق و کوردستانیش قانوونی وا بۆ بەتاوانبارکردنی هەرکەسێ نکوولی لێکردبا و خستبایە بەر پرسیار دەرچووبا، تا کەس زاتینەکردبا دەمشڕییەکی وا بکا.

چاوی لە سەر جاسووسەی تفەنگەکەیەتی، کەچی هێشتا پەنجەی پەلاپیتکەکەی نەهێناوەتەوە. ئەو لە ڕێیەکی دوورەوە هاتووە، نێچیرەکەش لە بەردەم دایە؛ ئەگەر تەقەی لێنەکات لەوانەیە دەرفەتێکی دیکەی وەهای بۆ هەڵنەکەوێتەوە. بەڵام نێچیروان چاوەڕێ دەکا، تەقەناکا. چونکە باڵندەکە لەسەر زەوییەکە، لە کەناری ئاوەکە، لەسەر لقی دارەکە هەڵنیشتۆتەوە. تەنیا ئەو کاتەی مەلەکە لە شەقەی باڵەکانی دەدا، ئەوکات دەرفەتی دەبێ ڕاوکەرەکە پل لە سەر پەلاپیتکەکە بگیرسێنێ و تەقەبکا. ئەگەر هاتوو لە نێچیرەکەی بدا و نیشانەکەی بشکێنێ، ئەوا بۆی دەبێ؛ ئەگەر لێشی نەدا ئەوا بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە و مەلەکەش دەفڕێ. ئەمەش قانوونی ڕاوکردنە.

دەی با ئەوە نەگوترێ، تەنانەت ئەگەر جیاوازیش لە نێوان ڕاوکەرانی ئادەمیزاددا هەبێ، ئەوەی نێچیرەکەی ڕاستەوخۆ لەبەر سێرەی مەرگ دادەنێ، لە کاتێکدا هەن ئەوانەی هەندێ دەرفەت بە قوربانییەکەیان دەدەن بەڵکو ڕزگاربێ، بەڵام لێرەدا هیچ جیاوازییێک لە نێو خودی گۆشەنیگای قوربانییەکاندا نییە، ئاخر هەر ڕاوکەرێکی دڵڕەق بوو، ئەوی بەو دەردە برد. هەروەها با لێنەگەڕێن و ئەوەش بگوترێ، ئەوانەی دەمودەست کوژران باشتر ڕزگاربوون. ئاخر ئۆردوگاکانی «هیملەر» ئۆردوگای دەستبەجێی قڕکردنی ڕاستەوخۆ و یەکسەر بوون، ئۆردوگاکانی «بێریاش»، سەرجەمیان ئۆردوگای مەرگێکی هێواش بوون. پێدەچێ مەرگی دوای ئەشکەنجەدانێکی کورت، بە باشتر بزانرێ لە مەرگێک، دوای ئەشکەنجەدانێکی درێژخایەن. بەڵام خۆ پرسەکە ئەوە نییە. پرسی دەرفەتی ڕزگاربوون، دەرفەتی مانەوە لێرەدا دەیخوا. ئەگەر هاتبا و شەش ملیۆن جووی ئەورووپا هەموویان بۆ دارستانی «ئارچئانگل»، یان بۆ کانە خەڵووزەکانی «ڤاکورتا»، یاخود بۆ کانەکانی زێڕ لە «کۆلیما» یان کانەکانی مس لە «ئورالس» نێردرابان، ڕەنگبوو چارەکێک یان سێیەکی ژمارەکەیان تەنانەت نیوەشیان هەر نەگەڕابانایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەو حاڵەشدا، خۆ ئێستا

ژمارەی گەلەکەمان نەوەک هەر یازدە بەڵکو خۆی لە چواردە یان پازدە بەڵکو شازدە ملیۆنیش دەدا. پزیشکە بەدبەختەکە کە لە دەستی ستەمکارێک کەوتبووە بن دەستی ستەمکارێکی دیکە، بەلایەنی کەمییەوە وەهای خۆ ئامادەکردبوو، وەک ئەو گوتی دەریاچەی پێچۆرای بە «داچاو» گۆڕیبووەوە؛ بە دڵنیاییەوە خۆی بۆ ئەوە ئامادە نەکردبوو «ڤاکورتا» بە «ئاوشویتز» بگۆڕێتەوە.

ئایا جیاوازی نێوان ئۆردوگاکانی ئاڵمان و ڕووسیا لەو ڕاستیەدا خۆی دەبینێتەوە، کە ئەفسەرەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی کەمتر دەلڕەق پتر لایەنی مرۆڤایەتیان لە «ئێس ئێس»ـەکانی ئاڵمان بەسەردا زاڵ بێ؟ مرۆ ناتوانێ گریمانەیەکی وەها بکا. وشەی "بەزەیی" لە قامووسی یەکەمیان و دووەمیان دەرهاتووە، یاخود وشەی "بە بێ" وەک پێشگرێکی بۆ زیادکراوە و بۆتە دەستەواژەی "بێ بەزەیی". وشەی Angriff (هێرش) وەربگرە، تا ڕاددەیەک لە هەموو پرسێکدا دەیدۆزییەوە، چەندین جار لە دەربڕینی وشەی rü cksichtslos دەیدۆزییەوە. وشەی پراڤدا بگرە، تۆ جار لەسەر جار لە دەربڕینی bez – poshchadno دەیدۆزییەوە. هەردووکیان یەک وشەن واتای "بێ بەزەیی" دەگەیەنن.

هەر بەڕێکەوت نییە دەسەڵاتدانی هەردوولا، هی ئاڵمان و ڕووسیا لە بانگخوازانی دروشمی "بەبێ بەزەیی"ـین، هەوڵیانداوە کۆتایی بە بڕوابوون بە خودا بێنن، دوای ئەوەی واتای وشەکەیان لە نێو دڵی خۆیان دەرهێناوە. هەموو بڕوایەکی ئایینی بانگی بەزەیی هەڵدەدا، هەرچەندە هەمووشیان بە گوێرەی بانگهەڵدانەکە بەڕێوە نەڕۆن. جزوێتی (یەسوعی)ـیەکان[156] قسەیان دەربارەی بەزەیی کرد و

[156]– جزوییتەکان Jesuits: ئەندامە کۆمەڵگەی عیسایییە کە پەیڕەوی کاسۆلیکی ڕۆمییە لەسەر دەستی سێنت ئیگناتیوس لۆیۆلا، سێنت فرانسیس خاڤیر و ئەوانی دیکە لە ١٥٣٤ وەک ئەرکێکی کەنیسەیی دامەزرا. بە توندی دژی چاکسازی دینی وەستانەوە. وێڕای

دادگەی پشکنینیشیان دانا. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ، لە بن بانگخوازی بەزەییانەی ئەواندا، ئەو ئاژەڵەی نێو مرۆڤ جڵەوکرا و کردەوەکانی سنووردارکرد، ئەگەرچی بە تەواویش ڕێی لە کردەوەی دڕندانە نەگرت. لەگەڵ ئەوەش، لەو شوێنەی کە هیچ بانگهەڵدانێکی بۆ بەزەیی تێدا نەبێ، هیچ بڕوابوون بە خوای بەزەیی نەبێ، و هاواری "بێ بەزەییانە" شەو ڕۆژ ببیسترێ، ئەوا ئاکامەکەی ڕاوەدوونانی مرۆڤ بە هەبوون و بە نەبوونی دەرفەتی ڕزگاربوون؛ ئۆردوگاکانی قڕکردنی دەمودەست و بە یەکجارە یاخود ئۆردوگاکانی مەرگی هێواش دێنێتە بەرهەم.

جیاوازی نێوان ئەوان بە وشەی "بەزەیی" بڕیاری لەسەر نادرێ، بەڵکو بە کورتکراوەی دەستەواژەی (راب سیلا / هێزی کاری کۆیلە). ئۆردوگای زۆرەملێ کار هێزی پیاو ڕادەخا.

پۆل پۆل حەشاماتی زیندانییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت، شتی هەرەنایابیان لە شوێنە دوورە دەستەکاندا دروستکرد. ڕێگەی ئاسنینی کۆتلاس - ڤارکوتا (بە بێ مِن) لە سەروبەندی ١٩٤٥دا تەواوکرا. لە ڕاستیدا بایەخی خاکە بەستەڵەکەکەی «ڤاکورتا» لەوەدایە، سەرچاوەیەکی لەبنەهاتووی خەڵووزە، مەزەندەکەی زۆر لە هی «دۆن باسین» زیاترە. ئەوەش وەنەبێ سۆڤیەتییەکان دۆزیبێتیانەوە؛ پێشتر حکوومەتی قەڕاڵ زانیاری لە بارەوە هەبووە و کەم تا کورتێک دەستی بە دەرهێنانیشی کردبوو. لە ڕۆژگاری قەڕاڵدا، خەڵووزی «ڤاکورتا» بە بەلەم بۆ «ئارچئانگل» دەگوێزرایەوە لەوێشەوە بە قیتار بۆ ناوجەرگەی ڕووسیا دەهێنرا. بەڵام کەناراوەکانی دەریای «بارێندز» لە ساڵدا زیاتر لە نۆ مانگ بەستەڵەک بوو؛ بۆیە تەنیا لە چەند ڕۆژێکی هاوین دەکرا خەڵووزەکە بە بەلەم بگوازرێتەوە. بەشی

ماوەی ڕاوەدوونان و چەوساندنەوە، ڕۆڵێکی گرنگیان لەسەر هزر و پەروەردەی کاسۆلیکییەوە هەبوو.

هەرەزۆری ڕۆژەکانی ساڵ، ئەو کانە گەورۆنانە لە بن بەفر شاردرابوونەوە. لەگەڵ لێدانی هێڵی ئاسنینی باکوور، گواستنەوە و ناردنی خەڵووزی ئەوێ بۆ هەموو گۆشە و کەنارەکانی ڕووسیا، لە هەموو ڕۆژەکانی ساڵیشدا مەیسەر بوو. لە ناوچەکە نەوتیش دۆزرایەوە. نازانم ئاخۆ نەوتی ژێرزەمینی ئەوێ زیاترە لە هی قەوقاز یان نا، بەڵام بە دڵنیاییەوە نەوتیشی لێبوو. کاتێکیش بە قیتارێکی شلۆق بەو ناوچەیەدا گوزەرمکرد و بەرەو باشوور دەهاتم، لە ڕێگەدا ئامرازی هەڵکەندنی بیری نەوتم لە نێوان «کۆشڤا» و «کۆتلاس» لە دەوروبەری «ئۆچتا»دا بینین.

بیست یان سی ساڵێک لەمەوبەر هەموو ناوچەکە، بە زستانان بیابانێکی سپیپۆش و بە هاوینانیش پانتاییە زۆنگاوێک بوو بۆ خۆی. خەڵکی خۆجێیشی لێدەژیا. بەڵام ژمارەیان کەم بوو، پێیان دەگوترا «زاریانی Zaryanye» یان گەلی «داون Dawn»، بێ سێودوو ناوەکە لە «ئاورۆرا بۆریلس Aurora Borealis»ەوە هاتووە. ئەوان هەر لە تەپڵی سەر تا پەنجەی پێ هەر جلی فەرووداریان لەبەردەکرد. تەنیا کونی چاویان لە بن پۆشاکەکەیان دیار بوو. هەر وەک ئەسکیمۆکان دەژیان.

ئەمڕۆش بە مەودای نزیکەی دوو هەزار کیلۆمەتر، هێڵی قیتار بە تەواوی ناوچەکەدا دەڕوا. هەر لە باشوورەوە قیتارەکان خەڵک، دامودەزگە، ماشێن، کەلوپەلی بیناسازی دەهێنن و لە باکوورییشەوە خەڵووز، نەوتی خاو، لەوانەیە سامانی دیکەش ببەنەوە. ناوچەکە وەک پێشان نەماوەتەوە کە چۆڵەوانی بێ؛ خەڵکی "لێ نیشتەجێ" کراوە. لەو شوێنەی من بەلەمەکەی ئیتاپم لە باکوور بەجێهێشت، تا «کۆشڤا» لە باشوور، لە هەردوو دیوی ڕووبارەکە قوللەی چاودێری بەرزکرابوونەوە، بە ڕوونوئاشکرایی هەبوونی ئۆردوگای زۆرەملێی کاریان ڕادەگەیاند. لەو کاتەی بە وێدا گوزەرمکرد، لە نێو ئەو

ئۆردوگایانەی لەوێ بینیم، هەندێکیان هیچ هێمایەکی ژیانیان لێنەمابوو. ئەوێ چۆڵکرابـوو. کـارەکە تەواوببـوو. ئەو خەڵکـانەی مـابوونەوە و نەمردبـوون، گوێزرابـوونەوە شـوێنی کـاری دیـکە. بەڵام لە زۆر لە ئۆردوگاکاندا ئەو نیشانانە هەبوون، کە بۆ من مایەی ناسینەوەیان بوو. لەو سەفەرەمدا، چ بە ڕێی ڕووبار یان بە قیتار، بە سەدان لەو جۆرە ئۆردووگایـانەم ژمـارد. لە "ڕوانـگە"ی منـدا زیـاتر لە هەزاران بـوون. ئەوان تەنیـا جـۆرە ئۆردوگـایەکی قەبـارە مـام ناوەنـد بـوون، بە هـیچ شـێوەیەک قەبارەیـان گەورە نەبـوو. زەحمەتـیش نەبـوو بزانـی چەنـد کەسـیان تێدابوو. بە ڕاسـتی سـەخت بـوو لە هەر بەشـێکی ڕووسـیادا ڕەتببـی، ئەو جـۆرە قـوللانە نەبینـی، بەڵـگەی ئەوە نەبـێ کە شـوێنەکە ئۆردوگایەکی زۆرەملێیە. ئەوەی من بە لایدا تێپەڕیم یەکپارچە شـوێنی کار و ڕۆنان و دروستکردن بوو.

نـاوچەی کـار و بینـاکردن لەبن ڕکێفی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی بـوو، ئەمەش هەر لە گۆشـەنیگای کـارگێڕی، لە گۆشـەنیگای دابینکـردن و نەخشـەدانان، تەنـانەت لە گۆشـەنیگای حیسـابکردنی نـوارینی ڕوانگەکانیشـەوە بـوو. جڵەوگرتنێکـی تەواو. هێـزی پۆلیسـی نهێنی تاکە ماخۆی زاڵ، کردەی کار و ڕۆنان و دەرچەی بەرهەمەکانی ئەوێ هەر بە خـۆی بـوو. لە یەکێتیـی سـۆڤیەتدا ماخۆکـانی کـار نـین، بەڵکو تەنیا ماخۆیەکی کار هەیە، ئەویش حکوومەتە. بەڵام تاکە ماخۆی کارەکە ئەو هەموو ناوچە فرەوان و پانوپۆڕەی کار و ڕۆنـانی دابـووە بەڵێنـدەرێکی لەبـن (لاوەکـی) کە دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی بوو. دەزگەکەش یەکێکە لە گەورەترین بەڵێندەرانی جیهان، ڕەنگە گەورەترینیان بێ. دەستی کاری هەرزان وەگەڕدەخا، بەڵکو لە جیهاندا هەرەهەرزانەکەی بێ.

کـار و ئەرکەکـانی ڕۆنـان تـا دەهـات گەورە و گەورەتـر دەبـوو، لەگەڵیشـیدا هێـزی کـار زیـاتر دەبـوو. خـۆ ئەگەر لەوێ هیچـی نەبـێ،

دەبوایە بۆی دروست بکردبایە. دەبوایە بەئەندازەی خواستەکانی بەهێزبوون هەڵبکشابایە. هەر ئەوەش ڕوویدەدا کە ڕوویدا، لە «تاشکەند» پێمگوترا، خەڵک لە پڕێکەوە بەسەدانیان لێگیران و دەستبەسەرکران ... هەر لەبەر ئەوەی کاتێ سواری ترام دەبوون تکتیان نەبڕی بوو! خۆ ترامەکەی «تاشکەند» هەر چەند کۆپێکێکی[157] کەمی تێدەچوو. ئەم بڕەش لە یەکێتیی سۆڤیەتی هەر بە پارە دانەدەندرا. بەڵام هەندێ جار وا دەکەوتەوە، ڕێبوار سواری ترامەکە دەبوو، بلیتی پێ نەبێ، یان پێڕانەگا بیبڕێ.. هەرچەندە خەڵکی وەهاش هەبووە بە بۆنە و بێ بۆنە نەیویستووە پارەی بلیتەکە بدا، ئەگەر هەر یەک دوو کۆپێکێکیش بێ. بەڵام بە شێوەیەکی ئاسایی خەڵکەکە پارەی سواربوونەکەی دەدا و بلیتەکیان دەبڕی. ئاسایش بووە جاری وا هەبووە لە کەمتەرخەمی پارەکە نەدراوە. بەڵام لەکاتێکی دیاریکراودا "یاساوڵەکان"ی نێو ترام یەکسەر خەڵکیان گرت و بۆساڵێک ڕەوانەی ئۆردوگای کاری زۆرەملێیان کردن. لە هەندێ جاردا وەها ڕوویداوە دوای یەک ساڵ ئینجا گەڕاونەتەوە. هەندێک جاریش حوکمی زیندانییەکەیان بۆ درێژکراوەتەوە. لەو نێوەشدا کاری ڕۆنان درێژەی هەبووە. جارێکیان «گارین» پێیگوتم: "لە ڕووسیادا ئێمە لە هەموو شتێکدا کورتهێنین." ئەوەش یەکێک لە سەرنجە ڕیزپەڕەکانی ئەم ڕێسایە بوو. چونکە هەر لەوێدا، لەبارەی هێزی کاری پیاودا کورتهێن نەبوون.

سەرۆکی هۆبەی دابینکردنی وڵسات (مەڕومالات) لە لینینگراد، ئەو شتەی بە خۆی بیستبووی بۆ برادەرێکی گێڕابووەوە. بە گوێرەی ڕاسپاردەی تایبەتی شوومی پریزیدیومی ئەنجوومەنی باڵا، ئەو لەسەر بەهەدەردانی سامانی گشتی گیرابوو. بەوە تاوانبارکرابوو، کە قایل بوو لەسەر نرخی باڵا و لە بەرانبەریشدا سەرمەڕ و بزنی ناوەخۆی کڕیوە.

---

[157] – دروای ئەوکاتی ئەوان.

ئەفسەرێکی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، کە پێشتر برادەری خۆی بووە، لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردووە. لێکۆڵینەوەکەش لە ژوورێک کراوە، بە تەنیشت نووسینگەی لێکۆڵەرەوەی بالاوە بووە. لە ماوەی وچانێکی کورتدا، لێکۆڵەرەوەکە دەچێتە ژوورێکی دیکە، کاتێکیش گەڕاوەتەوە هەر بەڕێکەوت دەرکەکەی دانەخستبوو. لە ژوورەکەوە دەنگی تووڕەیی ئەفسەرە بالاکەی دەزگەی ئاسایش هاتووە. بە تەلەفۆن قسەیکردووە. پرسیاری ئەوەی کردووە ئاخۆ ئەنجامی هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان چی بوو. پیاوەکەش وەلامیداوەتەوە، پێدەچوو زانیاری کۆبکاتەوە. ئیدی ئەفسەری بالا بە سەریدا تەقیوەتەوە و بە توندی پێیگوتووە: "من پێویستیم بە بەڵگە و زانیاری نییە. من پێویستم بە هێزی پیاوان هەیە. پیاوەکانم بۆ بنێرە!" ئەویش پیاوەکانی بۆ ناردن. لێکۆڵەرەوەکەش بەو شێوە ڕۆیشتن. ئەوان بەرپرس بوون، کە ئەم ڕەوشە لەبەرچاوبگرن.

بەلام خۆ ئەگەر دەزگەی ئاسایشی بەڵێندەر پێویستی بە خەڵک هەبووبێ، بۆچی ئەو کاتە لەدەستبدا بەو شێوەی کار بەڕێوە دەڕۆیشت؟ باشە بۆچی هەلومەرجی کار، کاری وەهایان بۆ برەخسێنێ کە بتوانن تێدا کار بکەن، نەوەک بیانکوژێ، بەلام ئەوەندەی تێبیڵێتەوە کە بتوانن کاربکەن؟ ئەوان بە شێوەیەکی دووسەرە وەلامیاندایەوە. کار دەبێ ببێ و تا دەشکرێ هەرزان بکەوێ. ئەمەش قانوونی ئابوورییە. خالی دووەمیش، نابێ ئەوە فەرامۆش بکا، کە لە نێو دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا نەوەک هەر بە تەنیا "قانوونی ڕۆنان" هەیە بەڵکو "قانوونی تۆڵەش" هەیە. ڕاب - سیلا دوژمنی گەلن. ڕاب سیلا دەبێ کاربکەن؛ دوژمنەکانی گەل دەبێ بمرن. لەوێدا هەرگیز لە راب سیلادا کورتهێن نەبوون. ئەو دژبەرییەی نێوان هەردوو قانوونەکان لە هاواری "بێ بەزەیی"دا ئاشتببوونەوە.

خەڵکێکی وا هەیە دەڵێ، بناوانی ئەم هاوارە و چالاکییەکانی کرێملن لەم پەندە دایە: "ئامانجەکان دەرەقەتی ڕەوایەتیدانن بە ئامرازەکان." منیش لەو بڕوایەدام ئەمە شاشییە.

بە کردەوە ئەوە ڕاستە، کە زۆر لە ستەمکاران ئەم پەندە بەکار دەهێنن، کە دەگەڕێتەوە بۆ «جزویت»ـەکان، بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بدەنە کارە پڕ لە فێڵ و گۆبەند و دڕندایەتیەکەیان. بەڵام ئەوەش ڕاستییەکی مێژووییە، کە ئەم ڕوانگەیە ڕێ ڕووناککەرەوەی شەڕڤانانی ڕێگەی دادپەروەری و ئازادیش بووە. «هاسمۆنییەکان» و ئەو پیاوانەی بەسەر باستیلیاندا دا، «بار کۆچبا» و «سپارتاکۆس»، «جۆرج واشنتن» و «گاریبالدی» بەو بڕوایە دژی ستەمکار وەستانەوە، کە ئەوپەڕی ئامانجیان ڕەوایەتیدانە بە دەستدانە چەک، شۆڕشێکی چەکداری و خوێنڕژانە. لێرەدا ڕاستییەک نابێ تەمومژ بخاتە سەر ئەوی دیکە. بەوەی چ لەنێو کایەی هزر یان لەنێو کایەی کردەدا، هەردووکیان بەندن بە چارەنووسی ئادەمیزاد. ئاسن مرۆڤایەتی پێشخست؛ بەڵام کێفەڕاتی سامناکیشی بەسەرداهێنا. ئاسن ژیانی دەوڵەمەند کرد و مەرگیشی زیادکرد. هەمان شتیش بەسەر ئەو پەندە ئاسنینەدا پەیڕەو دەبێ: ئامانج دەرەقەتی ڕەوایەتی ئامرازەکان دێ.

خۆ ئەگەر ئێمە بە دەسەڵاتدارانی کرێملن بڵێین، دیارە ئەم پەندە ناوەرە سادە و ڕۆمانتیکیانە و بورژوازیانەیەکی هیچوپووچە؛ ئەگەر ئێمە پێیانبڵێین؛ لە چاوەکانی ئەواندا ئامانج ڕەوایەتی بە هەموو ئامرازەکان داوە، هەنگاوێکی گرنگ بەرەو پێشەوە بڕاوە تا لەو فەلسەفەیە بگەن، کە ڕێنوێنی کردەوەکانیان دەکا، بەڵام ئێمە هێشتا نەگەیشتووینەتە بندینی[158] شتەکە. فەلسەفەی کرێملن، داڕشتەیەکی

---

[158] بندین، قووڵایی، ژێری ژێرەوە. لە یەکێک لە شیعرەکانی مامۆستا شێرکۆ بێکەس دا هاتووە.

تەواوکراوە: هەموو ئامانجێک دەرەقەتی ڕەوایەتیدانی هەموو ئامرازەکانی هەیە.

ڕاگەیەندراوی "ئامانج"ی کۆمۆنیستەکان؛ بۆ بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی بێ چین و دەوڵەت نەبووە[159]. ئەم ئامانجە، لە ڕوانینی خۆیاندا، بە شێوەیەکی سروشتی ڕەوایەتی دەداتە هەموو شێوازەکان، کە دوایاربێ پێیبگا، بەڵێ هەر هەموو شێوازەکان. بەڵام لەو گەشتە دوورودرێژە بەرەو دامەزراندنی "کۆمەڵگەیەکی دەوڵەت نەبوودا"، ئامرازەکان (شێوازەکان) - کە بە دەستپێکردنی دەرکەوتن بە دەستخستنی ئامرازەکان دەبێ - هەر بۆ خودی خۆی ئامانجە. دیسان: هەموو ئامانجێک خۆی ڕەوایەتی دەداتە هەموو ئامرازەکان.

بە کۆمەڵبوون بە یەکێک لە شێوازە بەدەستهاتووەکانی کۆمۆنیزم دانراوە. بەڵام خۆ ئەگەر بە کۆمەڵبوون ببێتە ئامانج، کەواتە دەکرێ هەموو شێوازەکان (ئامرازەکان) لە پێناوی بەدیهاتنیدا بخرێنەگەڕ. لە پێناوی پێکهێنانی "برایەتی کرێکاران و جووتیاران"دا لینین بەڵێنی زەوی بە وەرزێران دا. ئەمەش بنچینەکە نەبوو. لینین هەروەک خۆیشی دانی پێدانابوو، بەرنامەی کشتوکاڵییەکەی تا ڕاددەیەک، دەق وەک خۆی، وشە بە وشە لە بەرنامەی کێبەرکێکارەکانی (نەیارەکانی) بەلشەفیزم، لە شۆڕشیالیستە شۆڕشگێڕەکان وەرگرتبوو. ئەوانەی دوایی (واتە شۆڕشگێڕە سۆشیالیستەکان .و.) بەڵێنیان بە کشتیارانی ڕووس نەدابوو مەزرا و کێڵگەی هەرەوەزییان (بەکۆمەڵییان) بدەنێ، بەڵکو ماخۆیەتی تایبەت بەسەر پانتایی زەوییەکان دوای ئەوەی موڵکایەتی پێشتر تێکدەشکا. بەڵام کاتێک ئەوان هەڵمەتی بە هەرەوەزکردن (بە کۆمەڵکردن)یان دا، دەکرا بێباکانە هەر بە بەرنامەی «لینین» بەڵکو بە قانوونی شۆڕشەکە بزانرێ. بە هەمان شێوەش دەکرا هیچ ژانوناسۆرێکی کرێکاری زەوی بێ یاخود کارخانە بە هەند

---

159– دەوڵەت نەبوو: مەبەستم دەستەواژەی non-existent Stateە.

هەڵنەگیرێ. بە ملیۆنان لە کرێکاری زەوی وەک دوژمنی گەل ڕاپێچرانە نێو ئۆردوگاکانی زۆرەملێی کار؛ بە ملیۆنان کرێکار، تەنانەت لە ئۆکراینش برسی کران. لەو خاکەی چۆڵدەکرا، کشتیارەکانی لێ ڕیشەکێش دەکران. خۆ ئەگەر حیزب و میری بڕیاریان بدابایە سەبارەت بە سەعاتی کار، یان لە ئامانجی نێوەندگیرییدا بەوەی جوتیاران ببنە کرێکاری کێڵگە، ئەمە خۆی ئامانجێک بوو ڕەوایەتی بە هەموو شێوازێک دەدا، تەنانەت ئەگەر ببوایە مایەی وێرانکردنی ماڵی ملیۆنان کەس.

خۆ ئەگەر ئامانجی نێوەندگیر بووبایە مایەی پێکدادانی نێوان «بەرلین» و «لەندەن»، بە شێوەیەک کە «مۆسکۆ» دەبووایە 'سیستمی بۆ ئەورووپا" گەڕاندبایەوە، ئەمەش ئامانجێک بوو ڕەوایەتیدا بە پەیماننامەی خوێنین لەگەڵ ئاڵمانی نازی بۆ ئەوەی پاشخانی خۆی لە ڕۆژئاوا بپارێزی لەو کاتەی هێرش دەباتە سەر فەرەنسا.

تەنەنات ئەگەر ئامانجەکە سنووردداریش بووبێ - ئەمەش لە ڕوانگەی نێوەندگیری هەرەدوور - وەک بنیادنانی هێڵی ئاسنین لە باکوور، کەواتە ئەم ئامانجەش ڕەوایەتی دەداتە سەرجەم شێوازەکان: "هێڵی ئاسنین هەر بنیاد دەنرێ، ئەگەر لەژێر هەر مەترێکیشدا جەستەی مرۆڤێک بنێژرێ."

سیستمی وەبەرهێنی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە فەلسەفەوە پەرەی پێدرابوو. ئەم فەلسەفەیەش "ئابووری" دەزگەکەی بەرهەمهێنا، کرێکار و ئۆردوگای مەرگی هێواش.

ئەو نەوەیەش کە قوللەکانی چاودێری ئۆردوگا زۆرەملێکانی کاری سۆڤیەتی بینی و گەواهیدەربوون لەسەر ڕەتکردنەوەی خودا و گوێیان لە هاواری "بە بێبەزەیی" بوو، ئەو نەوەیەی بەلشەفیزم و فاشیزم، نازیزم و ستالینیزمی بینی؛ ئەو نەوەیەی شاهید بوو بەسەر ئەوپەڕی

هەرەتـــی دوو شـــت - ئەوپەڕی دڕنـــدایەتی ســـتەمکاری و ئەوپەڕی خۆقوربانیدان و پاڵەوانێتی ئەوانەی سەربەستیان خۆشویست - دەبێ بگەنە ئەم لێکەوتانە:

ئایا ئامانج ڕەوایەتی بە ئامرازەکان دەدا؟ - ئەگەر هـاتوو ڕووبەڕووی ستەمکاری بوویتەوە، ئەوا لەوە دوودڵ مەبە لە وەڵامدا بڵێی: بەڵێ!

هەموو ئامانجێک ڕەوایەتی بە شێوازەکان دەدا؟ - نەخێر!

ئامانجەکە ڕەوایەتی بە هەموو شێوازەکان دەدا؟ - نەخێر!

هەموو ئامانجێک ڕەوایەتی بە هەموو شێوازەکان دەدا؟ - نەخێر!

**٢١**

# ئاوارە و سەرباز

دوای بەجێهێشتنی ئۆردوگای زۆرەملێی و ناوچەی باکوور، بۆ ماوەی چەندین مانگ بە نێو ڕووسیادا ئاوارەبووم. هەموو ئەو پانتاییە پانوپۆڕەی دەریای «بارێندس» تا سەر کەناراوی «قەزوێن»م تەیکرد. بەنێو شاری گەورە و بچووکدا، بەنێو دێهاتیشدا ڕەتبووم. لە وێستگەکانی قیتار، لە پارکەکان، لە کۆڵیتی پیسوخۆڵدا نووستم. برسیەتی و بێئومێدی بەشە بەختی ئاوارەکانی وەک من بوو. بە دووریی سەدان کیلۆمەتر بە دزییەوە ڕۆیشتین، بە پێوە خۆمان بە قیتارەکان هەڵدەواسی، دەستمان بە دەسکی دەرگەکان دەگرت یان خۆمان بەیەکەوە دەگرتەوە. ئاخر پارەمان پێنەبوو تا بلیتی قیتاری پێبکڕین. چەندین جار لە لایەن جابییەکانی قیتارەوە پاڵنراین و لە قیتارەکە دوورخراینەوە، ئەمەش چیرۆکی ڕۆژە بەراییەکانی هێڵی ئاسنینی ئەمریکام دێنێتەوە بیر. بە ئاراستەی باشوور دەهاتم. بە دوای سەروسۆراغی خوشکەکەم و مێردەکەیدا دەگەڕام، کە بەر لە گرتنم لە «ڤیلنا» دەرەبەدەرکرابوون. بە دوای سەربازێکی پۆلۆنیدا دەگەڕام، دەکرا بە گوێرەی ڕێککەوتننامەی سۆڤیەت - پۆلۆنیا لەسەر خاکی ڕووسیدا بیدۆزمەوە.

شتێکی زۆر زەحمەتیش بوو لە سەر ئەو کیشوەرە پان و بەرینەدا و لە نێو ملیۆنان ئاوارەی نێوخۆ، کە لە باکوور و لە ڕۆژهەڵاتەوە بە

لێشاو هاتبوون، لە نێو ملیۆنان پەنابەری جەنگ، ئەوانەی لە بەرەکانی ڕۆژئـــاوادا هەڵاتبـــوون، بە دوای جووتێـــک، بە دوای ژن و پیاوێکـــدا بگەڕێی و بیاندۆزیەوە. بەڵام بەخت بە هانامەوە هات.

لە یەکـــێ لە وێســـتگە پیســـوپۆخڵەکانی ئاســـیای ناوەڕاســـتدا، لەگەڵ گرووپێک لە ئاوارەکاندا بووم، لە دەرفەتێکدا دەگەڕاین، تا بە مفت[160] ســـواری قیتـــار بـــین. کـــات شـــەو بـــوو. منـــیش خەواڵووبـــووم، لەگەڵ وەنەوزدانـــم گـــوێم لە دەنگـــی ئافرەتێـــک بـــوو باســـی کانەکـــانی مســـی لە ناوچەی شـــاخەکانی «ئـــورال» دەکـــرد. گـــوێم لە چیرۆکێکـــی هاوشـــێوەی خـــۆم بـــوو، بە ئەســـتەمیشـــەوە ســـەرنجم بـــۆ گێـــرانەوەکەی ڕاکێشـــا. لە هیکەوە گوێم لە ناوی "هـالپەرین" بوو. ئیدی بێ ئەوەی دەموچاویشـی ببینم، یەکسەر گوتم:

"ببـوورە، خـانم. ئەو «هـالپەرین»ـەی باسـی لێـوە دەکەی، ئایـا بە هـیچ ڕێکەوتێک ئەوقاتە[161]؟"

"بەڵێ."

"بەڵکو هی وارشۆ بێ؟"

"بەڵێ."

ئەو لەگەڵ ژنەکەی لە ئانوساتی ڕاگواستن بوو؟"

"بەڵێ."

"ناوەکەشی «ڕاشێل» بوو؟"

"بەڵێ وایە! ئایا دەیناسی؟"

---

160– بە مفت: بێپارە. بەلاش.

161– ئەوقات: پارێزەر.

به کۆمەکی ئەو ژنە، لە کۆتاییدا کەسوکارەکەم دۆزییەوە. تا ئەو کات نەمدەزانی، لەماڵی باوانمەوە تەنیا ئەوانیان لێدەرچوونە.

لە کۆڵێتێکی بە قوڕدروستکراوی شڕووڕ، لە شارێکی بچووکی «ئۆزبەکی» لە «دژیزاک» لە نێوان «تاشکەند» و «سەمەرقەند»دا، لەگەڵ خێزانی خوشکەکەم و دەستەخوشکێکی خۆی، کە هی سەردەمی ڕاگواستن بوو، بەسەرم برد. ژنە برادەرەکەی ناوی «لیە ڤیتکۆڤسکا» بوو.

«ڤیتکۆڤسکا» ژنێکی چاک بوو، ئەندامێکی کارای «بوند» بوو. بە چەند ساڵێکی کەم دوای ئەوەی ڕووسیای بەجێهێشت، لە بەردەم یەکێ لە کۆمیتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان قیتبووەوە و گەواهی لە سەر بارودۆخی کرێکاران و کانەکانی مس لە یەکێتیی سۆڤیەتی دا. خانمەکە بە کۆمیتەی نێودەوڵەتی گوت؛ لە «دژیزاک» ئەو شتانەی لەبەر دووکەڵی لەمپایەکی نەوتی گوایە شتەکانی بە من گوتووە. ئەو دژوارییە بەردەوامەکەی ژیان و تەندروستی کرێکارانی کانەکانی بە من گوتبوو، ئەوانەی بە سەتڵە بە یەکەوەنووساوەکان دەچوونە نێو قووڵایی زەوی. پەیژەکان لە یەکدەترازان. ئیدی بەو تاریکییە دەبوایە بیاندۆزیبایەوە و دەستیان پێوەگرتبا، دەبوایە هەرچۆنێک بووایە جێپێی خۆیان بکردبایەوە، دەنا خوار خۆیان خەرەندێکی جەهەنەماوی بوون و بکەوتبانە نێوی هەر نەدەدۆزرانەوە. هەندێ جار پەیژەکە لەبەر کۆنی و ڕزین، یان لەبەر قورسایی کرێکارەکە دەشکا، ئەوسا کابرا هیچی پێنەدەما، دەبوایە لە هەوا دەست بە شتێکەوە بگرێ. هەڵبەتە ئەنجامەکەشی پەککەوتەبوون یان مردن بوو، ئەوەش وەنەبێ لەبەر یەک پەیژە بێ، بەڵکو لەبەر پەیژەکانی دیکەش، چونکە لە کاتی خۆی ئاگادارنەدەکرانەوە. خانمەکە باسی خۆراکی ئەوێی بۆ کردن، کە لەو کانانەدا بایی پێویستی تێربوونیان نەدەدرایێ، لە کاتێکدا ئەفسەرانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی باشترین خواردنیان هەبوو.

کاتێکیش ژنەکە لە قسەکانی بووەوە، یەکێ لە نوێنەرانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکە هەڵسا و لێیپرسی: "ئێمە دەزانین ئەو ئافرەتە سیخوڕێکی پیشەمەندە[162]."

لە ڕێی «لیە ڤیکتۆڤسکا» و برادەرەکانی، هەواڵی دووبارەگرتنەوەی «ئالتەر» و «ئهرلی»، کە دوو سەرکردەی ناسراوی «بوندیت» بوون، زانی. ئەم دوو سەرکردەیەی حیزب دژی ئەو شتە بوون کە «ڤلادیمیر ئیلیچ لینین» بە هەموو توانای خۆی شەڕی بۆدەکرد، ئیدی ئەوە بوو لەگەڵ کەوتنی پۆلۆنیا، لە لایەن دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا گیران، حوکمی هەشت ساڵ کارکردن لە ئۆردوگای زۆرەملێی کاریان بۆ بڕینەوە. دواتر ئەوانیش بەر لێبوردننامەکەی هاوولاتیانی پۆلۆنی کەوتن، ئینجا هاتنە «کوبیشێڤ» لەوێشەوە پەیوەندییان بە نوێنەرایەتیی پۆلۆنی و ئەندامانی حکوومەتی سۆڤیەتیەوە کرد. ڕۆژێکیان بانگکران تا «بێریا» سەرۆکی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ببینن. ئیدی هەرگیز لەو دیدارە "دۆستانەیە" نەگەڕانەوە. ئەندامە چالاکەکانی دیکەی «بەندیت» بۆ خانم «ڤیتکۆڤسکا»یان نووسیبوو؛ "ڤیکتۆر و هاوڕێکەی هەر بە ڕاستی زۆر بە سەختی نەخۆش کەوتوون." دوای یەک دوو مانگیش لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی خۆیان بە جیهانیان ڕاگەیاند، کە هەردوو سەرکردەی «بەندیت» بە تاوانی "یارمەتیدانی سوپای ئاڵمان" لە سێدرارە دراون.

ئەگەر بڵێم «ئالتەر» و «ئێرلیچ» بوونەتە قوربانی پەلاماری ژاپۆنییەکان بۆ سەر بەندەری «پیرل هاربۆر»، ئەوا گومانم لەوەدانییە بە ڕۆچوون لە نێو دژبەریدا تۆمەتباردەکرێم. بەڵام بڕوام بەوە هەیە، شتەکە ڕاستییە و دژبەیەک نییە. زیاتر لە جارێک چارەنووسی تاکەکان بە ڕووداوی دوورەدەستی نێودەوڵەتییەوە بەندبووە، تەنانەت بێ ئەوەی ئەوان ئاگایان لە خودی ڕووداوەکەش هەبووبێ.

---

[162] – پیشەمەند: پرۆفیشیۆنال.

یەکێتیی سۆڤیەت تا ئەو کاتەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک شەڕکەرێک لە ناکۆکییە جیهانییەکە نەگلابا، پێویستیان بە «ئالتەر» و «ئێرلیچ» دەبوو. هەرچەندە قۆشەنە سەربازییەکانی ئاڵمان لە زستانی ١٩٤١ لە دەروازەکانی لینینگراد و مۆسکۆدا وەستان، تەنگژەکەی سۆڤیەت تا دەهات کوشندەتر دەبوو. ئەوەندە دژوار بوو، ستالین لە ساڵیادی شۆڕشەکەدا بە پێویستی زانی، دڵی گەلەکەی بە ڕاگەیەندراوێک بداتەوە، کە لە ڕاستییەکی زۆر نامۆوە هاتبوو، پێویستیش نەبوو بۆ بەرزکردنەوەی ورەیان وەها بکا. ستالین لە ٧ی نۆڤێمبەری ١٩٤١ و لە گۆڕەپانی سووردا گوتی: "جەنگەکە هێشتا بۆ شەش مانگی دیکە درێژە دەکێشی، لەوانەیە بگاتە ساڵێکیش." ڕووسیا لەو قەیرانە ڕاستەقینەی تێیکەوتبوو، چاوی لە هێزی ڕۆژئاوابوو بە هانایەوە بچی، بە تایبەتیش وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. بەڵام لە کاتێکدا کۆمەکی بەریتانیا هەر کەمێک دوای هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان ئاڵمان و ڕووسیا گەیشت، کۆمەکی ئەمریکا بە درەنگەوە گەیشت و وەخرا. هەرچۆنێک بێ لە ئاست خواست و داوای یەکێتیی سۆڤیەتدا نەبوو. لە خواستی سۆڤیەت بۆ زیاتر گوشار خستنەسەر ئەمریکا تا بە بێ پچڕان یاریدەدەری بێ، حکوومەتی سۆڤیەت بە دوای ڕێگەگەلێکدا گەڕا، بە هۆیەوە کار لە ڕای گشتی خەڵکی ئەمریکا بکا. بۆ ئەو مەبەستە، ڕووسیا کۆمیتەیەکی جووی دژەفاشیستی پێکهێنا و جووەکانی جیهانی بە "برایەکان" بانگدەکرد. هەر بۆ هەمان مەبەست، «بێریا» ئامادەبوو «ئالتەر» و «ئێرلیچ» بە یەکەوە لەگەڵ شاندێکی کۆمیتەی دژەفاشیزم، بنێرێتە ئەمریکا.

بەڵام لە ٧ی دیسێمبەری ١٩٤١دا، بۆمبەکانی «میکادۆ» کەشتیگەلی سەربازی ئەمریکایان ناردە بندینی ئۆقیانووسەکە. ئینجا ئەمریکا بووە هێزێکی شەڕکەر دژی هەردوو دەوڵەت، دژی ژاپۆن و دژی ئاڵمان. بەم جۆرە تەوژمی چەکناردن بۆ ڕووسیا مەیسەر بوو، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی پێشڕەوی هێزەکانی ئاڵمان ڕابگرێ و لێنەگەڕێ لەگەڵ

قۆشــەنی ســەربازی هێزەکــانی ژاپــۆنی دوژمــن یەکبگــرێتەوە. کەواتە «ئالتەر» و «ئێرلیچ» چیدی پێویست نەمان تا ڕای گشتی ناوەخۆیی ئەمریکــا بجــوولێنن. لەبەر ئەمە، دژەفاشیســتی ســۆڤیەتی، هەروەک «میخائیل» و «پفەفەر» بەس بوون. «ئالتەر» و «ئێرلیچ»یش هەر لە ڕۆژانــی بەرایــیەوە دژی بەلشــەفیزم بــوون، ئیــدی قــانوونی تۆڵەیــان بەســــــەردا جێبەجێکــــــرا. ســــــەرباری ئەوەش، ئەوان پۆلــــــۆنی نیشتمانپەروەربوون و سووربوون لەسەر ئەوە پۆلۆنیا مافی بەسەر ئەو ناوچانەی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری «بەگ» یان هێڵی«کورزۆن»ـەوە هەیە، و دەبــێ ئەم مافەشــیان دانــی پێــدابنرێ. کەســانێک کە ڕووســیا پێویستی پێبوون، ڕێگەیــان پێدرا بژین، ئەگەر "مەترسی"ـش بن، بەڵام بــۆ ئەو کەســانەی، کە پێویســت نەبــوون لەوێ هەبــن، دەکەوتــنە بــن قــانوونی دەزگەی ئاسایشــی کۆمۆنیســتی ســۆڤیەتی، دەبــێ فتبکــرێن. کاتێکیش ئەمریکا چووە نێو جەنگەکە، مۆری شــووم لەنێو نێوچــاوانی «ئالتەر» و «ئێرلیچ» درا؛ بە تاوانی سیخوڕیکردن بۆ ئاڵمــان، حوکمی مەرگیان بەسەردا سەپێنرا.

هەواڵــی دووبــارە گــرتنەوەی ســەرکردەکانی «بەنــدیت»، کە لەژێــر کەپووی باڵوێزی پۆلۆنی ئەنجامدرا، کاری تێکردم، تا هەوڵێکی دیکە بۆ چوونە ڕیزی سوپای پۆلۆنی بدەم. دەبوایە بەر لە دۆزینەوەی جێوڕێی خوشــــکەکەم ئەو هەوڵە بــــدەم، بەڵام ســــەرنەکەوتم. هەرچەنــــدە لەو ئاوارەییەمــــدا، بە دوای ســــوپای پۆلۆنیــــدا دەگەڕام، هەر زوو بــــۆم دەرکەوت سوپای پۆلۆنی کاری بە من نییە و بە دواشمدا ناگەڕێ. یەکــێ لە پۆلۆنییەکــان گــوتی: "پێشــوازی لە جووەکــان نــاکرێ." بەنــدوباوێکیش بڵاوببــووەوە، لەم شــارەوە بــۆ ئەو شــار دەچــوو، لە دەمێکەوە بۆ ئەویدیکە دەگوازرایەوە، بەوەی کە ستالین بە خۆی بە ژەنەڕاڵ «سیکۆرسکی» و ئانــدێرس (سوپاســالاری هێــزی پۆلــۆنی لە ڕووسیا)» گوتووە، گوایە جووەکان ئەندازیار و پزیشکی باشن و بۆ لایەنی کارگێڕی سەربازیش دەستدەدەن، بەڵام ئەوان نازانن بجەنگن.

ئێمەش باوەڕمان بەو بەندوباوە نەکرد. پێمانوابوو پۆلۆنییەکان ئەو بەندوباوە بۆ ئەوە بڵاودەکەنەوە، تا ڕەوایەتی بدەنە ئەو جیاخوازییەی خۆیان دژ بە هاووڵاتییە جووەکانی پۆلۆنیا.

پاش چەندین ساڵ، زانیم بەندوباوەکە لە جەوهەردا ڕاستی بوو. بەڵام ئەوەشم زانی، ئاخۆ پشتگیری ڕەوتی دژەجووایەتی چەند بە هێز بوو. دەکرا کەسانێکی وەک «ستالین» و «مۆلۆتۆڤ»، «سیکۆرسکی» و ژەنەڕاڵ «ئاندەرس» سەبارەت بەو پرسە لە هەمان بەرەدا بن.

ژەنەڕاڵ «ئاندەرس» لە یاداشتەکانیدا تەواوی ئەو گفتوگۆیەی ستالین لەگەڵ نوێنەرانی پۆلۆنی نووسیوەتەوە. لەنێو گفتوگۆکانیشدا، نووسەرەکە ئەم دەمەتەقێیەی خوارەوەی دەقنووسکردووە:

«ئاندەرس»: حیسابم لەسەر ئەوە کردووە کە سەد و پەنجا هەزار سەربازم هەبێ، بەڵام ژمارەیەکی زۆر جووی تێدایە، ئەوانیش نایانەوێ لە نێو سوپادا بن.

«ستالین»: جووەکان شەڕڤانی بەستەزمانن.

«سیکرۆسکی»: بە گوێرەی ڕاپۆرتی دەزگەی هەواڵگری سەربازی، زۆر لە جووەکان سەوداکاری بازاڕی ڕەشن یان ئەوانەن لەسەر بە قاچاخبردنی شتومەک سزادراون. هەرگیز سەربازی باشیان لێدروست نابێ. من نامەوێ کەسانی وا بخەمە نێو ڕیزی سوپای پۆلۆنی.

«ئاندەرس»: دوای بڵاوبوونەوەی بەندوباوی بۆمبارانی «کوبیشێڤ» دووسەدوپەنجا جوو لە سەربازگەی «بوزولوک» هەڵاتوون. زیاتر لە شەست جووش لە لەشکری پێنجەم بەر لە دابەشکردنەوەیان بەسەر سەربازگەکان، ڕایانکردووە.

ستالین: بەڵێ، جووەکان شەڕڤانی خراپن.

لە گفتوگۆیەکی دیکە لەگەڵ ستالین، نوێنەرانی حکوومەتی مەنفای پۆلۆنی نیگەرانی خۆیان سەبارەت بە هاووەڵاتییە پۆلۆنییەکانی دەڤەرەکانی ڕۆژهەڵات دەربڕیبوو، ئەوانەی لەنێو سوپای سووردا جۆشدرابوون، ویڕای ڕێککەوتنەکەی نێوان هەردوو حکوومەتیش، هێشتا ئازادنەکراون و نەگوازراونەتەوە نێو ڕیزی سوپای پۆلۆنی. ئەم جارەیان بە جیاوازی گفتوگۆکانی پێشتر، پشتگیرییان لە مافی کەمینەکان کردبوو. ئەرێ ئەو گۆڕانکارییە چی بوو؟ ڕاپۆرتەکەی ژەنەڕاڵ «ئاندەرس» مەتەڵەکە هەڵدێنێ، هەروەها شتێکیش لە ئاوەزمەندی دیپلۆماسی ژەنەڕاڵ «سیکۆرکسی» دەدرکێنێ، وەهاش دادەنرا ببێتە کەسێکی دەوڵەتمەدار.

«سیکۆرسکی»: زۆر بە مەحکەمی هەست بەو ڕاستییە دەکەم، ئێوە هاوڵاتییە پۆلۆنییەکان لە ڕیزەکانی سوپای سوور و لە بەتالیۆنەکانی کار ئازادناکەن، نەخاسمە ئەوانەی لە دەڤەرە داگیرکراوەکانی ١٩٣٩دا جۆشدراون.

«ستالین»: بەڵێ، ئێمە ئازادیان دەکەین.

«ئاندەرس»: لەو دواییانە لە بەتالیۆنەکانی کاردا دەست بە ئازادکردنیان کراوە. بەڵام لەو کاتەی تەنیا پۆلۆنییەکان ئازادبکرێن، ئۆکراینی و جووەکان ئازادناکرێن. هەر هەمووشیان (ڕاستییەکەی هەرگیز دەستیان لەوە بەرنەداوە، کە هەوبن) هاووڵاتی پۆلۆنین، ئەمەش دوای ئەوەی ئێوە ئەو ڕێککەوتننامەتان لەگەڵ ئاڵمانــدا هەڵوەشاندەوە.

«ستالین»: تۆ چیت لە بیلاڕووسی، ئۆکرانی و جوو دەوێ؟ تۆ پێویستیت بە پۆلۆنییەکانە، ئەوان باشترین سەربازن.

«سیکۆرسـکی»: مـن بیـر لە خەڵـکەکە نـاکەمەوە؛ دەکـرێ ئەوان بە پۆلۆنییەکان بگۆڕدرێنەوە کە هـاووڵاتی سۆڤیەتین؛ بەڵام لەبەر بنەما، ناتوانم بە ناسەقامگیری بەرەکانی پێشەوەی کۆماری پۆڵۆنی قایلبم ...

ئەم ڕاستییانە بە گشتی یادەوەری ژەنەڕاڵ «ئاندەرس» هەڵدەدەنەوە، کە لە زسـتانی ١٩٤٢دا بەرکـاربوون، هەرچەنـدە ئـێمەش وەک زۆر جـووی دیـکە، پێشـتر هەسـتمان بە بانـدۆرەکەی کردبـوو. مـایەی سەرسامی نییە، کە لە قۆناغی یەکەمی ڕزگاری لە ڕووسیا، من لە نێو ڕیزەکـانی سـوپای پۆلۆنیـدا وەرنەگیـرام. «سیکۆرسـکی» گـوتی "جامبازەکـان"؛ ئاندەرسـیش گـوتی "هەڵاتووەکـانی سـوپا" و هەرچـی سـتالینیش بـوو گـوتی "شـەڕڤانە بەسـتەزمانەکان". هەردوو ژەنەڕاڵە پۆلـۆنییەکە، بێگومـان دڵشـادبوون بە سـەلماندنی مۆرالییـانەی سـتالین سـەبارەت بە ڕەوتـی جیاکـارییە دژەجووەتییەکەیـان. بەڵام ئەوان لەو ڕاسـتییە نەگەیشـتن، کە سـتالین زۆربڵێیەکەیـان لەپێنـاوی ئەوە دەقۆزێتەوە، کە لە پۆلۆنیا زەبری خۆی بوەشێنێ!

زۆر لە جووەکـان لە نێوان بەرداشـەکانی قێزلێبـوونەوەی سـەرکردەی بـاڵای سۆڤیەتی و هەردوو ژەنەڕاڵە پۆلۆنییەکـان هـاڕدران. بەڵام پـاش چەند ساڵێکی کەم، هەر سێکیان، زانیـان جووەکـان چۆن دەجەنگن. بە نـاوی سـتالینەوە، ئەم ڕاسـتییە لەلایەن «دایڤیـد زاسلاڤسـکی»، کۆمێنتنووسی سیاسیی لە پراڤدا سەلمێندرا، ئەو کاتەی لە پەیماننامەی نێـودەوڵەتی ڕۆژنامەنووسـان لە «پـراگ»ـدا دانـی پێـدانا و بە سەرسامییەوە باسی کار و چالاکییەکانی سەربازانی «ئێرگون زڤای لیـومی»[163] کـرد. سـەرکردە پێشـووەکانی سـوپای پۆلـۆنیش هەر بە

---

[163]– مەبەست لەو ڕێکخراوە مێلیشیاییەیە، کە نووسەر دوای ئەوەی دەگاتەوە فەلەستین، سەرکردایەتیان دەکا، لە ڕووداوەکانی ناچارکردنی سوپای ماندانی بەریتانیا لە فەلەستین تا زووتر وڵاتەکە جێبێڵن، هەروەها دژی چەکدارە عەرەبەکان بەر لە جاڕدانی دەوڵەتی سەربەخۆی ئیسرائیل، ڕۆڵێکی کارانگازیان گێڕا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی «یاخیبوون»، نووسینی مناحیم بێگن، وەرگێڕانی شەفیقی حاجی خدر، ٢٠١٧ هەولێر.

هەمان سەرسامییەوە باسیان لە ڕۆڵی «ئیرگون» کرد، تەنانەت بە شێوازێک کە شانازیبوونیشی پێوە دیار بوو. ژەنەڕاڵ «ئاندەرس» لە کتێبەکەی خۆیدا لەسەری دەڕوا و بە شێوەیەکی لەبلەبانانە، بەکاریگەریی گەڕاندنەوەی ڕابردوو، خۆی هەڵدەکێشێ و باس لەوە دەکا، گوایە پلەی من لە نێو سوپادا بۆ کۆرپۆرال (عەریف) بەرزکراوەتەوە. ڕاستییەکەش ئەوە بوو، من لە سوپاکەی ئەودا هەرگیز لە سەربازێکی ئاسایی تێنەپەڕیم؛ تەنانەت ئەمەشیان هەر بە پەڕجوو بوو.

دوای ئەوەی بە دووبارە گرتنەوەی «ئالتەر» و «ئێرلیچ»م زانی، بڕیارمدا خێرا لە «دژهیزاک» دەرچم، ئاخر لەوێ زۆر کەس بە پاشخانی زایۆنیستیانەی منیان زانی. لەوێ ڕۆیشتم و چوومە «مارگیلان» دووەمین شاری گەورەی دۆڵی بە ناووبانگی «فێرگانا»، کە مۆڵگەی لەشکری پۆلۆنی لێنرابوو. لە بارەگای سەرەکیدا «شێسکین»ی برادەرم دۆزییەوە. ئەو پێیڕاگەیاندم، لەوکاتەی چووبووە «کیبوشەڤ» دەستی بە دانوستان کردبوو، تا یەکەی سەربازی جوو لەنێو سوپای پۆلۆنییدا پێکبهێنێ، بەڵام سەرکەوتوو نەببوو. ئەو چووبووە ڕیزی سوپا، ئەرکی گەیاندنی ئازووقەی لە دۆڵە بەپیتەکەی «فێرگانا» پێسپێردرابوو. هەرچەند هەفتەیەکی کەم دوای گەیشتنم بە شاری «مارگیلان»، خوشکەکەم خەبەری دامێ، "کەسێکی نە ناسراو" چووبووە کۆڵێتە بچکۆلانەکەی «تارتار» و پرسیبووی ئاخۆ لە کوێ بمدۆزێتەوە ...

لە «مارگیلان» دوو ئەندامی «بێتار»ی ڤێلنام دۆزینەوە، کە زیاتر لە جارێک منیان لە برسیەتی و نەبوونی پارەی بلیتی قیتار دەربازکرد.

گفتوگۆیەکی دوورودرێژم لەگەڵ «شیسکین» کرد، لە ئەنجامدا بڕیارماندا بە دوای دۆستەکەمان «د. یۆهانان بەدر» بنێرین، هەمووما ن دەمانزانی خاوەن چ مێشکێکی پیتۆڵانەیە، چ مامۆتکێکە بۆ

خۆی! لەبارەی دەرفەتی دەرچوون لە یەکێتیی سۆڤیەت و گەیشتنە فەلەستین پرسی پێبکەین، ئەمەش دوای ئەوەی برادەرەکانمان بەڵێنی ئەوەیان پێداین، مۆڵەتی کۆچکردنمان بۆ وەربگرن.

«د.بەدر»یش لەگەڵ خاوخێزانی بۆ ناوجەرگەی ڕووسیا دوورخرابووەوە، دوای ئازادکردنی چووبووە «ماری» پایتەختی تورکمانستان بژی. ئەویش بە هەزاران کیلۆمەتری بڕی تا ئێمە ببینێ. دەستبەجێ لەوە تێگەیشت، هیچ دەرفەتێک بۆ مۆڵەتنامەی دەرچوون لە یەکێتیی سۆڤیەتدا نییە، ئامۆژگاری ئەوەی کردم، هەموو هەوڵێک بدەم، بچمە نێو ڕیزی سوپای پۆلۆنی. گومانم نەبوو لەوەی هەموو ئاوەزمەندی و کارنامەی ژیانی خۆی، ئامۆژگارییەکی لەوە باشتری پێشکەشی کەس کردبێ.

منیش ئەوەم کرد کە پێشنیازی بۆ کردم، خۆمم بە بەشی وەرگرتنی سەربازی لەشکری پۆلۆنی ناساند. پزیشکیش پشکنیمی.

"بەڕێزا" پزیشکەکە بە دەنگێکی سەرسامانە پێیگوتم: "ئەرێ تۆ چ دڵێکت هەیە؟ تۆ خاوەن دڵێکی زۆر نەساغی، چۆن دەکرێ ببیتە سەرباز؟"

خەریکبوو دکتۆرەکە تەواو بمترسێنێ.

ئینجا چاوەکانمی پشکنی، دووبارە هاواری کردەوە: "بەڕێزا بینینت زۆر کزە. هەرگیز ناتوانی بە دروستی نیشانە بپێکی."

بە کورتی وەرنەگیرام. لە چاوی ئەو هەواڵەی لە خوشکمەوە پێمگەیشتبوو بڕیارمدابوو جارێکی دیکە بەختی خۆم لە ڕێی نامەیەکی تایبەت بۆ سوپاسالارەکە تاقیبکەمەوە. هەرچەندە ئەو سەرچڵییەش هەبوو، گەر هاتبا و وەرنەگیرابام، سەر لەنوێ دەگیرامەوە، بەڵام نامەکەشم هەر نووسی. «شێسکین» مشووری ئەوەی خوارد، نامەکەم بگاتە لای سوپاسالار. یەکدوو ڕۆژ دواتر، بە ئەفسەری یاریدەری

ئەوێم گوت ئاخۆ هیچ وەڵامێکی نامەکەم هاتۆتەوە. ئەویش گوتی، سوپاسالار دەیەوێ ڕاستەوخۆ بمبینێ، ئیدی لە دیدارەکەدا بڕیاردەدا ئاخۆ لە ڕیزەکانی سوپا وەرم بگرێ یاخود نا. دیدارەکەش ئەنجامی ئەرێنی هەبوو. بە ڕووخسارێکی خەندەدارەوە، سوپاسالار ئاگاداریکردمەوە، ئەگەر هاتوو لەشکرەکە چووە سەر سنوور، ئەوا چاوێکی تایبەتی لەسەر من دەبێ، بەوەی هەنگاوێکی وەها نەهاوێم و بەرەو فەلەستین هەڵبێم. لە ئەنجامدا، فەرمانی پێکردم ڕاپۆرتێک بۆ لیژنەی هێنانەڕیز بنووسم. منیش پێمگوت پێشتر ئەو کارەم کردووە، بەڵام نەیخوارد. پێیگوتم "قەیدی ناکا، جارێکی دیکە بڕۆوە ئەوێ، نامەی منیان پێدەگا." ئیدی چوومەوە بەردەمی لیژنەی هێنانەڕیز. ئەو پزیشکەی یەکەمین جار پشکنینی بۆ کردبووم، بە سەرسامی و بە گاڵتەوە پێیگوتم:

"ئەرێ من هەڵەم؟ سەرنجێکی وام هەیە، جارێکی دیکە هاتبیتە ئێرە."

منیش وەڵاممدایەوە: "بەڵێ. من ئەوم. بەڵام سوپاسالار فەرمانی پێکردووم جارێکی دیکە خۆم ناونووس بکەمەوە."

"سوپاسالار؟"

دکتۆرەکە چووە لای سەرهەنگ (مێجەر)ـە بەرپرسەکە. بینیم سەری بەسەر چەند کاغەزێکدا گرتبوو، گوێم لێبوو بە دکتۆرەکەی گوت:

"بەڵێ، ئەمەیە. تکایە بیپشکنە."

ئینجا دکتۆرەکە بە دەنگێکی بیستراوەوە گوتی: "دڵ و سییەکان نایابن! سیەیکانت هەر دەڵێی ئاسنن."

پاشان چاوەکانیشمی پشکنین.

"ئممم، لە ڕاستیدا کورتبینی، بەڵام لە سوپادا فێردەکرێی چۆن نیشانە بگری. ئەگەر هەوڵبدەی، دەکرێ ببیە یەکێک لە باشترین نیشانەشکێنەکانمان."

"بەڕێز، هەموو هەوڵێکی خۆم دەخەمەگەڕ."

بەم جۆرە لە نێو ڕیزەکانی سوپای پۆلۆنی وەرگیرام.

بەڵام تا ئەو کاتەی جلی خاکییم کردە بەر و لە سەربازگەیەک دانرام، وەک ئاوارەیەکی ئازاد، توانیم ژمارەیەک لە خەسڵەتەکانی ئایندەی ژیان لە یەکێتیی سۆڤیەتدا ببینم.

**٢٢**

# حکوومەت و یەکسانی

پێناسە پەسەندکراوەکەی چەمکی دەوڵەت سێ توخم لە خۆ دەگرێ: هەرێم، دانیشتوان و حکوومەتێک. پێناسەی لینینیش بۆ دەوڵەت تەنیا لە دوو توخم پێکدێ: چینی چەوسێنەر و چینی چەوساوە. لینین نووسیویەتی؛ دەوڵەت داردەستێکە، بە هۆیەوە چینێک ئەوی دیکە دەچەوسێنێتەوە. بە گوێرەی لێکدانەوەی ئەو، ئامانجی سەرەکی شۆڕشی پرۆلیتاریاش، نەهێشتنی چینەکان و لەگەڵیدا لەبەینبردنی دەوڵەتە. ڕێگەی نەهێشتنی دەوڵەتیش، دوای سەرکەوتنی شۆڕش دەستپێدەکا.

بەڵام لە ئاوارەبوونی من بە نێو ڕووسیادا، هیچ ئاماژەیەکی لەو شێوەم نەبینی. بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە هەموو شار و گوندێکدا، لە هەموو شوێنێکی کارکردندا و لە هەموو کونوقوژبنێکی ژیانی هاووڵاتی سۆڤیەتیدا، "دەوڵەت"ـم بینی. وەنەبێ دەوڵەت بەشەکاری هەر یەک لەو ملیۆنان هاووڵاتییانەی ڕێکبخا، بەڵکو شوێنی کاریشی بۆ هەڵدەبژاردن، ناچاریدەکردن کارەکە بکەن، دەنا گوشاری دووبارە چاوی لێسووردەکردنەوە و گەفی "دووبارە پەروەردەکردنەوەی" لێدەکرن. وەنەبێ مرۆڤ هەر ئەوەی دەبینی، کە دەوڵەتی سۆڤیەت لە هەموو شتێک و لە هەموو شوێنێکدا هەبوو، بەڵکو مرۆ بەبێ پچڕان هەر وەبەرگوێی دەکەوتەوە. ئەمریکییەکان بێهوودە لە ڕێی ڕادیۆی "دەنگی

ئەمریکا" قسەیان بۆ ڕووسییەکان دەکرد. لە یەکێتیی سۆڤیەتدا و لە ماڵە تایبەتییەکاندا کە ڕادیۆیان هەبوو، زۆر کەم بوون و لەیەک دووریش بوون. تەنانەت ئەو جۆرە ڕادیۆیانەی ئەوێش، وەک ڕێسایەکە، هەر توانستی ئەوەیان هەبوو بە تەنیا وێستگە خۆماڵییە ڕووسییەکان بگوازێتەوە، ئەوانیش هەواڵەکەیان لە ڕادیۆی ناوەندەوە وەردەگرت، ئەویش ڕادیۆی مۆسکۆ بوو. تەنانەت ئەگەر هاووڵاتییێکی سۆڤیەتی بە ڕێکەوت ڕادیۆکەی کەوتبایە سەر ڕادیۆیەکی دەرەوەی وڵات، ئەوا شێت نەبوو ئەو سەرچڵییە بکا، لە بەردەم ژن و منداڵەکانی گوێ لە "ڕادیۆی ئیمپریالیستی" بگرێ! بەشی هەرە زۆری خەڵک گوێیان لە ڕادیۆکەی سەر شەقام دەگرت. ئاخر دەوڵەت لە ڕێی ئەو ڕادیۆیە، بەردەوام، بە شەو و بە ڕۆژ، هەموو ڕۆژێک و هەموو کات قسەی بۆ دەکردن.

ئەوەش بۆ هەر چاودێرێک ڕوون و ئاشکرا بوو، کە دەوڵەتی سۆڤیەت هەر لە سەرەتاوە خۆی تاکە ناوبژیوان و تاکە "بەڵێندەر" بوو. پرسیارەکەش ئەوەبوو، ئاخۆ لە ژێر ڕۆشنایی پێناسەکەی لینین، " چینی چەوسێنەر" و "چینی چەوساوە" لە ڕووسیا، هەنووکەش چینەکانی بەر لە شۆڕش، خاوەنی کارخانەکان و زەوییە کشتوکاڵییەکان، بە تەواوی لەبەینبراون. لە بەرانبەر ئەم پرسەدا، کێشەی یەکسانی کۆمەڵایەتی لە کۆمۆنیزمدا بەهەموو جددیەتی خۆی و هەموو هەراسانییەکانی خۆی سەرهەڵدەدا.

پێموایە زاڵبوونە ڕاستەقینەکەی کۆمۆنیستی - نەوەک بە هێزی فیزیکییەوە بەڵکو بە ئامرازەکانی هزرەوەیە - لە ڕێگەی دروشمی یەکسانی گەیشتە لوتکەی خۆی. هەرچەندە کۆمۆنیزم بەڵێنی زەوی بۆ وەرزێر، ئاشتی بۆ سەرباز، نان بۆ برسی و باشترکردنی بارودۆخی ژیان بۆ هەمووان دابوو، لێ ئەم بەڵێنانە - وەک هەموو بەڵێنی ئادەمیزاد - دەکرێ (لە ڕاستیشدا هەروابوو) وەک گومانێک دابنرێ.

واقیعـیش سـەلماندی، ئەم گومـانە بـێ زەمیـنە نەبـوو. لە بەرانـبەر ئەمەشـدا، هـیچ شـتێکی گومانـاوی سـەبارەت بە خەبـاتی مـرۆڤ بـۆ یەکسـانی لە ئـارادا نیـیە. ئـاخر ئەویـش هەروەک ئـازادی خەبـاتێکی سروشـتکردە. دەکـرێ ئەمەش سـەرکوتبکرێ، بەڵام تێکناشـکێندرێ. تـا ئەو کـاتەی تـوێژێکی زۆر لە ڕەگەزی مـرۆڤ هەر بە ڕاسـتی بڕوایـان بەوە هەبـێ، کە جیـاوازی لە دایکبـوون، جیـاوازییێکی سروشـتکردەییە، ئەوا خەبات بۆ یەکسانی دەچێتە سووڕی متبوونەوە. بەڵام هەر لەگەڵ ڕۆژە بەراییەکـانی شۆڕشـی فەرەنسـا و شۆڕشـی بـاری دەروونـی گشتی، کە وەک دەرچەیەکی جەنگی یەکەمی جیهانی لێهات، ئیدی کەس لە جیهانـدا نەمـا، هێشـتا بـڕوای بە جیـاوازی سروشـتکردە لە نێـوان نیشتەجێی شوێنەکان و ئەوانەی برسی دەبن هەبێ. کۆمۆنیزم هانیدان دژی ئەو جۆرە جیاوازییـانە بوەسـتنەوە. ئەم پرسـە هێشـتاش هێـز و گوڕە سەرەکییەکی هەر تێداماوە.

شتێکی ڕێکەوت نەبوو شۆڕشی کۆمۆنیستی - بە پێچەوانەی پێشبینییە ناسـراوەکەی مـارکس - لە وڵاتە دواکەوتووەکـان نەوەک پەرەسـەندووەکان سـەرکەوت. لە وڵاتە گەشەسـەندووەکان پێواژۆکـانی دەوڵەمەندبوون لە سـەرێکەوە و بەردەوامیش برسیکردنی ئەوانـی دیکە (بنەمـا گریمـانەییەکەی پێشـبینییەکانی مـارکس) ڕووی نەدا. ئەمەش بە گـوێرەی دانەری سـەرمایەکە Das kapital، پێـواژۆیەکە، هەر دەبـێ چینایەتی لێبکەوێتەوە: خەڵکانێکی ژمـارە کەم، هەمـوو شـتێکیان هەیە و زۆرینەیەکـی پـانوپۆڕ لە هەمـوو شـتێکیان کەمە. بەڵام لە وڵاتە دواکەوتووەکـان ئەو بۆشـاییە بەرفـرەوانەی جیـاوازی هەبـوو و بەردەوامیشـە. لەوێ چینەکـانی خەڵـک لەگەڵ ئامرازەکانیـان، بە خۆپەرسـتییە کوێرانەکەیـانەوە، هـیچ هەوڵ و کۆششـێک بـۆ بەردەبـازکردنی ئەو کەلێنە، بۆ لەیەکنزیکردنەوە و بەیەکەوە گەیـاندنی بەشـەکانی کـۆمەڵ لە ئـارادا نیـیە. چینەکـان مـۆری نوشسـتییان لە نێوچاوان دراوە. بۆ مرۆڤایەتیش کە ناچـارکراوە خەبـات بۆ یەکسـانی

بکـا، دەمـێکە کـاروانەکە بەڕێـوەیە. ئەوەی دەگـاتە سـەر کەلێـنەکە ئەو بژاردەیەی لەپێشـە، ئایا بەردەبازێک دروسـتبکا یاخود بکەوێتە نـاوی. کـاتێکیش خەڵـک پـردەکە دروسـتناکەن، هەڵـبەت ڕەوشـەکە بەرەو تەقینەوە دەڕوا، ئەوسا کێفەڕات جێگەی پێواژۆکە دەگرێتەوە.

لە ڕووسیا ئەم جۆرە تەقینەوەیە قەوما. چینە خاوەن زێدەمافەکان بە ئـامرازە هەبـووە زۆر و زەوەنـدەکانیان، لە خەرەنـدی دۆزەخەکەدا غلۆربوونەوە. شۆڕشەکەش سەرکەوت. هەموو کەسێکیش وەهـای دانـا سـەعاتی فەرمـانڕەوایی یەکسـانی هـات. ئەرێ کـاتەکەی هـات؟ ئەرێ یەکسانی لە وڵاتی کۆمۆنیزم زاڵ بوو؟

مـن هەمیشـە وێنەی ئەو ئـافرەتەم لەبەرچـاوە، کە بە تـۆمەتی گومـانی سـیخوڕێتی بە پێنج سـاڵ زینـدانی کرابـوو. مـن ئەوم لە کەسـاسـیی و مەلوولی خۆیدا بینی، بەڵام لە گێڕانەوەی بەسـەرهاتەکەی خۆیدا، مرۆ دەیتـوانی ئەوە ببینـێ، جارێـک ئەو ژنە زۆر دڵخـۆش و بە شـێوەیەکی بەراوردکـاریش بـێ، زۆر خۆشـگوزەرانیش بـوو. ئـافرەتەکە پـاڵتۆ فەرووەکەی لە مۆسـکۆوە لەگەڵ خـۆی هێنـابوو. مێردەکەشـی بەڕێـوەبەری کارخـانە بـوو، خـاوەن مـووچەیەکی بەرچـاو و زۆر بـوو، بەرزتـر بـوو لە کرێکارەکـانی کارخـانەکە. بەو هـۆیەوە مێـردەکە تـوانی پـاڵتۆیەکی فەروو بـۆ ژنەکەی بکـڕێ. ئەو هەر وەک پیـاوێکی دەوڵەمەندی هەر وڵاتێکـی دیـکە لەگەڵ ژنە گەنجەکەیدا جووڵایەوە. لە خۆشەویسـتییەوە هەمـوو شـتێکی بـۆ ژنەکەی دەکرد. بەڵام ئایا لەگەڵ کرێکار، لەو هەموو ملیۆنانەی لە ڕووسیا کاریان دەکرد، دەکرا هەمـان دەربڕینی هەست و سۆز لە گۆڕێدا هەبێ؟

ئەو پاڵتۆ فەرووداره تـاکە شـت نەبـوو، کە لە یەکێتیـی سـۆڤیەتدا بینیم. ڕۆژێکیان، لە سـەر شـەقامەکانی «تاشـکەند»دا، تووشـی دوو ژنـی جل کەشخەی بەژندرێژ هاتم، پاڵتۆی فەروویان بەسەر شانەکانیاندا دابوو. بـۆنی خـۆش لەو خانمـانەوە دەهـات. ئەوان خەریکـی پیاسـەی خۆیـان

بوون. بە تەنیشت یەکێکیاندا، ئەفسەرێک بە پلەی ژەنەڕاڵ دەڕۆیشت؛ بە تەک خانمەکەی دیکەشدا، پیاوێکی مەدەنی بە جلوبەرگێکی کەشخەوە دەڕۆیشت. لە دەوروخولی ئەو دوو جووتە خواپێداوەدا، هاولاتی جلشڕ، سەرڕووت، زگبرسی، کە ئەسپێ خواردبوونی، دەڕۆیشتن. تەنیا پاش چەند ساڵانێکی زۆر، شتێکی وەک ئەو فەرووەی دوو خانمە سۆڤیەتییەکەم لە کۆمەڵگەی «ئەلیزێ»، لە «پاریس» بینی.

بەڵام خۆ دەکرێ ئەم شتە پرسە ڕاستەقینەکە نەبێ. بڕیارە یەکلاکەرەوەکە بەوەی زێدەماف[164] – کە لە جلوبەرگی نایاب یان خانووی گەورە و شیک یاخود خۆراکی چەور و باش خۆی نمایشدەکا – بەشێکن لە شتی تاکەکان (کە ڕیزپەڕە لە ڕێسای گشتی) یان هی سەرجەم چینەکەی کۆمەڵگە. کاتێکیش زێدەماف دەدرێتە چینێکی تایبەت و هەر تاکێکی نێو ئەو چینە، ئەوا لەچاو یەکێک لە گوتە پەسەندکراوەکانی مارکس دەبێتە "چین". ئەوەش بایەخی نییە، ئەگەر هاتوو زێدەماف تاکەکانی ئەو چینە بە هۆی پیشەکەیانەوە بوو یاخود پلەوپایەیان. ڕاستییەکە هەبوونی زێدەمافی چینەکە دەیخوا.

لە «تاشکەند» و «سەمەرقەند»، لە « دژیزاک» و «مارگیلان»، لەو شوێنەی کە زیاتر لە شارەکانی دیکەدا لێیمامەوە، توانیم جیاوازی نێوان چوار جۆرە "بازاڕ" لە یەکێتیی سۆڤیەتدا بزانم. دەوێرم بڵێم زیاتر لە چوار جۆر هەبوون، بەڵام لە ڕووی بنەماییەوە هەموویان یەک بوون، لە هەمووشیان تایبەتمەندتر تا بڵێی نایەکسان، یان کورتهێن لە یەکسانی، مایەی نیگەرانی بوون. لە چاوی چاودێری کەسەکییەوە دەمتوانی «سپێتس» بازاڕ، «ڤۆین» بازاڕ، بازاڕی شارەوانی و بازاڕی گشتی بە ڕیزبەستنەکانیان جیابکەمەوە.

---

[164] – زێدەماف: ئیمتیازات

بـازاڕی سـپێتس تـۆرگ (Spetz –torg)، بەتەواوی واتـای وشـەوە بازاڕێکی تایبەت بوو. هەرچەندە ناوەکەشی سروشتێکی تایبەتمەندانی بـازاڕێکی تـایبەت" بـوو. نـاوەکەی تایبەتمەنـدییەکەی دەردەخسـت، دیـاربوو بـازاڕەکە بـۆ کێـیە، یـان کێـی پێـوە پەیوەسـتە. ڕاسـتییەکەی ئەوەبـوو، بـازاڕەکە تـایبەت بـوو بە خەڵکـی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی. لە دووکانەکـانی سـپێتس بـازاڕدا، کەسـێکی لێنەبوو پلەیەکی لە نێو دەزگەی ئاسایشـدا نەبێ، کەسێک نەیدەتوانی شتی لێبکڕێ بەدەر لەوانەی باجێکی تایبەتی پۆلیسی نهێنییان نەبووبێ. تەنـانەت ئەندامەکانی پـارتی کۆمۆنیسـتیش، یـان ئەو کەسـانەی پلەی باڵایان لە نێو میکانیزمی پارتەکەدا هەبوو، نەیاندەتوانی لەو سپێتسـەدا، بازاڕبکەن. لەوەش زیاتر، کاربەدەستە باڵاکانی حکوومەت و ئەفسـەرە پلەباڵاکـانیش لەو بـازاڕە سـوومەند نەبـوون. ئەوانەی بە تەنیـا دەرگەی ئەو بازاڕەیان بۆ ئـاواڵا بـوو، خەڵکانی دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی، خێزانەکانیـان سـوودمەند بـوون. لە مـاوەی جەنگیشـدا، لەو کاتەی دانیشتوانی یەکێتیی سۆڤیەت بەزۆری برسـی بوون و بەوپەڕی پاڵەوانێتیشـەوە بەرگەی قاتوقڕییەکەیـان دەگـرت، خەڵکـی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، نەخاسمە پلەباڵاکانیان، بۆیـان هەبوو، نانی سپی، کەرە، گۆشت و هەموو شتێکیان لە دووکانەکانی ئەو بازاڕە تایبەتییەدا دەستبکەوێ. هەندێ جار، هەنـدێ لە کەلوپەلەکـانی بازاڕەکە بۆ بازاڕی دیکە دەنێردران کە ئاماژەم بۆ نەکرد، لە ڕووسـیا ئەویش پێیـدەگوترا بـازاڕی ڕەش. لە نێـو پاسـەوانانی شۆڕشـەکەدا کەسـانێک هەبوون پارەیەکی کەمیان دەستدەکەوت، بەڵام خۆ ئەمە پرسێکی دیکە بوو.

بازاڕی سوپاش (ڤۆین تۆرگ Voin torg) لەسەر هەمان بنەماوە تەنیا بۆ خەڵکی نێو سوپا بوو. لەو بازاڕەشدا هەندێ شت هەبوو، هاووڵاتیی ئاسـایی دەسـتی نەدەکەوت. بەڵام ئەم بـازاڕە لە هـی یەکەم هەژارتـر بوو. هەندێ جاریش بازاڕی ڕەش لەو بازاڕە کاڵای بۆ دەچوو.

بازاڕی کراوەی شارەوانییش بۆ هاوڵاتییە سۆڤیەتییەکان کراوە بوو. چەند جۆرە خواردنێکی دیاریکراوی تێدا دابیندەکرا، بەرهەمەکانی ئەو کۆلخۆزییانەی تێدا دەفرۆشرا، کە بۆ خۆیان کاریاندەکرد. هەندێک جار شتی وەک ئارد، میوە و سەوزەی لێدادەنرا. بەڵام نرخی ئەم بازاڕە چەندقات لە بازاڕەکانی دیکە گرانتر بوو. هەموو کرێکارێکیش نەیدەتوانی خۆراکی ڕۆژانەی پێویستی خۆی بە پێی پێوەرەکان لەبەر نرخگرانی یان لەبەر نەمانی شتەکان، یان لەبەر کەمکردنەوەیان لە کاتی جەنگ (کە بە خۆم ئەمەم بینی) پێبکڕێ.

بۆ سەربازی سادە، بۆ ئاپۆرای کرێکار و خەڵکی پیشەمەندیش بازاڕێکی گشتی دابەشکردن هەبوو، کە نرخی شتەکانی هەرزان بوو، بەڵام شتەکانی بە ژمارە سنووردار بوون بەتایبەتیش نان.

بەم جۆرە بینیمان، لە سەروی قووچەکە تایبەتییەکەی ڕووسیادا، پۆلیسی نهێنی بە خۆی و بازاڕەکەی وەستابوو. لە بنکەکەشی حەشاماتی خۆڵەمێشی کرێکاران و ڕەنجدەران بوو. پلەی ناوەڕاستیشی لە ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی و کاربەدەستانی حکوومەت پێکهاتبوو. ئەمەش لە ڕوانگەیەکی کۆمەڵایەتییانە (سۆشیال)ی دابەشکردنی کاڵا جەوهەرییەکان بوو، هەڵبەتە شتەکەش گردەبڕ و یەکلاکەرەوە بوو. هەرچی لە گۆشەنیگای داهاتی داراییشەوە بوو، بایی خۆی گرنگ بوو، بەڵام بڕیاردەر نەبوو، توێژەکانی گۆرانیبێژان، موزیکژەنان، ئەکتەران، نووسەران و هونەرمەندە هەمەجۆرەکانیش لە پلەی هەرە سەرەوە بوون. هەر توێژێک بازاڕی خۆی هەبوو، هەر چینێکیش زێدەمافی خۆی.

جیاوازی چین و توێژەکان لە ڕووسیا لە جیاوازییەکانی هیچ وڵاتێکی دیکە نەدەچوو. بە پلەی یەکەم، بنەمای ناسینەوەیان جیاواز بوو لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا، بنەماکەی موڵک و سامان بوو؛ کەچی لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا بنەماکە ئەرکی کەس بوو لە نێو پێکهاتەی میرییدا.

جیـاوازی دووەمـیش ئەوەبـوو، لەو ڕووسـیا مـرۆڤ ئەو جیـاوازییە چەندایەتییە قەبەیەی لە نێوان پشکەبوونی بەرھەمی زۆر و کرێکارە بەکرێگیراوەکان یان پیاوە یەخە سپییەکان نەدەبینی وەک لە وڵاتەکانی دیکەدا ھەبـوو. لە نەمـان و لە نەبـوونی ئەو جیاوازییـانەدا، بە تـایبەتی ھەمـوو ڕووسـییەک، تەنـانەت نەوەی پێشـووش، کە ڕۆژگـاری دیـکەی بینیبـوو، بەو شـتەش شـانازی بە خـۆیەوە دەکـرد. زیـاتر لە جارێـک تووشی ئەو حاڵەتە بووم، گوێم لە ڕووسێک بووە گوتوویەتی:

"ئەرێ کارخـانەی گەورە دەبینـی؟ ئەمەیـان سـەر بە ھـیچ مـاخۆیەکی کارخانە نییە."

ئاخر ڕووسەکان ئەوە نالێن: "ئەم کارخانەیە ھی ئێمەیە." دەکرێ بڵێن: "ئەم کارخـانەیە ھـی حکـوومەتە." بە گشـتی ئەو بە ڕاسـتییەکی نەرێنـی قەناعەتی بەخۆی ھێناوە، ھەر ئەمەشە وایلێکردووە شانازی پێوەبکا.

گرنگتـرین جیـاوازی ڕاسـتەقینە لە نێـوان "چینەکـان" لە ڕووسـیا چەنـدایەتی نـین، ھەرچەنـدە ئەو جیـاوازییە چەنـدایەتییانە ھەن و بەرچاویشن. لێ گەلۆ گرنگترین جیاوازییە ڕاستەقینەکان، کە بە چاوی خۆم بینین چۆنایەتییەکان بوون.

جیـاوازیی نێـوان کەسـێک کە ژەمەخـواردنێکی چەور و بەتـام و کەسێکیش کە بڕی برسیەتیەکەی بە شتێکی کەم بشکێنێ، جیاوازییەکی چەندایەتییە؛ جیاوازی نێوان کەسێکی ڕەزامەند و برسی جیاوازییێکی چۆنایەتییە. جیاوازی نێوان پیاوێک کە سێ قات جلی ھەبێ و یەکێکیش تەنیا قاتێکی تاقانەی ھەبێ، جیاوازییێکی چەندایەتییە؛ ھەرچی جیاوازی نێوان پیاوێک، کە قاتێکی گونجاوی لەبەردا بێ و کەسێکیش جلشڕ بێ، گوشی لەبەردابێ، جیاوازییێکی چۆنایەتییە. جیاوازی نێوان پیاوێک سێ جووت پێڵاوی لە دۆلابی پێڵاوگرەی ماڵەوەدا ھەبێ لەگەڵ یەکێک تەنیا یەک جووت پێڵاوی ھەبێ، جیاوازییێکی چەندایەتییە؛ کەچی جیاوازیی

نێوان کەسێک کە جووتپێڵاوی هەبێ و یەکێکیش نەیبێ و پێخواس بێ، ئەوە جیـــــاوازییێکی چۆنـــــایەتییە. دەق ئەوانەش ئەو جیـــــاوازییە کۆمەڵایەتییـانەن لە بـواری کـۆمەڵایەتی - ئـابووری کە لە ڕووسـیادا بەچاوەکانی خۆم بینیمن. من کەسانی ورگپڕ و زل و برسیشم بینین، بینیم جلێکی جوان و کەشخەی لەبەردایە، بینیم جلەکانی شڕۆڵ و پینە پینە بوو، بینیم بە پێڵاو و بێ پێڵاویشم بینین. لێرەدا دادپەروەرییێکی زۆر لە هەبـوونی جیـاوازییە چەندایەتییەکانـدا نیـیە؛ بەڵام جیـاوازییە چۆنایەتییەکان پیاوێک لەگەڵ یەکێکی دیکە ناچارەکییە.

خەڵک ئەو ڕاستییەیان بەبیردەهێنامەوە، کە خۆم لە سەردەمی جەنگی یەکەم جیهانی لە ڕووسیا بووم و مشتومڕ لەسەر ئەوە بوو کە نابێ ڕەوشی ڕۆژانی ئاشتی بەسەر ڕەوشی ڕۆژانی جەنگدا دادوەر بێ. من تەنیا پەنابەر و زیندانییە ئازادکراوەکانم نەبینین؛ من شێوازی ئاسایی ژیـانی هاووڵاتیـانی سۆڤیەتیشـم لە ماڵوحـاڵی خۆیـان بینـی. ئەوان هەمیشـە لەبەر لێشـاوی پەنـابەران دۆڕاو نەبـوون. بە پـێچەوانەوە، هەندێ جار تێیدا سوودمەند و دڵشادیش بوون بەوەی کراسێک یان پـاڵتۆیەک یـان جـووت پێڵاوێـک بکـڕن. زۆر جـار دەمپرسـی، ئەرێ جیاوازی لە ئازووقەی خۆراک بەر لە جەنگ و لە کاتی جەنگدا هەبوو. وەڵامیاندەدامەوە، بەڵـێ جیاوازی هەبـوو، بەڵام جیـاوازییەکە زۆریـش گەورە نەبـوو. ئەوان هەمیشـە بە قـاتوقڕی ئاشـنا بـوون، وەک خۆیـان دەیـانگوت، شەرمیشـیان لێنەدەکـرد. بە کـردەوە ئەو ڕاگەیەنـراوەیە، کە زۆر جـار لە ڕووسـییەکانم بیسـتبوو، بە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ دژبەرییێکی تێدابوو لەگەڵ ئەوەی سەربازەکانی لە «ڤیلنا» و «کۆڤنۆ» گوتیـان. ئەو سـەربازانە وەهـا ڕاهـاتبوون بڵـێن: "لە ڕووسـیا هەمـوو شتێکمان هەبوو - ئایا حەزت لە شخارتەیە؟ - ئێمە لە ڕووسیا هەموو شتێکمان هەبوو!" بەڵام لە «ڤیلنا» گوێم لە چیرۆکی گوڵگوڵی بوون لە بارەی ئۆردوگاکانی کار!

خەسڵەتە هەرە بەرچاو و بێچمە زەبروەشێنەکەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی سۆڤیەت لە ڕووی ئابوورییەوە باڵادەستێتی کەسانی نێو داودەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو. ئەوان هەمیشە جوان و جلێکی کەشخەی فەرمییان لەبەردابوو. پێڵاو و جزمە پانیبەرزەکانیان هەر بریقەیان دەهات. خواردنیان لە بازاڕی تایبەت دەکڕی. هەروەک «گارین» پێیگوتم، گۆڕانکاری لە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتیدا ببووە بەڵگەیەکی بواری ئابووری. لە سەردەمی لینیندا هێزی پۆلیسی نهێنی داردەستێک بوو لە دەستی حوکمگێڕانی پارتی کۆمۆنیست. ( ئەوێ ڕۆژێ بازاڕی تایبەت نەبوو). لە ڕۆژانی ستالینیشدا پارتی کۆمۆنیست ببووە ئامرازێک بە دەستی هێزی حوکمڕان کە دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو. (ئیدی بازاڕی سپێتز هاتە ئارا.) بە بەراوردکردن دەسەڵاتدار بووە دەوڵەمەند و دەوڵەمەندیش بووە دەسەڵاتداری ڕەها.

دەکرێ یەکێک بپرسێ: ئایا لەوێ لە نێو گەلی ڕووسیادا ئیرەییبردن سەبارەت بە زێدەمافەکان لە گۆڕێدا نەبوو؟ خۆ ئەگەر جیاوازییەکان جیاوازی نێوان کەسی ڕەزامەند و کەسی برسی، جیاوازیی نێوان پێڵاودار و بێپێڵاو بێ، باشە بۆچی شتێکی سروشتی نەبوو هەروەک وڵاتەکانی دیکە ئێرەیی دەربڕین هەبێ، نەخاسمە لەو وڵاتانەی کە جیاوازییە چۆنایەتییە ئابوورییەکان لەنێوان چینێک و چینێکی دیکەدا هەبن؟

دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی وەڵامی ئەو پرسەی داوەتەوە. ئاخر دەزگەکە سەرکەوتووبوو لەوەی لە مێشکی هەموو دانیشتوانی سۆڤیەتی ئەوە بسەلمێنێ، کە بە شێوەیەکی ڕەها دان بە بێمرادی و نەزۆکی و بێ ئەنجامی هەر هەوڵێکی بەرهەڵستییانەی حکوومەتدا بنێن. دەزگەکە لەوەدا سەرکەوتوو بوو ترسوبیم بترنجێنێتە نێو مۆخی ئێسقانی هاووڵاتییەکانی. ئەوەش وەنەبێ ترسێکی ئاسایی

بێ لە دەسەڵات و سزاکەی. بەڵکو ترس و تۆقین بوو لە ڕوودانی کێفەڕات. کێفەڕات لەسەر کێفەرات! وەک ئەوەی لە خەرەندێکی قووڵ و تاریکی هەزار بە هەزاری جەهەننەماوی بە دەستەکانی خۆی هەڵواسرابێ، بەم جۆرە هاووڵاتی سۆڤیەتی بە بینینی کڵاوسەوزەکانی دەزگەی ئاسایشی وڵات زەندەقی دەچوو.

بەڵێ، ئیرەییێکی قووڵی "کۆمەڵایەتی" لە ڕووسیا هەبوو، هەروەک چۆن لە وڵاتانی دیکەشدا هەیە؛ بەڵام لە وڵاتەکانی دیکەدا، هەندێک جار ئیرەییەکە لە ترس بەهێزترە: هەرچی لە یەکێتیی سۆڤیەتییە، ترس لە ئیرەیی بە هێزترە.

هەرچەندە یەکسانیی ئابووری لە ڕووسیادا نییە (وێرای بەڵێنەکانی کۆمۆنیزمیش)، لەوێ لە بن قەڵەمڕەوی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا یەکسانییێکی دیکە هەیە، ئەویش: یەکسانیی ترسە.

۲۳

# ڕێساکانی ڕیزبوون

لەم سەر بۆ ئەوسەری یەکێتیی سۆڤیەت هەر گوێت لەم پرسە دەبێ: "تۆ بڵێی ئەوانە چی دابەشبکەن؟" هاووڵاتی یەکێتیی سۆڤیەت ناپرسێ: "تۆ بڵێی ئەوانە چی بفرۆشن؟" ئەوەی دەیپرسێ ئەوەیە: "Chto diut?" – ئەرێ ئەوان چی دەدەن؟ بە وەڵام وەرگرتنەوەش ڕیزی خۆی بەستووە. ئەگەر هاتوو دوای شەکەتبوون و چاوەڕوانییەکی زۆر، بەختی هەبوو، ئەوا پارەی خۆی دەدا و ئەوەی "دەیدەن" و نۆرەی بۆ گرتووە وەردەگرێ. کەسانی وام بینین، هەر ڕیزێکیان بینیبێ، بێ ئەوەی پرسیارە سادەوساکارەکەش بکەن، یەکسەر نۆرەکەی خۆیان دەگرن. لە کۆتاییشدا بۆیان دەردەکەوێ، ئەمە نە ڕیزبەستن بووە بۆ نان، نە بۆ سابوونیش، بە ڵکو ڕیزبەستنێک بووە بۆ پاککەرەوەیەکی منداڵان یان هەر شتێکی لەو جۆرە.

لە گەڕەکەکەی لای خۆمان لە «دژیزاک» بە ژنێکی بنجوو ئاشنابووم، مێردی بە ڕووسییێک کردبوو. ژنە ڕووخسارێکی فریشتانەی هەبوو، بەڵام ژیان لەگەڵیدا زۆر دڵڕەق بوو. لە ئاکامی ڕووداوێکدا، هەردوو قاچی لەدەستدابوون و ببووە پەککەوتەیەکی بێچارەسەر. مێردەکەشی پیاوێکی درێژی بە جۆش و ڕووخسار جوان، بە تەواوی بە دڵ و گیان دڵسۆزی بوو. هیچ منداڵیشیان نەبوو. دەبوایە پیاوەکە نەوەک هەر ڕۆژانە بەشە کارەکەی خۆی بکردبایە، بەڵکو دەبوایە دواتر بە

چەندین سەعات - هەندێ جاریش تا درەنگانی شەو - لە ڕیزە هەمەجۆرەکاندا بوەستێ بەڵکو پێویستییەکانی ماڵ بەدەستبێنێ.

ژنەش بۆ مێردەکەی بە داخ بوو، چونکە هەروابوو بە ماندوویی دەگەڕایەوە ماڵ، ئیدی بە دڵشکاوی هەم لە کار و هەم لە ڕیزە دوورودرێژەکان دەگەڕایەوە. زیاتر لە جارێک خانمەکە دەردەدڵی سەختییەکانی ژیانی خۆی بۆ باسکردم، ئاخر ئەو ڕیزبەستنە هەرچی کاتی بە دەستەوە مابوو لەگەڵ ئەو بۆرە ئازادی و وزەیەی لە دوای کارەوە بۆی مابووەوە، دەفەوتاند. منیش لێمپرسی، ئەرێ هەروا بووە، هەمیشە ئەو نۆرەگرتن و ستوونی ڕیزبەستنانە لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا هەبوون، یان ئەم دیاردەیە بەرەنجامی جەنگ و لێشاوی ئاوارە و پەنابەرانە. ئەویش بە ڕوومدا پێکەنی و گوتی: "شتێکی مەحاڵە ئەگەر لێرە پرسی ڕیزبەستن لە گۆڕێدا نەبێ. ئەو ڕیزبەستنانە بەر لە جەنگیش هەر هەبوون، هەمیشە دەبوایە لە ڕیز بوەستین. بەڵام خۆ ئێمە شەرممان پێ نییە. ئێمە دەزانین، گەلی تۆ لە دەرەوە باشتر دەژی، بەڵام ئێمە بۆ نموونەیەکی مەزن تێدەکۆشین. شتی گرنگیش ئەوەیە، ستالینمان لەگەڵدایە. ئاستەنگییەکان پرسێک نین، ئەوان تێدەپەڕن؛ تەنیا ئەوەندەمان بەسە، ستالینمان لە نێواندا بێ. هەنووکەش، کاک «مناحیم وۆلفۆڤیچ» تکایە پێمبڵێ، ئەدی لە وڵاتەکەی تۆ شتەکان چۆن بوون. ئێو چۆن دەستتان بە ئازووقە و خۆراک ڕادەگەیشت؟"

منیش وەڵاممدایەوە، "زۆر ئاسان، ژنەکەم زەنگ بۆ دووکاندارەکەی هەرە نزیک لێدەدا و داوای نقێشک، پەنیر، و هەر شتێکی دیکەی پێویستدەکا، شاگردی دووکانەکەش هەموو شتەکانی بۆ دەهێنێتەوە بەردەرکەی ماڵێ."

بەم وەڵامە، ژنەکە خەریک بوو لە بەر پێکەنین بەپشتدا بکەوێ.

منیش بە سەرسوڕمانەوە لێمپرسی: "ئەوە بە چی پێدەکەنی؟"

بە زەحمەت توانی بەسەر قرتەی پێکەنینەکەیدا زاڵ بێ. ئینجا گوتی: "سەیرکە، ئێمە وەک دوو برادەر قسە لەگەڵ یەکدی دەکەین. من ڕاشەکاوانە باسی ڕەوشی ژیانی خۆمانەمان بۆ کردی، باشە ئەدی تۆ بۆ پروپاگەندەی ئیمپریالیزمیانەم بۆ دەڵێیتەوە؟"

منیش بە حەپەسانێکی زیاترەوە لێمپرسییەوە: "چ جۆرە پڕوپاگەندەی ئیمپریالیستیانە؟ ئەوەی پێمگوتی، ڕاستی بوو. سوێندت بۆ دەخۆم، ژنەکەم بۆ کڕینی کەلوپەل و پێداویستییەکانی ڕۆژانەی ماڵەوە، زەنگ بۆ دووکاندارەکە لێدەدا، هەندێ جاریش، بە خۆی دەچووە دووکانەکە. چییە، دەڵێی بڕوام پێناکەی؟"

"بوەستە، توخوا بوەستە. خۆت دەزانی هەرگیز پێتڕانابوێرم، ئەدی تۆ بۆ بە من ڕادەبوێری؟ تۆ خەریکە شێتم بکەی؟ من گوێم لە هەندێ پڕوپاگەندە سەبارەت بە ژیان لە وڵاتانی ئیمپریالیستی بووە، بەڵام بۆچی تۆش هەمان شت کاوێژ دەکەیتەوە؟ من لەوە تێدەگەم، گەلی ئێوە ژیانێکی ئاسانتری لە هی ئێرە هەبووە. بەڵام بەوەی زەنگ لێبدەی تا کەرە، پەنیر، میوە و شتەکانی دیکەتان بۆ بێتە بەردەرکەی ماڵێ ... هەموو ئەو شتانەش شاگردەکە بیهێنێتە بەردەرکەی ماڵێ؟ تکایە، مناحێم بوەستە، چیدی وەها مەڵێ. هەوڵمەدەوە ئەو بەندوباوەم بۆ بگێڕیتەوە."

بێهوودە بوو، هەرچەند تێکۆشام و گوتم، نەمتوانی قەناعەتی پێبهێنم، کە ئەوەی پێمگوت، ڕاستی بوو. ژنە لەسەر پێکەنینەکەی خۆی بەردەوامبوو، ئەو قسەیەشی هەر دووبارە دەکردوە: "دەی بوەستە، توخوا بەسیەتی!" لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا بڕوای بەوە نەدەکرد، کە ئێمە ڕیزمان بۆ پەیداکردنی ئازووقەی ڕۆژانە نەدەبەست، لەوێ لەو وڵاتانە تەنانەت بۆ شتە خۆش و بە تامەکانی وەک پەنیری سویسریش

پێویستی بە ڕیزبەستن نەبوو، بەڵکو دووکاندارەکە دەیگەیاندەوە ئەو ماڵەی داوایدەکرد. ژنە ئەو شتەی بەدەر لە پڕوپاگەندەیەکی ئیمپریالییانە بە هیچی دیکە نەدەزانی. خۆی و مێردەکەشی لە نەوەی شۆڕشەکەدا، هەرگیز خەونیان بە شتێکی وەها نەدەبینی، بەوەی بە تەلەفۆن داوای ئازوقە بکەن و بۆیان بێتە بەردەرکەی ماڵەوە. لەوانەیە هیوایان خواستبێ ڕۆژێک دابێ ڕیزبەستن نەمێنێ، بەڵام گومانیان لە ئەگەری ڕوودانی ئەو حاڵەتەدا هەبوو. خۆ گەر هاتبا و ڕیزەکان کورتببنەوە، یان سەعاتەکانی چاوەڕوانی کەمببنەوە، ئەوا بە بەختی خۆیان قایلدەبوون و لە دوای ستالین دەنگیان هەڵدەبڕی و دەیانگوتەوە: "ژیان لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا ساناتر بووە، باشتر لە ...."

فەلسەفەیەکی تەواو لە پشت ڕیزبەستن لە ڕووسیا سەریهەڵدا. لە ڕیزەکاندا پیاو، ئافرەت، تەمەندار، گەنج، منداڵیش دەوەستان. ئەندامەکانی خێزان بە نۆرە شوێنی خۆیان لە نێو ڕیزبەستنەکەدا دەگۆڕییەوە. خێزانە گەورەکان، ئەوانەی منداڵیان زۆر بوون، لە ڕیزبەستنەکاندا ئەرۆستۆکراتی بوون. دەیانتوانی لە یەک کاتدا شوێنەکانی خۆیان لە ڕیزە جیاجیاکان بگرن. بۆ خێزانە بچووکەکانیش ئەم دۆخە سەخت بوو. هەرچی ڕەبەن و زگورتییەکانیش بوو، بە هیچ شێوەیەک هی ئەوە نەبوون، ئێرەییان پێببردرێ.

ڕۆژێکیان لە «سڤێردلۆڤسک»دا لە ڕیزێکی زۆر دووروودرێژی نانوەرگرتندا وەستابووم. نزیکەی هەزار کەس لە ڕیزەکەدا وەستا بوون. تادەهات لە بەرکەوتنی شتە دابەشکراوەکەدا نزیک و نزیکتر دەبوومەوە. لە پشتی منیشەوە بە سەدان کەس بەڕیز نۆرەیان گرتبوو. (هەمیشە ئەو ڕیزە دووروودرێژەی پشت تۆ نیشانەی سەبووری و دڵدانەوەت بوو. وەستانەکەی بۆ ئاسانتر دەکردی.) ئینجا لە پڕێکەوە ڕایانگەیاند؛ نانەکە تەواوبوو. منیش گومانم هەبوو، ئاخۆ چ خۆشییەک لەو کەسەی نۆرەی دەگەیشتێ زیاتر بێ. ئەو خەڵکانەی پشت کابرا،

بێمرادبوون، بەڵام خۆگریش بوون. لە سەرچاوەی دابەشکردنەکەوە بەڵێندرا، بەو زووانە نانی گەرم و نوێ دەگات. ئێمە دەبوایە چاوەڕێمان بکردبایە و شوێنەکەشمان لە نێو ڕیزبەستنەکەدا بپاراستبا. لە پڕ یەکێک لە نێو ڕیزەکەدا بانگیکرد: "ئەرێ کێ قەڵەمێکی پێیە، ڕەش نەبێتەوە؟" لەنێو حەشاماتی ڕیزبەستوودا یەکێکیان دۆزییەوە، قەڵەمێکی وەهای پێبێ. ئەویش قایلبوو قەڵەمەکەیان بداتێ. ئەو کەسەی بانگی قەڵەمەکەی کرد، بە خۆی و قەڵەمەکە بە ڕیزەکەدا چوو، لە بەری دەستی هەر کەسێکی وەستاو شتێکی نووسی، بە خەتێکی گەورە ئەو ژمارەیەی نووسی کە لە ڕیزەکەدا جێگەی گرتبوو. ژمارەیەکیش بەر من کەوت، ئینجا لەگەڵ باقی خەڵکەکە ئاشبەتاڵمان لێکرد. من مەزەندەی ئەوەم کردبوو، ئەگەر هاتوو دەستبەجێ نانەکەش بگا، دوو تا سێ سەعاتی هەر پێدەچێ تا نۆرەم بگاتێ. ئێنجا لێمدا و بەرەو ناوەندی شار کەوتمەڕێ، بەو هیوایەی هەر بە ڕێکەوت جوویێکی سۆڤیەتی هی نەوەی پێشتر ببینم. حەزم لێبوو بپرسم ئاخۆ کەنیشتە (سیناگۆگ)یان هەیە. پیرەجوویێکم بینی، بەڵام نەمتوانی هیچ کەنیشتەیەک بدۆزمەوە. لەوێشەوە چوومە ژوورێکی گشتی بۆ خوێندنەوە، لە ڕووسیا پێیدەگوترا agit - punkt، یان خاڵی پڕوپاگەندە. لەوێ یەک دوو ڕۆژنامەم خوێندنەوە و چەند لاپەڕەیەکی نووسینەکانی لینینیشم هەڵدانەوە. خوێندنەوەکە منی بۆ خۆی بردەوە و برسیەتییم لەبیرچووەوە. کاتێکیش گەڕامەوە لای نۆرەی خۆم لە ڕیزبەستنەکەدا، هیچ چارەی دیکەم نەبوو، دەبوو تا دوایی لەگەڵی بڕۆم. ژمارەی ناولەپی دەستم نیشاندان، بەڵام پێیانڕاگەیاندم ژمارەکەم تێپەڕیوە. ئیدی شوێنەکەی خۆم لەدەستدا. ڕیزیش ڕیز بوو، هی گاڵتەپێکردن نەبوو، سۆز و بەزەییش دادی نەدەدا.

لە ڕیزبەستنەکدا ڕێز نەبوو. گەنجێک شوێنی خۆی بۆ پیرەمێردێک چۆڵنەدەکرد، پیاو شوێنی خۆی نەدەدایە ئافرەت یان منداڵێک. ئاخر بە ئاسانی نەیاندەتوانی وەها بکەن. هەموو هەر برسی بوون. لە

سەرمانیش هەڵدەلەرزین. هەمووان خێزانێکی برسی چاوەڕێیان دەکردن. ڕیزبەستنەکان دەربڕینێک بوو بۆ شەڕی مانەوە. ڕێزگرتنیش یاوەری مانەوەیەک بوو بە بێ شەڕ بۆکردن. لە هەندێ لەو ڕیزانەی نۆرەم تێدا گرتبوو، حاڵەتی وەها هەبوو ڕێگەیان بۆ ژنێک بەردەدا، کە مەلۆتکەی لە باوەشدا بوو، کەچی لە ڕیزبەستنی دیکەدا، ڕێگەیان بەو جۆرە ژنانەنە نەدا بچنە پێشی پێشەوە. لەنێو ڕیزەکاندا پرتەوبۆڵەی ئەوە هەبوو، گوایە دایکەکان بۆیە کۆرپەکانیان دێن و لە باوەشیان دەگرن، تا زوو ڕیزپەڕبکرێن.

وشەی ڕووسی پریدوریتسا priduritsa کە واتای دووڕوویی یان خۆنمایشکردن دەگەیەنێ، لە زمانی ڕیزبەستنەکاندا ببووە ناو. وەنەبێ هەر ژنان بە خۆیان و کۆرپەی باوەشیان بە «پریدوریتسا» تۆمەتباردەکران، بەڵکو هەر کەسێک قسەی لەگەڵ برادەرێکی خۆی لە نێو ڕیزبەستووەکاندا کردبا، تۆمەتبار دەکرا. وەک ڕاستییێکیش، گومان هەبوون لە کەسانی وەها، بێ هۆ نەبوو. زیاتر لە جارێکم بینیوە، کەسانی وا هەبوون بێوەییانە قسەیان لەگەڵ هاوڕێکانیان کردووە کە زۆر نەمابوو نۆرەیان بگاتێ، پاش کەمێک و لەبەر چاوی ئەوانی دیکە خۆیان بە ڕیزەکەدا کردووە، بەمە چوونەتە پێشی پێشەوەی ڕیزەکە و بۆ وەرگرتنی شتە دابەشکراوەکە لە یەکەمەکان بوونە. هەر ئاسمانیش یارمەتی ئەو کەسانە بدا، کە هەوڵێکی لەو جۆرەیان بۆ نۆرەبڕی دەدا و تێیدا سەرنەدەکەوتن! خۆ ئەگەر کابرا لە خەت گیرابا، ئەوا ئەو پیاوەی قسەشی لەگەڵ دەکرد، هی ئەوە نەبوو ئیرەیی پێببردرێ. ئیدی دەبوە هاتوهاوار: هۆ، ئەوەی لەوێ! چییە دەڵێی هەوڵی ئەوە دەدەی ببیە پریدوریتسا؟" ئیدی هەموو ڕیزەکە هەر ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە.

هەر وەک ئەوەی برسیەتی گشتی و هەمیشەیی میواندۆستی گەرموگوڕی لە کەسایەتیی ڕووسییەکان بەلاوە نابێ، ئاوەهاش

ڕیزبەستنەکان هەموو پرسنییەکی تایبەتییان لەنێوان پیاو و هاوولاتییەکانی بەلاوە نا. لە «تاشکەند»دا، بە و ژنە نازدارەی بەشەنانی منی دەکێشا گوتم: "سوپاس". ئەویش ڕووی کردە هاوکارەکەی و بە لاقرتێوە پێیگوت: "گوێت لێبوو؟ سەیرکە، لە نۆرەی خۆی وەستاوە، پارەی خۆشی داوە و دەشڵێ سوپاس!"

مەترسی لەوەدا نییە، لە ڕیزبەستنەکەدا بەڕێز بیت، بەڵام مەترسی گەورەکە لە پەتای تیفۆکەدایە. دانیشتوانی «ئۆزبەکستان» پێیانڕاگەیاندم، تەنینەوەی پەتای تیفۆ لە ناوچەکەدا ڕووداوێکی سالانەیە. هەڵگرە سەرەکییەکەی ڕیزەکانن، ئاخر ئەسپێیەکان لە پیاوێک بۆ یەکێکی دیکە، ئەوانەی لە ڕیزەکە بۆ چەندین سەعات لەپاڵ یەک وەستاون، دەگوێزرێتەوە. ڕووسەکان بە شێوەیەکی بنەمایی بۆ بەرەنگاربوونەوەی پەتاکە، هانا بۆ ئەوەی پێیدەڵێن حەوزی "پاککەرەوە" گەورە دەبەن، کە لە دەرەوەی گەرماوەکان دانراون. ئەوەی دەچێتە گەرماوەکە، هەموو جلوبەرگەکانی بە هی ژێرەوەش دەخاتە نێو ئەو حەوزە، بە گەرما هەرەبەتینەکە هەرچی کێچ و ئەسپێی تێدایە لەناو دەبا. ڕووسەکان زۆر بەو ڕێکارە خاوێنکەرەوەیەوە شانازن. سەربازێکی سۆڤیەتی، کە تا هەڵگیرسانی جەنگی نێوان ئاڵمان - ڕووسیا هەر لە «لوۆو» بووە، جارێکیان سەرنجێکی وەهای دەربڕیبوو: "ئاها، بەڵێ، «لوۆو» شارێکی جوانە. سینەمای نازدار، قاوەخانەی گەورۆنەی لێن، بەڵام خەڵکەکەی ناشارستانن ... لە هەموو شارەکەدا تاکە یەک شوێنی پاککەرەوەم بەدی نەکرد." هەڵبەتە بە بێ ئەو حەوزە پاککەرەوانە دۆخەکە زۆر شڕتر دەبوو؛ بەڵام ڕیزەکان وەک هەمیشە ئەو شتەیان ژیاندەوە، کە حەوزە هەڵمینە گەرمەکان کوشتبوویان.

ئەرێ بۆچی دەسەلاتدارانی یەکێتیی سۆڤیەت ڕیزەکان ناهێڵن؟ بە شێوەیەکی بیردۆزیانە، ئاستەنگی وەها لە ئارادانییە، کە ڕیزەکان لە

بارودۆخی ڕژێمی یەکێتیی سۆڤیەت هەڵبگرن. ئەگەر لە شارێکی وەک «دژیزاک»دا دەسەڵاتداران دە دووکانی دیکەی نانفرۆشتن بکەنەوە، چیدی ڕیزەکان لەسەر شەقامە پیسەکاندا نامێنن. بەڵام لەوانەشە کارەکە وەها ئاسان نەبێ، گەر هاتوو ئێمە ئاستەنگییەکانی ڕێکخراوەیی تایبەت بە دابەشکردنی یەک سەرچاوە و یەک مەڵبەند بۆ دووسەد ملیۆن بنیادەم لەبەرچاوبگرین. ئەگەری ئەوەش هەیە، هۆکارێکی دیکە بۆ ڕیزبەستن لە ڕووسیا لە ئارادا هەبووبێ. سۆنگەی ئەوە هەیە، دەسەڵاتداران بەرژەوەندییان لە مانەوەی ڕێوڕەسمی ڕیزبەستنەکاندا هەبێ. ئەوەش ڕاستە کە ڕیزبەستنەکان سەرچاوەی نارەزایەتیی نێوخۆن، کە بە بێدەنگی سەرکوتکراون. لەگەڵ ئەوەشدا، تا ڕاددەیەک خەڵک لە ڕیزبەستن ڕاهاتوون، وەک هەر مەیلێکی دیکە، لە ڕاستیدا، هۆکاری هەوادارانی شۆڕشگێڕی ئەوەیە، ڕێگربن لەوەی هاووڵاتییەکان بیر لە شتی دیکە بکەنەوە. ئەو پیاوەی دەچێتە ڕیز و نۆرەی خۆی بۆ شتێک دەگرێ، تەواو بەوە سەرقاڵدەبێ، کە بگاتە پێشەوەی ڕیزەکە، بەوەی نۆرەی بێت تا شتەکە وەربگرێ و بە دەستی بەتاڵ نەگەڕێتەوە ماڵێ. تیشکی هەموو هزر و هۆشی لەسەر داخوازییەکە، لەسەر ئەو برە ئازووقەیەی وەریدەگرێ، چڕبۆتەوە.

سیستمی دابەشکردنی دەوڵەت، بە تاکمەڵبەندی خۆیەوە، بەوەی یاوەری ڕیزبەستنەکانە، بۆ ئەوە بوو، پێویستییەکانی پیاوە نێوەندگیرەکان لە نێوان بەرهەمهێن و بەکاربەر نەهێڵێ. لە یەکێتیی سۆڤیەتدا هیچ بازرگان لە ئارادا نین؛ دابەشکردنی کاڵای بازرگانێتی خۆیان "کارکەرە کاسبەکانن" . ئەوان کاربەدەستی میریین. بەڵام ئایا بازرگانێتی لە یەکێتیی سۆڤیەت بە لەناوبردنی چینی بازرگانەکان لەبەین براوە؟

خۆی تێبینییەکەی «گارین»: "ئێمە هەمیشە لە ڕووسیا لە هەموو شتێکدا کورتهێنین"، هەبوو، منیش بە کردەوە جەوهەرەکەیم

دۆزییەوە. بۆ چەندین ڕۆژ لە شاری «تاشکەند»دا بە دوای فڵچەی ددانشوشتندا دەگەڕام، بێ ئەوەی تاکە دانەیەکیش بدۆزمەوە. خۆ ئەگەر سەری پریمزی[165] گازەکە شکابا، زۆر زەحمەت بوو یەکێکی دیکە پەیدابکەی. کورتهێنانی بەردەوام شتێک نەبوو مایەی سەرسامی بێ. خۆت هەر بە تەنیا دەسەڵاتدار و بە تەنیاش هەر دابینکەری کەلوپەلەکانی ژیان بی، هەڵبەتە لە خواستی حکوومەتدا نەبوو هەمیشە بەکاربەرەکە بە پلەی یەکەم ئاسوودە بێ. خەمی لە پێشی داخوازییەکانی حکوومەت و پیشەسازی جەنگ بوو.

ئەو ڕووسیانەی قسەیان بۆ کردم، ئەو ڕاستییەیان نەشاردەوە؛ کورتهێنانی بەردەوامی پێداویستییەکان دەبێتە مایەی دیارنەمانی چینێکی نێو کۆمەڵ، ئەوەی هەلی لەباری بەکاربەران بۆ بەرژەوەندی خۆی دەقۆزێتەوە، بە قەولی ئەوان بازرگانەکان بوون. حاشاییشیان لەوە نەکرد، شتێکی باش دەبێ گەر یەکێتیی سۆڤیەت ڕێگەی "وردە بازرگانی" بدا. هیچ کامێک لەو ڕووسیانەی من بینیمن و قسەم لەگەڵ کردن، نەیانگوت، باشترە کارخانەکان بخرێنە بەردەستی کەرتی تایبەت. بەڵام هەمووشیان پێیانخۆش بوو، بازاڕی ئازادیی کۆلخۆزی بەرفرەوانتربکرێ: ئەوەش ئەوەی دەگەیاند بەشبەشکردنی زەوی، بۆ کارکردنی تایبەت لە لایەن جووتیارەکان زیاتر بکرێ. بە کردەوەش هەر هەموویان لەگەڵ ئەوە بوون دەرفەتی "وردە بازرگانی" بدرێ. ڕوونترین دەربڕینیش لەو بارەیەوە، هی پیرەمێردێک بوو، کە ڕاشکاوانە دانیپیدانا، بەوەی ترۆتسکی بووە. هەڵبەتە من ئەو پیرەمێردەم لە هیچ لە ڕیزەکان نەبینییەوە. من ئەوم لەسەر لێوارەکانی ڕووباری «پێچۆرا» بینی. پیاوەکە ڕووسی بوو. ئەو بە پەسندانی ئەوەی لای جوو پێیدەگوترێ هەستێکی پاک، کەوتە قسە. "من لایەنگری ترۆتسکی بووم. هەمیشە هەوبووم، تەنانەت ئەگەر باقی

---

165 _Primus

ژیانی خۆم لێرە ببەمەسەر. ئەگەر هاتبا و ترۆتسکی لە دەسەڵاتدا بووایە، ڕەوشی ئێمە سەرلەبەری دەگۆڕا. ئاخر ترۆتسکی دەیزانی چی بۆ گەل باشە. ئەو لەسەر ڕێگەپێدانی وردە بازرگانی سووربوو ..."

بە کردەوەش هیچ شتێکی وا لە نێو بەرنامەی ترۆتسکیدا نەبوو، بەڵام ئەوە خەسڵەتی ترۆتسکییەکان بوو، هەر شتێک لە هزری ئاپۆرای خەڵکدا بوایە ئەوا ترۆتسکیش بۆی دەچوو.

کەچی لەو نێوەدا، ئاپۆرای خەڵک ناچارکرابوو، لەگەڵ ئەوە بڕوا، کە پێیاندەدرا. ئەمەش واتای ئەوەی نەدەگەیاند، لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا وردە بازرگانی لە ئارادا نەبووبێ. بە پێچەوانەوە، بازرگانی لە ڕووسیا بە هەرمێن[166] بوو، بە شێوەیەکی تایبەتی هەمووماڵێکیشی دەگرتەوە. دەکرێ مرۆ ئەوە بڵێ، لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا بە ئاستەم کەسێکت دەبینییەوە، بە دەستی خۆی شت نەکڕێ و نەفرۆشێ یان نەیگۆڕێتەوە. گومانم هەیە ئەگەر هیچ وڵاتێکی دیکە وەک یەکێتیی سۆڤیەت کردەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی هەبێ. ئەمەش دیسان یەکێک لە دژبەرییەکانی ڕژێمی سۆڤیەتییە: چینی بازرگانەکان لە بەینچووە و کەچی هەموو تاکێکیش خۆی بە بازرگانییەوە سەقاڵ کردووە. نەتەوەی ڕەنجدەر بۆتە نەتەوەیەکی بازرگان.

لە مانەوەم لە «دژیزیک» جارێکیان هەر لە سەعات چواری بەیانییەوە تا درەنگانێکی شەو لەڕیز وەستام. ناو بەناویش زاواکەم لێی وەردەگرتمەوە. لە ڕیزبەستنەکەدا چاوەڕێی نانمان دەکرد. هەر یەک دوو سەعات جارێک، ڕایاندەگەیاند؛ گوایە نانە نازدارەکە پاش ماوەیەکی کەم دەگا. کەچی هەر نەدەهات. لە کۆتاییدا، دوای چاوەڕوانییەکی یەک ڕۆژە، پێیانڕاگەیاندین نان نییە، چونکە ئاشەکان

[166] هەرمێن، کاڵایەک داوای زۆر لەسەر بێت. بابەتێک باوی بێت، بەڕەواج بێت.

شکاون و لە نانەواخانەکانیشدا ئارد نەماوە. ئیدی ڕیزە دووورودرێژەکە بڵاوەی لێکرا. خەڵکەکە بە زگی برسییەوە گەڕایەوە ماڵێ. ئەندامانی خێزانیش چاوەڕوانیی تەواوی ڕۆژەکەیان بە فیڕۆ چوو. بە برسیەتی لێیخەوتن.

بۆ بەیانییەکەی دیسان لە ڕیزەکەدا نۆرەی خۆم گرتەوە. هەشت کۆپۆن (کۆبۆن)م بۆ ئەو چوار کەسەی لە کۆڵیتەکەدا دەژیان، دایە هۆبەی نان دابەشکردن.

ئەو ژنەی نانەکەی دەدا پێیگوتم: "باشە بۆچی کۆپۆنی دوێنێم، دەدەیتێ؟"

منیش بە حەپەسانەوە وەڵاممدایەوە: "مەبەستت چییە؟ دوێنێ نانەکەمان بەرنەکەوت، ئاشەکە لە کار وەستابوو."

"پێتوایە هەواڵی دوێنێی ئاشەکان نازانم؟ دەزانم دوێنێ نانت بەرنەکەوت. بەڵام خۆ تۆ لە ئەمڕۆدا دەژی؟ ئەگەر بەم شێوە بێ، هەموو شتێک لە جێی خۆی دەبێ. لێرە بەشە سەموونی دوێنێ وەرناگری، ئەمەش بەشی چوار کۆپۆنەکە."

هەوڵمدا قەناعەتی پێبهێنم، بەڵام بێسوود بوو. ئەو هەر لەسەر قسەی خۆی مکوڕبوو، دەبوایە من لێیڕاهاتبام، هەر ئەوەش سەرهێڵە ڕاستەکەبوو. ئەمەشیان ڕێسایەکی ڕیزبەستنەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بوو.

بەڵام سەرەکیترین شت، کە لە ڕیزبەستنەکانی یەکێتیی سۆڤیەت فێربووم، ئەمەی خوارەوە بوو: هەموو هاولاتییانی سۆڤیەت، ئەوانەی چاوەڕێی بەشە نانی خۆیان دەکرد، وەک من زگبەتاڵ و برسی بوون.

به کـردەوە سـەموون تـاکە خـۆراک بـوو. زۆر کەم لەوان بەختیـان هەبـوو، سـەلکە پیازێـک یـان سـەلکە توورێـک لە بـازاڕی کۆلخـۆزدا دەسـتیان کەوتبـا. نـزیکەی هەمـوو ڕۆژەکە لە ڕیـزەکەدا لە سـەر پێـی خۆیان دەوەستان و چاوەڕێیاندەکرد، بێ ئەوەی هـیچ پرتەوبۆڵەشیان سەبارەت بە ڕێکخستنی دۆخەکە لێوە بێ. ئەو کاتە و دوای بیست و چـوار سـەعات چـاوەڕوانی، گوێیـان لە ڕاگەیانـدنێکی سـامناک دەبـوو "سەموون نەما،" دیسان هیچ دەنگی ناڕەزایەتییان لێبەرز نەدەبووەوە و بە بێدەنگی دەگەڕانەوە مـاڵی خۆیـان. گومـانی تێـدا نەبـوو، ئەگەر ئەم دۆخە لە هەر وڵاتێکـی دیـکەدا بـووایە، دەبـووە هەراوهوریـا و پاشـاگەردانی. لە یەکێتیی سۆڤیەتدا هـیچ هەراوهوریا یاوەری برسـێتی ئاپۆرای خەڵک نەبوو.

لە ڕیزبەسـتندا بە پـێچەوانەی لایەنـی بیـردۆزییەوە، فێـری ئەوە بـووم، دەکرێ سروشتی مرۆڤ بگۆڕدرێ. ڕژێمی یەکێتیی سۆڤیەت لە زۆر ڕوانـگەوە سروشـتی ئەو مرۆڤانەیـان گـۆڕی، کە لە بـن قەڵەمڕەوێتیـی ئەوانـدا دەژیـان. ڕژێمـی سـۆڤیەت سـنووری هەر پیـاوێکی لە بـارەی ژانوناسـۆری بـێ یـاخیبوون بەزانـد؛ ئەو سـنوورەی گەر هاتبـا لە دەرەوەی یەکێتیـی سـۆڤیەت بـووایە، بە خـاڵی وەرچەرخـانی سـنوور دادەنـرا و نەدەپەژرێنـرا. پاڵـدان و لابردنـی سـنووری بەرگەگـرتن بـۆ دەسەڵاتی ڕەهـا هۆکـارێکی زاڵبـوونی بێسنوور بـوو. باشـە، چـۆن ئەمە کـرا؟ ڕیزبەسـتن و دەزگەی ئاسایشـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی هەم ڕێگەکە و هەم باجەکەشی دەزانن.

لەو شـارە بچکۆلانەیەی نێوان «سـەمەرقەند» و «بوخـارا» پێیـانگوتم، ئەوەی سـەموونەکە دابەشـدەکا، جـووە. لە ڕابـردوودا بیسـتبووم، جووەکـانی بوخـارا زمـانی جووایەتیـان پاراسـتووە و لە بـن دەسـەڵاتی ڕژێمی سۆڤیەتیشدا «تەوجیل» و «تەلمود» بە منداڵەکانیان دەڵێنەوە.

ئیدی بڕیارمدا بەختی خۆم تاقیبکەمەوە. کاتێک نۆرەکەم هات، بە عیبری لە کابراکەم پرسی: "ئەرێ ئێوە کنیشتەتان لێرە هەیە؟"

ئەویش سەیرێکی کردم و هەر بە عیبری وەڵامیدامەوە: "تۆ جووی؟"

لەوێ لە شارەکەدا هیچ کەنیشتەی لێنەبوو؛ بەڵام لە «سەمەرقەند» یەکێکیانم دۆزییەوە. تا ئەوکاتەش ئەوێم جێهێشت و ڕووم لە «سەمەرقەند» کرد، پەکم لەسەر سەموون نەکەوت. پشتگیری جووانە – عیبرییانە هەندێ جار لە یەکێتیی سۆڤیەتدا کاری خۆی دەکرد.

بەڵام لە هەمووویەوە، جیاوازییێکی دیکەی "پشتگیری" لە ڕیزکان فێربووم. هیچ ڕۆژێک، هیچ ڕیزبەستنێک نەبوو، لە هیچ لەو پەڕاگەندەییەمدا نەبوو گوێم لەم سەرنجانەی خوارەوە نەبێ:

"هۆی، ئابراهام! تۆ پاڵ بە کێوە دەنێی؟"

"ئابراهام مەکربازە، ئەو ناچێتە بەرەی پێشەوەی شەڕ. دیارە ژیانی ئەو لە جووتیارێکی ڕووسی نازدارترە."

"خۆت دەزانی، دوێنێ ئابراهکای (هیندی)ێک وەک پەنابەرێکی بەستەزمان گەیشتە ئێرە. هەگبەکەی پڕ لە دە ڕۆبڵی بوو."

"جووەکان لە بەرەی پێشەوەی جەنگدا نین، هەموو ئەو ڕاستییە دەزانین! باشە بۆچی بچنە بەرەی پێشەوە؟ ئەدی ڕووسەکان بۆ چیین؟"

هەرگیز لە نێو ڕیزەکاندا گوێم لە وشەی «ژهید Zhid» جوو نەبوو. لە ڕووسیا تەنیا یەکجار، بەدەر لە ئۆردوگا زۆرەملێکان، گوێم لە وشەکە بوو. لە شاری «فێرگانا» بەسەر شەقامێکی سەرەکییدا دەڕۆیشتم. لە پێشمدا ڕووسییەک دەڕۆیشت بە هەموو دەنگی خۆی

هاواریــدەکرد: "دەبــێ هەر هەمــوو جووەکــان ســەرببڕدرێن!" ئەو بە ڕاستگۆییێکی دژوارەوە قسەیدەکرد، ئەو بەدمەست بوو.

بەڵام وشە سەنگینەکانی ئەو خەڵکەی لە ڕیزبەستنی خۆیاندا نۆرەیان گرتبــوو، یــارمەتی ئەو لێتێگەیشــتنەی دەدا، ئــاخۆ چــۆن لە یەکێتیــی ســۆڤیەتدا، کێشــەی جــوو "چارەســەرکراوە". ئەم وشــانە بە شــێوەیەکی سەرەکی لە دەمی گەنجان، ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان پازدە و حەڤدە ساڵیدا بوون، ئەوان بەرهەمی نەوەی شــۆڕش بــوون، هەر هەمووشــیان ئەندامی کۆمسۆمۆل[167] بوون. ئەمەش واتــای ئەوەی دەگەیاند، لاوانــی ســۆڤیەتی لە مــاڵەوە یــان لە قوتابخــانە یــان لە هەردوو شــوێنەکەدا گوێیــان لە ئابراهــامی مەکربــاز Abraham Chitrori ببــوو. ئەم وشــــانەش نەوەک هەر ئەوەی ڕوونــــدەکردەوە، کە بــــۆچی «ئیلیــــا ئێهرنبــورگ[168]» هەوڵیــدا بــوو، ئەوە بســەلمێنێ، زۆر لە جووەکــان لە بەرە هەمەجۆرەکــانی جەنگــی دووەمــی جیهانــدا فەوتــان؛ هەروەهــا ئەوەشــیان ڕوونکــردەوە، چــی لەبەر ســێبەری جەنگــی ســێهەمی جیهــان ڕوودەدا، کاتێــک فەرمــــان بە هەڵمەتــــی ڕقلێبــــوونەوە دەدرێ، کە بە پێشەنگێکی چارەنووسسازی هەر شــەڕێک دەزانرێ، بەوەی "ئابراهــامە مەکربازەکان" لە پشت دوژمنە نوێیەکەن، کە ئەمریکایە.

---

[167]– کۆمسۆمۆل Komsomol ڕێکخراوی گەنجانی یەکێتیی سۆڤیەت.

[168]– ئیلیا ئێهرنبورگ Ilya Ehrenburg (١٨٩١–١٩٦٧) نووسەرێکی جووی سۆڤیەتی، شۆڕشگێڕێکی بەلشەفی، ڕۆژنامەنووس و مێژوونووس بوو.

## ٢٤

# دوای مەرگی ستالین[169]

هاوچەرخەکانم و منداڵەکانیان دەکرێ ئینگلستانیش بەبێ چەرچل و ڕووسیاش بە بێ ستالین ببینن. کەسیش ناپرسێ: "ئەرێ دوای مردنی چەرچل چی بەسەر ئینگلستان دێ؟" لە کاتێکدا بۆ ساتێکیش گومان لە گەورەیی گیانی ئەو پیاوە ناکرێ، کە کەمێک بەر لە کشانەوە سەرکەوتوانەکەی «داونکەرک» هاتەسەردەسەڵات، بەوەی خۆی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا گورجکردەوە و سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا هەمووان دەزانن کاتێک کاتی خانەنشینییەکەی بێتە پێشەوە، ئەوا خانمە گەنجەکە، «ئیلیزابێت» لەسەر شاژنایەتی خۆی لەسەر تەختی ئینگلستان بەردەوام دەبێ و یەکێکیش لە کۆنسێرڤاتیڤەکان یان لە پارتی کار، دەکرێ ببێتە سەروەزیری حکوومەتی خاوەنشکۆ. تا ڕاددەیەک ئەوە ڕوونبۆتەوە، ئینگلستان سەربەخۆیی ئەو گەلانەی ڕاستەوخۆ فەرمانڕەوایی بەسەردادەکردن، مسۆگەردەکا و هەوڵدەدا حوکمڕانییەکەی ناڕاستەوخۆ بێ. سەختە دەوڵەتەکە بە دەوڵەتێکی هەژارونەدار بمێنێتەوە. شتێکی نەکردەشە بە ئیمپراتۆریەتێکی نەدار بمێنێتەوە. چالاکی سیاسییانەی چەرچل بەو پێواژۆیە ناکرێ. مردنەکەشی

---

169– ئەم بەندە بە زیاتر لە مانگێک، دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی نەخۆشکەوتنی ستالین و دواتر مردنی بەهۆی نەخۆشییەوە نووسراوە. نووسەر

کارڕاییەکە خێراتر ناکا. هەرچۆنێک بێ شتەکە نابێتە مایەی خێراترکردنی چارەنووسە هەستپێکراوەکە.

ستالینیش هەر تەنیا سێ ساڵ لە چەرچل گەنجترە. ئەگەر بە گوێرەی قانوونی سروشت و زانستی پزیشکیش بڕۆین، دەسەڵاتداری سۆڤیەتیش، هیچ دەرفەتێکی دیکەی لە بەردەمدا نامێنێتەوە. خۆ ئەگەر ئێمە تێکڕای تەمەندرێژیی جۆرجییەکان لەبەرچاوبگرین، هەر دەبێ لە پەنجاکان یان لە شەستەکان مەیدانەکە چۆڵبکا.

کەچی هەمووان دەپرسن: "ئەگەر هاتوو ستالین بمرێ، ئەرێ چی بەسەر ڕووسیادا دێ؟"

لێرەدا من گوێم لە دوو وەڵامی ئەو پرسە نەوەک هەر پێشبینیکراوە بەڵکو چارەنووسئامێزە بووەتەوە: یەکەمیان، هەر وەک شتێکی ئاسایی پێچەوانەی ئەوەی هەیە دەقەومێ. دەگوترێ، دوای مەرگی ستالین ڕژێمی سۆڤیەت بەسەریەکدا دەکەوێ. ئەوانی دیکەش دەڵێن، دوای مردنی ستالین، دەسەڵاتدارێکی دیکەی بەلشەفیک جێگەی دەگرێتەوە و هیچ گۆڕانکارییێک لە ڕووسیادا ڕوونادا.

ئەوانەی وەڵامی یەکەمی پرسەکەیان بەو جۆرەی نووسراوە داوەتەوە، بۆچوونەکەیان لەسەر قانوونەکانی مێژوو هەڵێنجاوە. ئەوان دەڵێن، دەسەڵاتداری تاکڕەوی، لەگەڵ غلۆربوونەوەی کەللەسەری سەردارەکە، دەسەڵاتەکەش دەڕمێ. هەرچەندە مرۆڤ ئەوەشی لە مێژوودا دۆزیوەتەوە، کە شکستی سەربازییانە لەوانەیە لەناوچوونی دیکتاتۆری تێدا بەرجەستەنەبێ، واتە ڕۆیشتن و ڕووخانی دیکتاتۆر هەمیشە ئەوەی لێناکەوێتەوە، کە دیکتاتۆریەتیشی لەگەڵدا گۆڕبەگۆڕ بچێ.

هەرچۆنێک بێ، ئەو دەسەڵاتە تاکڕەوییەی لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا هەیە، نابێ بە چاوی دیکتاتۆریی وڵاتانی دیکەوە سەیربکرێ و بەراوردبکرێ.

دەســـەڵاتدارێتی ســـۆڤیەتی لەســـەر پێکهـــاتەی ئـــابووری دانیشـــتوان هەڵنەنیشتۆتەوە؛ بەڵکو خۆی ماخۆی پێکهاتەکەیە. لە توانستی خۆی وەک تاکە دابینکەر، وەک دەسەڵاتی تاکڕەوی ڕووسی ڕۆچۆتە نێو هەموو کایەکانی ژیانی خەڵکەکە، ڕۆچۆتە نێو هەموو کونوکەلەبەری ژیانی تاکەکانەوە. قانوونەکانی ئاسایی مێژوو، ئەوانەی پەیوەستن بە دیکتاتۆرییەوە، تا ئەو ڕادەیەی ئەو جۆرە قانوونانە هەبن، ئەوا بەسەر دەسەلاتی تاکڕەوی ناوازەدا پەیڕەونابن. هەر بۆیە، مرۆ ناتوانێ ئەو ڕوانگەیە پەسەندبکا، کە لەو ڕۆژەی ڕادیۆی مۆسکۆ مەرگی لینینی ڕاگەیاند، ئەو تەختەی لە نۆڤێمبەری ١٩١٧دا دامەزرێنا، بڕووخێ.

بەڵام تۆبلێی ئەوان لەسەر حەق بن، ئەوانەی دەڵێن بە مەرگی ستالین هیچ شتێک لە ڕووسیا ڕوونادا، بەدەر لەوەی کەسێکی دیکە بێت و ببێتە "ئاوەزمەندترین کەس"؟ کەسانی سەر بەو قوتابخانە هزرییە، ئاماژەکەیان لە پێشینەی لینین - ستالینەوە وێناکردووە. ئەوان گوتیان لینینیش دیکتاتۆر بوو، کەچی لە دوای ئەو چی ڕوویدا؟ چەند لق و هۆبەیەک لە میراتگرەکانی هەبوون، بەڵام ئەوەی لە هەموویان باشتر بوو، بووە دەسەڵاتداری تاک و جێگەی پێشینەکەی خۆی گرتەوە. ئەوەی ئەوان گەلاڵەیان کردووە، هەر ئەوەش دوای مەرگی ستالین ڕوودەدا.

لۆژیک ئەوە دەخوازێ جیاوازییێکی بنەمایی لە نێوان شێوازی فەرمانڕەوایی لینین و خەسڵەتی ستالین بۆ دەسەڵات بکێشرێ. هەڵبەتە لینینیش لەسەر لوتکەی قووچەکی ڕژێمێکی دیکتاتۆری وەستابوو؛ بەڵام ئەو دیکتاتۆر نەبوو بەسەر دیکتاتۆراندا. ئەو یەکێک بوو لەوان، هەرچەندە گەر سەریشیان بووبێ. لینین لەگەڵ برادەرەکانی بە دوای سازان دەگەڕا، هەوڵیدەدا بیانهێنێتە ڕایێ. هەندێ جار بیروبۆچوونی برادەرەکانیشی پەسەنددەکرد، هەر بۆ نموونە، لە پرسی دانوستاندن لەگەڵ ئاڵمان لە برێست - لیتۆڤسک. هەندێک جار لەوەدا سەرکەوتوو

بوو، کە هەقبوونی خۆی بە یاوەرانی خۆی بسەلمێنێ، وەک ئەوەی لە دوای گفتوگۆی ئاڵمان – بەلشەفیک سەری نەگرت و سوپای قەڕاڵیش دوژمنکارییەکەی بۆ سەر ڕووسیا هەڵگیرساندەوە. لینین تەواو ڕاشکاوانە لە چاودێریکردنی هاوڕێکانیدا سەرکەوتوو بوو، نموونەش دۆزی «زینۆڤیێڤ» و «کامینێڤ»ـە دوای ئەوەی لە ئانوساتی دەستپێکی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا ڕاگەیەندراوێکیان بڵاوکردەوە، تێیدا بە ئاشکرا لینینیان تاوانبارکرد، گوایە چینی کرێکار لەسەر لێواری کێفەڕاتێکی گەورەدا بووە بە هۆی ئەوەی هەوڵیداوە شۆڕشێکی چەکداری بەرپابکا. بەڵام لینینیش دەیزانی چۆن لێبوردە بێ. تەنانەت بۆ ئەو ڕاگەیەنراوەش، کە نەوەک هەر کارنامە بەڵکو ژیانیشی دەخستە مەترسییەوە، کەچی لە هاوڕێکانی خۆشبوو، کە دژی وەستانەوە.

ئەو ئەگەرە هەیە جیاوازی نێوان شێوازەکانی حوکمڕانی لینین و ستالین لە جیاوازی خەسڵەتی کەسایەتی هەردوو سەرکردە شۆڕشگێرەکەوە سەرچاوەی گرتبێ. مسۆگەرە بناوانی دەسەڵاتی هەردوو سەرکردەکە تەواو لەیەک جیاوازن. لینین دەسەڵاتەکەی لە ڕێی زاڵبوون بەدەستهێنا، هەرچی ستالینە بۆی بەجێما. هەژموونی ژیانی لینین بەسەر هاوڕێکانی هەر مۆراڵ یان ڕۆشنبیریی بوو. ئەو لەسەر بەکارهێنانی ئەو ڕێگەیانە لە ماوەی ئەو چەند ساڵە کەمەی حوکمڕانییدا بەردەوامبوو. ستالینیش لە تەمەنی سی و هەشت ساڵیدا، تاڕاددەیەک هەموو ئامرازەکانی هێز و دەسەڵاتی لە دەستی خۆیدا کۆکردەوە. کاتێکیش بە تەواوی دەسەڵاتەکەی کەوتە بەردەست، ئەو چەندین ساڵی پاشخانی نەوەک هەر هێزی زاڵبوونی میری هەبوو بەڵکو، شەقڵی چۆنیەتی بەکارهێنانیشی بۆ مەیسەربببوو. وەنەبێ ئەو ڕاستەوخۆ دەستی بە کوشتن کردبێ، بەڵکو وەک حوکمڕانێک زیاتر مەیلی بە لای لەناوبردن نەوەک قەناعەتپێهێنادا چوو. دەکرا لینین هەڕەشەی دەستلەکارکێشانەوە، هەڕەشەی خۆکێشانەوە لەسەر

سەکۆی نمایشبکا، کەچی ستالین نەیارەکانی خۆی لەسەر ڕووی زەوی دەسڕییەوە! ڕێسای لینین کە "یەکەم بێ لە نێو یەکسانەکان"؛ هەرچی ستالین بوو دیکتاتۆر بوو بەسەر دیکتاتۆران. لە ڕوانگەی تیۆری شۆڕشگێڕێتیدا، لینین زۆر لە ستالین مەزنتر بوو، بەڵام لە سۆنگەی جیاوازی شێوازەکانی حوکمڕانییدا، لەدوای مەرگی ستالین، بۆشایی سەرکردایەتی دەکرێ گەورەتر بێ لەوەی کاتی خۆی لەگەڵ مەرگی لینیندا سەریهەڵدا.

هۆکاری دووەمیش هەیە، کە دەبێتە مایەی ئەوەی داوەریکردن لەسەر پێشینەی لینین – ستالین نەکردە بێ. ئەویش هۆکاری میراتگرەکانە. لێرەدا مەیلێک بۆ چاوپۆشین لە ڕاستییە مێژووییەکە هەیە، بەوەی ترۆتسکی، ڕکابەرە گەورەکەی ستالین، نەوەک هەر لە ڕووی ستالیندا نەیار بوو بەڵکو لەوەش خراپتر، ئەو بەرپەچی لینینیشی دابووەوە. ئەمەش ئەو ناکۆکییە قووڵەی نێو ژوورەکانی کرێملن نییە. بە پێچەوانەوە، نەیاریی ترۆتسکی بۆ شێوازەکانی بەڕێوەبردنی پارتی کۆمۆنیست لە بن سەرپەرشتی لینیندا، لای هەموو ئەندامێکی پارتی کۆمۆنیستی ناسرا بوو، ڕاستییەکەی لە ڕێی ڕۆژنامەوانی و کۆبوونەوە کراوەکاندا بۆ هەموو کەسێکی نێو یەکێتیی سۆڤیەت زانراو بوو. لەپێناو سەرکوتکردنی بەرهەڵستی ترۆتسکی و لایەنگرانی، لینین لە دواهەمین کۆنگرەی پارتییدا، کە ترۆتسکیش تێیدا بەشدار بوو، پێشنیازی دامەزراندنی نووسینگەیەکی سکرتێری گشتی کرد، تا ئەو کات ئەو پلەیە لە نێو پارتیدا نەبوو. خۆی هەر لینینیش بوو، پێشنیازیکرد ستالین بکرێتە بەرپرسی ئەو پلە مەڵبەندی و یەکلاکەرەوەیە. ترۆتسکی ئەم شتەی لە کتێبەکەی خۆیدا سەلماندووە، لاپەڕەی دوایین و بەرەنجامەکەی مێشکی خۆی بۆ گوشی بوو. ترۆتسکی بەکردەوە باسی ئەوەی کردبوو، کە لینین بە یەک دوو هەفتە بەر لە مردنی خۆی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ستالین بڕیبوو، چونکە بە شێوەیەکی زبرو بێڕێزانە لەگەڵ «کورپسکایا»ی ژنی لینین

جووڵابــووەوە. بەڵام ئەگەر ئەمەش ڕاســت بــێ، ئەم حــاڵەتە بــۆ هــیچ کەسـێک بەدەر لە یەک دوو کەسـی نێو کرێملن نەزانرابـوو؛ هەر وەک چــۆن خواســتی لینــین بــۆ داوانــامەکەی کە ســتالین لە نووســینگەکە دووربخــرێتەوە، تەنیــا بــۆ گرووپێکــی زۆر ســنووردار لە ســەرانی ڕژێمەکە ناسرابوو.

لە چـاو ئەنـدامە ئاسـاییەکانی پـارتی و بە گشـتی خەڵـکەکە، لە دوای مەرگــی لینــین، ترۆتســکی وەک کێبڕکــارێکی ســەرکردە مەزنەکەی شۆڕش ناسرا، لەو کاتەی ستالین وەک پیاوێکی دڵسۆزی لینین، وەک پاسـەوانی سیاسـەتەکەی، وەک پیاوێـک کە دەتـوانی هەنگاوەکـانی ئەو درێژەپێبدا، ناسرا. لە دیکتاتۆرییدا هەروەک پاشایەتی، بایەخی بەرچـاو دەکەوێـتە سـەر پرسـی جێنشـینی. بۆیە، هەر لە سـاتەکانی بەرایـیەوە، سـتالین بــایەخێکی لە پێشــینەی – بــایەخی لە پێشــینەی دڵســۆزی و درێژەپێــدەری ڕێبــازەکە – لە بەرانــبەر کێبەرکــارە ســەرەکییەکە و تەواوی کێبەرکارەکانی هەبوو.

هیچ کام لە جێگرەوەکانی ستالین ئەو خاسـیەتە پێشنۆرەییەیان نەبـوو. هــیچ کامێــک لەوان بەرهەڵســتکاری نەبــوون، نەدەکــرا هیچیــان بەرپەچیبــدەنەوە. هەمــوو ئەوانەی هەبــوون، دڵســۆزی بــوون. بــۆ هەمووانیش ئەو دوادەسەڵات بوو، ئەو تـاکە پیـاو بـوو، کە دوا بڕیـاری لە لا بـوو. هەرچۆنێک بێ، خەڵـک نەبیسـتبووی نە هـیچ جیاوازییێکیشـی لەنێـوان بیروبۆچـوونی «مۆلۆتـۆڤ» یـان «سـتالین»ـدا بەدیـدەکرد، بەوەی «مـالینکۆڤ» یـان «بێریـا» بتـوانێ بیسـەلمێنی، کە ئەو خـۆی نەوەک «مۆلۆتۆڤ» شایستەترە لە جێگرتنەوەی کۆچکردوودا. هەمـان بنەماش بەسـەر «مۆلۆتۆڤ» لە بەرانبەر «مـالینکۆڤ»ـدا پەیڕەودەبێ، یاخود «مالینکۆڤ» لە هەمبەر «بێریا»، یـان «بێریـا» لە بەرانـبەر دوو هاوڕێکەی خۆی. کەواتە ئایا سێکوچکەیی چارەسەرە؟

هەر لە ڕۆژگـاری «یولیـوس» قەیسـەرەوە تـا سـەردەمی سـتالین، سێکوچکەییەکان سەلماندیان کە لەنێو پێکهێنەرەکانی دەسەڵات خۆیدا، مەیدان مەیدانی کێشە و ناکۆکییە. لە کاتێکدا ستالین دەستپێشخەری لە پێشـینەی خـۆی وەک "جێگرەوەیەکـی دڵسـۆز" بەسـەر «ترۆتسکی» نەیـارە ڕکـابەرەکەوە هەبـوو، هەرچـی سـێ کەسـەکان، لەچـاو ئەو بەراوردەدا و لە چـاو جێگرەوەییـدا هاوشـانن. بە گـوێرەی ئەمە بـێ، دەکرێ مرۆ ئەوە لە ڕەوشـەکە هەڵبهێنجێ، کە بە یەکدادانی حەتمی لە نێـو ئەو سـێکوچکەییەدا وەنەبێـت هەر نـاکۆک بوونێـک بـێ لە سـەر ئاستی "کۆشک" بەڵکو بە درێژایی ڕێبازەکە ڕەنگدانەوەی دەبێ.

لە ئاسـتی خـوارەوەش، ئەگەر لە گۆشـەنیگای مـاخۆیەتی سەروسـامان یان ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا هیچ چینایەتییەک لە گۆڕێدا نەبێ، بەڵام لە هەمان کاتدا شتەکە لە نێو ئۆرگانەکانی میرییدا پەرەیسـەندووە، یـان بـــووەتە تـــوێژ و توێژکـــاری کە بەردەوام بـــۆ بەدەســـتهێنانی دەستڕۆیشتنی مەزنتر یان بۆ کۆنترۆڵی تەواو لە کێبڕکێدا بن. چوار ئۆرگـانە سـەرەکییەکانیش ئەمـانەن: هێـزی پۆلیسـی نهێنـی، سـوپای سوور، پارتی کۆمۆنیست و نەقابەکانی کرێکاران. ئەو کێبەرکێکارییە نێوخۆییەی توێژەکان بۆ بەدەستهێنانی پۆستی باڵای چارەنووسسازانە و دەسەڵاتی یەکلاکەرەوە لە نێو حکوومەتدا هەر هەبووە، تەنانەت لە کاتێکـــدا ســـتالینیش هەر لە ژیانـــدا مـــابوو. لە ئەنجـــامی کێبەرکێکارییەکەشـدا چەنـدین هەڵمەتـی گەسـکلێدان قەومـان. بەڵام سـایەی سـتالین، ئەو لەنـاوبەرە مەزن و سـەرکەوتووە گەورەیە بەردەوام پەردەپۆشـــی ئەو شـــەرەقۆچانێیەی دەکـــرد و تـــاک دەسـەڵاتداری سۆڤیەتی دەربەستی لەخـۆگرتنی ناکۆکییەکـان دەهـات. کاتێکیش ستالین دەڕوا، ئەوا ئەو بەیەکدادانانە نەوەک هەر دەتەقینەوە بەڵکو بازنەی دژواریی خۆشیان بەرفرەوانتردەکەن.

ئەگەری ئەوە هەیە پارتی کۆمۆنیستی - لە ڕێی یەکێک لە دەسەلاتدارەکانی، کە دەیەوێ خۆی مەزنایەتی بکا - تێبکۆشێ، ڕۆژەکانی بەرێ، هی ڕۆژگاری لینین بگەڕێنێتەوە، کە بە خۆی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە سەردەمی ستالین لەدەستیان دابوو. بەلام کێشە هەرەبەهەندهەلگیراو و دژوارییە هەرەزۆرەکەی ڕژێمی سۆڤیەتی ئەوەیە، نێوانی دەزگەی ئاسایش و سوپای سوور تێکبچێ. هەردووکیشیان لەشکری خۆیان هەیە. هەردوو لاشیان ڕقیان لە یەک دەبێتەوە.

من لە شارە دێرینەکەی «سەمەرقەند» ئاشنایەتیم لەگەڵ جووێکی پەنابەری خەڵکی «ڕگا» پەیدا کردبوو، ئەویش برادەری کۆلۆنێلێکی سوپای سوور بوو، زۆر جارانیش بە یەکەوە بە بۆنە سەرکەوتنەکانیان بەسەر لەشکری ئاڵمانیدا دەیانخواردەوە. ئەو ناسیاوەم پێیگوتم، لە یەکێک لەو بۆنە خواردنەوانەی ئەفسەرە پلەبالاکەی سۆڤیەتی، دیاربوو زۆری عەرەق[170] نۆشکردبوو، بەدمەست ببوو، دەستی لە ملی برادەرە جووەکەی نابوو ماچیکردبوو، ئینجا بە گریانەوە پێیگوتبوو: "بڕوام پێبکە، دەی ئەگەر ئەمجارە یەخەمان لە یەخەی هیتلەر ببێتەوە، ئەوسا ئێمە چارەی ئەو بیژمۆتانە، چارەی ئەهریمەنەکانی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دەکەین ..." ئەو ڕووداوانەی لە ڕابردوودا قەومان، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن، ئەوەی کۆلۆنێلەکە درکاندی نەوەک هەر بیروبۆچوونی خۆی بووە، بەڵکو هی پلەبالاکانی نێو لەشکریش بووە.

وێڕای ئەو کێبڕکێیەی نێوان ئۆرگانەکان، لە ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیدا هێزی هەڵقولاوی ناوەندییش هەن. لێرەدا ئاماژەکەم بۆ دەوڵەتە لکێندراوەکان نییە، زۆر - یان هەر هەموویان - پێدەچی دوای مەرگی

---

170– نووسەر هەر وشەی Arakی بەکارهێناوە، عەرەقیش خواردنەوەیەکی لیتوانییە کە ڕێژەی ٤٠ تا ٦٠٪ی ئەلکهوولە.

ستالین بە شوێنپێی «تیتۆ»دا بڕۆن. لێرەدا ئاماژەم بۆ نەتەوەکانی دیکەی نێو سنووری ڕووسیای سۆڤیەتییە. هەر بەڕاستیش ڕژێمی سۆڤیەت، زۆر شتی بۆ "دارشتەی نەتەوە" بە "تێگەیشتنی سۆشیالیستیانە" بۆ ژیانی کەمینە نەتەوایەتی هەرێمایەتییەکان کرد. لە هەردووکیان، لە باکوور و لە «ئۆزبەکستان» من ڕۆژنامەم بە زمانی دانیشتوانی ناوچەکانەوە بینین. بە کردەوەش، دانیشتوانەکان، تاڕاددەیەک ئەوانەی دەزانن بخوێنن و بنووسن، بە ڕووسی دەخوێننەوە؛ هەرچی ڕۆژنامە خۆجێیەکانیشن لە جیاتی خوێندنەوە وەک پەڕی جگەرە بەکاردەهێنرێن. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەو ڕۆژنامانە هەر لەسەر حاڵەتی هیچی خۆیان لە بڵاوبوونەوە بەردەوامن.

ئەمەش واتای ئەوە ناگەیەنێ، ڕژێمی سۆڤیەت سەرکەوتوو بووە لە زاڵبوون بەسەر ئەو قین و کینەی لەنێو گەلە هەمەجۆرە بەیەکەوە لکاوەکاندا و لە دووتوێی دەوڵەتی ڕووسیا یان لە چوارچێوەی یەکێتیی سۆڤیەتدا هەیە. من لەنێو زۆر شتی دیکەدا، ئەو پیلانە پڕقینەی ڕووسەکانم بینی. یەکێک لە دەربڕینە هەرە ڕاشکاوەکانی ئەم ڕقە لە لای خۆی ڕەنگدانەوەکە بۆ خۆی. جارێکیان لە گەڕەکێکی لاپەڕگەی شاری «دژیزیک»دا بەسەر گردبوونەوەیەکی پڕ لەدەنگوهەرا ڕاگەیشتم، دیمەنێکی نائاسایی لە یەکێتیی سۆڤیەتدا نیشاندەدا. لە هۆکارەکەم پرسی، ئافرەتێک پێیگوتم، ئەوان ئۆزبەکییەکیان لەگەڵ کوڕە هەتیوێکی ڕووسی گرتووە. "ئەم ئۆزبەکییانە منداڵەکانی ئێمە دەڕفێنن."

لە لێکدانەوەم بۆ تەواوی هۆکارەکان دەکرێ ئەم بەرەنجامەی خوارەوەی لێهەڵبهێنجێنرێ: هەروەک ئەوەی زەمینەیەکی ئەو پێشبینییە لە گۆڕێدا نییە، بەوەی لەگەڵ مەرگی ستالیندا، دەستبەجێ ڕژێمی سۆڤیەتی بڕووخێ، هەروەها هیچ ڕاستکردنەوەیەکی ئەو

بیرکردنەوەش لە ئارادا نییە، بەوەی دوای مەرگی ئەو هیچ شتێک لە ڕووسیادا نەگۆڕێ. لە هەمبەر ئەوەدا، زەمینەیەکی پتەوی بیرکردنەوەی وەها هەیە، لە ماوەیەکی دیاریکراودا و دوای مەرگی ستالین، ناکۆکییەکانی نێوان میراتگرەکان و شوێنکەوتووەکانیان سەرهەڵدەدا، کێبڕکێی نێوان چوار ئۆرگانەکە توند و گرژتر دەبێ و مەیلی سەرهەڵدانی خاڵە چەقەکانی کەمایەتیە نەتەوەکانیش پتر دەبێ. هەموو ئەو هۆکارانە - هەرچەندە دەستبەجێش نەبێ - سەردەکێشێ بۆ گۆڕانکاری لە فەرمانڕوایی یەکێتیی سۆڤیەتدا. ئەوانە دەبنە مایەی خولقاندنی دەوڵەتێکی تەواو جیاواز لەوەی ئەمڕۆ لەو ڕووبەرە پانوپۆڕەدا هەیە کە هەر لە ڤلادیڤوستۆک تا فرانکفۆرت درێژبۆتەوە.

بایەخە هەرەلەپێشەکەی ئەو ئەنجامانە، یان ئەو پێشبینییانە، هەر بەسەر ڕووسیاوە کاریگەریان نابێ بەڵکو سەرجەم مرۆڤایەتیش دەگرێتەوە. خۆ ئەگەر لە ماوەی پێنج یان دە ساڵی ئایندەدا، ڕەگەزی مرۆڤایەتی ڕانەکێشرایە نێو جەنگی جیهانی سێهەمەوە، ئەوا دەرفەتێکی باش بۆ نەوەی ئێمە و منداڵەکانیشمان دەڕەخسێ، کە بە تەواوی لە مەترسی وێرانکارییەکی ناوەکی تەواوعەیارەوە دووربکەونەوە.

## ٢٥

# لەگەڵ ئەوەشدا ...

"خەڵک لێرە دەربازی نابێ،" ئەوە قسەی ئەو پاسەوانەی زیندان بوو، کاتێ منی بۆ ئۆردوگای گواستنەوە لەسەر لێوارەکانی ڕووباری «پێچۆرا» برد.

تۆمارنووسە زیندانییەکەی نووسینگەی ئۆردوگا کاتییەکەش بەم جۆرە ڕۆژی ئازادبوونمی لە دەفتەرەکەی تۆمارکرد: "ڕۆژی دەرچوون: ٢٠ی سێپتێمبەری ١٩٤٨."

ئەو قسەیەی کابرای زیندانیکەرەکە کردی، ڕاستی بوو؛ ئەوەی تۆمارکەرەکەش یاداشتیکرد هەر ڕاستی بوو. ڕاستیش لەو قسەیەی دەزگەی ئاسایشی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا هەبوو، ئەوانەی ڕێیان پێدرابوو گاڵتە بە دەوڵەتێکی نەبوو بکەن و بە تەواوی قەناعەتەوە کابرای دەزگەکە پێیگوتم:

"نەخێر، تۆ دەوڵەتی جوو نابینی."

بەڵام ______

لە شەوی ١٥هەمی ئایاری ١٩٤٨دا، لەپشت مایکرۆفۆنێکی وێستگەی نهێنی ڕادیۆی «ئیرگون زڤای لیومی» قسەم بۆ گەلەکەم دەکرد:

"دوای ســـــالآنێکی دوورودرێـــژی خەبــــاتی ژێرزەمینـــــی، دوای چەوسـاندنەوە و ژانوناسـۆر، دوای ئـازارێکی جەسـتەیی و دەروونـی، ئەوانەی بەرەنگاری چەوسـێنەر ببوونەوە، ئێسـتا لە بەردەم ئێوەدا بە سوپاسـگوزاری سـەر لێـو و نـوێژ و درودی نـاو دڵیـان وەسـتاون. لە شەڕی خوێناوی، لە جەنگی ڕزگارییدا، دەوڵەتی ئیسـرائیل سـەریهەڵدا ...."

نـاکرێ حاشـایی لەوە بکـرێ، کە سـتەمکاریی ڕاسـتییە و ڕاسـتییەکی سامناکیش. بەڵام خۆ ڕاستییەکی دیکەش هەیە. ئەو کەسـە دڵشـادە، کە بڕوایەی ڕەتکردۆتەوە بەوەی ستەمکاری هێزێکی هەرەباڵادەست نییە. هەر بەڕاستیش، ئەو ڕۆژانی ڕەش، شەوانی لێپێچینەوە، شەوانی کاری زەحـمەت، شـەوانی ژێرزەمینـی، شـەوانی ئـازاری دەروونـی – شـەوە سپییەکانی تاقیدەکاتەوە. هەموو ئەوانە بەشی ئەون.

بەڵام خـۆ ڕۆژەکەش دێـت و ئەویـش لەبەر خۆرەتـاوی پێکەنینـی منداڵەکان پاڵبداتەوە.

**– کۆتایی –**

## چەند سەردێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ

- ❖ لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک لە دۆڵی ڕوستێی دەڤەری باڵەکایەتی لە دایک بووە.
- ❖ لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانوون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- ❖ لە ١٩٩٧ـەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەورووپا (هۆڵەندا و بەریتانیا) بووە.
- ❖ لە پاڵ زمانی زگماکیدا؛ زمانەکانی عەرەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزیش دەزانێ.
- ❖ لە ١٩٨٦ـەوە هەوڵی نووسینی داوە. تا ئێستا ١٧ کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان گوتار و لێکۆڵینەوەی قانوونی و سیاسیشی بڵاوکردوونەتەوە.

## چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١ - نهێنییەکانی مۆساد، نووسینی گۆردۆن تۆماس، وەرگێڕان لە زمانی هۆڵەندییەوە، سێ جار چاپکراوەتەوە؛ چاپی یەکەم ٢٠٠٨ چاپخانەی هێڤی، هەولێر. چاپی دووهەم دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠١٤. چاپی سێهەم ڕۆژهەڵات ٢٠١٦.

٢ - مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩، هەولێر.

٣ - داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نووسینی ڕۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی هێڤی ٢٠١١، هەولێر. چاپی دووەم ناوەندی ئاوێر ٢٠١٦ هەولێر.

٤ - کوردستان لە نێوان سیڤەر و سنوورە دەستکردەکاندا، نووسینی: هیسەر لێهر واگنەر. مێژوو. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. چاپی یەکەم؛ لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی هەولێر ٢٠١٣. چاپی دووەم، ئاوێر ٢٠١٥.

٥ - وەرزێکی سپیی وشکوبرینگ، ئەندریێ برینک. ڕۆمان. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣.

٦ - ژیانی من، چۆن ئیسرائیل دامەزرێنرا؟ گۆڵدا مایەر، یاداشت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر. ٢٠١٤.

٧ - ئینفێرنۆ، دۆزەخ، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.

٨ - شەرەف، ئەلیف شەفەق، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.

٩ - یاخیبوون، مناحیم بێگن، یادەوەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.

١٠ خـانووەکەی مزگەوتـی، قـادر عەبـدوڵڵا، ڕۆمـان، وەرگێـڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.
١١ – کـۆدەکەی داڤینشـی، دان بـراون، ڕۆمـان، وەرگێـڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر ٢٠١٦.
١٢ – خەتی بزماری، ڕۆمان، قادر عەبدوڵڵا، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئەندێشە، سلێمانی ٢٠١٧.
١٣ – کـردە هەرەگرنگەکـانی مۆسـاد، میخـائیـل بـار زۆهـار و نەسـیم میشال، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی.
١٤ – لە مەککە، قـادر عەبـدوڵڵا، ڕۆمـان، وەرگێـڕان لە هۆڵەنـدییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی
١٥ – ئەری کورد بوونە بەردەباز؟! ڕۆبەرت بریان گیبسن، مێژوو، لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی کوردستان، سلێمانی ٢٠١٩.
١٦ – زۆربای ئێرانی، قادر عەبدوڵڵا، ڕۆمان، لە هۆڵەندییەوە، ئامادەی چاپە.